# تەفسیری زمناكۆیی

بەقەلـەمی

مەلا سعیدی زمناكۆیی

جزمی ﴿١٤،١٥،١٦﴾

بەرگی هەشتەم

ناوی کتێب : تەفسیری زمناکۆیی .
ناوی نووسەر :مەلا سعیدی زمناکۆیی .
جزمی چواردەهەم و پازدەهەم و شازدەهەم.
بەرگی هەشتەم.
چاپی یەکەم .
چاپی کۆمپیۆتەرو ڕاکێشانی : ﴿ چاپخانەی ئۆفسێتی بابان ﴾
ژمارەی سپاردنی (٤٠٩) ی ساڵی ( ٢٠٠٠ ) ی وەزارەتی ڕۆشنبیری پێ سپێردراوە .
مافی لەچاپدانی بۆ نووسەر پارێزراوە .

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ

بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان. سوپاسی بیٚ ژمارە بۆ خوای بونەوەران درودی بیٚ ئەندازە لەسەر پیٚغەمەرو یاوەرانی بیٚت .

﴿ سورەتی ئەلحیجرە ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٩٩ ) ئایەتن .

لەکاتیٚکدا خوای مەزن کۆتایی بەسورەتی ئیبراهیم هیٚنا بەباسکردنی قورئـانی پیرۆز و بەڕاستی قورئان و بەڕاگەیاندنی ئادەمیزاد. دەست بـەم سورەتەیش ئـەکا هەربـە باسی قورئان وفەرمانەکانی خوا ڕون ئەکاتەوەو ئەفەرمویٚ :

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**﴿ بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان ﴾**

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الٓر تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾ رُّبَمَا يَوَدُّ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لَوْ كَانُوا۟ مُسْلِمِينَ ﴿٢﴾ ذَرْهُمْ يَأْكُلُوا۟ وَيَتَمَتَّعُوا۟ وَيُلْهِهِمُ ٱلْأَمَلُ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ وَمَآ أَهْلَكْنَا مِن قَرْيَةٍ إِلَّا وَلَهَا كِتَابٌ مَّعْلُومٌ ﴿٤﴾ مَّا تَسْبِقُ مِنْ أُمَّةٍ أَجَلَهَا وَمَا يَسْتَـْٔخِرُونَ ﴿٥﴾

﴿ الٓمر ﴾ مانای ئه م پیتانه ڕابووردوون لەسورەتی ئەلبەقەرەو سورەتەکانی تـردا، بـەم نزیکەش لەسورەتی ئیبراهیم دا، هەندێ لە زانایان ئەلێن: ئەو پیتانه ناوی قورئانن .

﴿ تِلكَ آياتُ الكِتابِ وَ قُـرآنٍ مُبِـينٍ ﴾ ئـەم سـورەتەی ئـەوتۆ ئێمـە مانـای ئەکـەین ئایەتەکانی نامەی خوان، ئەو نامەیە لە ئەو پەڕی ڕێزدایـە و ئایـەتی قورئـانێکن ڕاسـت و پوچ جوێ ئەکەنەوە و ڕونیان ئەکەنەوە لە یەکتری، ئەو قورئانەی دادپەروەری و شـارەزا کردنی ئادەمیزادە.

﴿ رُبّما يَوَدُّ الَّذِيْنَ كَفَرُوا أنَّ لَوْ كانُوا مُسْلِمِيْنَ ﴾ زۆر کەسانی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە و تاوان باران پەردەی چاویان لائەبری، ئـاوات ئـەخوازن لـە جیـهاندا موسـڵمان بونایـە وکاریان بە ڕاستی بکردایە و باوەڕیان بـە موحەمـەد بهێنایـە. ئـەو ئاواتـەی بـێ بـاوەڕان لەوکاتەدا بێچاویان بە سەرکەوتنی موسڵمانان ئەکـەوێت یـا لەسـەرە مـەرگدا بـێ، یـا لەڕۆژی دواییدا کاتی پرسـیار و وەڵام گرنـگ نیـە، ئـەوەی شـایانی باسـبێ ئـەو ئاواتـە ئەخوازن لەهەر کاتێکا بێ .

﴿ ذَرْهُمْ يَأكُلُوا وَيَتَمَتَّعُوا ﴾ تۆ وزایـان لێ بهێنـە و بـەبێ نرخیـان دابنـێ و بەتـەمای باوەڕهێنانیان مەبە وئامۆژگاریان مەکە بابخۆن و ڕابوێرن وەك چوارپێ ، دووایی جێگـەیان دۆزەخە ، ڕابوواردن و خواردن و ژیـانی جیـهان شـتێکی زۆر کـەمن بەرانبـەر بـەژیانی پاشەڕۆژ .

﴿ وَيُلْهِهِمُ الأَمَـلُ فَسَـوْفَ يَعْلَمُـونَ ﴾ ئـاواتی درێـژی تەمـەن وبەتـەمای پلـە و پایـە سەرگەردانی کردون لەوەی باوەڕبهێنن ، دوایی لە ڕۆژی دواییدا ئـەزانن بـە کـردەوەی خراپی خۆیان و بە سزای خۆیان .

﴿ وَما أهْلَكْنا مِنْ قَرِيَةٍ إلا وَلَها كِتابٌ مَعْلُومٌ ﴾ وە ئێمە لە ناومان نەبردوە دانیشـتوانی هیچ گوندێك مەگـەر کـاتێ دیـاری کـراوە بـۆ لـەناوبردنیان و نوسـراوە لـە لەوحـەل مەحفوزدا.

﴿ ماسبق من اُمةٍ أجَلَها وَما يَسْتأخِرُونَ ﴾ هیچ تاقمێ پێش کاتی دیاری کراوی خۆیـان ناکەون و دوایشی ناکەون، دواخستنی لەناوبردنیان لەبەرئەوەیـە ئەوکاتـەی خـوا بـۆی دیاری کردوون بێت، ئەو کاتە پاش وپێشی بۆ نابێت .

وَقَالُوا۟ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِى نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلذِّكْرُ إِنَّكَ لَمَجْنُونٌ ﴿٦﴾ لَّوْ مَا تَأْتِينَا بِٱلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّـٰدِقِينَ ﴿٧﴾ مَا نُنَزِّلُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةَ إِلَّا بِٱلْحَقِّ وَمَا كَانُوٓا۟ إِذًا مُّنظَرِينَ ﴿٨﴾ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَـٰفِظُونَ ﴿٩﴾ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ فِى شِيَعِ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٠﴾ وَمَا يَأْتِيهِم مِّن رَّسُولٍ إِلَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿١١﴾ كَذَٰلِكَ نَسْلُكُهُۥ فِى قُلُوبِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١٢﴾ لَا يُؤْمِنُونَ بِهِۦ ۖ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣﴾ وَلَوْ فَتَحْنَا عَلَيْهِم بَابًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَظَلُّوا۟ فِيهِ يَعْرُجُونَ ﴿١٤﴾ لَقَالُوٓا۟ إِنَّمَا سُكِّرَتْ أَبْصَـٰرُنَا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورُونَ ﴿١٥﴾ وَلَقَدْ جَعَلْنَا فِى ٱلسَّمَآءِ بُرُوجًا وَزَيَّنَّـٰهَا لِلنَّـٰظِرِينَ ﴿١٦﴾ وَحَفِظْنَـٰهَا مِن كُلِّ شَيْطَـٰنٍ رَّجِيمٍ ﴿١٧﴾ إِلَّا مَنِ ٱسْتَرَقَ ٱلسَّمْعَ فَأَتْبَعَهُۥ شِهَابٌ مُّبِينٌ ﴿١٨﴾

﴿ وَقَالُوا يا أَيُّها الَّذِي نُزِّلَ عَلَيْهِ الذِكْرَ إنّكَ لَمَجْنُون ﴾ وە بت پەرستانی قورەیش ڕویان کردە پێغەمەر وئەیان ووت: ئەی کەسێکی ئەوتۆ نێرراوە بۆ سەر تۆ قورئان و یادی خوا: بەڕاستی تۆ شێتی کە داوا لە ئێمە ئەکەیت واز لە شتێ بهێنین لەبەر چاومانە

بۆ لای شتیٚ لەبەر چاونیە ، ئەو شتەی تـۆ ئـەیلێی پـوچ و بیٚمانایـە . دووبـارە ئـەیان ووت:

﴿ لَوْما تأتِيْنا بِالمَلائِكَةِ إنْ كُنْتَ مِنَ الْصّادِقِيْنَ ﴾ ئەگەر تۆ لـە ڕاستگۆیانی بۆ تۆ نایـەریٚ بۆ لای ئیٚمە فریشتەیە شایەتی بدا بۆ تۆ کە تۆ پیٚغەمەری. خوای مەزن وەلاٚمیان ئەداتـەوە و ئەفەرمویٚ :

﴿ مانُنَزِل الْمَلائِكَةَ إلا بِالْحَقِّ وَما كـانُوا مُنْظِرِيْـنَ ﴾ ئیٚمـە لـەسـەر داواکردنـی ئیٚـوە فریشتەکان نانیٚرینە خوارەوە مەگەر بەناردنەخوارەوەی ڕاستی بـەو جـۆرەی زانینـی خـوا داوای بکا، هاتنە خوارەوەی فریشتەکان جگە لـەوەی ئیٚوە سەرگەردانبن و سوودی ترتان پیٚ ناگەیەنیٚ و چارەیە بۆ سزادانی ئیٚـوە نادۆزنـەوە و، ئەگـەر ئیٚمـە فریشـتەکان بنیٚرینـە خوارەوە و مۆڵـەتیان نادریٚ و هەمویان بنەبڕ ئەبن، بەو جـۆرەی نەتـەوە بـیٚ باوەڕەکـانی رابووردوو بنەبڕبوون .

﴿ إنّا نَحْنُ نَزّلْنا الّذِكْرَ وَإنّا لَهُ لَحافِظُونَ ﴾ بە ڕاستی ئیٚمە قورئانمان ناردوەتە خـوارەوە بۆ سەر موحەمەد، بۆ ئەوەی یادی خوای پیٚ بکەنەوە و باوەڕی پیٚ بهیٚنن و بەڕاستی ئیٚمە ئەو قورئانە ئەپاریٚزین لـە دەست کاری و گۆڕان بەکەم کردنەوەی و خستنە سەری .

پرسیار/ بە چ جۆریٚ و بەچ شتیٚ خوای مـەزن قورئـان ئـەپاریٚزیٚ ؟ ئەگـەر مەبەسـت ئەوەبیٚ ئەی پاریٚزیٚ لـە دەستکاری بەوشیٚوەیە باسـکرا، زۆرتریـن زانایـان ووتویانـە: ئـەو وەلاٚمدانەوەیە بۆ ئەوان ناچیٚتە سەر، ئەوەتە ئیسرائیلیە بیٚباوەڕەکان بەهەزاران قورئانیـان چاپکردوە، بەگویٚرەی ئارەزووی خۆیان دەست کاریان کـردوە، لەوگۆڕاوانەیـە: ئایـەتی (٨٥) ی سورەتی ئالی عیمرانیان گۆریوە کەخوا ئەفەرمویٚ :

﴿ وَمَنْ يَتبِعْ غَيرَ الآسْلامَ دِيْناً فَلَنْ يُقْبَلْ مِنْهُ ﴾ یانیٚ هەر کەسیٚ دوای جگـەی ئیسـلام بکا بیکا بەئایین ، دوایی ئەو ئاینە وەرناگیریٚ لـەوکەسە. جوەکان کەمیان کردوەتەوە بە ( یقبل منه ) یانیٚ جگەی ئایینی ئیسلامی لیٚ وەردەگـیریٚ. ئەگـەر مەبەسـتیش لـە پاراسـتن ناتوانیٚ تانەو تاوانجیٚ بگریٚتە قورئان ، ئەوەیشیان بـۆ ناچیٚتـە سـەر ، ئەوەتـە دەیـان تانـەو تاوانجیان ئاراستەی قورئان کردوە ؟

وەلاّم / زانایان بەتایبەتیَ پیَشەوا ڕازی و تەبەرسی وەلاّمی ئـەو پرسیارەیان داوەتـەوە بەچەندین وەلاّم، بەلاّم چاکترین وەلاّم ئەمەیە: خوای گەروە قورئان ئەپاریزیَ بەوشـیَوەیە ناوەڕۆکەکانی قورئانی پیرۆز هەمویان ڕاستن و بەردەوامن لەسەر ئەو ڕاستیە هەتا هەتایـە و ناگۆڕیَ و بۆ هیچ کەسیَ ناچیَتـە سـەر وبلّـیَ: نـاوەڕۆکی ئـەو قورئانـە ڕاسـت نیـەو بەلّگەی ڕونی دەست ناکەویَ بتوانیَ دژی قورئان ڕابوەستیَ. بگرە بیَگومان هەتا ئـەقلّ و زانیاری بەرەو پیَش بڕوا بەدەیان بەلّگەی ڕون و بەهیَزی تازەتر پەیدا ئەبیَ لەسەر ڕاسـتی وگەورەیی قورئان .

کاتیَ بیَباوەڕانی مەکە بیَ ڕەوشتی زۆریان کرد لەخزمەت پیَغەمەردا ﴿ ﷺ﴾ خـوای مەزن بۆ دلّدانەوەی پیَغەمەر ئەوەی ڕاستبیَ بیَ باوەڕان هەر لــە کۆنـەوە ڕەوشـتیان بـەو شیَوەیە بوە لەگەلّ پیَغەمەرەکانی خۆیان، بەوانیان ئەووت: ئیَوە شیَـت بوون، تۆیـش وەك ئەوان ئارام بگرە لەسەر ئازاری بت پەرستان وئەفەرمویَ:

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنا مِنْ قَبْلِكَ فِـي شِيَعِ الأَوَلِيْـنَ ﴾ وە بەڕاسـتی ئیَمـە ڕەوانـەمان کـردوە چەندین پیَغەمەر لە پیَش تۆوە لەنیَو گەلانی پیَشوودا. کەواتە خەفـەت مـەخۆ، ئـەوانیش وەك تۆ گەلەکانیان گالّتەیان پـیَ ئـەکردن و پیَغەمـەرەکانیان ئارامیـان ئـەگرت لەسـەر ئازاریان .

﴿ وَما يَأْتِيَهُمْ مِنْ رّسولِ إلا كانُوا بِهِ يَسْتَهْزِؤُنَ ﴾ وە نایە بۆلایان هیچ پیَغەمەریَ مەگەر ئەوان گالّتە ئەکەن بەو پیَغەمەرەی خۆیان، پیَغەمەرەکانیان ئارامیان ئەگرت لەسـەر ئـازار دانیان.

﴿ كَذلِكَ نَسْلُكُهُ فِي قُلُوبِ الْمُجْرِمِيْنَ لا يُؤمِنُونَ بِهِ ﴾ هەر بەو جۆرەی ئیَمە خستمانە دلّی بیَ باوەڕانی پیَشو بیَباوەڕی وگالّتە کردن بەپیَغەمەرەکانیان و باوەڕیان پیَ نـەهیَنان، هەروایش ئیَمە بیَ باوەڕی ئەخەینە دلّـی تاوانبـارانی مەکـە بـاوەڕ بـە موحەمـەد نایـەرن ولـەسەر ڕەوشتی پیَشووان ئەڕۆن . ئەتوانریَ ڕاناوی ( نسلکە بە ) بگەڕیَنینـەوە بـۆ لای قورئان .

﴿ وَقَدْ خَلَتْ سُنَّةُ الأَوَلِيْنَ ﴾ وە بەڕاستی تێپـەڕبوە دەستوری خـوا بـۆ لـە نـاوبردنی کەسیٚ بەدرۆبخاتەوە پێغەمەری خۆی. کەواتە بت پەرستانی مەکە ئێوەیش ئـەوەی توشـی گەلانی پێشوو بوە، ئەوانـەی ئێستا پێغەمـەرەکانیان بـەدرۆ ئەخەنـەوە و بـە وێنـەی بـیٚ باوەڕانی رابوردو کاری پوچ ئەخەینە دڵیان .

﴿ وَلَـوْ فَتَحْنـا عَلَيْـهِمْ بابـاً مِـنَّ السَـماءِ فَظَلّـوا فِيْـهِ يَعْرُجُـونَ ﴾ وە ئەگـــەر ئێمــە دەرگایـەکمان بکردایـەوە لـەسـەر داخـوازی تاونبـارانی مەکـەدا لـە ئاسمانـەوە، دوایــی بەرزبونایەتەوە بە لـەشی خۆیانەوە لـەو دەرگایەوە فریشتەکان و دەیان شـتی سەرسـوڕێنەر ببینن .

﴿ لَقْالُوا إِنَّما سُكِرَتْ أَبْصارُنا بَلْ نَحْنُ قَوْمٌ مَّسْحُورونَ ﴾ بەڕاستی ئەو تاوانبارانە ئـەیان ووت: بەڕاستی چاوەکانی ئێمە داپۆشراوەوە ڕاستی نابینیٚ و ئەوەی ئێمە ئەی بینین ڕاست نیەو تارماییە. بـەڵکو ئێمـە کۆمـەڵێکین جادومـان لیٚکـراوە لـەلایـەن موحەمـەدەوە وای لیٚکردووین بەڕاستی بزانین .

﴿ وَلَقَدْ جَعَلْنا فِي السَّماءِ بُرُوجاً ﴾ وە بەڕاسـتی ئێمـە دروسـتمان کـردووە چـەندین جێگە و بەشیٚ لـە ئاسمان بۆ هاتوچۆی مانگ و خۆر و بۆمان ئامادەکردوون. ئەو جێگانــە بریتین لـە دووازدە جێگە لـەهـــەر یەکـەیان جولانێکـی تایبـەتی هەیـە بـۆ مـانگ و خـۆر هاتوچۆی پیٚدا ئەکەن بە دەستورو فەرمانی خوا، بە بیٚ گۆڕان و تێك چوون. ئەو جێگانــە ئەم ناوانەیان لیٚ نراوە: حەمەل. سەور. جەوزاء. سـیٚ مانگـەی بـەهار سـەرەتان. ئەسـەد سونبولـە. سیٚ مانگەی هاوین. میزان، عەقرەب، قەوس، سیٚ مانگەی پاییز. جەدی، دەلو، حوت، سیٚ مانگەی زستان. ئەتوانریٚ بەم جۆرەی خوارەوە مانای ئەو ڕستەیە بکـریٚ: وە بەڕاستی ئێمە دروستمان کردوە لـە ئاسماندا چەند جێگەیە بۆ هــەمو ئەستێرەکان، هەیانـە ناجوڵێن لـەو جێگەیەدا، هەیانە ئەجوڵێن و هاتوچۆئەکـەن بـەو جێگەیـەدا بۆیـان دیـاری کراوە ، ماوەي ئەندازەی جولانیان بەشێوەیەکی تایبەتی بۆ هەریەکەیان دیاری کـراوە لـە کەمی و لـە زۆری .

﴿ وَ زیناها لِلْناظِرِیْنَ ﴾ وە ئێمە ئاسمانمـان ڕازاندوەتـەوە بـەجۆرە ڕەنـگ وڕوونـاكی تایبەتی ئەستێرەكان بۆ ئەوەی ئەو كەسانەی تەماشایان بكـەن هـەتا ئـەقڵ بگـرن و تـەمێ خوار بن، توانای خۆیان بخەنە كار و بیكەن بە بەڵگە لەسەر تەنیایی خواو بـت پەرسـتان بیكەن بەڕاستی كارە پەكخەرەكان .

زۆربەی دانیشتوانی ڕووی زەوی لە پێش هاتنـە خـوارەوەی قورئـانی پـیرۆز بڕوایـان وابوو هەموو پۆشەوێژێ ( الكاهن ) شەیتانێ هەیە بەرز ئەبێتەوە بـۆ لای ئاسمـان و گـوێ ئەگرێ لە گفتوگۆی فریشتەكان لـە بـارەی كـار و ڕوداوی سـەر زەوی، لـە پاشـا ئـەو شەیتانە دێتە خوارێ، ئەوەی بیستویەتی بە پۆشەوێژەكانی ئـەڵێ، لەلایـە تـرەوە خۆیشـی بلاوی ئەكاتەوە بەسەر زەویدا، خوای مەزن بـەم ئایەتـەی دوایـی ئاگادارمـان ئـەكا كـە شەیتان توانای ئەوەی نیە بگاتە ئاسمان بە هیـچ جـۆرێ نـە لەمەوبـەر ونەلـەمـەودوایش، ئەفەرموێ :

﴿ وَ حَفِظْناها مِنْ كُلِّ شَیْطانٍ رَّجِیْمٍ ﴾ وە ئێمە ئاسمانمـان پاراسـتوە لەهـەموو شـەیتانێ دورخراوەتەوە لەبەزەیی و میهرەبانی خوا، توانای ئەوەیان نیە بەرز ببنەوە بۆ لای ئاسمان و دوو دڵی بخاتە ناو، دڵی دانیشتوانەوەو ئاگادری كار و فرمانی دانیشتوانی ئاسمان نین .

﴿ إلاّ مَنْ اسْتَرَقَ الْسَّمْعَ فَاتْبَعَهُ شِهابٌ مُبِیْنٌ ﴾ مەگەر كەسێ لەو شەیتانانە بە پەنـهانی و بەدزییەوە گوێیان گرتبێ بۆ بیستنی شتێ لە ئاسمان و لـە گفتوگـۆی فریشـتەكان، دوای ئـەو شـەیتانە ئەكـەوێ كۆمەڵـە گڕێكـی ئاشـكرا بـۆ بینـەرانی سـەر زەوی كـە لـە ئەستێرەكانەوە دەرئەچێ و پـرژ و بـلاو ئەبێتـەوەو هـەندێ لـە شـەیتانەكان ئەسـوتێنێ . بەڕاستی ئەو شەیتانانە بێ نرخترن لەوەی بە دزیـەوە گـوێ بگـرن لـە فریشـتەكان وەك دانیشتوانی كۆن گومانیان ئەبرد .

كاتێ خوای مەزن باسی ئاسمان و توانای خـۆی و ئـەو شـتانەی كـرد لـە ئاسمـاندان ، دوایی باسی زەوی وچۆنیەتی زەویمان بۆ ئەكا و ئەفەرموێ :

﴿ وَٱلْأَرْضَ مَدَدْنَٰهَا وَأَلْقَيْنَا فِيهَا رَوَٰسِيَ وَأَنۢبَتْنَا فِيهَا مِن كُلِّ شَيْءٍ مَّوْزُونٍ ﴿١٩﴾ وَجَعَلْنَا لَكُمْ فِيهَا مَعَٰيِشَ وَمَن لَّسْتُمْ لَهُۥ بِرَٰزِقِينَ ﴿٢٠﴾ وَإِن مِّن شَيْءٍ إِلَّا عِندَنَا خَزَآئِنُهُۥ وَمَا نُنَزِّلُهُۥٓ إِلَّا بِقَدَرٍ مَّعْلُومٍ ﴿٢١﴾ وَأَرْسَلْنَا ٱلرِّيَٰحَ لَوَٰقِحَ فَأَنزَلْنَا مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَسْقَيْنَٰكُمُوهُ وَمَآ أَنتُمْ لَهُۥ بِخَٰزِنِينَ ﴿٢٢﴾ وَإِنَّا لَنَحْنُ نُحْيِۦ وَنُمِيتُ وَنَحْنُ ٱلْوَٰرِثُونَ ﴿٢٣﴾ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَقْدِمِينَ مِنكُمْ وَلَقَدْ عَلِمْنَا ٱلْمُسْتَـْٔخِرِينَ ﴿٢٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُۥ حَكِيمٌ عَلِيمٌ ﴿٢٥﴾

﴿ وَ الأَرْضُ مَدَدْناها ﴾ وە ئێمە بە گوێرەی ڕواڵەت زەویمان ڕاکێشاو سێ بەشی بە ئاو داپۆشراوەو بەشەکەی تری بە ئادەمیزاد ئاوەدان کراوەتەوە. زەوی لە ناوەڕۆکا خڕە. بەڵام لەبەر گەورەیی خڕییەکەی پانە، خوای مەزن بەو جۆرەی لێ کردوە هەتا ئادەمیزاد بتوانن لەسەری دابنیشن و ئاوەدانی بکەنەوە. زەوی بە دەروی خۆردا ئەسوڕێتەوەو شەو و ڕۆژ و چوار وەرزەی ساڵ پەیدا دەبێت. لەباسی ماناکردنی ئایەتی ( ٣ ) ی سورەتی ڕەعد بە درێژی مانای ئەو ڕستەیە کراوە .

﴿ وَ أَلْقَيْنا فِيها رَواسِيَ ﴾ وە ئێمە چەندین کێوی وەستاوی بێ جموجوڵمان داناوە لە زەویدا هەتا کێشەی زەوی بپارێزن لە جوڵان، ئەو کێوانە هەیانە بەردی ڕەقن و بڵند، هەیانە نزم و نەرمن، وایش ئەبێ بە خۆڵ داپۆشراون .

﴿ وَ آتَیْنا فِیْها مَنْ کُلِّ شَيءٍ مَّوْزُونٍ ﴾ وە ئێمە ڕواندومانە لە زەویدا هەموو شتێ بە ئەندازەیەکی دیاری کراو بەجۆرێ شیاو بێ بۆ سوودی ئادەمیزاد. هەندێ لە زانایان ئەڵێن: مەبەست لەو ئایەتە ئەو شتانەیشە بکێشرێن، وەك زێڕ و زیو و مس و کل و شتی تریش. میوەو بەرهەمێ لە زەویدا پەیدا ئەبن تام و بۆن و ڕەنگی تایبەتی دیاری کراوی خۆیانیان هەیە، هەروەهایش کێشراوەکانیش .

﴿ وَ جَعَلْنا فِیْها مَعایْشَ ﴾ وە ئێمە دروستمان کردوە بۆ سوودی ئێوە لە زەویدا هۆی ژیان و زیندەگانی و گوزەرانتان لە کشتوکاڵ و خواردەمەنی وبازرگانی و ئاژاڵ و کڕین و فرۆشتن و پیشەسازی و خواردنەوە و بەرگ و پۆشاك و خانوو شتی تر، ئەبێ بزانین هۆی ئەو ژیانە بە تالاَن و دزی پەیدا بکرێ لای خوا قەدەغەیە .

﴿ وَ مَنْ لَّسْتُمْ لَهُ بِرازِقِیْنَ ﴾ وە ئێمە دروستمان کردوە بۆ ئێوە کەسێ ئێوە بە خێویان ناکەن و ڕۆزی و خواردەمەنی دەری ئەو کەسە نین، وەك خێزان و خزمەتکار، ئێوە گومانتان وایە ئێوە ئەوان بەخێو ئەکەن. ئێمە ئێوە و ئەوانیش بەخێو ئەکەین. بەلاَم ئێوە ئەیان خەنەگەڕ بۆ سودی خۆتان .

﴿ وَ إنَّ مِنْ شَيءٍ إلا عِنْدَنا خَزائِنَهُ ﴾ وە هیچ شتێ نیە کە ئادەمیزاد و جگەی ئادەمیزاد پێویستیان پێی هەبێ لە باران و جگەی باران مەگەر لەلای ئێمە گەنجینە و سەرچاوەکانیان و کلیلەکانیان لای ئێمەیە .

﴿ وَ ما نُنَزِّلُهُ إلاّ بِقَدَرٍ مَعْلُومٍ ﴾ وە ئێمە ئەوشتانە نانێرینە خوارەوە مەگەر بە ئەندازەیەکی دیاری کراو بەگوێرەی ویست و ئارەزووی ئێمە، بونەوەرانی خۆمانی پێ بەخێو ئەکەین. بە گوێرەی کۆششی خۆیان. بەلاَم تەمەڵ و کارنەکەر بێ بەشن لە خواردەمەنی ئێمە .

﴿ وَ أرْسَلْنا الرِّیاحَ لَواقِحَ ﴾ وە ئێمە بایەکانمان ڕەوانەکردوە بەوەی هەڵگری هەور بن بەباران و برژێنە سەر زەوی بۆ سوودی ئێوە، هەر بەهۆی باوبارانەوە موتو ئەبێ درەخت و تۆزی نێرینە ئەبا بۆ لای مێینەکان هەتا بەچاکی میوە و بەرهەم بڕەخسێنن بۆ ئێوە .

﴿ فَأَنْزَلْنا مِنَ السّماءِ ماءً فَاسْقَيْنا كُمُوهُ ﴾ دوایی ئێمە ئەنێرینە خوارەوە ئاو لە هەورەوە، دوایی ئەو ئاوە ئەگێڕن بە ئاودانی ئێوەو ئاژاڵ و کشتوکاڵ و درەختەکانتان، بەو بۆنەوە بە تەواوی درەخت و سەوزاییەکان موتوربە ئەبن و بەرهەمی خۆش و بەتام پەیدا ئەکرێن بۆ ئێوە .

﴿ وَ ما أَنْتُمْ لَهُ بِخازِنِيْنَ ﴾ وە ئێوە توانای ئەوەتان نیە ئەو ئاوە دەربهێنن لە هەور و هەر ئێمە ئەتوانین بیرێژینە خوارەوە، دوایی بیپارێزین لە نێو گۆلا و بیر و کانیەکاندا، بەگوێرەی هۆی سروشتیەوە ئەوئاوە دێنە خوارێ و نەختە لەسەرچاوەکانەوە بە گوێرەی پێویست دێنە دەر .

﴿ وَ إِنّا لَنَحْنُ نَحْيِي وَ نُمِيْتُ وَ نَحْنُ الْوارِثُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە زیندەگانی و گیان پەیدا ئەکەین لە لەشی هەندێ لە بونەوەران، وە ئێمە ئەمرێنین گیانداران. ئەئبێ بزانین گژوگیا ودرەختیش خاوەنی گیانی تایبەتی وهەستی خۆیانن و ەهەر ئێمە ئەمێنینەوەو کەسی تر نامێنێ .

﴿ وَ لَقَدْ عَلِمْنا الْمُسْتَقْدِمِيْنَ مِنْكُمْ وَ لَقَدْ عَلِمْنا المستأخرين ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ئەزانین بە ژمارە و بە لە دایکبوونی ئەوانەی پێشی ئێوە کەوتوون و بەڕاستی ئەزانین بە ژمارەی ئەو کەسانە لەمەوپاش لە ئێوە پەیدا ئەبن و ئەزانین چ کاتێ لەدایك ئەبن ؟ ئەزانین ئەوانەی ڕابووردوون و ئەوانەی لەمەوپاش پەیدا ئەبن چ کردەوەیەکیان کردوەو چ شتێ ئەکەن .

﴿ وَ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ يَحْشُرُهُمْ إِنَّهُ حَكِيْمٌ عَلِيْمٌ ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەموو گیانداران لە پاشەڕۆژدا کۆئەکاتەوە بۆ پرسیار و وەڵام وەرگرتنی پاداشتی کردەوەیان. بەڕاستی خوای پەروەردگاری تۆ هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ لە پاداشتی چاکەکەران و تۆڵەسەندن لە خراپە کاران، ئەزانێ بە چاك وبەخراپیان و بەنهێنی و ئاشکرایان .

کاتێ خوای مەزن باسی زیندوو بونـەوەو مراندنـی گیـاندارانی کـرد لـەیەکـەم جـارو دووهەم جار دالە جیهاندا و لــە ڕۆژی دوایشـدا زیندوویـان ئەکاتـەوە، باسـی ئـەوەیش ئەفەرموێ چۆن یەکەم جار گیاندارانی دروست کردوون و ئەفەرموێ :

وَلَقَدْ خَلَقْنَا ٱلْإِنسَـٰنَ مِن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٦﴾ وَٱلْجَآنَّ خَلَقْنَـٰهُ مِن قَبْلُ مِن نَّارِ ٱلسَّمُومِ ﴿٢٧﴾ وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَـٰٓئِكَةِ إِنِّى خَـٰلِقٌۢ بَشَرًا مِّن صَلْصَـٰلٍ مِّنْ حَمَإٍ مَّسْنُونٍ ﴿٢٨﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُۥ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِى فَقَعُوا۟ لَهُۥ سَـٰجِدِينَ ﴿٢٩﴾ فَسَجَدَ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ كُلُّهُمْ أَجْمَعُونَ ﴿٣٠﴾ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰٓ أَن يَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٣١﴾

﴿ وَ لَقَدْ خَلَقْنا الإِنسانَ مِنْ صِلْصالٍ مِّنْ حَمَأٍ مسفون ﴾ وە بەڕاستی ئێمــە دروستمان کردووە ئەو مرۆڤە کە ناوی ئادەمە لـە گڵێکی ووشك کاتێ لێـت بدایـە زرنگـەی لێـوە دەهات ئەو گڵەش لـە قوڕێکی ڕەنگ گۆڕاوی ڕەش، ئەوەندە نەرم بۆ ئەتوانرا پەیکــەر و شێوەی مرۆڤ و جگەی مرۆڤی لێ دروست بکرێ. ئەو قـوڕە ترشـابوو بـەهۆی ئـاوەوەو مانەوەی لە نێو ئاودا بۆنی کردبوو نرخی بۆ دانەئەنرا، دوایی ئــەو قـوڕە بـەهۆی توانـای خواوە بەشێوەیەکی شیرین پەیکەر و لاشەی مرۆڤی بەسەردا کێشا، لەپاش ووشکبونەوەی ئەو قوڕە گیانی کرد بەبەریا و هاتە گفتوگۆ .

﴿ وَ الْجانَّ خَلَقْناهُ مِنْ قَبْلُ مِنْ نّار السَّمُومِ ﴾ وە ئێمە لـە پێـش مرۆڤـەوە جـانی باپـیرە گەورەی جنۆکەکانمان دروست کردبو لـەئاگرێکی گەرمی بێ دووکـەڵ بەشـێوەیە بتوانـێ بچێتە ناو، کونی ووردی پێستەوە.

خوای مەزن ئەو توانایەی هەبیّ بۆ یەکـەمجار مـرۆڤ و جنۆکـە لـە گـلّ و لـە ئـاگر دروست بکات و گیان بکا بە بەریانا و یارمەتیان بدا بـۆ بیرکردنـەوەو ڕاویـژ و ئـەقلّیان بداتیّ، توانایشی هەیە بۆ جاریّ تر لـەسەر پاشماوەی ئەوان زیندوویان بکاتەوە.

بۆ زانین : ئیّمەی موسلّمان بڕوای تەواومان هەیوە بەبونی جنۆکە، لەبەر هیچ شتیّ نیە جگە لـەوەی سروشی خوا هاتوەتە خوارەوە دەربارەی بونیان وئـەقلّیش ئـەی سـەلمیّنیّ و گونجاویشە. ئیّمە بڕوامان بەوە نیە یەکیّ بلّیّ: من جنۆکەم بینیوە مەگەر سروشـی خوایـی بیفەرمویّ بەڕونی وئیّمە ئاگاداری ئەو سروشە نین. زۆر جیّگەی سەرسوڕمانە هەندیّ لـە زانایانی تازە ئەلّیّن: جنۆکە بریتین لـە میکرۆب و بەچاو نابینریّن، چونکە میکـرۆب چـۆن داوای پەرستنی خوای لیّ ئەکریّ ؟ ئیّمە بڕوامان هەیە جنۆکە لـە ئاگر دروسـت کـراون. بەلاّم چۆن ئاگریّ و چۆن دروست کراوە خوا ئەیانزانیّ .

ئەگەر کەسیّ پرسیار بکا چۆن خاوەن گیانیّ ئاگر نای سوتیّنیّ کە لـە ئـاگر دروسـت کراوە. وەلاّمی ئەدریّتەوە خوای مەزن هـەموو شـتیّ ئـەکا و ئـەتوانیّ جنۆکـە لـە ئـاگر دروست بکا ونەی سوتیّنیّ. کەواتە دروسـتە لـە نیّـو خـۆردا زینـەوەریّ دروسـت بکـا بەجۆریّ شیاوی ئەوە بیّ لـەگەلّ گەرمایی خۆردا بژی، ویّنەی ماسی لـە نیّو ئاودا و ڕەنگ گرتنی پەپولـە بەڕەنگی گولّ. هەندیّ لـە زانایان دەریان خستوە جڕوجانـەوەری ووردی وا هەیە بەهەوای ژەهراوی ئەژی، جۆریّ تر هەیە لـە نیّـو بـیری نـەوت و گـەرماییدا نـەبیّ ناژین.

﴿ وَ إذا قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلائِكَةِ إنّي خالِقٌ بَشَراً مّن صَلْصالٍ مِّنْ حَمَإٍ مَسْنُونٍ ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە پەروەردگاری تۆ بە فریشەکانی فەرمو: بەڕاستی مـن دروسـت ئەکـەم مرۆڤیّ لـە گلّیّکی ووشکی سـۆرکراوە کـاتیّ دەسـتیّ لیّ بـدریّ زرنگـەی لیّـوە دیّ لـە قوڕیّکی ڕەشی ترشاو بە بۆنەی مانەوەی لـە نیّو ئاودا، ئەوەندە نەرمە ئەتوانریّ بە ئاسـانی پەیکەری لیّ دروست بکریّت .

لە باسی ماناکردنی ئایەتی (١١) ی سورەتی ئەلئەعرافدا باسی مانای ئەو ڕستەیە کراوە. با لێرەیش هەندێ تر باسی لێوە بکەین، بەگوێرەی زانیاری و تاقی کردنەوە لە لەشی مرۆڤدا چەندین شتی وای تێدا دروست کراوە جێگەی سەرسوڕمانن و بەڵگەی بەهێزن لەسەر توانای خوای مەزن و گۆترەکاری و بە ڕێکەوت نرخی بۆ دانانرێ. بەڵام ئەوەی ئێمە بمانەوێ ئەمەیە: ئایا ئادەم چۆن دروست کراوە؟ لەسەر چ شێوەیە دروست کراوە؟ ئێمە وەڵامی ئەو پرسیارە نازانین، چونکە هیچ مرۆڤێ نەبوە لەکاتی دروست کردنی ئادەم یەکەم جار و ئەبینراوە چۆن دروستبوە و لە چ شتێ پێکهاتوە؟ هەتا ئێمە وەڵامی بدەینەوە. کەواتە ئەوەی ئێمە بیزانین ئەمەیە: کە بەسروش لەلایەن خوای مەزنەوە هاتوەتە خوارەوە، ئێمەیش بڕوای تەواومان بەو فەرمودەی خوایە هەیە. بەڵگەی ترمان جگە لە فەرمودەی خوا دەستمان ناکەوێ بۆ داواکانیان .

﴿ فَإِذا سَوَّيْتُهُ وَ نَفَخْتُ فِيْهِ مِنْ رُوحِي فَقَعُوا لَهُ ساجِدِيْنَ ﴾ دوایی کاتێ من بە تەواوی دروستم کرد و ئامادەم کرد بۆ ئەوەی گیانی بکرێ بە بەرداو، دوایی من گیانم کرد بە لەشیا و زیندووم کرد. خوای مەزن گیانی ئادەمی ئاراستەی خۆی کردوە لەبەر ڕێزدان بەئادەم، دوایی ئێوە بکەون بەدەما و سوژدە ببەن بۆی بەڕێزگرتنەوە. یانی ئێوە مەرحەبای لێ بکەن بەڕێزەوە نەك سوژدەی ڕاستی .

﴿ فَسَجَدَ الْمَلائِكَةُ كُلُّهُمْ أجْمَعُونَ إلاّ إبْلِيْسَ أبـى أنْ يَكُـونَ مِـنَ السّـاجِدِيْنَ ﴾ دوایی فریشتەکان هەمویان سوژدەیان برد و ڕێزی ئادەمیان گرت مەگەر شەیتان سوژدەی بۆ نەبردو خۆی وەرگێڕا کە سوژدە ببا لەگەڵ فریشتە سوژدەبەرەکان. لە ئایەتی (٣٤) ی سورەتی ئەلبەقەرەدا باسی مانای ئەو ڕستەیە کراوە .

قَالَ يَـٰٓإِبۡلِيسُ مَا لَكَ أَلَّا تَكُونَ مَعَ ٱلسَّـٰجِدِينَ ﴿٣٢﴾ قَالَ لَمۡ أَكُن لِّأَسۡجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقۡتَهُۥ مِن صَلۡصَـٰلٍ مِّنۡ حَمَإٍ مَّسۡنُونٍ ﴿٣٣﴾ قَالَ فَٱخۡرُجۡ مِنۡهَا فَإِنَّكَ رَجِيمٌ ﴿٣٤﴾ وَإِنَّ عَلَيۡكَ ٱللَّعۡنَةَ إِلَىٰ يَوۡمِ

ٱلدِّينِ ﴿٣٥﴾ قَالَ رَبِّ فَأَنظِرۡنِيٓ إِلَىٰ يَوۡمِ يُبۡعَثُونَ ﴿٣٦﴾ قَالَ فَإِنَّكَ مِنَ ٱلۡمُنظَرِينَ ﴿٣٧﴾ إِلَىٰ يَوۡمِ ٱلۡوَقۡتِ ٱلۡمَعۡلُومِ ﴿٣٨﴾ قَالَ رَبِّ بِمَآ أَغۡوَيۡتَنِي لَأُزَيِّنَنَّ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَلَأُغۡوِيَنَّهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٣٩﴾ إِلَّا عِبَادَكَ مِنۡهُمُ ٱلۡمُخۡلَصِينَ ﴿٤٠﴾ قَالَ هَٰذَا صِرَٰطٌ عَلَيَّ مُسۡتَقِيمٌ ﴿٤١﴾ إِنَّ عِبَادِي لَيۡسَ لَكَ عَلَيۡهِمۡ سُلۡطَٰنٌ إِلَّا مَنِ ٱتَّبَعَكَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ﴿٤٢﴾ وَإِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوۡعِدُهُمۡ أَجۡمَعِينَ ﴿٤٣﴾ لَهَا سَبۡعَةُ أَبۡوَٰبٖ لِّكُلِّ بَابٖ مِّنۡهُمۡ جُزۡءٞ مَّقۡسُومٌ ﴿٤٤﴾

خوای مەزن فەرمانی دا بەفریشتەکان سوژدە ببەن بۆ ئادەم بەرێزگرتن نەك سوژدەی پەرستن هەموو فریشتەکان فەرمانی خوایان بەجێ هێنا، شەیتان بێ فەرمانی خوای کرد و سوژدەی بۆ نەبرد. زانایان بیریان جیاوازە لە بارەی شەیتانەوە: ئایا فریشتە بوەو دەرکراوە، یا هەر یەکەم جاری دروست کردنی شەیتان بوە، ئەو جیاوازیەی نێوانیان بێ ئەنجامە، هەرچۆنێ بێ دەرکرا و لەبەزەیی و میهرەبانی خوا، کاتێ شەیتان بێ فەرمانی خوای کرد .

﴿ قَالَ ياإِبْلِيْسَ مالَكَ أنْ لاَ تَكُونَ مَعَ الْسّاجِدِيْنَ ﴾ خوا فەرموی: ئەی شەیتان: تۆ چ مەبەستێکت هەیە کە تۆ لەگەڵ فریشتە سوژدەبەرەکان سوژدەت نەبرد بۆ ئادەم .

بۆ زانین : هەرچەندە باسی شەیتانمان کرد. بەڵام هەندێ لە بیروباوەڕی زانایان باس ئەکەین لە بارەی شەیتانەوە. هەندێ لە زانایان لایان وایە یەکێکە لە فریشتەکان. بەڵام ئایەتی ( كان من الجن ) وامان بۆ دەرئەخا یەکێکە لە جنۆکەکان نەك لە فریشتەکان .

﴿ قْالَ لَمْ أكُنْ لأسْجُدَ لِبَشَرٍ خَلَقْتَهُ مِنْ صَلْصالٍ مِنْ حَمَأٍ مَسْنُونٍ ﴾ ئیبلیس ووتی: من سوژدە نابەم بۆ مرۆڤیّ تۆ دروستت کردبیّ لە گلّیك لە قوری ڕەشی بۆگەنی ترشاو لە نێو ئاودا. ئەو کردەوەی شەیتانە لەبەر ڕەگەزی پەرستی بوە، هەموو ڕەگەزپەرستبیّ بە وێنەی ئیبلیس دەرکراوی میهرەبانی خوایە .

﴿ قْالَ فَأخْرُجْ مِنْها فَإنَّكَ رَجِيْمٌ ﴾ خوا فەرموی: ئیبلیس تۆ بڕۆ دەرەوە لە نێو ئەم فریشتانە و لەم پلە گەورەیە دوایی بەڕاستی تۆ دەرکراوی لەبەزەیی و میهرەبانی خوا .

﴿ وَ إنَّ عَلَيْكَ اللّعْنَةَ إلى يَوْمِ الدّيْنِ ﴾ وە بەڕاستی لەسەر تۆیە دوربون لەبەزەیی خوا هەتا ڕۆژی ئایین و ڕۆژی وەرگرتنی پاداشت و تۆلّە، هەر لەبەرئەوەی خۆت بەگەورە دائەنێی بەرانبەر بەخوا و کوڕنوشت بۆ ئادەم نەبرد .

﴿ قْالَ رَبِّ فَأنْظِرْنِي إلى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴾ ئیبلیس ووتی: ئەی پەروەردگاری من : تۆ من دوواخە و مۆلّەتم بدە و من مەمرێنە هەتا ڕۆژی زیندوو کردنەوەی ئادەم و گیاندارانی تر.

﴿ قْالَ فَإنَّكَ مِنَ الْمُنْظِرِيْنَ إلى يَوْمِ الْوَقْتِ الْمَعْلُومِ ﴾ خوا فەرموی: دوایی بە ڕاستی تۆ لەو کەسانە ئەبی دوا ئەخرێن هەتا ڕۆژی زیندو بونەوەی گیانداران .

﴿ قْالَ رَبِّ بِما أغْوَيْتَنِي لأزَيِّنَنَ لَهُمْ فِي الأرْضِ وَ لأُغْوِيَنَّهُمْ أجْمَعِيْنَ ﴾ ئیبلیس ووتی: ئەی پەروەردگاری من: سوێندم بە گەورەیی تۆ: هەر بەهۆی شتیّ منت پیّ تاقی کردەوە فەرمانت دا بەسوژدە بردن بۆ ئادەم بەو بۆنەوە منت خستە ناوبیّ فەرمانی خۆتەوە، من بۆ ئادەمیزاد ئەڕازێنمەوە گوناهو بیّ فەرمانی تۆ لە زەوی جیهاندا و بەڕاستی ئەیان خەمە نێو بیّ فەرمانی تۆ و بیّ فەرمانی تۆ بکەن هەمویان.

﴿ إلاّ عِبادَكَ مِنْهُمْ الْمُصْلِحِيْنَ ﴾ مەگەر چەندین بەندەی پاك و نیازی پاکی تۆ لە ئادەمیزاد، ئەوانەن من ناتوانم لە ڕێگەی ڕاست لایان بدەم و ناتوانم بیان خەمە نێو گوناهەوە و ڕازاندنەوەی من کاریان تیّ ناکا .

﴿ قْالَ هذا صِراطُ عَلَيَّ مُسْتَقِيْمٌ ﴾ خوا فەرموی: پاراستنی بەندە پاك و نیاز پوختەکان لە شەیتان و لە بیّ فەرمانیمن ڕێگەیەکی ڕاست وبیّ خوار وخێچە شایستە و ڕاستە

لەسەر من چاودێریان بکەم و هەر کەسێ ڕێگەی ڕاست بگرێ ڕزگاری بوە، هەرکەسێ لابدا لەناو چوە.

﴿ إِنَّ عِبادِي لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطانٌ إِلاَّ مَنْ اتَّبَعَكَ مِنَ الْغاوِيْنَ ﴾ بەڕاستی بەندە نیاز پاکەکانی من بۆ تۆ نابێ بەسەر ئەوانەوە هیچ دەستەلاتێ کە تۆ لایان بدەی لەڕێگەی ڕاست مەگەر کەسێ دوای تۆ بکەوێ ئەو کەسە لەو کەسانەیە بێ فەرمانی خوایان کردوە. ئایینی خۆیان فرۆشتوە بە پارە و پول و کالای جیهان .

﴿ وَ إِنَّ جَهَنَّمَ لَمَوْعِدُهُمْ أَجْمَعِيْنَ ﴾ وە بەڕاستی دۆزەخ و قولایی دۆزەخ جێگەی شەیتان و پەیڕەوانی شەیتانن، هەموویان بێزارن لە یەکتری ونەفرەت لە یەکتری ئەکەن.

﴿ لَها سَبْعَةُ أَبْوابٍ لِكُلِّ بابٍ مِنْهُمْ جُزْءٌ مَقْسُومٌ ﴾ بۆ دۆزەخ هەیە حەوت دەرگا بۆ هەموو دەرگایە هەیە بەشێکی دیاری کراو بۆ ئەوان و بۆ ئەوان دیاری کراوەتەوە. دۆزەخ چەندین جێگەی هەیە بە گوێرەی سزادانی گران، بۆ هەریەکە لەو جێگانە هەیە چەندین تاوانبار بە گوێرەی زۆری و گوناهی ئەوان .

کاتێ خوای مەزن باسی بەندە نیازپاکەکانی خۆی کرد. لە دوایدا باسی هەواڵیان ئەکا لە ڕۆژی دواییدا و ئەفەرموێ:

إِنَّ ٱلْمُتَّقِينَ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٤٥﴾ ٱدْخُلُوهَا بِسَلَٰمٍ ءَامِنِينَ ﴿٤٦﴾ وَنَزَعْنَا مَا فِى صُدُورِهِم مِّنْ غِلٍّ إِخْوَٰنًا عَلَىٰ سُرُرٍ مُّتَقَٰبِلِينَ ﴿٤٧﴾ لَا يَمَسُّهُمْ فِيهَا نَصَبٌ وَمَا هُم مِّنْهَا بِمُخْرَجِينَ ﴿٤٨﴾ ۞ نَبِّئْ عِبَادِىٓ أَنِّىٓ أَنَا ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٤٩﴾ وَأَنَّ عَذَابِى هُوَ ٱلْعَذَابُ ٱلْأَلِيمُ ﴿٥٠﴾

﴿ إِنَّ الْمُتَّقِيْنَ فِي جَنّاتٍ وَ عُيُونٍ ﴾ بە ڕاستی ئەو کەسانەی لە خوا ئەترسن و خۆیان ئەپارێزن لە پەیڕەوی ئیبلیس لە نێو چەندین بەهەشت و سەرچاوەی ئاوی شیرین و بەتام و پوختە، گوزەرانێکی خۆش ئەبەنە سەر لەو بەهەشتانەدا بە خواردن وخواردنەوەی جووان و بەنرخ، ئەوەی ئارەزویان بۆی بڕوا بۆیان ئامادەکراوە بەبێ ماندوو بون .

﴿ اُدْخُلُوها بِسَلامٍ آمِنِيْنَ ﴾ فریشتەکان بەوان ئەڵێن: ئێوەی لە خوا ترس بچنە نێو بەهەشتەکان بە ئاشتی و بەبێ ترس لەهەموو ئازارێ، بەخۆشی بژین بەبێ ترس و خەفەت.

﴿ وَ نَزَعْنا ما فِي صُدُورِهِمْ مِنْ غِلٍّ إِخْواناً عَلى سُرُور مُتَقابِلِيْنَ ﴾ وە ئێمە لامان بردوە شتێ لە دڵیانا بوە لە جیهاندا لە ڕق و دوژمنایەتی بۆ یەکتری براو دۆستی ئەکترین بەرانبەری یەکتری دانیشتوون لەسەر کورسی و تەختی ڕازاوە وتەماشای یەکتری ئەکەن ، بۆ هەرلایە وەرئەگەڕێن کورسیەکانیان لەگەڵیان وەرئەگەڕێ، بۆ ئەو لایە، تەماشای پێشانگای بەهەشت و جێگە جووانەکانی بەهەشت ئەکەن .

﴿ لايَمَسُّهُمْ فِيْها نَصَبٌ وَّما هُمْ بِمُخْرَجِيْنَ ﴾ تووشی ئەو خوا ترسانە نابێ ڕەنج و ناخۆشی و ئەوان دەرناکرێن لەبەهەشتا، نەخۆشی و هەژاری تووشی ئەوان نابێ و لەبەهەشتا نەدا هەتا هەتایە .

﴿ نَبِیء عِبادِي أَنِي أنا الْغَفُورُ الرَّحِيْمُ ﴾ تۆ هەواڵ بدە بە بەندەکانی من کە بەڕاستی لێ خۆشبوونم زۆرە بۆ ئەو گوناهبارانە پەشیمان ئەبنەوە، بەزەیی و میهرەبانیم زۆرە بۆیان .

﴿ وَ أَنَّ عَذابِي هُوَ الْعَذابُ الأَلِيْمُ ﴾ وە هەواڵیان بدەرێ بەڕاستی سزای من ئەو سزایەیە ئازاردار و گرانە.کەواتە ئێوە بترسن و بێ فەرمانی خوا مەکەن و خۆتان بە گەورە دامەنێن و ئاوڕێ بدەنەوە بۆ لای پەرستنی من و کەمتەرخەمی مەکەن .

کاتێ خوای مەزن باسی موژدەدان و هەڕەشە کردنی فەرمو، دوای ئەوانە باسی بەسەرهاتی ئیبراهیم و لوت ئەکا ، هەتا بەڕاستی بەو باسانە تەمێ خوار بن و لەجیهاندا بێ فەرمانی خوا نەکەن و ئەفەرموێ :

وَنَبِّئْهُمْ عَن ضَيْفِ إِبْرَاهِيمَ ﴿٥١﴾ إِذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقَالُوا سَلَامًا قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا لَا تَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَامٍ عَلِيمٍ ﴿٥٣﴾ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَىٰ أَن مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴿٥٤﴾ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلَا تَكُن مِّنَ الْقَانِطِينَ ﴿٥٥﴾ قَالَ وَمَن يَقْنَطُ مِن رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلَّا الضَّالُّونَ ﴿٥٦﴾ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴿٥٧﴾ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَىٰ قَوْمٍ مُّجْرِمِينَ ﴿٥٨﴾ إِلَّا آلَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا امْرَأَتَهُ قَدَّرْنَا إِنَّهَا لَمِنَ الْغَابِرِينَ ﴿٦٠﴾

﴿ وَ نَبِئْهُمْ عَنْ ضَيْفِ إبْراهِيْمَ ﴾ وە تۆ هەواڵ بدە بە بەندەکانی من لەبارەی میوانەکانی ئیبراهیم، ئاگاداریان بکە بەوکارەی سپێرابو بە فریشتەکان بیگەیەنن بە ئیبراهیم و چونە لای لە شێوەی ئادەمیزادا و ئیبراهیم نەی ئەزانی فریشتەن .

﴿ إذْ دَخَلُوا عَلَيْهِ فَقالُوا سَلاماً ﴾ کاتێ میوانەکانی چون بەسەر ئیبراهیما، دوایی سڵاویان کرد لە ئیبراهیم، ئیبراهیم سڵاوی سەندنەوەو بەگەرمی پێشوازی لێ کردن و هەڵسا لەبەریان. ئیبراهیم مرۆڤێکی دڵ فراوانی میوان بەزێڕ و نان بدە بو، گوێرەیەکی بۆ سەربرین و خواردەمەنی بۆ سازکردن و بردیە بەردەمیان و نەیان خوارد، بەو بۆنەوە ترسی لێ پەیدا بوو کەوتە گومانەوە .

﴿ قَالَ إِنَّا مِنكُمْ وَجِلُونَ ﴾ ئیبراهیم فەرموی: بەڕاستی ئێمە ئەترسین لە ئێوە کەنان ناخۆن و گومانی پیاو خراپیتان لێ ئەکەین .

﴿ قَالُوا لاتَوْجَلْ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلامٍ عَلِيمٍ ﴾ فریشتەکان ووتیان: تۆ مەترسە. بەڕاستی ئێمە هاتووین بۆ لای تۆ بۆ ئەوەی موژدە بدەین بە تۆ بە کوڕێکی خاوەن پلەی بەرز و زانا لای خوا کە پەیدا ئەبێ لە خاتون سارای هاودەمت کە ناوی بنێن ئیسحاق.

﴿ قَالَ أَبَشَّرْتُمُونِي عَلَى أَنْ مَّسَّنِيَ الْكِبَرُ فَبِمَ تُبَشِّرُونَ ﴾ ئیبراهیم فەرموی: ئایا ئێوە چۆن موژدە ئەدەن بەمن بەبونی کوڕێك لەسەر ئەو پیرییەوە تووشی من بوەو تەمەنم زۆرە ؟ دوایی بەچ شتێ موژدە ئەدەن بە من ؟ ئەم هەواڵە جێگەی سەرسوڕانی منە.

﴿ قَالُوا بَشَّرْنَاكَ بِالْحَقِّ فَلا تَكُنْ مِنَ الْقَانِطِيْنَ ﴾ فریشتەکان ووتیان بە ئیبراهیم: ئێمە موژدەمان بە ڕاستی و بەبێ گومان داوە بە تۆ، دوایی تۆ لەڕیزی نائومێدانا مەبە، فەرمانی خوایە کە کوڕێ بدا بە تۆ با پیریش بیت، توانای خوا لەسەرەوەی هەموو شتێکە. فریشتەکان وایانزانی ئیبراهیم بێ ئومێدە لەپەیدابوونی کوڕێك .

﴿ قَالَ وَمَنْ يَقْنَطُ مِنْ رَّحْمَةِ رَبِّهِ إِلا الضَّالُونَ ﴾ ئیبراهیم ووتی: من نائومێد نیم لە میهرەبانی و گەورەیی پەروەردگاری خۆم، و هیچ کەسێ بێ ئومێد نابێ لە میهرەبانی خوای پەروەردگار مەگەر کەسانێ لابدەن لە ڕێگەی ڕاست و بەهەلەدا چوبن و نەزانن توانای خوا فراوانە، من نائومێد نیم بەو موژدەدانەی ئێوە. بەڵام زۆر لام سەیرە پیرێکی وەك من چۆن منالّی ئەبێت؟

﴿ قَالَ فَمَا خَطْبُكُمْ أَيُّهَا الْمُرْسَلُونَ ﴾ ئیبراهیم دوای ئەوەی دڵی کرایەوەو ترسی نەما بە فریشتەکانی ووت: دوایی ئەو کارە گرنگ وگەورەیەی ئێوە چ شتێکە؟ ئەی نێرراوەکان لەلایەن خواوە، چ کارێکتان پێ سپێرراوە و بۆچ جێگەیە ئەڕۆن بۆلای چ کەسێ ئەڕۆن؟.

﴿ قَالُوا إِنَّا أُرْسِلْنَا إِلَى قَوْمٍ مُجْرِمِيْنَ ﴾ فریشتەکان ووتیان لە وەڵامی ئیبراهیما: بەڕاستی ئێمە ڕەوانەکراوین بۆ لای گەلێکی تاوانبار و بێ باوەڕ کەگەلی لوتی برازای تۆیە.. ئەو

گەلە دلنیشتوی شاری سەدوم عاموره بونکە شوێنی دەریای ( البحر الميت )ە گەلێکی جەنگ خواز وڕێگەگرو تالاّنکەر و نێرباز بوون. ئیتر ئیبراهیم ترسا کە لوتی برازای وخێزان و پەیڕەوانی تووشی ئەو سزایە بن لە گەڵ ئەو تاقمە تاوانبارانە، بۆیە فریشتەکان ووتیان:

﴿ إلا آلَ لُوطٍ إنّا لَمُنْجُّوهُمْ أجْمَعِيْـنَ ﴾ مەگەر خاو خێزانی لووت و پەیڕەوانی . بەڕاستی ئێمە ئەوان ڕزگار ئەکەین تووشی ئەو سزایە نابن هەمویان .

﴿ إلاّ إمْرَاتَهُ قَدَّرنا إنّها لَمِنَ الْغابِرِيْنَ ﴾ مەگەر ژنەکەی لوت فەرمانمان داوە و دیاریمان کردوە بەفەرمانی خوا، بەڕاستی ئەو ژنە لەوکەسانەیە ئەمێنێتەوە لەنێو شارەکەدا و لەگەڵ تاوانبارانی تردا تووشی ئەو سزایە ئەبن و بنەبڕ ئەبن، چونکە ئەو ژنە بێ باوەڕ بوە لەژێرەوە پیلانی سازاندوە لە دژی لوتی مێردی .

کاتێ فریشتەکان لای ئیبراهیم چونە دەرەوەو گەیشتنە لای لوت موژدەیان دایە بە لەناوچوونی ئەو گەلە داوێن پیسە. وەك خوا ئەفەرموێ :

فَلَمَّا جَآءَ ءَالَ لُوطٍ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٦١﴾ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ وَجَآءَ أَهْلُ ٱلْمَدِينَةِ

يَسْتَبْشِرُونَ ﴿٦٧﴾ قَالَ إِنَّ هَٰؤُلَاءِ ضَيْفِي فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ قَالُوا أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعَالَمِينَ ﴿٧٠﴾ قَالَ هَٰؤُلَاءِ بَنَاتِي إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ ﴿٧١﴾ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِي سَكْرَتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴿٧٢﴾

﴿ فَلَما جاءَ آل لُوط الْمُرْسَلُونَ ﴾ دوایی کاتێ چون بۆلای خانەوادەی لوت نێراوەکانی خوا لەشێوەو ڕەنگی چەند کوڕێکی جوان و شۆخدا لوت ترس کەوتە دڵی، بیم و خۆفی لەوەبو ئەو تاونبارانە دەست درێژی ناپاکی بکەنە سەریان .

﴿ قالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُنْكَرُونَ ﴾ لوت فەرموی بە فریشتەکان: بەڕاستی ئێوە تاقمێکن من ناتان ناسم و نازانم چ شتێکتان ئەوێ، زۆر لام سەیرە بەرگی کاروانیتان لەبەردا نیە و لەم گەلە تاوانبارە نین. من ئەترسم بەبۆنەی ئێوە وە تووشی ئازار بین وئێوە لەلایەن ئەو گەلەوە تووشی ئازار بن .

﴿ قالُوا بَلْ جِئْناكَ بِما كانُوا فِيْهِ يَمْتَرُونَ ﴾ فریشتەکان وتیان: ئێمە نەهاتووین بۆ لای تۆ بە جۆرێ گومان لە ئێمە پەیدا بکەی. بەڵکو هاتووین بۆ لای تۆ بۆ شتێ تۆ بەو شتە دڵخۆش ببی و بۆ ئەو شتەی ئەو کەلە تاوانبارانە گومانیان وایە تووشی نابن لە سزای خواو لەناوبردنیان، فریشتەکان کاری خۆیانیان بۆ لوت دەرخست کە لەناوبردنی گەلەکەیەتی، ئەو بەڵێنەی تۆ لەمەوبەر بەوانت دابو کە ئەگەر واز لەو کارە خراپانە نەهێنن خوا سزایان ئەدا وایان ئەزانی تۆ درۆ ئەکەی.

﴿ وَ آتَيْناكَ بِالْحَقِّ وَ إِنّا لَصادِقُونَ ﴾ وە ئێمە هاتووین بۆ لای تۆ بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو ڕاستیە تۆ بەڵێنت داوە بەوان بە هاتنە خوارەوەی سزا بۆ سەریان و، ئێمە ڕاست ئەکەین لەم هەواڵەدا بێگومان ئەو گەلە بنەبر ئەبن .

﴿ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقَطْعٍ مِنَ اللَّيْلِ ﴾ دوایی تـۆ بـە خـۆت وبەخێزانەکەتـەوە شـەوڕۆی بکەن و بەگورجی لـەم شارە دەرچن لـەبەشێکی مانەوەی شەودا .

﴿ وَ اتَّبِعْ أَدْبارَهُمْ وَلا يَلْتَفِتْ مِنْكُمْ أَحَدٌ وَامْضُوا حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴾ وە تۆ دوای خێزان و پەیڕەوانت بکەوەو لـە دووایانەوە بڕۆو هانیـان بـدە بەپەلـە بڕۆنـە دەرەوەو هیـچ یـەکێ لـەئێوە لانەکەنەوە بۆ دووای خۆتان لـەبەرئەوەی ئەو سزایە نەبینن و خەفەت بار بن، ئێوە بڕۆن بەرەو ئەو جێگەیە فەرمانتان پێ دراوە بۆی بڕۆن. زانایان بیریان جیاوازە لـە دیـاری کردنی ئەو جێگەیە ئایا شامە یا ئەردەن یا میسر .

﴿ وَ قَضَيْنا إِلَيْهِ ذلِكَ الأَمْرَ أَنْ دابِرَ هَؤُلاءِ مَقْطُوعٌ مُصْبِحِيْنَ ﴾ وە ئێمە سـروشمان نـارد بۆ لای لوت بە جێ بەجێ کردنی ئەو کارەکە بەڕاستی دواهەمین و بنچینەی ئـەو تاقمـە تاوانبارانە لـەکاتی بەیانیدا بنەبڕ ئەبن و نیشانە و پاشماوەیان نامێنێ بەهیچ جۆرێ .

کاتێ هەواڵی ئەو کوڕە شۆخ و جووان و بێ موونەی میوانی لوت بڵاوبویـەوە بـەناو شاردار دانیشتوانی ڕایان کرد بۆ لای خانوی لـوت، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَجاءَ أَهْلُ الْمَدِيْنَةِ يَسْتَبْشِـرُونَ ﴾ وە چـون دانیشـتوانی شـار و مـوژدەی خۆشـیان بەیەکتری ئەدا و بەنیازی ئەوەی ئەو کارە بێز لێ کراوە بکەن لـەگەڵ میوانـەکانی لـوت، جیهان تاریکبو لـەڕوی لوتا بەنەرمی و بەژیرانە کەوتە گفتوگۆ لـەگەڵیان .

﴿ قالَ إِنَّ هَؤُلاءِ ضَيْفِي فَلا تَفْضَحُونِ وَ اتَّقُوا اللهَ وَ لاتُخْزُونِ ﴾ لـوت فـەرموی بـەو گەلـە تاوانبارانە: ئەوانە میوانی منن و وازبهێنن، دوایی ئێوە من تووشی بێ ئابڕویی مەکەن و ئێوە لـە خوا بترسن و من ڕسواو شەرمەزار مەکەن بەرانبەر ئەو میوانانە .

﴿ قالُوا أَوَ لَمْ نَنْهَكَ عَنِ الْعالَمِيْنَ ﴾ گەلـەکـەی لـوت بـە لـوتیـان ووت: ئایـا ئێمـە قەدەغەمان نەکرد لـەتۆ میوانداری هیچ کەسێ نەکـەی و بێگانـە نەیەتـە لای تـۆ، پێمـان نەووتی: ڕێگە لـە ئێمە مەگرە ئەگەر نیازی ئەو کارەمان کرد. ئێستا تۆ چۆن پاڵ بە ئێمەوە ئەنێی و قەدەغە ئەکەی لـە ئێمە لـەئارەزووی خۆمان ؟

ئەی خاوەن بیر وهۆشەکانی ڕوی زەوی: سەیری ئەو بێ شەرمانە بکەن کە ئەو گەلـە تاوانبارانە خۆیان بەچاك ئەزانن و لـوت بـە تاوانبـار دائـەنێن و سەرزەنشـتی ئەکـەن لـە ڕاگرتنی میوان و بەرگرتنی لوت لـەو کارە ناڕەوایەی ئەوان. هەروەك ئەو گەلـە تاوانبـارە هەمو مرۆڤێکی خراپ و ڕەگەز پەرست و تاوانبار کە نرخ بـۆ هیـچ ڕەوشـتێکی بـەرز و پیاوچاکان دانانێن و جگەی سودی تایبەتی خۆیان هیچ شتێ نریان مەبەست نیە. جێگـەی سەرسوڕمانە کە نەتەوەی کـوردی سـتەم لێ کـراو داوای مـافی ڕەوای خۆیـان ئەکـەنو ئەیانەوێ لـە جێگەی باوباپیری خۆیانا بژین کەچی ڕەوشت پیس وڕەگەز پەرستەکانی لـەو ژیان هەڵساون. کە گەلـەکەی لوت نیازی کاری خراپیان بوو لـەگەڵ میوانەکانی لوت .

﴿ قَالَ هَؤُلاءَ بَنَاتِي إِنْ كُنْتُمْ فاعِلِيْنَ ﴾ لوت فـەرموی: ئـەم ژنانـەی شـار هـەموویان کچی منن و لـەئێوەیان مارە ئەکەم و بیبان کەن بەژنی خۆتان ئەگەر ئەتانـەوێ ئـارەزووی خۆتان بەجێ بهێنن، ژنان پاك و خاوێن و واز لـە پیاوان بهێنن، دوایی خـوا فـەرموی بـە پێغەمەر:

﴿ لَعَمْرُكَ إِنَّهُمْ لَفِيْ سَكَرْتِهِمْ يَعْمَهُونَ ﴾ بە گیانی تۆ سوێند ئەخۆم: بەڕاستی ئەو گەلـە گومڕابی و بێهۆشی و بەسەرخۆشی خۆیان سەرگەردانن و هـاتوچۆ ئەکـەن. هـەندێ لـە زانایان ئەڵێن: ئەو ڕستەیە لـەلایەن فریشتەکانەوە بە لوت بێژراوە. گفتوگۆی ئەوانە، نەك گفتوگۆی خوا لـەگەڵ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ .

دوایی خوای مەزن هەواڵ ئەدا بەچۆنیەتی سزادانی گەلی لوت و ئەفەرموێ :

فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً لِّلْمُؤْمِنِينَ ﴿٧٧﴾ وَإِن كَانَ أَصْحَٰبُ ٱلْأَيْكَةِ لَظَٰلِمِينَ ﴿٧٨﴾

فَانتَقَمْنَا مِنْهُمْ وَإِنَّهُمَا لَبِإِمَامٍ مُّبِينٍ ﴿٧٩﴾ وَلَقَدْ كَذَّبَ أَصْحَابُ الْحِجْرِ الْمُرْسَلِينَ ﴿٨٠﴾ وَآتَيْنَاهُمْ آيَاتِنَا فَكَانُوا عَنْهَا مُعْرِضِينَ ﴿٨١﴾ وَكَانُوا يَنْحِتُونَ مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا آمِنِينَ ﴿٨٢﴾ فَأَخَذَتْهُمُ الصَّيْحَةُ مُصْبِحِينَ ﴿٨٣﴾ فَمَا أَغْنَىٰ عَنْهُم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴿٨٤﴾ وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَإِنَّ السَّاعَةَ لَآتِيَةٌ فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيلَ ﴿٨٥﴾ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ الْخَلَّاقُ الْعَلِيمُ ﴿٨٦﴾

﴿ فَأَخَذَتْهُمْ الصّيحةَ مُشْرِقِيْنَ فَجَعَلْنا عالِيها سافِلَها وَ أَمْطَرْنا عَلَيْهِمْ حِجارةً مِنْ سِجِّيلٍ ﴾ دووایی گەلەکەی لوتی گرت دەنگێکی زۆر سەخت لەکاتی چێشتەنگاودا سزای ئێمە تووشی ئەوان بو لەکاتی هەڵهاتنی خۆردا، دوایی ئێمە ئەو شارەی لوتمان گێڕا سەرەوەی بۆ خوارەوەو ژێراو ژوورمان کرد و بنەبڕمان کردن و، ئێمە بارانمان بەسەریانا بەردێ لەگڵی ڕەق، جێگەکانیانمان خاپوور کرد، پاشماوەی ئەو شارە ئێستا ماوەتەوە هەتا گەلانی دوایی تەمێ خوار بن .

﴿ إنَّ فِي ذلِكَ لآياتٍ لِلْمُتَوَسِمِيْنَ ﴾ بەڕاستی هەیە لە بنەبڕکردن و سزادانی ئەو گەلەی لوت چەندین بەڵگەی ئاشکرا بۆ ئەو کەسانەی ژیرن و تەمێ خوار ئەبن و سود لە ئامۆژگاری وەرئەگرن و پسپۆرن هەمووشتێ ئەزانن بەڕاستی و بیری لێ ئەکەنەوە بەهۆی نیشانەکانییەوە .

﴿ وَ إِنَّها لَبِسَبِيلٍ مُقِيمٍ ﴾ وە بەڕاستی ئەو شارەی لوت پاشماوەی ماوە لـــە ڕێگەیـەکی بەردەواما و ئادەمیزاد هاتوچۆیپێدا ئەکەن و شوێنەوارەکان ئەبینن، پێویستە قورەیشیەکان ئاگاداری خۆیان بن .

﴿ إِنَّ فِي ذلِكَ لَآياتٍ لِلْمُؤمِنِيْنَ ﴾ بەڕاستی هەیە لە تۆڵە سەندن و لـــەناوبردنی گـەلی لوت چەندین بەڵگەو نیشانەی ئاشکرا بۆ ئەو کەسـانەی باوەڕیـان بـەخواو بەپێغەمـەر و بەبوونی ئەو سزایە هەیە لەپاش ئەوەی خوای مەزن باسی گەلی لوتی کـرد، باسـی گـەلی شوعەیبیشمان بۆ ئەکا کە خوا بنەبڕی کردن لەبەر بێ باوەڕی و سەرپێچی کردنیـان لـە ئاستی ڕاستی، ئەو گەلـەیش خاوەنی باخ و دارستانی زۆر چڕ و پڕبون و بەرهەمی زۆریان هەبو لە نزیکی مەدیەن و لەنێوان حیجاز و شامدا، ئەوان خەریکی بازرگـانی و کڕیـن و فرۆشتن بون، جگەی خوایان ئەپەرست. لە کێشانەو پێوانـەدا دانیشـتوانیان ئەخەڵـەتان، خوای مەزن باسیان ئەکا وئەفەرموێ :

﴿ وَ إِنَّ أَصْحابَ الأيكة لَظالِمِيْنَ فَأَنْتَقَمْنا مِنهُمْ ﴾ وە بەڕاستی دانیشتوانی لای ئەو بـاخ و دارستانە پڕو چڕەکە گەلی شوعەیب لەوێ نیشتەجێ بون ستەمیان لە خۆیان کردو بـێ باوەڕبون، دوایی خوای مەزن شوعەیبی بۆ ناردن و ئەوانیش بـەدرۆیان خسـتەوە، دوایـی ئێمە لەناومان بردن و تۆڵەمان لێ کردنەوە بەهۆی گەرما لەسەریانەوە بۆ ماوەی حـەوت ڕۆژ، دوایی هەورێکمان ڕاگرت بەسەریانەوەو کۆبونەوە لە ژێریا بەنیازی ئـەوەی خۆیـان بپارێزن لەگەرما، دوایی خوا ئاگری باران بەسەریاناو هەمویانی سوتاند، شـوێنەواری ئـەو گەلە ماوەتەوە بە ئاشکرایی، بۆ ئەوەی تاوانبـارانی دوایـی تـەمێ خـوار بـبن و هەڵمـەتی خوایان بۆ دەرکەوێ .

﴿ وَ إِنَّها لَبِإِمامٍ مُّبِيْنٍ ﴾ وە بەڕاستی ئەو دوو شارەی لـوت و دانیشـتوانی ئـەو جێگـە پڕوچڕە و باخ و دارستان ڕێگەیەکی ڕون و ئاشکران بۆ کەسانێ بچن بەلایانا، هەتا بۆیان دەرکەوێ خوای مەزن بە چ جۆرێ بنەبڕی کردوون ، بۆ ئـەوەیش ئـەو جێگانـە چـاولێ کراوی ئاشکرا بن بۆ ئادەمیزادی ژیر .

گەلێکی تر هەبون ناویان سەمود بو، گەلی ساڵح بـون، دانیشـتوانی حیجـر بـون کـە شوێنێکە ئەکەوێتە نێوان شام و مەدینە، بت پەرست بون. خوای مەزن ساڵحی بـۆ نـاردن بانگیان بکا بۆ لای خوا پەرستی، ساڵح و باوەڕدارانی تریان بەدرۆخستەوە، بـەو بۆنـەوە خوای گەورە لەناوی بردن، وەك خوا ئەفەرموێ :

﴿ وَ لَقَدْ كَذَّبَ أصْحابُ الحجر الْمُرْسَلِيْنَ وَ آتَيْناهُمْ آياتِنا فَكانُوا عِنْـها مُعْرِّضِيْـنَ ﴾ وە بەڕاستی دانیشتوانی حیجری گەلی ساڵح نێرراوەکانی خوایان بەدرۆخستەوەو باوەڕیان پێ نەئەهێنان بە تایبەتی پێغەمەرەکەی خۆیان کە ساڵح بوو، ئێمە بەخشیومانە بە دانیشـتوانی حیجر چەندین نیشانەی ئاشکرای ئێمە کە بەڵگەبوون لەسەر ڕاستی پێغەمەرەکان. بـەڵام ئەو بەڵگانە ڕێك نەئەکەوتن لەگەڵ ئارەزووی ئەوان، دوایی ئەو گەلـە ڕویـان وەرگـێڕا لەو نیشانە ئاشکرایانە .

﴿ وَ كانُوا يَنْحتونَ مِنَ الْجِبالِ بُيُوتاً آمِنِيْـنَ ﴾ وە ئـەو گەلـە لـە کێوەکـاندا چـەندین خانویان بۆ خۆیان ئەتاشی ترسیان نەبو لەڕوخان و کون کردنی دزو پـەلاماردانی دوژمـن ئەوەندە چاکبون، بە ئەقڵی ناتەواوی خۆیان لە سزا ئەیانپارێزێ. لەگەڵ ئەوانەیشدا ئـەوە ئەگەیەنێ ئەو گەلە پێش کەوتوو بون خاوەنی شارستانیەت بون. یەکێ لەو بەڵگانە خـوا پێی دابون هوشترێ بو ساڵح ئامۆژگاری کردبون ئازاری نەدەن کەچی سەریان بڕی، بـەو بۆنەوە خوا لەناوی بردن .

﴿ فَأَخَذَتْهُمْ الصَّيحَةُ مُصْبِحِيْنَ فَمَّا أغْنِي عَنْهُمْ ماكانُوا يَكْسِبُونَ ﴾ دوایـی ئـەو گەلـەی ساڵحی گرت دەنگێکی سەخت و توندبەهاتنە خوارەوەی سزا بۆ سەریان لـەکاتی بـەیانی کردنەوەیانا. خانوەکانیان ڕوخان و خۆیشـیان مـردن، دوایـی نەگەیشـتە فریایـان و ئـەو سزایەی لانەبرد لەسەریان شتێ پەیدایان کردبو بۆ خۆیان لـە دارایـی و خـانوی لەبـەرد تاشراوی لە کێوەکان .

﴿ وَما خَلَقْنا السَّماواتِ وَ الأَرْضِ وَما بَيْنَهما إلا بِالْحَقِّ ﴾ وە ئێمە ئاسمانـەکان وزەوی و شتێ لە نێوان ئەواندایە دروستمان نـەکردوە مەگـەر بـە جۆرێکـی ڕاسـتی و نـاگونجێ

لەگەڵ بەردەوامی خراپە کاری، بۆیە زانستی خوا فەرمانی دا بە لەناوبردنی ئەو گەلە و نەهێشتنی خراپەکاریان .

﴿ وَ إنَّ السّاعَةَ لآتِيَةٌ فَاصْفَحِ الصَّفْحَ الْجَمِيْلَ ﴾ وە بەڕاستی و بێگومان ڕۆژی دوایی دێت و هەموو کاتێ چاوەڕووانی هاتنی بکەن و تۆڵە لە تاوانباران و بێ باوەڕان ئەسێنرێ، دوایی تۆ واز لەوان بهێنە بەوازهێنانێکی چاك و لۆمەیان مەکە و پەلەی تۆڵە کردنەوەیان مەکە. ئەوان خراپە لە تۆ ئەکەن تۆ لێ بوردنت هەبێ و بەتەمای جگەی خوا مەبە .

﴿ إنَّ رَبَّكَ هُوَ الْخَلاقُ الْعَلِيْمُ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ هەر ئەوە دروستکەری هەمو بونەوەران وخو ڕەوشتیان، ئەزانێ بەو کەسانە بێ باوەڕ و دوو ڕوون .

ئەگێڕنەوە حەوت کاراونی جولەکەکان لە دەرەوە هاتنەوە بۆ مەدینە لەیەك ڕۆژدا، بارەکانیان ئەوریشم و بۆن وگەوهەر و شتی تری بەنرخ بوون. موسڵمانان ووتیان: ئەگەر ئەو دارایی وسامانە بۆ ئێمە بووایە خۆمانمان بەهێز ئەکردو دامان ئەنا لە ڕێگەی خوا و سەرکەوتنی ئاینی ئیسلامدا. خوای مەزن دڵخۆشی دانەوەو فەرموی:

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ لَا تَمُدَّنَّ عَيْنَيْكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّنْهُمْ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَٱخْفِضْ جَنَاحَكَ لِلْمُؤْمِنِينَ ﴿٨٨﴾ وَقُلْ إِنِّىٓ أَنَا ٱلنَّذِيرُ ٱلْمُبِينُ ﴿٨٩﴾ كَمَآ أَنزَلْنَا عَلَى ٱلْمُقْتَسِمِينَ ﴿٩٠﴾ ٱلَّذِينَ جَعَلُوا۟ ٱلْقُرْءَانَ عِضِينَ ﴿٩١﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَسْـَٔلَنَّهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩٢﴾ عَمَّا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ فَٱصْدَعْ بِمَا تُؤْمَرُ وَأَعْرِضْ

عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٩٤﴾ إِنَّا كَفَيْنَٰكَ ٱلْمُسْتَهْزِءِينَ ﴿٩٥﴾ ٱلَّذِينَ يَجْعَلُونَ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴿٩٦﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيقُ صَدْرُكَ بِمَا يَقُولُونَ ﴿٩٧﴾ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ﴿٩٨﴾ وَٱعْبُدْ رَبَّكَ حَتَّىٰ يَأْتِيَكَ ٱلْيَقِينُ ﴿٩٩﴾

﴿ وَلَقَدْ أتَيْناكَ سَبْعاً مِنَ المثاني وَالْقُرْآنَ الْعَظِيْمَ ﴾ وە ئێمە بەخشیومانە بە تۆ حەوت ئایەت لەو ئایەتانە دوو جار دووپات ئەکرێنەوەو بە تۆیشمان بەخشیوە ئەو قورئانە گەورەیە چاو ساغ و شارەزایی کەر وڕوناکیە بۆ هەموو دڵێ و لای ئێمە خوێندنی قورئان پاداشتی گەورەی هەیە .

زانایان لە ماناکردنو مەبەست لە ڕستەی (سبعان من المثاني ) بیرو بۆچونیان جیاوازە لەهەموویان بە هێزتر ئەمەیە کە ناوە بۆ سورەتی فاتیحە، چونکە حەوت ئایەتە و دووپات ئەکرێنەوە لەهەموو ڕکاتەکانی نوێژدا، باسی خوایەتی خوا و پەرستنی خوای تێدا کۆکراوەتەوە، ئەو سورەتە بەبێ گومان لەو حەوت کاروانەی جوەکان زۆر گەورەترە .

﴿ لاتَمُدَنَّ عَيْنَيْكَ إلى ما مَتَّعْنا بِهِ أزْواجاً مِنْهُمْ ﴾ تۆ چاوەکانی خۆت درێژ مەکەو مەنوارە بۆ لای شتێ ئێمە چەند تاقمێ لە بێ باوەڕانمان بەو شتە بەرخوردار کردوەو بەوشتە ڕائەبوێرن .

﴿ وَ لاتَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَ اخْفِضْ جَناحَكَ لِلْمُؤمِنِيْنَ ﴾ وە تۆ خەفەت مەخۆ لەسەر شتێ لە کیسی تۆ چوە لەهاوبەشی ئەوان لە جیهاندا و لەسەر بێ باوەڕنەهێنانی ئەوان و لە هەژاری وبێ سامانی هاوڕێکانت و، تۆ ڕابخە باڵی خۆت بۆ باوەڕداران دانەوێنە، چونکە ڕێزگرتن لەوان ڕەزایەتی خوایە .

﴿ وَ قُلْ إِني أنا النَّذِيْرُ المُبِيْنُ ﴾ وەتۆ بلّیّ: بەڕاستی من ئێوە ئەترسێنم بە بەلّگەی ڕون ئاشکرا لە سزای خوا ئەگەر ئێوە باوەڕنەهێنن و بیّ فەرمانی خوا بکەن خـوا سـزاتان بـۆ ئەنێریّ ئەگەر باوەڕ نەیەرن .

﴿ كَمّا أنْزَلْنا عَلى المقتسمين الَّذِيْنَ جَعَلُوا الْقُرآنَ عضين ﴾ بەوێنـەی سـزایەکی ئـەوتۆ ئێمە ناردومانە خوارەوە بۆ سەر ئەو کەسانەی ئەوتۆ قورئانیان پارچە پارچە ئەکرد، بـاوەڕ بەهەندیّکیان ئەهێناو باوەڕیان بەهەندیّ تریان نەئەهێنا، هەرشتیّ بە گوێرەی سودی ئەوان نەبوایە باوەڕیان پیّ نەئەهێنا و باوەڕیان بە جگەی ئەو ئەهێنا .

زانایان بیرو بۆچونیان لە بارەی ئەو کەسانە فـەرمودەی خوایـان پارچـە پارچەئـەکرد جیاوازە: هەندێکیان ئەلّێن: بریتین لە جوەکان و گاورەکـان، هـەندیّ تریـان لایـان وایـە بریتین لـە بت پەرستان ئەیان ووت: قورئان جادوەو هۆنراوە و چیرۆك و ئەفسانەیە .

﴿ فَوَرَبِّكَ لَنسْألَنهُمْ أجْمَعِيْنَ عَمّا كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ دوایی بە پەروەردگاری تۆ سـوێندم بیّ: بەڕاستی ئێمە پرسیار ئەکەین لەو کەسانەی قورئـان پارچـە پارچـە ئەکـەن هـەمویان لـەشتیّ ئەوان ئەیکەن لە پارچە کردنی قورئان ولـە بەدرۆخستنەوەی تۆ و لـەشتی تریان.

﴿ فَاصْدَعْ بِما تُؤمَرُون وَأعْرِضْ عَنِ الْمُشْرِكِيْنَ ﴾ دوایی تـۆ بـانگی ئـادەمیزاد بکـە و دەنگی خۆت بەرز بکەرەوە بە ڕاگەیاندنی شتیّ تۆ فەرمانت پیّ ئەدریّ و بەوانی بسـەلمێنە بە بەلّگەی بەهێز کە قورئان یاسای بەردەوامە بۆ ئادەمیزاد و، تـۆ ڕوی خـۆت وەرگـێرە لـەبت پەرستان و پشتیان تیّ بکە .

﴿ إنّا كَفَيْناكَ الْمُسْتَهْزِئِيْنَ الَّذِيْنَ يَجْعَلُونَ مَعَ اللهِ إلهاً آخرَ فَسَوْفَ يَعْلَمُونَ ﴾ بە ڕاسـتی ئێمە بەسین بۆ تۆ و ئەتپارێزین لـەو کەسـانەی ئـەوتۆ گالّتـە ئەکـەن بـە قورئـان و بـەتۆ، ئەگێرن و دائەنێن لـەگەلّ خوادا چەندین خوای پڕوپوچ بۆ پەرستن، دوایی ئـەزانن بەشـتیّ توشیان ئەبیّ لـە ڕۆژی دواییدا لـە سزای گران .

زانایان ئەلّێن: ئەو ئایەتە دەربارەی لـەناوبردنی پێنج کـەس لـەگـەورەکانی قورەیشـەی هاتوەتە خوار کە ئازاری زۆری پێغەمەریان ئەدا کە ئەمانەن: وەلیـدی کـوڕی موغـەیرە. عاسی کوڕی وائیل. عودەی کوڕی قـەیس. ئەسـوەدی کـوڕی عەبدیـەغوس. ئەسـوەدی کوڕی ئەلموتەلیب. دوایی خوای مـەزن هەریەکـە لـەوانی لـەناوبرد زۆر بـەبیّ نـرخ و بەئازاری گران .

شتێکی سروشتی و یاسایيه كه پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دڵی تـەنگ بـوه بەشـتیَ بـیَ بـاوەڕان ئەیلێن، چونکه پێغەمەر ئادەمیزادەو لەخوێن و گۆشت دروست کراوه، خەفـبەت ئـەخوا بەشتیَ ئادەمیزاد خەفەتی بۆ ئەخوا و دڵخۆش ئەبیَ بەشتیَ ئەوان پێی دڵخۆش ببن. بـەلاّم پەیوەندی لـەنێوان خەفەت و پەرستنی خوادا چ شتێکه هەتا خـوا فـەرمان بـدا هـەرکاتیَ خەفەت ڕوی تیَ کردو دڵی تەنگ بو پـەنا ببـا بـۆ لای پەرسـتنی خـوا؟ لـەوەلاّمی ئـەو پرسیارەدا بێژراوه: خوا فەرمانی نەداوه به پەرستنی خوا لێره لەبەرئەوەی ڕونـی بکاتـەوه كه دڵتەنگی ئەبێته هۆی فەرمان دان به پەرستنی خوا .

ئەبیَ بزانریَ فەرمانداان به پەرستنی خوا نەبەستراوه نەبـەکاتی خەفـەت و نـه بـەکاتی دڵخۆشی بەڵکو فەرمانداان به پەرستنی خوا لێره هێمایه لەوەی ئادەمیزاد ئەبیَ هەر پشت بەخوا ببەستن بەتەنها کاتیَ شتیَ پەیدا بو ئازاری پیَ گەیاندن. کەواته مانای ئەم ئایەتانـەی دوایی پێویسته بەوجۆره ئاماژەی بۆ بکریَ :

﴿ وَ لَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّكَ يَضِيْقُ صَدْرَكَ بِما يَقُولُونَ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَكُنْ مِنَ السَّاجِدِيْنَ ﴾ وه بەڕاستی ئێمه ئەزانین كه تۆ دڵ تەنگ ئەبی بەشتیَ بیَ باوەڕان ئەیلێن: کەخوا هاوبەشی هەیه، گاڵته به تۆ ئەکەن وتاوانج ئەگرنه قورئان، دوایی تۆ پەنا ببه بـۆ لای خـوا لـەشتیَ بەتۆ ئەگا لـه ئازار بەهۆی پاك وخاوێنی و سوپاسی پەروەردگاری خۆتەوە خوا خەفـەت و ناخۆشی تۆ ناهێڵیَ، پاك و خاوێنی دەربڕه بۆ خـواو سوپاسـی خـوا بکـه لەسـەر ئـەوەی خوای مەزن ڕێبەرایەتی وڕاغومایی تۆی کـردوەو ، تـۆ لـەوکەسـانه بـه نوێـژ ئەکـەن و سوژده بۆ خوا ئەبەن .

﴿ وَ اعْبُدْ رَبَّكَ حَتّى يَأْتِيَكَ الْيَقِينُ ﴾ وەتۆ بەردەوام به بۆ پەرستنی خوا هـەتا دێـت بـۆ لای تۆ مردن بەبیَ گومان و هەتا دواکاتی ژیانت بەردەوام به لـەپەرستنی خوادا .

بەیاریدەی خوا کۆتایی لـه ١٠ ی مانگی شەوال ( ١٤٢٠ ) ڕێکەوت

بەرانبەر ١٧ / ١ / ٢٠٠٠ زایینی

داوام لـەخوای مەزن ئەمەیه یاریدەم بدا لـەسەر کاری چاك و پیرۆز

## ﴿ سورەتی نەحل ﴾

لەمەکە هاتوەتـە خـوارەوە. جگـە لەئایـەتی ( ٢٦ -١٢٧ -١٢٨ ) کـە لـە مەدینـە هاتونەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (١٢٨ ) ئایەتن .

پێغەمەری خوا بت پەرستانی ئەترسان لـەسزای ئازاردار، ئەوانیش وەلاّمـی پێغەمـەریان ئەدایەوە بەگاڵتە پیٚکردنەوە ئەیان وت: ئەگەر ڕاست ئەکەی با ئەوسزایە بێتە خـوارەوە، خوا ئەفەرمویٚ :

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

( بەناوی خوای بەخشندە و میهرەبان )

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

أَتَىٰٓ أَمْرُ ٱللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿١﴾ يُنَزِّلُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةَ بِٱلرُّوحِ مِنْ أَمْرِهِۦ عَلَىٰ مَن يَشَآءُ مِنْ عِبَادِهِۦٓ أَنْ أَنذِرُوٓا۟ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱتَّقُونِ ﴿٢﴾ خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ بِٱلْحَقِّ تَعَٰلَىٰ عَمَّا يُشْرِكُونَ ﴿٣﴾ خَلَقَ ٱلْإِنسَٰنَ مِن نُّطْفَةٍ فَإِذَا هُوَ خَصِيمٌ مُّبِينٌ ﴿٤﴾

﴿ أتَى امْرُ اللهِ فَلا تَسْتَعْجِلُوهُ ﴾ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بت پەرستانی ئەترسان لـەسـزای خـوا، ئەوانیش ئەیان ووت: دەیبا خوا باران بباریـنیٚ بەسەرمانا، خوا وەلاّمـی دانـەوە: بەڕاسـتی سزای خوا دیٚت بۆ لاتان لەڕۆژی دواییدا، دوایی ئیٚوە پەلـەمەکەن بۆ هاتنی فەرمانی خواو سزدانی ئیٚوە. خوای مەزن بە ووشەی ڕابوردو فەرمویەتی هـاتوە فـەرمانی خـوا، چونکـە

ئەوەندە گومان لەبونیا نیە وەك ئەوەیە هاتبیٚ بۆ لایان ئەگینا ئەو سزایە لـەڕۆژی دواییـدا دیٚت بۆ لایان .

﴿ سُبْحانَهُ وَتَعالَى عَمّا يُشْرِكُونَ ﴾ پاك وخاوێنی بۆ خوایە و بەرز بـالاٌو دورە لەشـتیٚ بت پەرستان ئەیکەن بەهاوبەش بۆخوا لەفریشتەو ئادەمیزاد و بتەکان .

﴿ يُنَزِلُ الْمَلائِكَةَ بِالْروحِ مِنْ أمْرِهِ عَلَى مَنْ يَشاءُ مِنْ عِبادِهِ ﴾ خوا فریشتەکان ئەنیرێتـە خوارەوە بەهاوڕێیەتی سروش و قورئانەوە لەفەرمودەکانی خوا، سروش و قورئان ناونراون بەگیان چونکە دلّی ئادەمیزاد زیندو ئەکەنەوە بەلابردنی نەزانین و خوانەناسین، ئەی نێرێتە خواریٚ بۆ سەر هەرکەسـیٚ ئـارەزوی هـەبیٚ لەبـەندەکانی خـواو ئـەیانکا بەپێغەمـەر بـۆ گەیاندنی فەرمودەکانی خوا .

﴿ أنْ أنْـذِرُوا وأنَـهُ لا إلـهَ إلا أنـا فَـأتَقُونِ ﴾ کەئـەو بەندانـەی خـــوا ڕای بگەیەنـە بەئادەمیزاد بەهۆی قورئانەوە کە بەڕاستی هیچ خوایە نیە پەرستنی بۆ بکریٚ مەگـەر هـەر من، ودوایی ئێوە لەخوا بترسن و خۆتان لەبیٚفەرمانی خواو بت پەرستی ولەسـزای خـوا بپارێزن.

﴿ خَلَقَ السَّماواتِ وَالأَرْضِ بِـالْحَقِّ تَعـالَى عَمّـا يَشْـرِكُونَ ﴾ خـوا دروسـتی کـردوە ئاسمانەکان و زەوی بەڕاستی و بەبیٚگومان خوا بەرزترو دوورترە لەشتیٚ بت پەرستان وبیٚ باوەڕان ئەیکەن بەهاوبەش بۆ خوا، ئەوکەسـەی توانـای دروسـت کردنـی ئاسمانـەکان و زەوی هەبیٚ شایستەی ئەوەنیە هاوبەشی بۆ دابنریٚ لەفریشتەو جگەی فریشتە لەپەرستندا.

﴿ خَلَقَ الإنسان مَنْ نَطْفَةٍ فإِذا هُوَ خَصِيْمٌ مُبِيْنٌ ﴾ خـوا ئـادەمیزادی دروسـت کـردوە لەدلۆپیٚ ئاوی قێزەون و بیٚنرخ کەئەچێتە نێومنالاٌنی ژنـان هـەتا ماوەیـەکی دیـاریکراو لەدواییدا ئەبیٚ بەخوێن ودواتر ئەبیٚ بەپارچە گۆشتیٚ دواتر بەمنالّی و بەنەفامی پەیدا ئـەبیٚ دوایی ئەبیٚ بە مرۆڤێکی ژیر .

﴿ فَإذا هُوَ خَصِيْمٌ مُبِيْنٌ ﴾ دوایی کوتوپڕ ئەو ئـادەمیزادە ئـەبیٚ بـەدوژمنێکی ئاشـکراو سوپاسی چاکەی خوا ناکا ودەست ئەکا بەگفتوگۆی پڕوپـوچ. بەتایبـەتی ئوبـەی کـوڕی خەلّەف ئەی ووت: زیندوو بونەوە نیە دوای ڕزانی ئێمە .

خوای مەزن کاتی باسی دروســت کردنـی ئاسمانـەکان و زەوی وئـادەمیزادی کـرد، لـەدواییدا باسی ئەو شتانە ئەفەرموی کەئادەمیزاد سودی لی وەرئـەگرن و پیویسـتیان پیـی هەیە لـەخوادرەمەنی وبەرگ و شتی تر. ئەفەرموی:

وَٱلْأَنْعَٰمَ خَلَقَهَا لَكُمْ فِيهَا دِفْءٌ وَمَنَٰفِعُ وَمِنْهَا تَأْكُلُونَ ﴿٥﴾ وَلَكُمْ فِيهَا جَمَالٌ حِينَ تُرِيحُونَ وَحِينَ تَسْرَحُونَ ﴿٦﴾ وَتَحْمِلُ أَثْقَالَكُمْ إِلَىٰ بَلَدٍ لَّمْ تَكُونُوا۟ بَٰلِغِيهِ إِلَّا بِشِقِّ ٱلْأَنفُسِ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٧﴾ وَٱلْخَيْلَ وَٱلْبِغَالَ وَٱلْحَمِيرَ لِتَرْكَبُوهَا وَزِينَةً وَيَخْلُقُ مَا لَا تَعْلَمُونَ ﴿٨﴾ وَعَلَى ٱللَّهِ قَصْدُ ٱلسَّبِيلِ وَمِنْهَا جَآئِرٌ وَلَوْ شَآءَ لَهَدَىٰكُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٩﴾

﴿ والأنعام خلقها لكم فيها دفء ومنافع و منها تأكلون ﴾ وخوا چوارپیی دروسـت کـردوە بۆ سودی ئیوە، چوارپی بریتین لـەهوشتر گاو مەرو بزن کەخوا رامی کردون بۆ خزمەتی تایبـەتی ئیوەو، هەیە لـەوچوارپییانەدا شتی خۆتانی پی‌بپاریزن لـەسـەرما، لـەپیسـت و کـورگ و خـوری وموەکانیان، بەرگ وراخەر وسەرخەر وشتی تریان لی دروست ئەکەن و چەندین سودی تریان تیدا هەیە وەك رۆن و کـەرەو مـاس وپـەنیر و شـیرو گۆشـت وگواسـتنەوەی کـەلو پـەلتان و سورابونیان و کیلانی زەوی بۆ پیکهینانی دانەویلەو میوەو کشت وکال و، هەیە لـەوچوارپییانەدا شتی ئیوە ئەی خۆن لـەوانەی باسبان کران .

﴿ وَلَكُمْ فِيْها جَمالٌ حِيْنَ تُرِيحُونَ وَحِيْنَ تَسْرَحُونَ ﴾ وەبۆ سوودی ئێوە هەیە لەوچوارپێیانەدا جوانی و ئارایش و تەماشاکردنیان لەلای خانوەکانتان ولەکاتی وەستان ومۆڵ دانیان وە لەکاتێکا ئێوە ئەیان هێننەوە لە لەوەڕگاکانیان بۆئارام گرتن وپشـودانیان لەپەچەکانیان ودەست ئەکەن بەکاوێژ کردن و، جوانی لەواناهەیە لەکاتێکا ئێوە دەریان ئەکەن لەپەچەکانیان بۆ لەوەڕگاکانیان و بۆلای ڕووبارو کانیەکان بۆخواردنەوەی ئاو، چاوتان بەتەماشاکردنی ئەوان ڕون ئەبێتەوەو دڵتان خۆش ئەبێ چونکە ئەبنە هۆی ژیان وگوزەرانتان .

﴿ وَتَحْمِلُ أَثْقالَكُمْ إِلى بَلَدٍ لَمْ تَكُونُوا بالِغِيهِ إِلا بِشِّقِ الآنْفُسِ ﴾ وەئەوچوارپێیانە خۆتان وبارە گرانەکانی ئێوە هەڵئەگرن لەشارێکەو ەبۆ شارێکی تر ئێوە بۆتان نەئەگونجا بگەنە ئەوشارە مەگەر بەڕەنجاندن و ئازاردان وماندووبونیخۆتان بەپیادەبێی بەبێ بارەکانیشتان، خۆ ئەگەر ئەو بارانە بکەنەکۆڵی خۆتان و بییان بەن بۆ شاری زۆرتر ماندوو ئەبن وئازارتان توش ئەبێ.

﴿ إِنَّ رَبَّكُمْ لَرَؤُوفٌ رَحِيْمٌ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە زۆر بە بەزەی ومیهرەبانە بەبێ ژمارەکە ئەو چوارپێیانەی دروست کردوە ورامی کردون بۆ ئێوە بۆئەو مەبەستانەی پێشوو .

﴿ وَالخَيْلَ وَالْبِغالَ وَالْحَمِيْرَ لِتَرْكَبُوها وَزِيْنَةً ﴾ وەخوا دروستی کردوە بۆ سوودی ئێوە چارەوی و هێستر وگوێ درێژەکان لەبەرئەوەی ئێوە سواریان بن بۆ پێویستی و جێ‌بەجێ کردنی کارەکانتان و جەنگ کردنتان لەکاتی ئاشتیو جەنگداو، خوا ئەوگیاندارانەی دروست کردوە بۆ ئێوە لەبەرجوانی وتەماشاکردنی ئێوە و ئارایشیان بدەن بۆ ڕمبازی و پێش برکێو ڕێزیان بدەن بۆ ڕابوارادن لەگەڵ ئەوسودانەی تر باسکران .

﴿ وَيَخْلُقُ ما لا تَعْلَمُونَ ﴾ وەخوا دروستی ئەکا بۆ سوودی ئادەمیزاد شتێ ئێوە نایزانن و نەتان دیوە، وێنەی فڕۆکەو ماشێن وپاپۆڕ و جۆرەها میوەی خۆش وچەندین شتی تری سوودبەخش بۆ ئێوە .

بۆ زانین: گۆشتی چارەویٚ خواردنی لای پێشەوا شافیعی ڕەوایە، لای پێشەوا حەنـەفی قەدەغەنیـە، گۆشـتی هێسـرو گوێدرێـژ قەدەغەیـە لای پێشـەوایان حەنـەفی وشـافیعی وئەحمەد، لای پێشەوا مالیك قەدەغە نیە. بەڵام خوادرنیان چـاك نیـە. ﴿ وَعَلَى اللهِ قَصْدُ السَّبِيلِ وَمِنْهَا جَائِرٌ ﴾ وەلەسەر ڕوونكردنەوەی ڕێگەی ڕاسـت كـەمرۆڤ ئەگەیـەنی بـۆ لای ڕاستی ڕاغوبی وەرگرتن و، هەندیٚ ڕێگە هەن خوارو خێچـن ولایـان داوە لـەڕاسـتی بەوێنەی ئاینەكانی جگەی ئیسلام لـەئاایینی جوەكان كەئەڵێن: عوزەیر كوڕی خوایە، ئاایینی گاورەكان لایان وایە عیسا كوڕی خوایە، هەندیٚ تریان هەن گاو ئاگر پەرستن و چـەندین بیروباوەڕی تری پروپوچ .

﴿ وَلَوْ شَاءَ لَهَدَاكُمْ أَجْمَعِينَ ﴾ وەئەگەر خوا ئـارەزووی بكردایـە ئێـوەی ئـادەمیزادی ناچار ئەكردن هەمووتان بۆلای باوەڕهێنان و كەسیان بیٚباوەڕ نەئەبون، بەڵام خوای مەزن واز لـەئادەمیزاد ئەهێنیٚ كەبەهۆی ئەقڵی خۆیانەوە ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە، هەتا شـیاوی پاداشت وتۆڵـەبن .

دوای ئەوەی خوا باسی چاكەی خۆی بەسەر بەندەكانی خۆیـەوە كـرد لـەبـەر سـودو ڕابواردنی جوانی ئەوان باسی بارینی بارانمان بۆ ئەكا كەگـەورەترینی چاكـەی خوایـە بـۆ ئادەمیزادو ئەفەرمویٚ:

هُوَ الَّذِي أَنزَلَ مِنَ السَّمَاءِ مَاءً لَّكُم مِّنْهُ شَرَابٌ وَمِنْهُ شَجَرٌ فِيهِ تُسِيمُونَ ﴿١٠﴾ يُنبِتُ لَكُم بِهِ الزَّرْعَ وَالزَّيْتُونَ وَالنَّخِيلَ وَالْأَعْنَابَ وَمِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿١١﴾ وَسَخَّرَ لَكُمُ اللَّيْلَ وَالنَّهَارَ وَالشَّمْسَ وَالْقَمَرَ وَالنُّجُومُ

مُسَخَّرَٰتُۢ بِأَمۡرِهِۦٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّقَوۡمٖ يَعۡقِلُونَ ﴿١٢﴾ وَمَا ذَرَأَ لَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُخۡتَلِفًا أَلۡوَٰنُهُۥٓۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَةٗ لِّقَوۡمٖ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣﴾ وَهُوَ ٱلَّذِي سَخَّرَ ٱلۡبَحۡرَ لِتَأۡكُلُواْ مِنۡهُ لَحۡمٗا طَرِيّٗا وَتَسۡتَخۡرِجُواْ مِنۡهُ حِلۡيَةٗ تَلۡبَسُونَهَاۖ وَتَرَى ٱلۡفُلۡكَ مَوَاخِرَ فِيهِ وَلِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦ وَلَعَلَّكُمۡ تَشۡكُرُونَ ﴿١٤﴾ وَأَلۡقَىٰ فِي ٱلۡأَرۡضِ رَوَٰسِيَ أَن تَمِيدَ بِكُمۡ وَأَنۡهَٰرٗا وَسُبُلٗا لَّعَلَّكُمۡ تَهۡتَدُونَ ﴿١٥﴾ وَعَلَٰمَٰتٖۚ وَبِٱلنَّجۡمِ هُمۡ يَهۡتَدُونَ ﴿١٦﴾ أَفَمَن يَخۡلُقُ كَمَن لَّا يَخۡلُقُۚ أَفَلَا تَذَكَّرُونَ ﴿١٧﴾ وَإِن تَعُدُّواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ لَا تُحۡصُوهَآۗ إِنَّ ٱللَّهَ لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٨﴾ وَٱللَّهُ يَعۡلَمُ مَا تُسِرُّونَ وَمَا تُعۡلِنُونَ ﴿١٩﴾

﴿ هُوَ الّذِي أنْزَلَ مِنَ السّماءِ ماءً لكُمْ ﴾ خوا کەسێکی ئەوتۆیە ناردویەتە خوارەوە لەهەوری ئاسمان ئاوێك بۆ سوودی ئێوە، دوایی لەو ئاوە چەندین ڕووبار پەیدا ئەبێ و هەندێکی ئەچێتە نێو زەوی لەکانیەکانەوە دەرئەچێ و لەناو بیرەکانیشا بەدۆڵچە دەری ئەهێنن، خوای مەزن چاکەی خۆی ئەرێژێ بەسەر بەندەکانی خۆیا بەهۆی ئاوەوە، دوایی:

﴿ مِنْهُ شَـرابٌ وَمِنْـهُ شَـجَرٌ فِيْـهِ تَسِيْمُونَ ﴾ هـەندێ لـەوئاوە ئـەگیرێ بـەوەی ئێـوە بیخۆنەوەو خۆتانی پێ بشۆرن و خانووی پێدروست بکەن و بەهۆی پـاپۆڕو شـتی تـرەوە بسوڕێتەوە بەنێو ڕوبارو دەریاو زەریاکان، بەهەندێ لەو ئاوە پەیدا ئـەکا درەخـت و گیـا لەلەوەڕگاکاندا ئێوە بەوئاوە ئاژاڵەکانی خۆتانی پێبەخێوئەکەن.

﴿ يُنْبِتُ لَكُمْ بِهِ الـزَّرْعَ وَالْزَيْتُـونَ وَ النَّخِيْـلَ وَ الأعْنـابَ وَمِـنَ كَـلِ الثَمَـراتِ ﴾ خـوا ئەڕوێنێ بۆ سوودی ئێوە بەهۆی ئەو ئاوەوە سەوزایی وزەیتون و داری خورما و درەختـی ترێکان و میوەکانی تر و ئەڕوێنێ لـەهەمو جــۆرە بەرهەمـەکانی تـر چـەندین دانەوێڵـەی جۆراوجۆر بۆ ئێوە .

﴿ إنَّ فِي ذٰلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَتفَكَرُونَ ﴾ بەڕاستی هەیە لـەدروسـت کـردن و پـەیداکردنی ئەو شتانە بەهۆی ئاوەوە نیشانەو بەڵگەی زۆر گەورە لـەسەر تواناو زانستی خوا بۆ تاقمێ بیر بکەنەوە لـەوکارە زۆر سەرسوڕێنەرانە و لـەجۆری پەیدابونیان لـەدەنکێ دانەوێڵەو تەڕ ئەبێ بە بۆنەی ئاوەوە ئەقڵیشی ئەوشتانەی لێپەیدا ئەبێ .

﴿ وَسَخَّرَ لَكُمْ اللَّيْلَ وَ النَّهارَ وَالْشَّمْسَ وَالْقَمَرَ ﴾ وەخوا ڕامی کردوە بۆ سوودی ئێـوە شەو بەزۆری بۆ پشودان و خەوتن و ڕۆژیشی بۆ ڕام کردون بـەزۆری بـۆ کـارکردن و پەیداکردنی ژیانتان وخۆری بۆ ئێوە ڕام کردوە هەتا بـەهۆی ڕونـاکی خـۆرەوە بگـەڕێن بەجێگەکانی زەویدا و گەرماییتان بۆ بسازێنێ بـۆ گەشـەکردنی خۆتـان و ئـاژاڵ وکشـت وکاڵتان ومانگی بۆ ئێوە ڕام کردوە بۆئەوەی ڕێگەی پێ بدۆزنـەوە لـە تـاریکی شـەو و تاریکی نێودەریاکاندا .

پرسیار / ئایا کەناوی شەو برا پێویست ئەکات ناوی مانگ بـبرێ، یـا نـاوی ڕۆژ بـرا پێویستە ناوی خۆر ببرێ ؟

وەلاَم / بـەڵێ: چونکـە وائـەبێ شـەو پـەیدا نـەبێ بـەبێ مـانگ، ڕۆژیـش هەندێکـە لـەسودەکانی خۆر وبریتی نیە لە هەمو سودەکانی خۆر .

﴿ وَالْنّجُومُ مُسَخَّراتٌ بِأمْرِهِ ﴾ وە ئەستێرەکان ڕام کـراون بـۆ سـودی ئێـوە بـەهۆی فەرمان ودەستوری خواوۆ بۆ ئەوەی ئێوە ڕێگەی خۆتـانی پـێ بدۆزنـەوە لـەنێو تـاریکی زەریاو دەریاکان و لـەسـەر ڕووی زەوی. ڕستەی ( بِـأمْرِهِ ) ئاماژە ئـەکا بـۆ بـەر پێـچ دانەوەی مادییەکان کەهەمو ڕوداوی جیهان ئەگێڕنەوە بۆلای سروشت هەربەتەنها .

﴿ إنَّ فِي ذلِكَ لآَياتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴾ بەڕاستی هەیـە لەدروسـت کردنـی ئەوشـتانەی ڕابوردون چەندین بەڵگەی بەهێز لـەسەر تواناو زانستی خـوا بـۆ تـاقمیٚ خـاوەنی ئـەقڵی تەواو بن و بۆیان دەرئەکەویٚ هەموو شتیٚ یەهۆی توانای خواوە پەیدا ئەبن .

﴿ وَما ذرأ لكُمْ فِي الأَرْضِ مُخْتَلفاً ألْوانُهُ إنَّ فِي ذلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَذكِرُونَ ﴾ وەخوا ڕامی کردوە بۆسوودی ئێوە شتێکی ئەوتۆ دروستی کردوە بۆ تان لەزەویدا بەجۆریٚ ڕەنگەکانی جیاوازن لەتام و بۆن و جۆری ڕووەکەکان، خوا لەزەویدا چەندین کانگای تەڕو ووشـك وچەندین سەوزایی هەمەجۆری پەیداکردووە، بەڕاستی هەیە لەدروسـت کردنـی ئەوشـتە بەڵگەی زۆر گەورە بۆ تاقمیٚ ئامۆژگاری وەربگرن و سوپاسی خوا بکەن لەسەریان .

﴿ وَهُوَ الّذِي سَخَّرَ الْبَحْرَ لِتأكُلُوا مِنْهُ لَحماً طَرِيـاً ﴾ وەخـوا کەسێکی ئەوتۆیـە ڕامـی کردوە بۆ سوودی ئێوە دەریا بەجۆریٚ دەستەلاتی داوە بەئێوە بتوانن بگەڕێن بەنێو ڕوباردا و سودی لیٚوەربگرن بە ڕاوکردنی نێچیرەکانی نێو دەریـا وێنـەی ماسـی، بۆئـەوەی ئێـوە بتوانن بخۆن لـەوشتەی ڕاوی ئەکەن گۆشتێکی تەڕو تازەی ماسی ڕاوکراو،ئیـتر ئاوەکـەی سوێربیٚ یا شیرین بیٚ .

﴿ وَتَسْتَخْرِجُوا مِنْهُ حَلبَةَ تَلْبِسُونَها ﴾ وەئێوە دەرئـەهێنن لـەودەریایـە دا شـخڵ و شـتی تری بەنرخ لـەمەرجان و شتی تر ئیوە خۆتان و ژنەکانتان ئەیکەنە بەرتان و ئـەی پۆشـن و خۆتانی پیٚ ئەڕازێنەوە .

﴿ وَتَرى الْفَلَكُ مَواخِرَ فِيْهِ و لِتَبْغُوا مِنْ فَضْلِـهِ وَلَعلَكُـمْ تَشْكُرُونَ ﴾ وەئێـوە بـەچاوی خۆتان کەشتیەکان ئەبینن لـەنێو شەپۆلی ئاوی دەریاکانا ئاوەکـە ئەکـەن بـەدوو کەرتـەوە بەلای ڕاست و پەلاچەپاو جێگەی خۆیان ئەکەنەوە لەنێو دەریادا ، بۆئەوەی تەمیٚ خواری

وەرگن وبۆ ئەوەیش ئێوە پەیدابکەن قازانجی بازرگانی و خواردەمەنی فراوان بەهۆی سواربوونی کەشتیەکان لەنێو دەریادا وو بۆ ئەوەیش ئێوە سوپاسی خوا بکەن لەسەر ئەو هەمو چاکانە خوا بەئێوەی بەخشیوە وەهەتا خوا چاکەی زۆرترتان لەگەڵدا بکا .

﴿ وَ أَلْقى فِيْ الأَرْضِ رَواسِيَ أَنْ تَمِيدَ بِكُمْ ﴾ وەخوا دایناوە لەزەویدا چەندین کێوی بۆئەوەی زەوی بوەستێ ونەجولێ وتووشی ئازارنەبن و زەویش بەتوندی نەسوڕێنەوە .

﴿ وَأَنْهاراً وَ سُبُلاً لَعَلَكُمْ تَهْتَدُونَ ﴾ وەخوا دایناوە لەزەویدا چەندین ڕوبار بۆئەوەی خۆتان وئاژاڵتان و کشت وکاڵتان ئاویان لێ بخۆنەوەو خانو وتەلاری پێدروست بکەن وخوا بۆی داناون چەندین ڕێگەیە لەڕووی زەویدا بۆئەوەی ئێوە شارەزایی وەربگرن و بڕۆن بۆلای هەموو گوند وشارێ بتانەوێ بۆیان بچن هەتا سەرگەردان نەبن .

﴿ وَعَلاماتٍ وَبِالْنَجْمِ تَهْتَدُونَ ﴾ وەخوا دایناوە چەندین نیشانەیەکی ئەوتۆ شارەزایی ئادەمیزاد ئەکەن بۆ لای ڕێگەکان وبۆئەوەی بگەن بەمەبەستی خۆتان بەوێنەی کێو وشیوەکان و بەهۆی ئەستێرەکانەوە ئادەمیزاد ڕاغویی وەرئەگرن بەشەودا لەووشکایی و دەریادا .

﴿ أَفَمَنْ يَخْلُقُ كَمَنْ لا يَخْلُقُ أَفَلا تَذَكَّرُونَ ﴾ ئایا دوایی کەسێ دروست بکا هەموو بونەوەران، بەتایبەتی ئاسمانەکان وزەوی و مرۆڤ وئەوانەی تر باسیان کرا وێنەی کەسێکە هیچ شتێ دروست نەکا و خۆیان دروست کراوبن وەك ئەو بتە بێ گیانانە بت پەرستان ئەیان پەرستن، ئایا دوایی ئێوە بۆ بیرناکەنەوەو ئامۆژگاری وەرناگرن هەتا خۆتان ڕزگار بکەن لەوبیرو باوەڕە پوچانە .

﴿ وَإِنْ تَعُدُّ نِعْمَةَ اللهِ لا تُحْصُوها إِنَّ اللهَ لَغَفُورٌ رَحِيْمٌ ﴾ وەئەگەر ئێوە بتانەوێ چاکەکانی خوا بژمێرن ئێوە ناتوانن بیانژمێرن لەبەر زۆری چاکەی خوا. بەڕاستی خوا لێ خۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانە باوەڕ ئەهێنن، میهرەبان و خاوەن بەزەییە بۆ گوناهباران کە سوپاسی چاکەی خوا بکەن بەجۆرێ شایستەی خوا بێ.

﴿ وَاللهُ يَعْلَمُ ما تُسِرُّونَ وما تُعْلِنُونَ ﴾ وەخوا ئەزانێ بەشتێ پەنهانی ئەدەن لە بیروباوەڕی پوچتان وئەزانێ بەشتێ ئێوە ئاشکرای ئەکەن لەکردەوەکانتان .

وَٱلَّذِينَ يَدۡعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ لَا يَخۡلُقُونَ شَيۡـًٔا وَهُمۡ يُخۡلَقُونَ ﴿٢٠﴾ أَمۡوَٰتٌ غَيۡرُ أَحۡيَآءٖۖ وَمَا يَشۡعُرُونَ أَيَّانَ يُبۡعَثُونَ ﴿٢١﴾ إِلَٰهُكُمۡ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞۚ فَٱلَّذِينَ لَا يُؤۡمِنُونَ بِٱلۡأٓخِرَةِ قُلُوبُهُم مُّنكِرَةٞ وَهُم مُّسۡتَكۡبِرُونَ ﴿٢٢﴾ لَا جَرَمَ أَنَّ ٱللَّهَ يَعۡلَمُ مَا يُسِرُّونَ وَمَا يُعۡلِنُونَۚ إِنَّهُۥ لَا يُحِبُّ ٱلۡمُسۡتَكۡبِرِينَ ﴿٢٣﴾

﴿ وَالّذِيْنَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ لا يَخْلُقُونَ شَيْئاً وَهُمْ يُخْلَقُونَ ﴾ وەكەسانێکی ئـەوتۆ بتەکان ئەپەرستن لـە جگەی خواو بەلایانەوە وایە هاوبەشی خوان لـەپەرستندا ناتوانن هیـچ شتێ دروست بکەن و ئەوان دروست کراوی خوان و تاشراوی دەستی ئادەمیزادن .

﴿ أمْواتٌ غَيْرٌ أحْياءِ وَ ما يَشْعُرُونَ أيانَ يُبْعَثُونَ ﴾ ئەوانەی جگەی خوا مردوو بێ گیانن و زیندوو نین و مەرجیپەرستراو ئەوەیـە زینـدوو بـن و ئەوانـە هەسـت ناکـەن چ کـاتێ زیندوو ئەکرێنەوە، ئەگەر گیان بکرێ بەبەریان و لەڕۆژی دواییدا زیندو بکرێنەوە بێزاری دەرئەبڕن لەوکەسانەی ئەوانیان پەرستوە .

پرسیار/ پیتی ( واو ) لـەڕستەی ( یشعرون، يَبْعَثُونَ ) بۆ کەسانێ بەکارئەهێنرێ خاوەنی ئەقڵبن، بتەکان خاوەنی ئەقڵ نین، چۆن بەکارهێنراوە بۆیان ؟

وەڵام/ ئەو پیتە بـەکارهێنراوە بۆئەوبتانـە، چونکەبـەگوێرەی بـاوەڕی بـت پەرسـتان ئەویتانە خاوەنی ئەقڵ و هەستن .

پرسیار/ ئەوبتانە زیندوو ناکرێنەوە ، چـۆن خـوا ئەفـەرموێ هەسـت ناکـەن زینـدوو ئەکرێنەوە ؟

وەڵام/ هەندێ لـەزانایان لایان وایە ڕاناوی ڕستەی ( یشـعرون ) ئەگەڕێتـەوە بـۆ لای بتەکان، ڕاناوی ( يَبْعَثُونَ ) ئەگەڕێتەوە بۆ لای بت پەرستان. یانیٚ بتەکان هەست ناکەن چ کاتێ بت پەرستان زیندو وئەکرێنەوە؟ ئیتر چۆن شایستەی پەرستنن؟

﴿ إِلَهُكُمْ إِلَهٌ واحِدٌ ﴾ خوای ئێوەی ئادەمیزاد خوایـەکی تەنـهاو بیٚهاوبەشـە وئـەوەی شایانی پەرستنبێ پێویستە تەنها بێ وهاوبەشی نەبێ، ئەوبتانە بەو زۆرییـە شـایانی پەرسـتن نین.

﴿ فَالَّذِيْنَ لا يُؤْمِنُونَ بالآخرة قُلوُبـهِمْ مُنْكِـرَةٌ وَهُـمْ مُسْـتَكْبِرُونَ ﴾ دوایـی کەسـانێکی ئەوتۆ باوەڕ بەڕۆژی دوایی نایەرن دڵیان ووشکەو ڕاستی ناناسن و دژی یەکێتی خـوان و دژی ڕێگەی ڕاستن وئامۆژگاری وەرناگرن و یادی خوا ناچێتە دڵیان وبەئومێدی پاداشتی دوارۆژ نین ولـەسـزای خـوا ناترسـن و، ئەوکەسـانە خۆیـان بەگـەورە ئـەزانن بەرانبـەر بەفەرمانیخوا، بۆیە پەیڕەوی کردنی پێغەمەر وەرناگرن .

﴿ لا جَرَمَ إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ ما يَسِرُّونَ وَما يُعَلِنُونَ إِنَّ اللهَ لا يَحِبُّ الْمُسْـتَكْبِرِيْنَ ﴾ بێگومـان بەڕاستی خوا ئەزانێ بەشتێ ئەو بیٚباوەڕانە پەنـهانی ئـەدەن لـەدڵیاناو بەشـتێ ئاشـکرای ئەکەن لـەکاری خراپ و جەنگ هەڵگیرسان و دوژمنایەتی پێغەمەر. بەڕاستی خوا خۆشی ناوێن ئەو کەسانەی خۆیان بەگەورە ئەگرن لەئاستی یەکێتی خوا و پێغەمەری ئیسلام .

خوای مەزن لە ئایەتی پێشوودا باسی ئەوکەسانەی کرد باوەڕ بەڕۆژی دوایـی نایـەرن لەبەرئەوەی خۆیان بە گەورە دائەنێن، لەم ئایەتەی دواییدا باسی ئەوەمان بۆ ئەکا کە ئـەو بێ باوەڕانە قورئان بە دەسـت نووسـی ڕابـوردوان و چـیرۆك نووسـان دائـەنێن. ئەگـەر پرسـیاریان لێبکرایـە لـەبارەی قورئانـەوە ئـەیان ووت: بیٚسـوود وپڕوپوچـە، وەك خـوا ئەفەرموێ:

وَإِذَا قِيلَ لَهُم مَّاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ قَالُوٓا۟ أَسَـٰطِيرُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ لِيَحْمِلُوٓا۟ أَوْزَارَهُمْ كَامِلَةً

يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ ۙ وَمِنْ أَوْزَارِ ٱلَّذِينَ يُضِلُّونَهُم بِغَيْرِ عِلْمٍ ۗ أَلَا سَآءَ مَا يَزِرُونَ ﴿٢٥﴾ قَدْ مَكَرَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَأَتَى ٱللَّهُ بُنْيَـٰنَهُم مِّنَ ٱلْقَوَاعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ ٱلسَّقْفُ مِن فَوْقِهِمْ وَأَتَىٰهُمُ ٱلْعَذَابُ مِنْ حَيْثُ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٢٦﴾ ثُمَّ يَوْمَ ٱلْقِيَـٰمَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ كُنتُمْ تُشَـٰٓقُّونَ فِيهِمْ ۚ قَالَ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ إِنَّ ٱلْخِزْىَ ٱلْيَوْمَ وَٱلسُّوٓءَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ ﴿٢٧﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ ظَالِمِىٓ أَنفُسِهِمْ ۖ فَأَلْقَوُا۟ ٱلسَّلَمَ مَا كُنَّا نَعْمَلُ مِن سُوٓءٍ ۚ بَلَىٰٓ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌۢ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٢٨﴾ فَٱدْخُلُوٓا۟ أَبْوَٰبَ جَهَنَّمَ خَـٰلِدِينَ فِيهَا ۖ فَلَبِئْسَ مَثْوَى ٱلْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٢٩﴾

﴿ وَإِذا قِيلَ لَهُمْ ماذا أَنْزَلَ اللهُ رَبُّكُمْ قالُوا أَساطِيرُ الأَوَّلِينَ ﴾ وە هەر كاتێ بێژرابێ بەبێ باوەڕان چ شتێكی ئەوتۆیە پەروەردگاری ئێوە ناردوییەتیـە خـوارەوە بـۆ سـەر موحەمـەد ئەیان ووت بەگاڵتەپێ كردن ئەو شتە نوسراوێكن دەرهێـنراون لـەنامـەكانی پێشـووەكاندا بەبێ ئەوەی بەڵگەیە هەبێ لـەسەر ڕاستی ئەوشتە. ئەوگفتوگۆیانەیان ئەكرد لـەبەر لادانـی ئادەمیزاد لـەڕێگەی ڕاست .

﴿ لِيَحْمِلُوا أَوْزارَهُمْ كامِلَةً يَوْمَ الْقِيامَةِ ﴾ لەبەرئەوەی گوناهی گومڕایی خۆیان بەتەواوی هەڵگرن لەڕۆژی دواییدا خوا لەهیچ گوناهێکیان خۆش نابێ، چونکە گومڕایی جێگەی خۆی گرتوە لەدڵیان .

﴿ ومِنْ أَوْزارِ الَّذِيْنَ يُضِلُّونَهُمْ بَغَيْرِ عِلْمٍ ﴾ وەبۆ ئەوەیش هەڵیبگرن هەندێ لەگوناهی کەسانێکی ئەوتۆ ئەو بێ باوەڕانە لایانداون لەڕێگەی ڕاست بەبێ ئەوەی لادراوەکانیان بزانن لەگومڕاییدان بەبێ بەڵگەو ئەبوایە چاك و خراپان جوێ بکردایەتەوە کەواتە بیانویان نیە .

﴿ ألا ساءَ ما يَزِرُونَ ﴾ ئێوە ئاگاداربن وبزانن خراپ شتێکە ئەو بێ باوەڕانە هەڵی ئەگرن. بەڕاستی خۆیان گومڕان وکەسانێکی تریان لاداوە لەڕێگەی ڕاست .

﴿ قَدْ مَكَرَ الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ بەڕاستی کەسانێکی ئەوتۆ لەپێش بت پەرستانی مەکەوە بوون پیلان و فێڵیان سازاندوە بۆ پێغەمەرەکانی خۆیان، دوایی خوا پیلانەکەیانی پروپوچ کردوەتەوە، ئەوکەسانەی پێشووینەی نەمردوی کوڕی کەنعان کەدژی ئیبراهیم بو کۆشکێکی زۆر بەرز و سەرسورهێنەری دروست کردبو کەبیپارێزێ لەڕوداوی ڕۆزگار، بەلام بەبێ هودە دەرچوو، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَأَتَى اللهُ بُنْيانَهُمْ مِنَ الْقَواعِدِ فَخَرَّ عَلَيْهِمُ السَّقْفُ مِنْ فَوْقِهِمْ ﴾ دوایی خوا نیازی فەرموو بڕوخێنێ کۆشکەکەیان ولەبن هەڵی کەنێ، بۆیە فەرمانی خوا چو بۆلایان و کۆشکەکەیان لەژوورەوە ڕوخان بەسەریانا .

﴿ وَأَتاهُمُ الْعَذابُ مِنْ حَيْثُ لايُشْعِرُونَ ﴾ وە چوو بۆلای ئەو گەلە بێ باوەڕە سزای خوا لەجێگەیەکەوە هەستی پێ نەکەن، کۆتایی هەموکەسێ دوژمنایەتی ڕاستی بکاو پڕوپاگەندەی درۆو بلاوبکاتەوە وێنەی ئەو بێ باوەڕانە ئەبێ، ئیتر ئەو ڕاستیە لەسەر زمانی پێغەمەرەوە دەرچێ یا لەزمانێ ترەوە دەردەچێ.

﴿ ثُمَّ يَوْمَ الْقِيامَةِ يُخْزِيهِمْ وَيَقُولُ أَيْنَ شُرَكائِي الَّذِيْنَ كُنْتُمْ تُشاقُونَ فِيْهِمْ ﴾ لە پاشا خوا لەڕۆژی دواییدا ڕسوایان ئەکا بەسزایە جگەی سزای جیهان کەتوشیان ئەبێ و، خوا

ئەفەرموێ بەبت پەریستان :لەچ جێگەیەکن ئەوشتانەی ئەوتۆ ئێوە ئەتان کـرد بەهاوبـەش بۆمن لەپەرستندا، ئێوە دوژمنایەتی پێغەمەرتان پێ ئەکردن لەبارەی ئەوبتانەوە ئەتان ووت: بۆمان ئەپارێنەوەو نزیکمان ئەخەنەوە لەخوا .

﴿ قَالَ الَّذِيْنَ أُتُوا الْعِلْمَ إِنَّ الْخِزيَ الْيَوْمَ وَالْسُوءَ عَلَى الْكَـافِرِيْنَ ﴾ کەسـانێکی ئـەوتۆ بەخشرابو بەوان زانینی ڕاستی و کاریان پێ ئەکرد لە پێغەمـەران و زانایـان و پیاوچاکـان ئەیان ووت: بەڕاستی ڕسوایی ئەم ڕۆژەی دوایی و سزای سەخت لەسەر ئەو بێباوەڕانەیە کەدوژمنی ڕاستین .

﴿ الَّذِيْنَ تَتَو فَّاهُمْ الْمَلائِكَةُ ظَالِمِي أنْفُسِهِمْ فَـأَلْقُوا السـلْمَ مـا كُنّـا نَعْمَـلُ مِـنْ سُـوءٍ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ فریشتەکانیان گیانیان کێشاون ستەمیان لەخۆیان کـردووەو لەسـەر بـێ باوەڕی مردوون، دوایی خۆیان ئەدەنەدەسـت خـواو سـەربۆ خـوا شـۆڕئەکەن لـەکاتێکا ئەوسەر شۆرکردنەیان سودیان پـێ نابەخشـێ، بـەدرۆوە ئـەیلێن: ئێمـە کـاری خراپـان نەکردووە. خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەوە:

﴿ بَلى إِنَّ اللهَ عَلِيْمُ بِما تَعْلَمُونَ ﴾ ئەوشتەی ئێوە ئەیلێن وانیە ، بەڕاستی خـوا ئـەزانێ بەشتێ ئێوە کردوتانە لەستەم کـردن ولـەگوناە ، ئـەمرۆ پاداشـتتان ئەدرێتـەوە بەسـزای سەخت بەهۆی درۆکردن و بوختان کردنتان. بەبێ باوەڕان ئەبێژرێ:

﴿ فَأَدْخُلُوا أَبْوابَ جَهَنَّمُ وَأَنْتُمْ خالِدِيْنَ فِيْها ﴾ دوایی ئێوە بڕۆنە نێو دەرگـای دۆزەخ و هەریەکـەیان دەرگایـەکی تایبـەتی بـۆ ئامـادەکراوە لـەو دەرگایـەوە بچنـە نێـو دۆزەخ بەدرەوامبن لەنێو دۆزەخدا .

﴿ فَلَبِئْسَ مَثْوى الْمُتَكَبِّرِيْنَ ﴾ دوایی خرایـە جێگـەی ئەوکەسـانەی خۆیـان بەگـەورە دائەنا بەرانبـەر بەفـەرمودەکانی خـواو ئـایینی ئیسـلام، ئیـتر خۆیـان پـاڵ بـدەن بـەئایینی ئیسلامەوە یابەئایینی جگەی ئیسلامەوە .

﴿ فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴾ دوایی خرایە جێگەی ئەو کەسانەی خۆیان بەگەورە دائەنا بەرانبەر بەفەرمودەکانی خواو ئایینی ئیسلام، ئیتر خۆیان پاڵ بدەن بەئایینی ئیسلامەوە یابەئایینی جگەی ئیسلامەوە .

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو بێ باوەڕانەی کرد کە قورئانیان بە پرو پوچ دائەنا، لەدواییدا باسی ئەو باوەڕدارانە ئەکا نیاز پاکن و قورئان بەڕێزو بەگەورەی دائەنێن وئەفەرموێ:

وَقِيلَ لِلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ مَاذَآ أَنزَلَ رَبُّكُمْ ۚ قَالُوا۟ خَيْرًا ۗ لِّلَّذِينَ أَحْسَنُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا حَسَنَةٌ ۚ وَلَدَارُ ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ ۚ وَلَنِعْمَ دَارُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣٠﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ يَدْخُلُونَهَا تَجْرِى مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ ۖ لَهُمْ فِيهَا مَا يَشَآءُونَ ۚ كَذَٰلِكَ يَجْزِى ٱللَّهُ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿٣١﴾ ٱلَّذِينَ تَتَوَفَّىٰهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ طَيِّبِينَ ۙ يَقُولُونَ سَلَٰمٌ عَلَيْكُمُ ۙ ٱدْخُلُوا۟ ٱلْجَنَّةَ بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٣٢﴾ هَلْ يَنظُرُونَ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمُ ٱلْمَلَٰٓئِكَةُ أَوْ يَأْتِىَ أَمْرُ رَبِّكَ ۚ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ وَمَا ظَلَمَهُمُ ٱللَّهُ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٣٣﴾ فَأَصَابَهُمْ سَيِّـَٔاتُ مَا عَمِلُوا۟ وَحَاقَ بِهِم مَّا كَانُوا۟ بِهِۦ يَسْتَهْزِءُونَ ﴿٣٤﴾

﴿ وَقِيْلَ لِلَّذِيْنَ اتَّقَوْا ماذا اَنْزَلَ رَّبُكُـمْ قـالُوا خَـيْراً ﴾ وەئـەبێژرێ بەکەسـانێکی ئـەوتۆ لـەخوا ترسابوون و خۆیان پاراستبو لـەبت پەرستی، پەروەردگاری ئێوە چ شتێکی نادروەتە خوارەوە بۆ سەر موحەمەد و ڕاغوبی کـەری ئـادەمیزادە بـۆلای هـەموو چاکەیـە، ئـەیان ووت: پەروەردگاری ئێمە چاکترین شتی ناردوەتە خـوارەوە بۆسـەر موحەمـەد ڕانومـایی کەری ئادەمیزاد بۆلای هەمووو چاکەیە .

﴿ لِلَّذِيْنَ أَحْسَنُوا فِي هَذِهِ الّدُنيا حَسَنَةٌ وَلِدارُ الآخِـرَةْ خَـيْرٌ ﴾ وەبـۆ ئەوکەسـانە هەیـە باوەڕیان هێناوە و کردەوە چاکـەکانیان کـردوە لـەم جیهانـەدا پاداشـتی چـاك بەڕاسـتی لەخانووی دوارۆژدا بۆیان هەیە پاداشتی چاکتر بەجۆرێ نایەنە ژمارە .

﴿ وَ لَنِعْمَ دارُ الْمُتَّقِيْنَ ﴾ وەبەڕاسـتی چـاك خانویەکـە جێگـەی ئەوکەسـانە باوەڕیـان هێناوەو کردەوە چاکەکانیان کردوەو خۆیانیان پاراستوە لـەبێفەرمانی خوا .

﴿ جَنّاتٌ عَدنٍ يَدْخِلُونَها تَجْرِي مِنْ تَحْتِها الأَنْهارُ ﴾ ئەوخانوەی لـەخوا ترسان بریتی‌یـە لـە چەندین باخ وبۆستانێ بۆ جێگەی دانیشتن و بەرین و بەردەوامە ئەچنـە ناویـان ئـەڕوا بەژێریانا وبەم لاولای خانوەکانیـان چـەندین ڕوبـاری ئـاوی شـیرین وئەوبەهەشـتانەیان ڕازاندوەتەوە .

﴿ لَهُمْ فِيْها ما يَشاؤُونَ كَذلِكَ يَجْزِي اللهُ الْمُتَّقِيْنَ ﴾ بۆ ئەو لـەخوا ترسانە هەیـە لـەنێو ئەو بەهەشتانەدا شتێ ئەوان ئارەزوی بکـەن لـەخواردەمـەنی و پۆشـاك وشـتی تـر، هـەر بەوێنەی ئەوپاداشتەی باسکران خوا پاداشتی ئەو کەسانە ئەداتەوە خۆیان لـە بـێ فـەرمانی ئەپارێزن و لـەخوا ترسن .

﴿ الَّذِيْنَ تَتَوَفاهُمْ الْمَلائِكَةُ طَيِّبِيْنَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ فریشتەکان گیانیان کێشاون پاکن لـەوەی ستەمیان لـەخۆیان کردبێ بـاوەڕدارو دووربـون لـەبت پەرسـتی بـەجۆرێکن خـوا لـەوان ڕازیە .

﴿ يَقُولُونَ سَلامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِما كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ ﴾ فریشتەکان بەوان ئەڵێن: سلاو وبێوەیی وئاشتی لەسەر ئێوە بێ ئێوە بچنە بەهەشتەوە بەهۆی شتێکەوە ئێوە کردوتانە لەکاری چاك و هەمو شتێکتان بۆ ئامادەکراوە لەوەی ئەتانەوێ .

﴿ هَلْ يَنْظُرُونَ إلاّ أنْ تَأتِيَهُمْ الْمَلائِكَةُ أوْ تَأتِي أمْرُ رَبِّكُمْ ﴾ ئەوبێباوەڕانە چاوەڕوانی هیچ شتێ ناکەن مەگەر کەبێت بۆلایان فریشتەکان بۆ گیان کێشانیان، یابێت بۆلایان سزای خوا لە رۆژی دوایی یاسزایە بنەبڕیان بکا لەجیهاندا.

﴿ كَذَلِكَ فَعَلَ الَّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ هەر بەو جۆرەی بت پەرستان ئەیکەن لەگەڵ تۆو باوەڕ ناهێنن و جنێوت نەدەنێ کەسانێکی ئەوتۆ لەپێش بت پەرستانەوە بوون ئەوکارانەیان کردووە لەگەڵ پێغەمەرەکانیخۆیان بەدرۆیان ئەخستەوە .

﴿ وَما ظَلَمَهُمُ اللهُ وَلَكِنْ كانُوا أنْفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴾ وەخوا ستەمی نەکردوە بەلەناوبردنی ئەوان وسزادانیان و، بەلاّم خۆیان ستەمیان لە خۆیان کردووە بەهۆی کردەوەی خراپیانەوە .

﴿ فَأصابَهُمْ سَيِّئاتُ ما عَمِلُوا وَحاقَ بِهِمْ ما كانُوا بِهِ يَسْتَهْزِئُونَ ﴾ دوایی تووشی ئەوان بوە تۆڵەی خراپەکانی شتێ ئەوان کردبویان و هاتە خوار بەسەریانا سزای شتێ ئەوان بەوشتە گاڵتەیان پێئەکرد بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ و بەقورئان .

خوای مەزن ڕوونی ئەکاتەوە جۆرێ تر لە خراپە و بێ باوەڕی و بەدرۆخستنەوەی پێغەمەر و تانەدان لەپەیامی خواو ئەفەرموێ:

وَقَالَ ٱلَّذِينَ أَشْرَكُواْ لَوْ شَآءَ ٱللَّهُ مَا عَبَدْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ نَّحْنُ وَلَآ ءَابَآؤُنَا وَلَا حَرَّمْنَا مِن دُونِهِۦ مِن شَيْءٍ كَذَٰلِكَ فَعَلَ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ فَهَلْ عَلَى ٱلرُّسُلِ إِلَّا ٱلْبَلَٰغُ ٱلْمُبِينُ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَّسُولًا أَنِ ٱعْبُدُواْ ٱللَّهَ

وَٱجْتَنِبُوا۟ ٱلطَّٰغُوتَ فَمِنْهُم مَّنْ هَدَى ٱللَّهُ وَمِنْهُم مَّنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ ٱلضَّلَٰلَةُ فَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿٣٦﴾ إِن تَحْرِصْ عَلَىٰ هُدَىٰهُمْ فَإِنَّ ٱللَّهَ لَا يَهْدِى مَن يُضِلُّ وَمَا لَهُم مِّن نَّٰصِرِينَ ﴿٣٧﴾

﴿ وَقَالَ الذِيْنَ أشْرَكُوا لَوْ شَاءَ اللهُ ماعَبْدَنا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيءٍ نَحْنُ وَلا آباؤُنا﴾ وەکەسانێکی ئەوتۆ هاوبەشیان دائەنا بۆ خوا ئەیان ووت: ئەگەر خوا بیویستایە ئێمە و باپیرانمان نەمان ئەپەرست لە جگەی خوا هیچ شتێ .

﴿ وَلاحَرَّمْنا مِنْ دُونِهِ مِنْ شَيءٍ ﴾ وە ئەگەر خوا ئارەزووی هەبوایە ئێمە بە جگەی فەرمانی خوا هیچ شتێکمان قەدەغە نەئەکرد. کە خوا نەی ویستوە ئێمە هاوبەش بۆ خوا دائەنێین و هەموو شتێ بەئارەزووی خۆمان قەدەغە ئەکەین، ئەوەی موحەمەد ئەیڵێ خۆی هەڵی بەستوە وفەرمانی خوا نیە، خوای مەزن وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ كَذلِكَ فَعَلَ لِّذِيْنَ مِنْ قَبْلِهِمْ ﴾ هەر بە وێنەی ئەو شتەی بت پەرستانی مەکە ئەیکەن لەبت پەرستی و ڕەواکردنی هەموشتێ کەسانێکی ئەوتۆ لەپێش ئەوانەوە بوون ئەو کارانەیان ئەکرد هاوبەشیان بۆ خوا دائەناو شتەڕەواکراوەکانیان قەدەغەئەکرد .

﴿ فَهَلْ عَلَى الرَّسُولِ إلا الْبَلاغُ الْمُبِيْن ﴾ دوایی هیچ شتێ لەسەر نێرراوەکانی خوانیە مەگەر ڕاگەیاندنی پەیامی ئاشکرای خوا بەئادەمیزاد و ڕێگەی ڕاستیان پیشان بدەن .

﴿ وَلَقَدْ بَعَثْنا فِي كُلِّ اُمَةٍ رَسُولاً أنْ اعْبُدُوا اللهَ وَأجْتَنِبُوا الْطاغُوتَ ﴾ وەبەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردوە لەنێو هەمو نەتەوەیەکدا لە هەموو خولێك و لە هەموو هەرێمێکا فروستادەیە کە فەرمان بدا بەوەی کە پێویستە ئێوە خوا بپەرستن وخۆتان بپارێزن لەپەرستنی جگەی خوا ئیتر بت بێ یا ئەستێرە یا ئادەمیزاد یا شتی تربێ ،ئەقڵی مرۆڤ جۆرە نێرراوێکە خوا دیناوە لەمێشکی مرۆڤدا بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی ڕاست .

﴿ فَمِنْهُمْ مَنْ هدىَ اللهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حقت عَلَيْهِ الضّلالَةُ ﴾ دوایی هەندێکە لەونەتەوانەدا کەسیّ خوا ڕێگەی ڕاستی پیشان داوە بەهۆی پێغەمەران و ئەقڵی خۆیەوەو، هەیە لەوانە کەسیّ پێویستبوە لەسەری ڕێگە وون بکاو گویّ نەگریّ لەپێغەمەران وئەقڵی خۆی نەخاتەکار بۆ دۆزینەوەی هەتا کۆتایی تەمەنی ورسوای لای خوا ئەبیّ .

﴿ فَسِيْرُوا فِي الأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كانَ عاقِبَةُ الْمُكَذّبِيْنَ ﴾ دوایی ئێوەی بیّباوەڕان بڕۆن بەڕوی زەویدا، دوایی ئێوە تەماشا بکەن چۆن بوەکۆتاییو پاشەڕۆژی ئەوکەسانە باوەڕیان نەهێناوەو پێغەمەرەکانیان بەدرۆخستوەتەوە. ئەوکاتە بۆتان ڕون ئەبێتەوە بەچ جۆریّ خوا سزای گەلی عادو سەمود و جگەی ئەوانی‌داوە بوون بەجێگەی خەشمی خوا .

﴿ إنْ تَحْرِصْ علَى هُداهُمْ فَأنَّ اللهَ لايَهْدِي مَنْ يُضِلُّ وَمالَهُمْ مِنْ ناصِرِيْنَ ﴾ ئەگەر تۆ ئەوپەڕی کۆشش بکەی لەسەر ڕاغویی کردنی بت پەرستان، دوایی بەڕاستی خوا ڕاغویی کەسیّناکا لەڕێگەی ڕاست لای دابیّ و پەیڕەوی تۆیان نەکردووەو ئەقڵی خۆیانیان نەخستوەتەکارەوە بۆ بت پەرستان نیە هیچ کەسیّ یارمەتیان بداو ڕێگە لەسزادانیان بگریّ ونەیەڵیّ سزایان بدریّ.

پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ زۆر تیّ ئەکۆشا بۆ نیشاندانی ڕێگەی ڕاست بەهەمو کەسیّ بەتایبەتی قورەیشیەکان، بەڵام تەنها کۆششی پێغەمەرنابێتە هۆی شارەزایی ئەوان بەبیّ کۆشش وئاواتی مرۆڤ بۆ شارەزا بوونی خۆی، بەوێنەی ئەوکەسانە کەبەهۆی ئارەزۆو کۆششی خۆیانەوە خوا پەرستیان کردوە .

لەئایەتەکانی پێشوودا خوای مەزن باسی ئەوەی کرد بت پەرستان شتێکیان ئەپەرست دروستکرابو ودروست کەر نەبوو، ئەیشیان ووت: قورئان سەرگوزەشتەی پێشوەکانە، بیّباوەڕی خۆیانیان ئەدایە پاڵ باوکەکانیان، لەم ئایەتەی دواییدا باسی ئەوە ئەفەرمویّ: یت پەرستان باوەڕیان بەزیندوو بونەوە نیە، ئەفەرمویّ:

وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَٰنِهِمْ لَا يَبْعَثُ اللَّهُ مَن يَمُوتُ بَلَىٰ

وَعْدًا عَلَيْهِ حَقًّا وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٣٨﴾ لِيُبَيِّنَ لَهُمُ ٱلَّذِى يَخْتَلِفُونَ فِيهِ وَلِيَعْلَمَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَنَّهُمْ كَانُوا۟ كَٰذِبِينَ ﴿٣٩﴾ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَىْءٍ إِذَآ أَرَدْنَٰهُ أَن نَّقُولَ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٤٠﴾ وَٱلَّذِينَ هَاجَرُوا۟ فِى ٱللَّهِ مِنۢ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا۟ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً ۖ وَلَأَجْرُ ٱلْءَاخِرَةِ أَكْبَرُ ۚ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ٱلَّذِينَ صَبَرُوا۟ وَعَلَىٰ رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٤٢﴾

﴿ وَ أَقْسِمُوا بِاللهِ جَهْدَ إِيْمانِهِمْ لا يَبْعَثُ اللهُ مَنْ يَمُوتُ ﴾ وەبت پەرستان سوێندیان ئەخوارد بەئەوپەڕی کۆششی سوێندەکانیان: خوا زیندوو ناکاتەوە کەسیێ بمرێ بۆ پرسیارکردن لەکارەکانیان خوای مەزن زۆر بەتوندی وەڵامیان ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ بَلَى وَعْداً عَلَيْهِ حَقاً ﴾ بەڵێ خوا مردووان زیندو ئەکاتەوە خوا بەڵێنی داوە بە بەڵێنێکی ڕاست لەسەر زیندوو کرنەوەی مردووان بەبێ گومان بەڵێنی خوا دێتە جێ .

﴿ وَلَكِنْ أَكْثَرَ النّاسِ لايَعْلَمُونَ ﴾ وەیەلاّم زۆرتر لەئادەمیزاد نازانن خوا گیان ئەکاتەوە بەبەریاو زیندویان ئەکاتەوەو پارچەکانیان لەدوای بلاّی وبونەوەیان کۆ ئەکاتەوەو زۆر بەئاسانی کەسێ یتوانتێ لەنەبونەوە دروستیان بکا چاکتر ئەندامەکانیان پەیدا ئەکاتەوە.

﴿ لِيُبَيْنَ لَهُمْ الَّذِي يَخْتَلِفُونَ فِيْهِ ﴾ لەبەرئەوەی خوا زیندوو ئەکاتەوە مردووان هەتا ڕونی بکاتەوە بۆیان شتێکی ئەوتۆ ناکۆکیان تێدا پەیدا ئەکرد لەنێوان خۆیانا لەڕاستی ئەوشتەدا هەندێکیان ئەیان وت ڕاستەو هەندێ تریان بڕوایان پێیان نەبوو، وەك یەکێتی خواو پێغەمەرایەتی و زیندوو بونەوەو کارە ڕەواکان وقەدەغەکراوەکان .

﴿ وَلِيَعْلَمَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّهُمْ كَانُوا كَاذِبِينَ ﴾ وەبۆ ئەوەیش کەسانێکی ئـەوتۆ باوەڕیـان نەهێنابو درۆیا کردوە کەووتویانە: دوای مردن زیندوو بونەوە نیە و بەچاکی بزانن ینـدوو بونەوە هەیە بەڕاستی لەزیندو بونەوەدا زۆر شتی بەنرخ هەیە لەجویێ بونەوەی پاکو پیس، چاکەکـەران لـەخراپـە کـەران، پاداشـت دانـەوەی هــەموو کەســێ بەشــتێ شــایانی کردەوەکەیەتی.

بۆ ڕوون کردنەوەی توانای خوا بۆ گەڕانەوەی گیان بۆلای لـەشی مرۆڤ پاش ڕزینـی پارچەکانی و کۆکردنەوەیان. زیندوویان ئەکاتەوە بەوێنەی جـاری پێشـوو کـە دروسـتی کردوون لـەنەبونەوە بۆلای بوون. خوا ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّمَا قَوْلُنَا لِشَيْءٍ إِذَا أَرَدْنَاهُ أَنْ نَقُولَ لَهُ كُنْ فَيَكُونُ ﴾ بەڕاستی فەرمودەی ئێمە هەرشتێ کاتێ بمانەوێ ئەوشتە بکەین کەئەڵێین: تـۆ بـە، ئەوشـتە کوتوپـڕ پـەیدا ئـەبێ بـەجۆرێ بمانەوێ. خوای مەزن جاری یەکەم بەڕستەی ( کُن ) هەموو بونەوەرانی هێناوەتە بوونـەوە بۆ جاری دووهەمیش بۆ زیندووبونەوەیان هەر بەووڕستە زیندویان ئەکاتـەوە بەئاسـانتر لـە جاری یەکەم. لـەپاش ئەوەی خوای مەزن باســی کـردەوەی پڕوپوچـی بێباوەڕانی کـرد لەهاوبەشدانان بۆ خوا ولـە بەدرۆخستنەوەی پێغەمەران وباوەڕنەبونیان بـەزیندو بونـەوە، باسی دروست کردنی بونەوەرانی کرد کەبەویستی خۆیەتی، لـەمەو دوایـش باسـی کـۆچ کەران و ئاازردانیان و دەرکردنیان لـەنیشتمانی خۆیان ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَالَّذِينَ هَاجَرُوا فِي اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مَا ظُلِمُوا ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ کۆچیـان کـرد لـەنیشتمانی خۆیان لـەبەرئایینی خوا، هەندێکیان بۆ حەبەشەو جارێ تـر بـۆ مەدینـە دوای ئەوەی ستەمیان لێکرابوو لـەڕێگەی بـاوەڕدا و ئـازاری زۆریـان چەشـتبو، قورەیشـیەکان هەموو توانای خۆیان خستبوە کار بۆ ئەوەی لـەئایینی خۆیانیان وەربگێڕن خوای مەزن بـۆ پاداشت دانەوەیان ئەفەرموێ:

﴿ لَنُبَوِّئَنَّهُمْ فِي الدُّنْيَا حَسَنَةً ﴾ بەڕاستی ئێمە ئامادە ئەکەین بۆیان ودایان ئـەنێین لـەم جیهانەدا بەدانانێکی چاك و لـەجێگەیەکی خۆشدا کەمەدینەیە و لە مەکـە خۆشـترە، لـەو

جێگە تازەیەدا ئەحەسێنەوە بە بێ ترس، ئـەتوانن بـیرو بـڕوای خۆیـان دەربـڕن و بـڵاوی بکەنەوە، خواردەمەنی فراوانیان دەست ئەکەوێ و خوا سەریان ئەخا .

﴿ وَلَدارُ الآخِرَةِ أَكْبَرُ لَوْ كانُوا يَعْلَمُونَ ﴾ وەبەڕاستی پاداشتی ڕۆژی دوایی گـەورەترە لەوەی لەجیهاندا بەوان ئەدرێ، زۆر شتیان بۆ ئامادەکراوە ئەگـەر بـت پەرستان بزانـن بەوشتەی بۆ باوەڕداران ئامادەکراوە. بەڵام باوەڕداران بەتایبەتی هاوڕێکانی پێغەمەر ئەزانن پاداشتی ڕۆژی دواییی گەورەترە .

﴿ الَّذِيْنَ صَبَرُوا وَ عَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴾ ئەوکۆچ کەرانە کەسانێکی ئەوتۆن ئارامیـان گرتوە لـەسەر ئازار و دەربەدەری و خۆبەخت کردن و هەژاری و، هەمو کارێکی خۆیـان ڕەوانەی لای خوا ئەکەن وڕازین بەوشتەی توشیان ئەبێ لەڕێگەی ئایندا .

قورەیشیەکان ئەیان ووت: خوا بەرزترە لەوەی مرۆڤ بکا بەفروستادەی خۆی ،بەڵکو فریشتەکان ئەنێرێ و ئەوان بانگی ئادەمیزاد ئەکەن بۆلای ئـایینی خـوا، خـوای وەڵامیـان ئەداتەوە کەدەستوری خوا واهاتوە لەهەمو نەتەوەیەکدا فروستادەیە لـەخۆیان ئـەنێرێ بـۆ لایان هەتا باشتر لەیەکتری بگەن، ئەفەرموێ:

وَمَآ أَرۡسَلۡنَا مِن قَبۡلِكَ إِلَّا رِجَالࣰا نُّوحِيٓ إِلَيۡهِمۡۚ فَسۡـَٔلُوٓاْ أَهۡلَ ٱلذِّكۡرِ إِن كُنتُمۡ لَا تَعۡلَمُونَ ﴿٤٣﴾ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ وَٱلزُّبُرِۗ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلذِّكۡرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيۡهِمۡ وَلَعَلَّهُمۡ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾ أَفَأَمِنَ ٱلَّذِينَ مَكَرُواْ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَخۡسِفَ ٱللَّهُ بِهِمُ ٱلۡأَرۡضَ أَوۡ يَأۡتِيَهُمُ ٱلۡعَذَابُ مِنۡ حَيۡثُ لَا يَشۡعُرُونَ ﴿٤٥﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ فِي تَقَلُّبِهِمۡ فَمَا هُم بِمُعۡجِزِينَ ﴿٤٦﴾ أَوۡ يَأۡخُذَهُمۡ عَلَىٰ تَخَوُّفࣲ فَإِنَّ

رَبَّكُمْ لَرَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿٤٧﴾ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَىٰ مَا خَلَقَ ٱللَّهُ مِن شَىْءٍ يَتَفَيَّؤُا۟ ظِلَـٰلُهُۥ عَنِ ٱلْيَمِينِ وَٱلشَّمَآئِلِ سُجَّدًا لِّلَّهِ وَهُمْ دَٰخِرُونَ ﴿٤٨﴾ وَلِلَّهِ يَسْجُدُ مَا فِى ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ مِن دَآبَّةٍ وَٱلْمَلَـٰٓئِكَةُ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ﴿٤٩﴾ يَخَافُونَ رَبَّهُم مِّن فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ ۩ ﴿٥٠﴾

﴿ وَما أَرْسَلْنا مِنْ قَبْلِكَ إلا رجالاً نُوحِي إلَيهِمْ ﴾ وەئێمە لەپێش تۆوە ڕەوانەمان نەكردوە بۆلای ئادەمیزاد هیچ فروستادەیەك مەگەر چەندین پیاوێ لەخۆیان ئێمە سروشمان نادروە بۆلایان فەرمانی ئێمەیان پێ ڕاگەیەنێ، وەك نوح و ئیبراهیم وئیسماعیل و جگەی ئەوان، چونكە مەبەست لەڕەوانەكردنی پێغەمەران پێك نایە بەجگەی ڕەگەزی خۆیان .

﴿فَسأَلُوا أهْلَ الْذِكْرِ إنَ كَنْتُمْ لاَتَعْلَمُونَ ﴾ دوایی ئێوەی بت پەرست پرسیار بكەن لەخاوەن نامەكان و زاناكانیان ئەگەر ئێوە نازانن پێغەمەران لەچ ڕەگەزێ ڕەوانە ئەكرێن بۆ لای ئادەمیزاد هەتا ئەو شتەی ڕاستە ئێوە بزانن پێغەمەران لەچ ڕەگەزێ ڕەوانە ئەكرێن بۆ لای ئادەمیزاد هەتا ئەو شتەی ڕاستە ئێوە بزانن پێغەمەران پێویستە لەڕەگەزی خۆیا نین.

﴿ بِالْبَيْناتِ وَالزُّبُرِ ﴾ ئێمە سروشمان ناردووە بۆلای پێغەمەران بەهۆی چەندین كاری پەك خەر وبەڵگەی بەهێز و بەچەندین نامەیەكەوە بیرو باوەڕو دەستوریان تێدا ڕون كراوەتەوە .

﴿ وَأَنْزَلْنا إِلَيْكَ الّذِكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلْنّاسِ مانُزِّلَ إِلَيْهِمْ ﴾ وەئێمە تۆمان هەڵبژاردوە بۆ پێغەمەرایەتی و قورئانمان نادرووەتە خوارەوە بۆ لای تۆ لەبەرئەوەی ڕونی بکەیتەوە بۆ ئادەمیزاد شتیّ نێرراوەتە خوارەوەبۆ لایان و ڕاغویان بکەی بۆ لای ڕێگەی ڕاست.

﴿ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴾ و بۆ ئەوەیش ئادەمیزاد بیربکەنەوە لەناوەڕۆکی قورئان هەتا بۆیان دەربکەویّ قورئان دانراوی خوایەو بەسەرهاتی گەلانی ڕابووردو یان بۆ ڕوون بێتەوە هەتا باوەڕ بەفەرمودەکانی خوا بهێنن. لەپاشا خوای مەزن هەڕەشە لەبت پەرستان ئەکاو ئەفەرمویّ:

﴿ أَفَأَمِنَ الّذِيْنَ كَفَرُوا السَّيِّئاتِ أَنْ يَخْسَفَ اللهُ بِهِمُ الأَرْضَ ﴾ ئایا ئاسودەن و ناترسن ئەوکەسانەی چەندین پیلان و فێڵ و خراپەیان سازاندوە لە دژی پێغەمەر کەخوا زەوی بەوانەوە بباتە خوارەوە بەوێنەی قارون کەخۆی و کۆشکەکەیمان بردە خوار بەزەویدا .

﴿ أَوَ يَأْتِيَهُمْ الْعَذابُ مِنْ حَيْثُ لايَشْعُرُونَ ﴾ یابێت بۆ لای ئەوان سزای خواو بنەبڕیان بکا لە جێگەیەکەوە هەستی پیّ نەکەن. بەوێنەی گەلی نوح کەبەسزای خوا بنەبڕبوون .

﴿ أَوْ يَأْخُذَهُمْ فِي تَقَلُّبِهِمْ فَما هُمْ بِمُعْجِزِيْنَ ﴾ یاخوا ئەوان لەناو ببا لەکاتی هاتوچۆ و گەڕانیان لەزەویدا بۆ پەیدا کردنی هۆی ژیانیان، دوایی ئەوان نەتوانن ڕێگە لەخوا بگرن ونەتوانن ڕابکەن .

﴿ أَوْ يَأْخُذَهُمْ عَلى تَخَوُّفٍ ﴾ یاخوا لەناویان ببا لەسەر ترس و بیمی ئەوەی لەناو بچن و سامانیان کەم بێتەوەو بەیەك جار لەناو نەچن. بەڵکو خوا گیرۆدەیان ئەکا بەکەمبونەوەی خۆیان وسامانیان یەك لە دوای یەك هەتا بنەبڕ ئەبن .

﴿ فَأَنَّ رَبَّكُمْ لَرَؤُوفٌ رَحِيْمٌ ﴾ دوایی بەڕاستی پەروەردگاری ئێوە خاوەنی بەزەیی ونەرمیە بۆ بەندەکانی خۆی و تۆڵە لەئێوە ناسێنیّ هەرچەندە شایستەی سزابن، میهرەبانەو بەخشندەیە و پەلەناکا بۆ سزادانی ئێوە، بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە لەکرداری خۆتان و پەشیمان ببنەوە بۆ لای پەروەردگارتان .

﴿ اَوَ لَمْ يَرَوْا إِلى ماخَلَقَ اللهُ مِنْ شَيءٍ يَتَفَيَأ ظِلالَهٌ عَنْ الْيَمِيْنَ والشَـمائِلَ سُـجْداً للهِ وَهُـمْ داخِرُونَ ﴾ ئایا ئەو کەسانە پیلانیان لەدژی پێغەمەر ئەسازاند بۆ تەماشـای شـتێکی ئـەوتۆ ناکەن لـەهەمو شتیّ سـێبەرەکانیان ئەگەڕێنـەوە جـاریّ بـۆلای ڕاسـت و جـاریّ بـۆ لای چەپەکانیان، کوڕنوش ئەبەن بۆ خواو سەریان بۆ خـوا شـۆڕ ئەکـەن و ئـەوان بچـووك و لاوازی بەردەرگای خوان .

ئەو ئایەتە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا دوای هەڵهاتنی خۆر سێبەری هەمو شتیّ بۆ لای ڕاسـت ئەڕوا هەتا کاتی نیوەڕۆ، دوایی ئەو سێبەرە ئەگەڕێنـەوە بـۆ لای چـەپ هـەتا مـەغریب، ئەوەی لـەم گەردونەدایە هەمویان سوژدە ئەبەن بۆ خـواو سـەر شۆڕشـی فـەرمانی خـوان جگە لـەبت پەرستان وبیّ باوەڕان وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَلِلّهِ يَسْجُدُ مافِي السّماواتِ وَمافِي الأرْضِ مِنْ دابّةٍ وَالْمَلائِكَةُ وَهُمْ لايَسْـتَكْبِرُونَ ﴾ وەسوژدی ئەبەن بۆ خوا هەموشتیّ لەئاسمانەکان و لـــەزەویدان لەوشـتانە ئـەڕۆن بەسـەر زەویدا و هەمو ئەوشتانە سوژدە بۆ خوا ئەبەن و ئەوان خۆیـان بەگـەورەدانانێن بەرانبـەر بەگەورەیی خوا .

هـەمو بونـەوەرانی لای ســەرەوە لـەفریشــتەکان و لـەئەسـتێرەکان وئەوانــەی لای خوارەوەن لـەئادەمیزاد و جنۆکە ودرەخت و ڕوبارەکان و شتی تریش، هەمویان بەڵگــەی ڕونن لـەسـەر تواناو زانستی خوا ئەوبەڵگانە خۆیان بــەگوێرەی سروشـت سـوژدەئەبەن و ڕکوع ئەبەن بۆ دروستکەری خۆیان .

﴿ يَخافُونَ رَبُّهُمْ مِنْ فَوْقِهِمْ وَيَفْعَلُونَ مايُؤْمَرُونَ ﴾ ئەوشتانەی خۆیان بەگــەورە دانـانێن لـەپەروەرداگاری خۆیان ئەترسن لـەسـزایە بێتـە خـوار لـەسـەریان و لـەدەسـەڵاتی خـوای پەوەردگار ئەترسن و شـتیّ فـەرمانیان پـیّ بـدریّ ئەیکـەن. ئـەو ڕِسـتەیە وائەگەیـەنیّ فریشتەکان داوای فەرمانبەرداریان لیّ ئەکریّ وئەڕۆن و دێـن ولـەنیو ئومێدو ترسـان، هەروەها ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا هەرکەسیّ بـاوەڕی بـەخوا هێنـا پێویسـتە لـەخوا بترسـی و

فەرمانەکانی خوا بەجیّ بهیّنیّ، هەرکەسیّ بیّ فـەرمانی خـوا بکـاو بلّـیّ: مـن بـاوەڕدارم ولـەخوائەترسم درۆ ئەکا کە فەرمانی خوا بەجیّ نەیەریّ.

کاتیّ ڕونی کردەوە سەرشۆڕی هەمو بونەوەران بۆ خواو کورنوش بردنیـان بـۆ خـوا، ڕونیشی ئەکاتەوە هاوبەشدانان بۆ خوا قەدەغەیە وجگەی خوا نـابیّ پەرستنی بـۆ بکـریّ ئەفەرمویّ:

وَقَالَ ٱللَّهُ لَا تَتَّخِذُوٓاْ إِلَٰهَيۡنِ ٱثۡنَيۡنِۖ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٞ وَٰحِدٞ فَإِيَّٰيَ فَٱرۡهَبُونِ ﴿٥١﴾ وَلَهُۥ مَا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ وَلَهُ ٱلدِّينُ وَاصِبًاۚ أَفَغَيۡرَ ٱللَّهِ تَتَّقُونَ ﴿٥٢﴾ وَمَا بِكُم مِّن نِّعۡمَةٖ فَمِنَ ٱللَّهِۖ ثُمَّ إِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فَإِلَيۡهِ تَجۡـَٔرُونَ ﴿٥٣﴾ ثُمَّ إِذَا كَشَفَ ٱلضُّرَّ عَنكُمۡ إِذَا فَرِيقٞ مِّنكُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ ﴿٥٤﴾ لِيَكۡفُرُواْ بِمَآ ءَاتَيۡنَٰهُمۡۚ فَتَمَتَّعُواْ فَسَوۡفَ تَعۡلَمُونَ ﴿٥٥﴾

﴿ وَقَالَ اللّهُ لاتَتَّخِذُوا إلَهَيْنِ إثْنَيْنِ ﴾ وەخـوا فـەرموی ئیّـوە دوو خـوا وەرمـەگرن بـۆ پەرستن، زۆر ڕوونو ئاشکرایە بونەوەران پیویستیان بەدروست کەریّ هەیە بۆ خۆیان، ئەو دروست کەرەیش ئەبیّ تاك و تەنها بیّ، چونکە هیچ هۆیە نیە بۆبونی خوایەتر، ئـەقلّ لای قەدەغەیە بوونی دووخواو ئەفەرمویّ:

﴿ إنّما هُوَ إلَهٌ واحِدٌ فَأَيايَ فَارْهَبُونِ ﴾ بەڕاستی خوا خوایەکی تەنهایەو پەرستن هەر بۆ ئەو ئەکریّ، دوایی ئیّوە ئەبیّ هەر لـەمن بترسن. بەڵـگە لـەسەر یـەکیّتی خـوازۆرن خـوای مەزن ئاماژە بۆهەندیّکیان ئەکا:

١- ﴿ وَلَهُ مافِي السّماواتِ وَالأَرْضِ ﴾ وەهەر بۆ خوایە شتێ لەئاسمانەکان ولەزەویدان وهەمویان خوا روستی کردوون و لەژێر توانای ئەودان بێ ئەوەی کەسێ هەبێ دژی بێ، چونکە هەرخوایە دروست کەری ئاسمانەکان وزەوی و ئەوشتەی لەنێو ئەواندان .

٢- ﴿ وَلَهُ الّدِيْنُ واصباً ﴾ وە هەر بۆ خوایە پەرستن و فەرمانبەرداری بەبەردەوامی وهەرکاتێ خوا دروست کەری هەموو بونەوەرانبێ پێویستە بە بەردەوامی لەپەرستنی خوادا بن نەك جگەی خوا .

﴿ أفَغَيْرَ اللّٰهِ تَتَّقُونَ ﴾ دوای ئەو هەموە بەڵگانە ئێوە لەجگەی خوا ئەترسن و پەرستن بۆ جگەی خوا ئەکەن؟ هیچ کەسێ خاوەنی سوودو زیان نیە لەجگەیخوا. کەواتە ئەبێ هەر لەو بترسن .

٣- ﴿ وَمابِكُمْ مِنْ نِعْمةٍ فَمِنَ اللّٰهِ ﴾ وەشتێکی ئەوتۆ پەیوەندی بەئێوەوە هەبێت لەهەمو چاکەیە هەر لەلایەن خواوە پێتان دراوە، چونکە هەرخوایە دروست کەری هەمو شتێکە ڕاستەوخۆ یابەهۆی شتێ ترەوە .

﴿ ثُمَّ إذا مَسَّكُمْ الْضُرُّ فَأَلَيْهِ تَجأَرُونَ ﴾ لەپاشا هەرکاتێ تووشی ئێوە بوبێ زیان وئازار و گیرتان خواردبێ دوایی هەر بۆخوا ئێوە پەنائەبەن و هاوار لەوئەکەن وبەکزۆڵیەوە دەنگی خۆتانی بۆ بەرز ئەکەنەوە لەکاتی نەخۆشیو گرانی و ترس و خەفەت، چ کەسێ تر هەیە ئێوە پەنای بۆ ببەن وایش ئەبێ ئاگاتان نیەو هاوار بۆلای ئەو ئەکەن و لەو ئەپاڕێنەوە .

﴿ ثُمَّ إذا كَشَفَ الضُّر عَنْكُمْ إذا فَرِيْقٌ مِنْكُمْ بِرَبِّهِمْ يُشْرِكُونَ ﴾ لەپاشا هەرکاتێ خوا لابیا ئەو ئازارو سەختیە لەئێوەی بێ باوەڕ کوتوپڕ تاقمێ لەئێوە لەخۆیان ئەگۆڕێن و هاوبەش دائەنێن بۆ پەروەردگاری و سوپاسی خوا ناکەن.

﴿ لِيَكْفِرُوا بِما آتَيْناهُمْ ﴾ دوارۆژی ئەوان وای لێدێت سوپاسی شتێ ناکەن ئێمە بەوانمان بەخشیوە کە لابردنی ئێش وئازارەکەیانە کەچی ئەبوایە سوپاسی ئێمەیان بکردایە.

﴿ فَتَمَتَّعُوا فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ ﴾ دوایی ڕابوێـرن وبـەرخورداربن و بخۆن وبخۆنـەوە لـەم مـاوە کورتەدا، دوایی لەمەودوا ئێوە ئەزانن بەپاشەڕۆژی تاریکی خۆتان ئە وکاتە پەشـیمان ئەبنـەوەو سودی بۆ ئێوە نابێ .

لەپاشا خوای مەزن باسی کردەوەیەکی تری بێباوەڕان ئەکا کە بەڵگەیە لەسەرنەزانین و بێ باوەڕی ئەوان، خوا ئەفەرموێ:

وَيَجْعَلُونَ لِمَا لَا يَعْلَمُونَ نَصِيبًا مِّمَّا رَزَقْنَاهُمْ ۗ تَاللَّهِ لَتُسْأَلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴿٥٦﴾ وَيَجْعَلُونَ لِلَّهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ ۙ وَلَهُم مَّا يَشْتَهُونَ ﴿٥٧﴾ وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَىٰ مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ ۚ أَيُمْسِكُهُ عَلَىٰ هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ ۗ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِالْآخِرَةِ مَثَلُ السَّوْءِ ۖ وَلِلَّهِ الْمَثَلُ الْأَعْلَىٰ ۚ وَهُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ ﴿٦٠﴾

﴿ وَيَجْعَلُونَ لِما لايَعْلَمُونَ نَصِيباً مِمّا رَزَقْناهُمْ ﴾ وەبت پەرستان دائەنێن بۆ ئەو خوایانـە خۆیـان کەهیچ شـتێك نـازانن، چونکـە ووشـك و بێ گیـانن بەشـێ لـەوشـتەی ئێمـە بەخشـیومانە بـەوان لەدانەوێڵەو چوارپێکان بەگوێرەی بیروبۆچونی ئەوان ئەپارێنەوە خوا سزایان نەدا، بەشەکەی تریان دائەنێن بۆ خوا .

﴿ تاللهِ لَتُسأَلُنَ عَمّا كُنتُمْ تَفْتَرُونَ ﴾ سوێندم بەخوا ئێـوە پرسـیارتان لێ ئـەکرێ لـەوشـتەی ئێـوە لـەجیهاندا بەدرۆ هەڵتان بەستوە کە ئێوە ئەڵێن ئەوبتانە خوان و بۆ ئەوان هەیە شتێ لەدارایی خۆتان

﴿ وَيَجْعَلُونَ لِلهِ الْبَنَاتِ سُبْحَانَهُ وَلَهُمْ مَايَشْتَهُونَ ﴾ وەبـت پەرستان دائـەنێن بـۆ خـوا چەندین کچێ، هـەندێ لـەهۆزەکانی قورەیـش ئـەیان ووت:فریشـتەکان کچـی خـوان، ئەوەندەنەزان و بێ ئەقڵبوون ئەوشتانەی خۆیان خراپ بون ئەیان کرد بەهی خـوا لـەکچ دانان بۆی، خوا پاك و خاوێنە لەوەی ئەوان ئەیانکەن بەهی خوا وئەیان کەن بەکچی ئـەو بۆ خۆیان دائەنێن شتێ خۆیان ئارەزوو ئەکەن و پێیان خۆشە وەك کوڕ بی .

﴿ وَإِذا بُشِرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنْثى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَداً وَهُوَ كَظِيْمٌ ﴾ وە هەرکاتێ موژدە بدرایـە بەیەکێ لـەو بێ باوەڕانە بەبونی منالێکی مێینە ڕوی ڕەش هەڵئەگەڕاو، ئـەو کەسـە دڵـی پڕئەبوو لە خەفەتی ئەوەی ژنەکەی کچی بووە. بەداخەوە لـەگەڵ ئەو فەرمودەی خوایـەدا زۆربەی موسڵمانان لایان گران و ناخۆشە کچیان ببێ.

﴿ يَتَوارى مِنَ الْقَوْمِ مِنْ سُوءِ مابُشِّرَ بِهِ ﴾ ئەوکەسە کچـی ئـەبوو خـۆی پەنـهان ئـەدا لـەخزم و دۆستەکانی لـەبەر خراپی شتێ موژدەی پێ درابو کە کچی بوە، بەسـەرگەردانی هاتوچۆی ئەکرد چ شتێ بکا ؟.

﴿ أَيُمْسِكُهُ عَلى هَوْنٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرابِ ﴾ ئایا ئەو شتەی پەیدابووە لـەکچ ڕای گرێ و بیهێڵێتەوە لـەسەر بێ ئابڕویی و ڕسوایی یا دای پۆشێ لـەنێو خاکاو زیندە بەچاڵی بکا؟

﴿ أَلا ساءَ مايَحْمِلُونَ ﴾ ئێوە ئاگادارین و بزانن خراپ شتێکە بێ باوەڕان فەرمانی پـێ ئەدەن کە کچیان لا بێ نرخەو ئەڵێن: خـوا کچـی هەیـە کـەچی خۆیـان کچـی خۆیـان زیندەبەچاڵ ئەکەن وگڵیان ئەدەن بەسەردا. ئەو بێ باوەڕانە لـەکوشتنی کچەکانیانا چـەند جۆرێ بوون: هەندێکیان کچەکانیان لـەسەر کێوێکی بەرز ئەخستە خوارەوە، هـەندێکیان زیندە بەچاڵیان ئەکردن وخۆڵیان ئەدا بەسەریاندا، هەندێ تریان فڕەیان ئەدایـە نێـو ئـاوو ئەیان خنکاندن .

بۆ زانین: لـەم سەردەمەدا کەبۆشایی ڕام ئەکـەن و ئەچنـە نێـو مـانگ وئەسـتێرەکان ئەڵێن: ئەوکەسانەی پێشوو کۆنەپەرست بوون و دور بـوون لـەشارستانیەت کـەچی بـێ دەنگن لـەو کارە خراپانەی ڕژێمی عێراق ئەیکا بەگـەلی کـوردی موسـڵمان، بـۆ نموونـە

لەشاری هەڵەبجەی شەهید زۆرتر لەشەش هەزار کەسی بەدەرمانی کیمیاوی شەهید کـرد و ( ٧٠٠)کەسی لەگەڵ قادر تەگەرانیدا لەنێو ئاودا خنکاندنیـان، سـەدو هەشتا هـەزار کەس لەدانشتوانی کورد بەناوی ئەنفالـەوە زیندە بەچاڵ کرد. زۆر کەسیشی لەکوردانیان کوشت بەسێ دارەو بە خستنە خوارەوەیان لـە سەر فڕۆکەداو بـەتاقی کردنـەوەی گـازی کیمیاوی و زۆر شتی تریش .

﴿ لِلَّذِيْنَ لايُؤمِنُونَ بِالآخِرَةِ مَثَلُ السُّوءِ ﴾ بۆ کەسانێکی ئـەوتۆ هەیـە بـاوەڕ بـە ڕۆژی دوایی نایەرن ڕەوشتی خراپ لە ستەمکردن و تالاّن کردن و بێ بـاوەڕی و پێویستی بـە منالّ بۆ خواو زیندە بەچاڵ کردنی کچان و نەزانین و چەندین شتی خراپتر .

﴿ وَللهِ لَمَثَلُ الأَعْلى وَهُوَ الْعَزِيْزُالحَكِيْمُ ﴾ شـێوەی کـرداری چـاك لەگـەورەیی ودادپەروەری ویەکێتی وزانست وتواناو پاکێتی لە منالّ وشتی تری بێ ئـەندازە و نایەنـە ژمارە . وە خوا زۆر گەورە و بەدەسەلاّتە، هەمو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ.

وَلَوۡ يُؤَاخِذُ ٱللَّهُ ٱلنَّاسَ بِظُلۡمِهِم مَّا تَرَكَ عَلَيۡهَا مِن دَآبَّةٖ وَلَٰكِن يُؤَخِّرُهُمۡ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗىۖ فَإِذَا جَآءَ أَجَلُهُمۡ لَا يَسۡتَـٔۡخِرُونَ سَاعَةٗ وَلَا يَسۡتَقۡدِمُونَ ﴿٦١﴾ وَيَجۡعَلُونَ لِلَّهِ مَا يَكۡرَهُونَ وَتَصِفُ أَلۡسِنَتُهُمُ ٱلۡكَذِبَ أَنَّ لَهُمُ ٱلۡحُسۡنَىٰۖ لَا جَرَمَ أَنَّ لَهُمُ ٱلنَّارَ وَأَنَّهُم مُّفۡرَطُونَ ﴿٦٢﴾ تَٱللَّهِ لَقَدۡ أَرۡسَلۡنَآ إِلَىٰٓ أُمَمٖ مِّن قَبۡلِكَ فَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ ٱلۡيَوۡمَ وَلَهُمۡ عَذَابٌ أَلِيمٞ ﴿٦٣﴾ وَمَآ أَنزَلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ

ٱلَّذِى ٱخۡتَلَفُواْ فِيهِ وَهُدًى وَرَحۡمَةً لِّقَوۡمٍ يُؤۡمِنُونَ ﴿٦٤﴾

﴿ وَلَوْ يُواخِذُ اللهُ النّاسَ بِظُلْمِهِمْ ماتَرَكَ عَلَيْها مِنْ دابَةٍ ﴾ وە ئەگەر خوا سزای ئادەمیزاد بدا بەهۆی ستەمکردنیانەوەو بەهۆی بێ فەرمانی خواوە نـەی ئەهێشـت بەسـەر زەویـەوە هیچ شتێ بڕوا بەسەر زەوییـەوە ،بـە گورجـی سزای بـۆ ئەناردنـە خـوارەوە و بنـەبڕی ئەکردن. ئادەمیزاد ستەمیان زۆرە: سـتەمکردنیان لـەخوا بـەوەی بـاوەڕی پـێ نـاهێنن و هاوبەش و منالّی بۆ دائەنێن. ستەمیان لەئادەمیزاد بەوەی ئەیان چەوسێننەوەو ئەیان کـەن بەکۆیلە و سەرچاوەی ژیانیان داگیر ئەکەن، ستەمیان لەخۆیان بـەوەی خۆیـان بەگـەورە ئەگرن .

﴿ وَلَكِنْ يُؤَخِرُهُمْ إِلى أَجَلٍ مُسَمىً فَإِذا جاءَ أَجَلَهُمْ لايَسْتَأخِرُونَ ساعَةً وَ لا يَسْتَقْدِمُونَ﴾ وە بەلاّم خوا ئەوان دووائەخاو مۆڵـەتیان ئـەدا بـۆ لای کـاتێکی دیـاری کـراو و نـاوبراو لەلایەن خواوە بەڵکو پەشیمان بینەوە لەو ستەم کردنەی خۆیان، دوایی کاتێ چو بۆ لای ئەوان ئەو کاتەی بۆ ئەوان دیاری کراوە کە خوا ویستویەتی لەناویان ببا ئـەوان کـەمترین کات دواناکەون و پێشی ناکەون بەچرکەیە لەوماوەیەدا .

﴿ وَيَجْعَلُونَ للهِ مايَكْرَهُونَ ﴾ وەبت پەرستان دائەنێن بۆ خـوا شـتێ ئـەوان بەلایانـەوە ناخۆشە و بۆ خۆیانی دانانێن لەکچ و بێ‌ترخترین سامان و شتی چاك بۆ خۆیان دائەنێن .

﴿ وَتَصِفُ أَلْسِنَتُهُمْ الْكَذِبَ بِأَنَّ لَهُمْ الْحُسْـنى ﴾ وە درۆو بوختـان ئـەڵێن بـە زمـانی خۆیان کە بۆ ئەوان هەیە لای خوا چاکـترین شـت کـە بەهەشـت و کـوڕ وسـامانی زۆر لەگەڵ ئەوەیشدا باوەڕ بەخوا نایەرن ئەڵێن: خوا کچی هەیەو ئێمە کوڕمان هەیە. ئـەڵێن: ئەگەر موحەمەد ڕاست بکات لە زیندوو بونەوەی مردووانـدا ئێمـە ئەگەڕێینـەوە بـۆ لای خوا بەپلەی یەرزەوە .

﴿ لا جَرَمَ بِأَنَّ لَهُمْ الْنّارُ وَ أَنَهُمْ مُفْرَطُونَ ﴾ بێگومان بەڕاستی بـۆ بـت پەرسـتان هەیـە ئاگری دۆزەخ، ئەو گومانەی ئەوان پوچ وبوختانەو، بەڕاستی ئەوان پێش ئەخرێن بـۆ لای ئاگری دۆزەخ .

لەپاش باسکردنی خراپەو پاداشتی بێباوەڕان، خوای مەزن دڵخۆشی پێغەمەر ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ تَاللَّهِ لَقَدْ أَرْسَلْنَا إِلَى أُمَمٍ مِنْ قَبْلِكَ ﴾ سوێند بەخوا: بەڕاستی ئێمە ڕەوانەمان کردوە بۆ لای ئەو نەتەوانەی لەپێش تۆوە بوون پێغەمەران بۆیان، زۆر بەبێ شەرمانە وەڵامی پێغەمەرەکانیان ئەدایەوەو ڕویان لێ وەرئەگێڕان وئازاریان ئەدان، بێباوەڕان هەر لەکۆنەوە ڕەوشتیان وابوە، وێنەی بت پەرستانی ئێستا کە ڕو لەتۆ وەرئەگێڕن و ئازاری تۆ ئەدەن .

﴿ فَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ أَعْمَالَهُمْ فَهُوَ وَلِيُّهُمُ الْيَوْمَ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴾ دوایی شەیتان بۆ ئەوانی ئەڕازاندەوە کردەوە خراپەکانیان و لایانی جوان ئەکرد، دوایی شەیتان لەم ڕۆژەی جیهاندا یاریدەرو دۆستیانە هەربەو جۆرەیش شەیتان یاریدەدەری گەلانی پێشو بووەو، بۆ بێ باوەڕان هەیە سزایەکی خاوەن ئازار لەتۆڵەی ئەوەدا شەیتان یاریدەدەریان بووە لەدوارۆژدا .

﴿ وَمَا أَنْزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ إِلَّا لِتُبَيِّنَ لَهُمُ الَّذِي اخْتَلَفُوا فِيهِ ﴾ وە ئێمە قورئانمان ڕەوانەکردوەتە سەر تۆ مەگەر بۆ ئەوەی تۆڕونی بکەیتەوە بۆ ئادەمیزاد شتێکی ئەوتۆ ئەوان بیریان جیاوازی یەکترە لەوشتەدا وەك یەکێتی خواو توانای خواو زیندو بوونەوەی ڕۆژی دوایی و وەرگرتنی پاداشت.

﴿ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ وەئەو نامەیەمان نەناردوەتە خوارەوە مەگەر بۆ ڕوون کردنەوەو بۆ ڕاغوییو شارەزایی و بۆ میهرەبانی و بەخشش بۆ تاقمێ باوەڕ بەخوا وبەپێغەمەر ئەهێنن .

دوای ئەوی خوای مەزن باسی چاکەکانی خۆی کرد کەبەخشیویە بەئادەمیزاد ، ئەفەرموی:

وَٱللَّهُ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَحْيَا بِهِ ٱلْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَآ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ

لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴿٦٥﴾ وَإِنَّ لَكُمْ فِي الْأَنْعَامِ لَعِبْرَةً نُّسْقِيكُم مِّمَّا فِي بُطُونِهِ مِن بَيْنِ فَرْثٍ وَدَمٍ لَّبَنًا خَالِصًا سَائِغًا لِّلشَّارِبِينَ ﴿٦٦﴾ وَمِن ثَمَرَاتِ النَّخِيلِ وَالْأَعْنَابِ تَتَّخِذُونَ مِنْهُ سَكَرًا وَرِزْقًا حَسَنًا إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ ﴿٦٧﴾ وَأَوْحَىٰ رَبُّكَ إِلَى النَّحْلِ أَنِ اتَّخِذِي مِنَ الْجِبَالِ بُيُوتًا وَمِنَ الشَّجَرِ وَمِمَّا يَعْرِشُونَ ﴿٦٨﴾ ثُمَّ كُلِي مِن كُلِّ الثَّمَرَاتِ فَاسْلُكِي سُبُلَ رَبِّكِ ذُلُلًا يَخْرُجُ مِن بُطُونِهَا شَرَابٌ مُّخْتَلِفٌ أَلْوَانُهُ فِيهِ شِفَاءٌ لِّلنَّاسِ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٦٩﴾

﴿ وَاللهُ أَنْزَلَ مِنَ الْمَاءِ ماءً فَأَحْيا بِهِ الأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِها ﴾ وەخوا لەهەورەوە ناردویەتیە خوارەوە ئاوێ، دوایی خوا زیندوی کردوەتەوەو بوژانویەتیەوە بەوئاوە زەوی لەدوای مردنی و ووشکبونی، هەتا لەو زەویەدا گژوگیا ودرەخت و دانەوێڵەی پێ سەوز ببێ و خۆتان و ئاژاڵتان بیخۆنەوەو باخ و بۆستانەکانیان پێ ئاوبدەن، پیت و فەڕی زەوی زۆر ببێ بۆ ژیانی ئادەمیزاد .

﴿ إِنَّ فِي ذلِكَ لَآيَةً لِقَوْمٍ يَسْمَعُونَ ﴾ بەڕاستی هەیە لەو شتانەی باسکران نیشانەو بەڵگەی بەهێز لەسەر تواناى خوا بۆ تاقمێ قورئان ببیسن و لەماناکەی بگەن و بیری لێ بکەنەوە و بەدڵێکی دادپەروەرانە وبێ لایەنی .

﴿ وَ إنَّ لَكُمْ فِي الأَنْعامِ لَعِبْرَةً نُسْقِيْكُمْ مِمَّا فِي بُطُونِهِ مِنْ بَيْنَ فَرْثٍ وَدَمٍ لَبَنَا خالِصاً سائغاً لِلْشاربِيْنَ ﴾ وەبەڕاستی هەیە بۆ سوودی ئێوە لەچوارپێکانا کە بزن و مەڕو گاو هوشـتـرن ئامۆژگاری و تەمیٚ کردنی ئێوە، ئێمە دەرخواردی ئێوەی ئەدەین هـەندیٚ لەوشـتە لـەنێو وورگی هەندیٚ لەو چوارپێیانەدایـە شـیرێکی پـاك و خـاوێن بەباشـی ئەڕواتـە خـوارەوە بەقوڕگی ئەو کەسانەدا ئەیخۆنەوەو ئـەو شـیرە دێتـە دەرەوە لـەنێوان شـیاکەی تـوواوەو خوێندا .

زانایان ئەڵێن: گیانداران گیاکان ئەخۆن، دوای توانەوەی گیاکە ڕیخۆڵ‌کانیان ئەوەی زیانیان هەیە فڕەی ئەدەنە دەرەوە، ڕیخۆڵـەکان ئەوەی سـوودی هـەبیٚ ئـەی مـژن وئـەبیٚ بەخوێن و ئەڕوا بەنێو دەمار و لوەکانا، هەتا هەندیٚ لەو خوێنە ئەچێتە ناو گووانەوە ئەبیٚ بەشیرێکی پاك و پاڵفتەکراو .

﴿ وَمِـنْ ثَمُـراتِ الْنَّخِيْـلِ وَالأَعْنـابِ تَتَّخِـذُونَ مِنْـهُ سَـكَراً وَرِزْقـاً حَسَــنَاً ﴾ وەئێمـە درەخواردی ئێوەی ئەدەین لــە گوشـراوی بەرهـەمی خورمـاو تـریٚ ئێـوە لەوگوشـراوە دروست ئەکەن شتیٚ ئادەمیزاد سەرخۆش ئـەکا لـەمـەیی و جگـەی مـەی. ئـەوەی لـێرە دەرئەکەویٚ لـەووشەی (سَكَراً) هەموو خواردنەوەیەکە کەسەرخۆش کەربیٚ .ئیتر مەی بیٚ یا جگەی مەی. ئەم ئایەتە ئاماژەی بۆ فەرمانی شتیٚ نـەکردوە سـەرخۆش کـەربیٚ ڕەوایـە یانە، بەڵکو خوای مەزنباسی ڕ‌وشتی ئادەمیزاد ئەکا کەلـەبەرهەمی درەختی خورماو تـریٚ خواردەمەنی شیرین و خۆشو بەتام وەك خورما و مێوژو تریٚ و سرکەو دۆشاو و باسوق و شتی تریش. هەندیٚ لـەزانایان ئەڵێن: مەبەست لـەسەکر شـتێکە قەدەغـە بـیٚ و مەبەسـت لـەرزق شتێکە ڕەوا بیٚ .

﴿ إنَّ فِي ذلِكَ لآيَةً لِقَـوْمٍ يَعْقِلُـونَ ﴾ بەڕاسـتی هەیـە لـەوانـەی باسـکران و دروسـت ئەکرێن لـەبەرهەمی خورماو تریٚ بەڵگەی بەهێز بۆ کەسانیٚ خـاوەنی ئـەقڵ بـن و ئـەقڵی خۆیان بخەنەکار لـەسەر یەکێتی خواو توانای خوا .

﴿ وَ أَوْحى رَبُّكَ إِلى النَّحلِ أَنْ إِتَخِذِي مِنَ الْجِبالِ بِيُوتاً وَمِنْ الْشَجرِ ﴾ وەپەروەردگاری تۆ فەرمانی خۆی ناردوە بۆلای مێش هەنگ و فێری ئەوی کرد کەدروست بکـا بۆخـۆی چەندین خانو لـەکێوەکان و لـەدرەختەکان بـەبێ ئـەوەی ئـادەمیزاد بـەخێوی بکـەن، بـۆ ئەوەی لـەو خانووانەدا هەنگوینی تێبکەن .

﴿ وَمِمّا يِعْرِشُونَ ﴾ وە دروستیش بکەن چەندین خانوی شەش سوچ لە هـەندێ لـەو شتەی بەرز ئەبنـەوەو ئـادەمیزاد ئەیانکـەن بەکـەپر بـۆ ئـەو مێـش هەنگانـەی ئـادەمیزاد بەخێویان ئەکەن .

﴿ ثُمَ كُلِي مِمْ كُلِ الْثَمَراتِ﴾ لە پاشا تـۆی مێـش هـەنگ بخـۆن لـە هـەموو جـۆرە میوەکـان و لـەگوڵ وشـینایی ڕوەکـەکان بەهـەموو جـۆرە تامێکیانـەوە لەهـەرکامێکیان ئارەزووت هەیەو شیلەکانی بمژن .

﴿ فاسْلُكي سُبُلَ رَبِّـكِ ذُلـلاً ﴾ دوایـی تـۆی مێـش هـەنگ بـڕۆ بـــەو ڕێگایانـــەدا پەروەردگاری تۆ بۆی ڕام کردووی بۆی ئامادکردووی .

﴿ يَخْرُجُ مِنْ بُطُونِها شَـرابٌ مُخْتَلِـفٌ أَلْوانـهُ ﴾ دێتـە دەرەوە لـە وورگـی ئـەو مێش هەنگەوە و لە دەمییەوە جۆرە خواردەمەنییەکە بریتەلە هەنگوین، هەیانە ڕەنگـی سـپیەو هەیانە زەوردە یا سور یا ڕەشە بەگویرەی خوادرەمەنیەکەی و بەگوێرەی تەمەنی مێشـەکە لەجوانی و پیریدا و زۆر مانەوەی لە جێگەی خۆیـا، ئەگـەر مێشـەکە تەمـەنی کـەم بـێ هەنگوینەکەی سپیە، مام ناوەندی زەردە، تەمەنی زۆربێ ڕەش ئەبێ ، وایش ئـەبێ ڕەش و سەوز ئەبێ .

﴿ فِيْهِ شَفاء لِلْناسِ ﴾ لەو هەنگوینەدا هەیە ڕزگار بوون بۆ ئامیزاد لەزۆر نەخۆشـی، وەك کەمخوێنی و خراپی تواندنـەوەی خوادرەمـەنی و ئاوسـانی پـوك و سـی ومـیزڵدان و نەخۆشی جگەرو نەخۆشی تر .

﴿ إِنَّ فِي ذلِكَ لآيَةً لِقَوْمٍ يَتَفكَرُونَ﴾ بەڕاسـتی هەیـە لەفـەرماندان وفـێرکردنی مێش هەنگ و زانین و کردەوەی سەرسوڕێنەری مێش هـەنگ بەڵگـەی بـەهێز بـۆ تـاقمێ بـیر بکەنەوە لەبونەوەران و توانای بێ وێنەی خواو ئەو زانستیە داوێتی بەمێش هەنگ .

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی توانای زۆری خۆی کرد ، وەك بارینی باران لەئاسمانەوەو ئەوشتانەی لەچوار پێ دروستی کردون، باسی بەرهەمی میوەکان و مێش هەنگی کردوە، فەرمان ئەدا بەئادەمیزاد بیر لەخۆیان بکەنەوە چۆن دروست کراون و هاتونەتە بونەوە، ئەفەرموێ :

وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفَّىٰكُمْ ۚ وَمِنكُم مَّن يُرَدُّ إِلَىٰٓ أَرْذَلِ ٱلْعُمُرِ لِكَىْ لَا يَعْلَمَ بَعْدَ عِلْمٍ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ ٱللَّهَ عَلِيمٌ قَدِيرٌ ﴿٧٠﴾ وَٱللَّهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ فِى ٱلرِّزْقِ ۚ فَمَا ٱلَّذِينَ فُضِّلُوا۟ بِرَآدِّى رِزْقِهِمْ عَلَىٰ مَا مَلَكَتْ أَيْمَـٰنُهُمْ فَهُمْ فِيهِ سَوَآءٌ ۚ أَفَبِنِعْمَةِ ٱللَّهِ يَجْحَدُونَ ﴿٧١﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا وَجَعَلَ لَكُم مِّنْ أَزْوَٰجِكُم بَنِينَ وَحَفَدَةً وَرَزَقَكُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَـٰتِ ۚ أَفَبِٱلْبَـٰطِلِ يُؤْمِنُونَ وَبِنِعْمَتِ ٱللَّهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴿٧٢﴾ وَيَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مَا لَا يَمْلِكُ لَهُمْ رِزْقًا مِّنَ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ شَيْـًٔا وَلَا يَسْتَطِيعُونَ ﴿٧٣﴾ فَلَا تَضْرِبُوا۟ لِلَّهِ ٱلْأَمْثَالَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٧٤﴾

﴿ وَ اللّٰهُ خَلَقَكُمْ ثُمَّ يَتَوَفاكُمْ ﴾ وەخوا ئێوەی دروست کردوە لەنەبونەوە، لەپاشا ئێوە ئەمرێنی لەجیهاندا، دوایی بۆ جارێ تر زیندووتان ئەکاتەوە لە رۆژی دواییدا، هەتانە بە منالّی وهەیشتانە لە تەمەنی گەورەیدا ئەتان مرێنێ .

﴿ وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلى أرْذَلِ الْعُمْرِ ﴾ وەهەندێ لەئێوە کەسێکە ئەگێڕێتەوە بۆ لای بێترخترین تەمەن و پیر ئەبێ وەك منالّی لێ دێ، پێویستی بەوە هەیە ئاگاداری بکرێ وبەخێو بکرێ وئیشەکانی بۆ بسازێنێ .

بۆ زانین: بۆ ئادەمیزاد چەند پلەیە هەیە کەبەو پلانەی دا تێپەڕئەبێ: لەمنالّیەوە بۆلای نزیکبون لە بالّغی، لەویشەوە بۆلای لاوی، دوایی بۆ لای گەورەیی و بۆ لای پیری، هەتا وای لێ دێت ئەندامەکانی پەکیان ئەکەوێ و وای بەسەردێ بێ هۆش و بیری نامێنێ، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ لِكَي لايَعْلَمْ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئاً وَّاللهُ عَلِيْمٌ قَدِيْرٌ ﴾ هەتا وای لێ دێت هیچ شتێ نازانێ لەدوای ئەوەی خاوەنی زانینی زۆر شت بوە، بەجۆرێکی لێدێت وەك منالّی وزۆر شتی لەبیر ئەچێتەوە بەهۆی پیرییەوە. بەڕاستی خوا هەموو شتێ ئەوزانێ و بەئەندازەی تەمەنی هەمو کەسێ ئەزانێ کە بەوپلانە ئەڕوا، خاوەنی توانایەو هەندێ کەس بەمنالّی یا بەلاوی ئەمرێنێ، پیرەکان تەمەن درێژ ئەکا بەگوێرەی ویستی خۆی .

﴿ وَاللهُ فَضَّلَ بَعْضَكُمْ عَلى بَعْضٍ فِي الْرِزْقِ ﴾ وەخوا ڕیزی هەندێ لەئێوەی داوە بەسەر هەندێ ترتانا، هەندێکیان ساماندارن و هەندێ تریان هەژارن، هەتانە سەربەستن و هەتانە بەندەو کۆیلەن .

ئەوانەتان ساماندارن لەبەر ژیری و کۆشش و خۆ ماندوکردنەوە نیەکە ساماندارن، ئەوانەتان هەژارن لەبەر کەم ئەقلّی و کۆشش نەکردنەوە نیە، زۆر مرۆڤی بەتوانا و ژیر تەمەنی خۆی دائەنێ بۆ کەمێ دارایی کەچی دەستی ناکەوێ، زۆر ئادەمیزادی بێ نرخ و کەم ئەقلّ هەیە دەرگای جیهانی بۆ ئەکرێتەوە. کەواتە ئەو بەشکردنە بەدەستی کەسێکە هەرشتێ ئارەزۆی بکا ئەیکا کە خوای مەزنە .

﴿ فَمَّا الَّذِيْنَ فَضِّلُوا بِرادِّيَ رِزْقِهِمْ عَلى مامَلَكَتْ إِيْمانُهُمْ ﴾ دوایی کەسانێکی ئەوتۆ ڕێزیان گیراوە بە گەورەیی وسامان و ڕۆزی زۆر نابەخشن و ڕۆزی زۆر نادەن بەبەندەوکۆیلەکانیان، نایانەوێ ببن بەهاوبەشی ئەوان لەسامان و ئەیانەوێ پلەیان

لەخۆیان نزمتربێ کەچی ڕۆزی دەری بەندەکانیان نین بەو ڕۆزیە لــەلای ئەوانـە. بـەڵکو ڕۆزی دەری هــەمو کەسـێ هــەر خوایــە بەتەنـها. بـەڵام ڕۆزی ئـەوانی داوەتـە دەسـتی گەورەکانیان .

﴿ فَهُمْ فِيْهِ سَواءٌ ﴾ دوایی هەمو یەکێ لە گەورەکان و لــە بـەندەکان یەکسـانن لــەو ڕۆزی و سـامانەدا، کەواتـە پێویسـتە گـەورەکان گومــــان نەبــەن ئــەوان ڕۆزی دەرو بەخێوکەری بەندەکانیان و ئەوان ڕۆزی ئەبەخشن بەوان .

﴿ أَفَبِنِعْمَةِ اللهِ يجحدون ﴾ ئایا دوایی بۆ بت پەرسـتان باوەڕیـان بەچاکـەی خـوا نیـەو هاوبەشی بۆ دائەنێن. زۆر جێگەی سەرسوڕمانە بت پەرستان بەندەکانی خۆیان ناکـەن بـە هاوبەشی خۆیان لەدارایی و ڕۆزیدا ونایانــەوێ بەشـیان ببــێ لـەداراییدا کـەچی ئـەوان هاوبەش بۆ خوا دائەنێن. بەگوێرەی گومانی خۆیان پلەی خوا نزمترە لەپلەی ئەوان .

بۆ باشتر ڕوون کردنەوەی ئەو فەرمودەیخوایــە: بـت پەرسـتان هاوبەشـیان بـۆ خـوا دائەنا، دوایی خوای مەزن وەڵامیان ئەداتەوە وئەفەرموێ :ئەی بت پەرستان :ئێــوە ڕازی نابن بەندەکانتان هاوبەشی ئێوە بن لەدارایی خۆتان وئێوەو ئەوان یەکسان بـن لـەڕۆزی و لە دارایی ئێوەدا، کاتێ ئێوە ڕازی نابن بۆ خۆتان یەکسان بن ئێوەو بەندەکانتان لەوشتەی هەتانە، چۆن بەندەکانی ئێمە ئەکەن بەهاوبەشی ئێمە لەدروست کردنی بونەوەراندا، ئایــا پلەی خوا کەمترە لەپلەی ئێوە. بەچ بەڵگەیــە ئێـوە ئـەیلێن: بتـەکان وجگـەی بتـەکان خاوەنی شتێکن لەگەڵ خوادا و لایان هەیە هەمو شتێ .

﴿ وَاللهُ جَعلَ لَكُمْ مِنْ انْفُسِكُمْ أَزْواجَاً ﴾ وە خوا دروستی کردوە بۆ ئێــوە لەڕەگـەزی خۆتان ژن و هاوسەرەکانتان، هەتا کۆمەکیتان پێبکەن و هاوبەشتان بن لە هەمو ڕوێکەوە بە خۆشەویستی وبە میهرەبانیەوە. دوای ئەوەی خوا باسی چاکەی ژنهێنانی کــرد، باسـی چاکەی منداڵ ئەکاو جوانی جیهانن .

﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ أَزْواجُكُمْ بَنِيْنَ وحَفَدَةً ﴾ وەخوا دروســتی کـردوە بـۆ ئێـوە کـوڕو نەوەکانتان لەژنەکانی خۆتان، هەتا بەوان دڵخۆش بن ویاریدەدەرتــان بـن لـەپـەیداکردنی هۆی ژیانتان .

﴿ وَرَزَقَكُمْ مِنَ الْطَيِّباتِ ﴾ وە خوا ڕۆزی ئێوەی داوە وبەخێوتان ئەكا لەخواردەمەنیە پاك و بەتامەكان، بەرگ و ئـاژاڵی داونـەتێ خۆتـانی پێداپۆشـن و سـوود لەبـەروبومی ئاژاڵەكانتان وەربگرن.

بۆ زانین: زانایان بیریان جیاوازە لەمانای (حَفَدَةً ) ئەوەی چاكتر بێ مەبەستە لەهـەمو كەسێ یاریدەی مرۆڤ بدا لەكاروباریا.

﴿ أَفَبِالْباطِلِ يُؤمِنُونَ وَ بِنِعْمَةِ اللهِ هُمْ يَكْفُرُونَ ﴾ ئایا دوای ئەو هەمو چاكانە چۆن باوەڕ ئەكەن بەو شتە پڕو پوچانە وبتەكان ئەكەن بەهاوبەشـی خـوا، یـا بەتەنـها بـاوەڕ بەوانـە ئەهێنن و ئەوان سوپاسی خوا ناكەن ولەڕۆزی خوا ئەخۆن و جگەی خوا ئەپەرستن. وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَيَعْبُدُونَ مِنْ دُونِ اللهِ مالا يَمْلُكُ لَهُمْ رِزْقاً مِنَّ السَّماواتِ وَالأَرْضِ شَيْئاً وَلايَسْتَطِيْعُونَ ﴾ وەلـەجگەی خوا شتێ ئەپەرسـتن خـاوەن ڕۆزی نیـە بـۆ ئـەوان كـە لـە ئاسمانەكانەوە پەیدا ئەبن وەك باران ولـەزەوی پەیدا ئەبن وە ك ڕوەكەكان و كانگاكـان و، توانای هیچ شتیان نیەو شایستەی ئەوەیان نیە ببن بەخاوەنی هیچ شتێ .

﴿ فَلا تَضْرِبُوا اللهَ الأَمْثالَ ﴾ دوایی ئێوە مەگێڕن بۆ خوا چەندین وێنەیە بۆ خـواو خـوا وێنەی نیە وبەڕاوردی خوا وەك هیچ شتێ مەكەن و خوا لەهیچ ناچێ .

﴿ إِنَّ اللهَ يَعْلَمُ وَأَنْتُمْ لاتَعْلَمُونَ ﴾ بەڕاسـتی خـوا ئـەزانێ بـەپوچی شـتێ ئێـوە پشـتی پێ‌ئەبەستن وئەڵێن: پەرستنی بەندەكانی خوا باشتر گەورەیی خوا دەرئـەخا، خـوا ئـەزانێ بەو تاوانە گەورەی ئێوەو، ئێوە نازانن بەهەڵەی خۆتان و وێنەی بۆ دائەنێن .

پـاش ئـەوەی خـوا ڕوونـی كـردەوە ناشـارەزایی بـت پەرسـتانلەهاوبەش دانـان بـۆ خوالـەپەرستندا بەشتێ نەخاوەنی سودن بۆ خۆیان و نەبۆ جگەی خۆیـان، خـوا وێنەیـە لێ ئەدا بۆ ڕون كردنەوەی تواناو یەكێتی خۆی لەهەمو ڕویێكەوە، ئەفەرموێ:

ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً عَبْداً مَمْلُوكاً لَّايَقْدِرُ عَلَى شَيْءٍ وَمَن رَّزَقْنَهُ مِنَّا رِزْقاً حَسَناً

فَهُوَ يُنفِقُ مِنْهُ سِرًّا وَجَهْرًا هَلْ يَسْتَوُونَ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٧٥﴾ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا رَّجُلَيْنِ أَحَدُهُمَآ أَبْكَمُ لَا يَقْدِرُ عَلَىٰ شَيْءٍ وَهُوَ كَلٌّ عَلَىٰ مَوْلَىٰهُ أَيْنَمَا يُوَجِّههُّ لَا يَأْتِ بِخَيْرٍ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَن يَأْمُرُ بِٱلْعَدْلِ وَهُوَ عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٧٦﴾ وَلِلَّهِ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَآ أَمْرُ ٱلسَّاعَةِ إِلَّا كَلَمْحِ ٱلْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴿٧٧﴾

﴿ ضَرَبَ اللهُ مَثَلاً عَبْداً مَمْلُوكاً لايَقْدِرُ عَلى شَيءٍ ﴾ خوا وێنەیە لێ ئەدا لەبارەی گەورەیی خۆی و بێ‌نرخی ئەوبتانە ئەوان ئەیان پەرستن لەجگەی خوا بەبەندەیە دارایی کەسێ بێ و توانای بەسەر هیچ شتێکا نەبێ و سەرشۆری ویستی جگەی خۆی بێ.

﴿ وَمَنْ رَزَقْناهُ رِزْقاً حَسَناً ﴾ وەبەکەسێ ئێمە بەخشییێتمان بەو کەسە ڕۆزی ودارایی پاك وخاوێن بەبێ ماندو بون وبتوانێ دەستکاری دارایی خۆی بکا بەهەمو جۆرێ.

﴿ فَهُوَ يَنْفِقُ مِنْهُ سِراً وَعَلانِيَةً ﴾ دوایی ئەوکەسە ببەخشێ و دەستکاری دارایی ورۆزی خۆی بکا بەنهێنی و بەئاشکرا وباکی لەکەس نەبێ و لەکەس نەترسێ. ئایا ئەوبەندە بێ دەسەڵاتە وئەوکەسەی سەربەست و بەتوانایە وەك یەك وان و یەکسانن؟ وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَهَلْ يَسْتَوُونَ ﴾ دوایی ئایا ئەو بەندە هەژارەی خاوەنی هیچ شتێ نیە و دارایە بۆ جگەی خۆی و ئەو مرۆڤە ساماندار و سەربەستە دارایی خۆی بەبێ ترس ئەبەخشێ وەك

یەك وان؟ ئیتر ئێوە چۆن ئەو بتە بێ توانان و ئەو خوایە کەئێوەو ئەو بتانەیش بەندەو دروستکراوی ئەون ئەیان پەرستن .

﴿ الْحَمْدُ اللهِ ﴾ سوپاس بۆ ئەو خوایە وبەندەیی هەر بۆئەوە کە هیچ خوا نیە شایانی پەرستنبیجگەی ئەو، بونەوەران هەمویان بەندەی ئەون

﴿ بَلْ أكْثَرُهُمْ لايَعْلَمُونَ ﴾ بەڵکو زۆرتر لەوبت پەرستانە و بگرە هەموویان نازانن سوپاس ئەبێ هەر بۆ خوا بێ بەتەنها نەك بۆ جگەی خواو ئەبێ پەرستن هەر بۆ خوا بێ و هاوبەشی نەبێ .

خوای مەزن وێنەیەکی تری دووهەم لێئەدا لەبارەی گەورەیی وتوانای خۆی و بێنرخی و بێ توانایی ئەو بتانەئەوان ئەیان پەرستن لەجگەی خواو ئەفەرموێ:

﴿ وَضَرَبَ اللهُ مَثَلاً رَّجُلَيْنِ أحَدُهُما أبْكَمُ لايَقْدُرُ عَلَى شَيءٍ ﴾ وەخوا وێنەیە لێئەدا بەدووپیاو یەکێکیان لاڵ بێ و توانای بەسەر هیچ شتێکا نەبێ و هیچ شتی فێر نەبوبێ و نەتوانێ گفتوگۆبکا و خاوەنی هەست و تێکەیشتن نەبوبێ .

﴿ وَهُوَ كُلٌ عَلى مَوْلاهُ أيْنَما يُوَجِهْهُ لاَياتِ بِخَيْرٍ ﴾ ئەو کەسە لاڵە بارێکی گرانبێ بەسەر خاوەنەکەیەوە و نەتوانێ هیچ شتێ پەیدا بکا خاوەنەکەی بۆ هەر جێگەیەکی بنێرێ بۆ کردنی فەرمانێ نایەتەوە بەسەر کەوتویی و بەهیچ چاکەیەکەوە چونکە لاڵەو لەهیچ شتێ تێناگا و ناتوانێ گیرو گرفتی خۆی بکاتەوەو توانای پرسیارکردنی نیە، هەر ئەبێ کەس وکاری بەخێوی بکەن .

﴿ هَلْ يَسْتَوِي هُوَ وَمَنْ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَهُوَ على سِراطٍ مُسْتَقِيْمٍ ﴾ ئایا ئەو کەسە لاڵە و کەسێ فەرمان بدا بەدادپەروەری وخاوەن گفتو گۆو هۆش و هەست بێ و ژیربێ و بتوانێ فەرمان بدا بەچاکەو بەدادپەروەری وێنەی یەکن لەڕاپەڕینی فەرمانەکاندا و، ئەو کەسە خۆی لەخۆیا لەسەر ڕێگەی ڕاستە و بۆ هەر لایەکی بنێرێ بەکەمترین کۆشش جێبەجێ ئەکات، ئیتر ئەی بت پەرستان ئێوە چۆن خوایە کەخاوەنی ئەو هەموچاکانە بێت ئەیکەن بەهاوبەشی بەردی تاشراوی دەستی خۆتان؟

﴿ وَلِلهِ غَيْبُ السَّماواتِ وَالأَرْضِ ﴾ وە بۆخوایە زانینی نهێنیەکانی ئاسمانـەکان وزەوی و هیچ شتیٚ لـەخوا پەنهان نیە .بەرۆژی دووایشەوە.کەخوا ئەفەرمویٚ:

﴿ وَما أمرُ السّاعَةِ إلاكَلمْحِ الْبَصَرِ أَوْ هُوَ أَقْرَبُ ﴾ وە پەیدابوون و هاتنی ڕۆژی داوی لـەبە گورج هاتنی نیە بە ماوەیە مەگـەر بەئـەندازەی چـاو نوقـان کردنەوەیـەتی، یاهـاتنی ڕۆژی دوایی نزیکترە لـەچاو نوقاندنیٚ، چونکە چاونوقاندن پێویستی بـەکاتیٚ هەیـە، بـەلاٚم فەرمانی خوا بیٚکاتە وئەفەرمویٚ:

بەهەرشتیٚ بیەویٚ ئەویش ئەبیٚ کوتوپڕ. کەواتە ئێوە تەمیٚ خواربن و بترسـن لـەهاتنی دوا ڕۆژ .

﴿ إنَّ اللهَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدِيْرٌ ﴾ بەڕاستی خوا دەسەلاٚتی بەسەر هـەمو شتێکا هەیـە و ئەتەوانیٚ ئێوە زیندوو بکاتەوە بۆ پرسیار و وەلاٚم وپاداشت وتۆلـە وەرگرتن .

لـەپاشا خوای مەزن هەندیٚ لـەچاکەکانی خۆی جگەی ئەوانـەی پێشوو بـاس ئـەکاو ئەفەرمویٚ:

وَٱللَّهُ أَخْرَجَكُم مِّنۢ بُطُونِ أُمَّهَٰتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْـًٔا وَجَعَلَ لَكُمُ ٱلسَّمْعَ وَٱلْأَبْصَٰرَ وَٱلْأَفْـِٔدَةَ ۙ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴿٧٨﴾ أَلَمْ يَرَوْا۟ إِلَى ٱلطَّيْرِ مُسَخَّرَٰتٍ فِى جَوِّ ٱلسَّمَآءِ مَا يُمْسِكُهُنَّ إِلَّا ٱللَّهُ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿٧٩﴾

وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّنۢ بُيُوتِكُمۡ سَكَنٗا وَجَعَلَ لَكُم مِّن جُلُودِ
ٱلۡأَنۡعَٰمِ بُيُوتٗا تَسۡتَخِفُّونَهَا يَوۡمَ ظَعۡنِكُمۡ وَيَوۡمَ إِقَامَتِكُمۡ
وَمِنۡ أَصۡوَافِهَا وَأَوۡبَارِهَا وَأَشۡعَارِهَآ أَثَٰثٗا وَمَتَٰعًا إِلَىٰ حِينٖ
﴿٨٠﴾ وَٱللَّهُ جَعَلَ لَكُم مِّمَّا خَلَقَ ظِلَٰلٗا وَجَعَلَ لَكُم
مِّنَ ٱلۡجِبَالِ أَكۡنَٰنٗا وَجَعَلَ لَكُمۡ سَرَٰبِيلَ تَقِيكُمُ
ٱلۡحَرَّ وَسَرَٰبِيلَ تَقِيكُم بَأۡسَكُمۡۚ كَذَٰلِكَ يُتِمُّ نِعۡمَتَهُۥ
عَلَيۡكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تُسۡلِمُونَ ﴿٨١﴾ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَإِنَّمَا عَلَيۡكَ
ٱلۡبَلَٰغُ ٱلۡمُبِينُ ﴿٨٢﴾ يَعۡرِفُونَ نِعۡمَتَ ٱللَّهِ ثُمَّ يُنكِرُونَهَا
وَأَكۡثَرُهُمُ ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿٨٣﴾

﴿ وَاللَّهُ أَخرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أمَهاتِكُمْ لاتَعْلَمُونَ شَيْئاً﴾ وە خوا ئێوەی لـەمناڵدان وورگـی دایکتان هێناوەتە دەرەوەهیچ شتێکتان نەئـەزانی لـەپـەیداکردنی چاکـەو خراپـە وتوانـای پاراستنی خۆتانتان نەبوو کارو کردەوەی خۆتانتان بۆ هەڵنەئەسوڕا مەگـەر یـەکێ ئێـوەی بپارێزایە لـەڕووداو و چاکەی بۆ بڕەخساندنایە .

﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ الْسَّمْعَ وَالأَبْصارَ لَعَلَكُمْ تُشكُرُونَ ﴾ وە خوا داینا بۆ ئێـوە گوێچکـە بـۆ ئەوەی شتی پێ ببیسن ونامەی پێ ببیسن و چـاوی پـێ بەخشـین هـەتا دروسـت کـراوە سەرسوڕێنەرەکانی پێ ببینن و یەکێتی خواتـان بـۆ دەرکـەوێ و دڵـی پێـدان بـۆ ئـەوەی لـەمانای هەمو شتێ بگەن، بۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی خوا بکەن لـەسەر ئەوچاکانە .

بۆ زانین: هەندێ کەس گومانیان وایـە مـادەی کـەڕ وکوێـر خۆیـان گوێچکـەو چـاو ودڵیان بۆ خۆیان پەیدا کردووە. ئێمە وەڵامیان ئەدەینـەوە ئـەوەی شـتێکی نـەبێ نـاتوانێ ئەوشتە پەیدا بکا لـەخۆیا، دووبارە ئەگەر گیان وزانستی تایبەت بێ بۆ مادەیە و ئەوانـەی لێ جوێ نەبیتەوە پێویستە هەمو مادەیە گوێ وچاو ودڵی هەبێ. ئەگەر ئەو کەسانە بڵێـن .بەڵێ هەندێکیان بەوجۆرە تایبەتیەن. ئێمە بـەوان ئـەڵێین: ئایـا ئێـوە ئـەبێ بڵێـن مـادەی بەوجۆرە هەرئەوە گیان و زانست و هەست پەیدا بکەن، یا ئەو شتەئێوە نـەیڵێن، کەواتـە پێویستە هەمو مادەیەکی خاوەن گیان وهەستبێ، یا هەمویان خاوەنی گیان و هەست نەبن، بەهەر جۆری بێ ئەوان بیڵێن، هەردو داواکانیان پوچن، چونکە بـەچاو ئـەبینرێ هـەندێ مادده وشك و بێگیانن، هەندێ تریان زیندوو خاوەن هەستن.کەواتە بەگوێرەی ئەو جۆرە جیاوازیانە پێویستە جگە لـە مادە هـێزێکی خـاوەن زانسـت هـەبێ زیندەگـانی و هەسـت ببەخشێ بەهەندێ مادە وجگەی مادەیە تر و پێویستی جیاوازی لەنێوانیا هەبێ .

﴿ أَوَ لَمْ يَرُدُوا إِلَى الْطَيْرِ مُسَخَّرَاتٍ فِي جَوِّ السَّمَاءِ مَايَمْسِكُهُنَّ إلا اللهِ ﴾ ئایـا ئـادەمیزاد بۆ نەیان ڕوانیوە بـۆ لای باڵندەکـان ئامـادەکراون بـۆ فڕیـن لـەبۆشـایی ئاسمـاندا و دوور لـەزەوی هیچ کەسێ ڕای نـەگرتوون ناکەونـە خـوارەو مەگـەر هـەر خـوا، ئـەگینا بـەو لـەشەگرانەوە هەیانە ئەبوایە بکەوتنایە خوارەوە.خوای مەزن دووباڵی دروست کردوە بـۆ باڵندە هەمو ئامادەیەکی تێدا دروست کردوە بتوانێ بفڕێ لـەئاسماندا .

پرسیار/ ئادەمیزاد فڕۆکـەی دروسـت کـردوە خـێرایی ڕۆیشـتنی لـەدەنگ زۆرتـرە، سارو خیان دروستکردوە لەکاتژمێرێکا هەزاران میل ئەبڕێ وئەڕوا بۆلای مانگ ومـەریخ، مانگی دەستکردیان دروست کردوە ئەسوڕێتەوە بـەدەوری زەویـدا و گفتـو گـۆ ئەکـەن لەگەڵ زانایان بەزمانی خۆیان بەشتێ ببیسـتن وببینـن، دوایـی بـاڵندە لـەکوێ و ئەوانـە لەکوێ کەسەرسوڕێنەرترن لەباڵندە .

وەڵام / ئەو پرسیاروداوایە لـە مرۆڤی ژیرەوە زۆر جێگەی سەرسوڕمانەو سـەرگەردان بوەو خۆی بێئاگاکردوە لـەو خوایەی ئەوئەقڵەی دروسـت کـردوە کەئەوشتانەی پـەیدا

کردوە، ئەگەر خاوەنی ویژدان بیٚ تەماشای خۆیو ئەقڵی خۆی ئەکا زۆر گـەورەترن لــە دروستکردنی ساروخ و مانگی دەستکرد بەڵکو ئەگەر خاوەنی ویژدان بێت ئـەی ڕوانـی بـۆلای دروسـت کردنـی گـەردون کەگـەورەترن لـەدروسـتکردنی ئـادەمیزاد. ئەوانـــە لـەلایەکـەوە ولـەلایـە تـرەوە: ئـەو گفتوگۆیانـە لـــەبارەی باڵندەوەیـــە، کەباڵندەیـــەش لـەزیندەوەرانە، فڕۆکە وساروخ و مانگی دەستکرد لـەبیٚ گیانانن. کەواتە ئـەو ڕەخنانـەی ئیوە لـەجێگەی خۆیــا نیــە، زۆر ڕون وئاشـکرایە کـەزانایانی سـاروخ دروسـت کـەر و هەموزانایانی ئادەمیزاد و جنۆکە ناتوانن مێشولـەیە یـا شـانەیە لـەباڵی مێشـولـە دروست بکەن .

﴿ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴾ بەڕاستی هەیە لـــەئامادەکردنی بـاڵندە بـۆ فڕیـن لـەبۆشایی ئاسمانـا چـەندین بەڵگـەی بـەهێز وپـەك خـەر بـۆ کۆمـەڵیٚ باوەڕیـان بـەخواو ئەوشتانەی هاتون بۆ لای پێغەمەر هەبیٚ .

﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ بُيُوتِكُمْ سَكَنًا ﴾ وە خوا دروستی کـردوە بـۆ سـوودی ئێـوە چـەند خانویەبۆ کاکردن و دانیشتن لـەنێویانا کە ئێوەدروستیان ئەکەن لـەبەردو درەخـت وئاسـن وچیمەنتۆ بۆ پشودانتان .

﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ مِنْ جُلُودِ الأَنْعامِ بيوتا تَسْتَخِفُّونَها يَوْمَ ظعنكم وَيَوْمَ إِقـامَتِكُمْ ﴾ وە خـوا دروستی کردوە بۆ ئێوە لـەپێستی چوارپێکان چەندین خانویٚ هەڵگرتنیان سـوکە بـۆ ئێـوە لـەڕۆژی کۆچ کردنتان و لـەڕۆژی دانیشتنی ئێوەدا یانی لـە هەردوو کاتەکانا هـەڵگرتنیان گران نیە.

بۆ زانین: خانو لـەیاسای ئیسلامدا ڕیزی تایبەتی خۆی هەیەو چاکەکانی خوایـە بەسـەر بەنەکانیەوە، ڕیزی خانو نازانیٚ مەگەر کەسیٚ خـانوی نـەبی. خـانو ڕێـزی تایبـەتی هەیـە لـەلای ئیسلام نابی بەبیٚ دەستور بچێتە ژوورەوەی خانوی جگەی خۆت، زانایـان ئـەڵێن: ئەگەر کەسیٚ لـەکونێکەوە یا لـەجێگەیە تـرەوە تەماشـای خـانوی کەسـیٚ تـری کـرد بـۆ خاوەن خانوەکە هەیە سەرزەنشتی بکا، ئەگەر هەر بـــەدرەوام بـو بـۆی هەیـە لـێـی بـدا، هەرکەسیٚ تەماشای جیگەی دانیشـتنی کەسـیٚ تـر بکـا خـاوەن جێگـە هـەردوو چـاوی ئەوکەسەی بۆ ڕەوایە کوێری بکا وبەردی ووردی بۆ فڕەبدا .

﴿ وَمِنْ أَصْوافِها وَأَوْبارها وَأَشْعارْها اَثاثاً وَ مَتاعاً إلى حِيْنٍ ﴾ وە خوا دروستی کردوە بۆ سوودی ئێوە لەخوری مەڕ و لەکورگی هوشتر ولەموی بزن شتێ ئێـوە پێویستیتان پێـی هەبێ بۆ ڕاخستن و بیدەن بەسەرخۆتانا وبۆ بەرگ وکەل وپەلی ترتان، بەوێنەی بەڕەو قاڵی و لەباد و چۆغە وبەرماڵ وچاتوڵ و دەیان شتی تر، بـۆ ئـەوەیش سـوودیان لێ و ەربگـرن لەجێ بەجێ‌کردنی پێویستی خۆتان وپێیان ڕابوێرن لەماوەی ژیانی خۆتانا لەجیهاندا .

﴿ وَاللهُ جَعَلَ لَكُمْ مِمّـا خَلَقَ ظِـلالاً ﴾ وە خـوا دروسـتی کـردوە بـۆ سـوودی ئێـوە لەهەندێ لەوشتەی دروستی کردون لەسێبەرەکانی خانو و دیوار ودرەختەکان بۆ ئەوەی خۆتان بپارێزن لەگەرما و لەسەرما .

﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ مِنَ الْجِبالِ أَكْناناً ﴾ وە خوا دروستی کردوە بۆ سـوودی ئێـوە چـەندین جێگەیە بۆ دانیشتن لەوانا لە خانو وئەشکەوتی کێوەکان خۆتان بپارێزن بەهۆی ئەوانـەوە لەگەرما وسەرما، هەمو پێویسـتیەکانی ئـادەمیزاد چاکـەی خـوان بۆیـان بگـرە سـێبەری هەوریش .

﴿ وَجَعَلَ لَكُمْ سَرابِيْلَ تَقيكُمُ الْحَرَّ وَسَرابِيْلَ تَقِيكُمْ بِأْسَكُمْ ﴾ وە خوا دروستی کـردوە بۆ سوودی ئێوە کراس وبەرگ لە لۆکەو کەتان و خوری ونـایلۆن وجگـەی ئـەوانیش هەتاخۆتانی پێ بپارێزن لەگەرما ولەسەرما و بـۆی دروسـتکردوون زرێـی وتـاس کـڵاو وهەمو چەکێکی تریتان پارێزی لەدەست درێژی دوژمنـان وپـەلاماردانی دڕونـدە. وایـش ئەبێ نایەڵن پێست و گۆشت و ئێسکەکانتان برینداربن .

﴿ كَذلِكَ يَتم نِعْمَتَهُ عَلَيْكُـمْ لَعَلَكُـمْ تُسْلِمُونَ ﴾ هـەر بـەوجۆرەی خـوا ئـەو هـەمو چاکانەی بەخشی به ئێوە خوا چاکەی خۆی ئەرێژێ بەسـەرتانا لەهـەردوو جیـهاندا بـۆ ئەوەی ئێوە سوپاسی خوا بکەنو بچوکی خوا بکەن وچاوەڕوانی چاکەی زۆرتر بکەن .

خوای مەزن داوامان لێ ئەکاسوپاسی خوا بکەین لەبەرئەوە لەمەوبەر خانوی درەخـت و ئەشکەوت و بەرگی لۆکە و خوری بەخشیوە بەئادەمیزادی ئەوکاتانەی پێشـوو، ئـەی ئێستا چۆن ئێمە سوپاسی زۆرتر بۆ خوا نەکەین کە لـە ئـاڵتوونی ڕەش جۆرەهـا چاکـەو

سودی تێدایە بۆ ئادەمیزاد، چۆن سوپاسی خوانەکەین لەجیاتی چوار پێ و چارەوێ و هێسرو گوێ درێژو خانوی لەبەرد تاشراو خوا ماشین و فڕۆکەو کۆشکی بلّندی بەخشیوە بەئادەمیزادی ئەم سەردەمە .

﴿ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّمَا عَلَيْكَ الْبَلَاغُ الْمُبِينُ ﴾ دوایی ئەگەر ئادەمیزاد پشتیان کردە تۆو باوەڕیان نەهێنا وازیان لێ بهێنە، دوایی تۆ بەڕاستی لەسەر تۆیە ڕاگەیاندنی ئاشکرای پەیامی ئێمە بەوان وپرسیار وپاداشت وتۆڵەیان لەسەر ئێمە .

﴿ يَعْرِفُونَ نِعْمَةَ اللَّهِ ثُمَّ يُنْكِرُونَهَا وَأَكْثَرُهُمُ الْكَافِرُونَ ﴾ ئادەمیزاد چاکەی خوا ئەزانن و ئەیناسن لەپاشا باوەڕ بەوچاکانە نایەرن، زۆر جێگەی سەرسوڕمانە خوا بەخێویان ئەکا کەچی لەجگەی خوا ئەپەرستن و زۆرتر لەوان باوەڕ نایەرن و سوپاسی خوا ناکەن، بەڵام کەمێکیان باوەڕ ئەهێنن و سوپاسی خوا ئەکەن .

کاتێ خوای مەزن باسی بت پەرستانی کرد، باسی بەسەر هاتی بێباوەڕان ئەکا لەڕۆژی دواییدا، کەدرۆو بوختان سود بەوان ناگەیەنێ وئەفەرموێ :

وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِن كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا ثُمَّ لَا يُؤْذَنُ لِلَّذِينَ كَفَرُوا وَلَا هُمْ يُسْتَعْتَبُونَ ﴿٨٤﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا ٱلْعَذَابَ فَلَا يُخَفَّفُ عَنْهُمْ وَلَا هُمْ يُنظَرُونَ ﴿٨٥﴾ وَإِذَا رَءَا ٱلَّذِينَ أَشْرَكُوا شُرَكَآءَهُمْ قَالُوا رَبَّنَا هَٰٓؤُلَآءِ شُرَكَآؤُنَا ٱلَّذِينَ كُنَّا نَدْعُوا مِن دُونِكَ فَأَلْقَوْا إِلَيْهِمُ ٱلْقَوْلَ إِنَّكُمْ لَكَٰذِبُونَ ﴿٨٦﴾ وَأَلْقَوْا

إِلَى ٱللَّهِ يَوْمَئِذٍ ٱلسَّلَمَ ۖ وَضَلَّ عَنْهُم مَّا كَانُوا۟ يَفْتَرُونَ ﴿٨٧﴾ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ وَصَدُّوا۟ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِ زِدْنَٰهُمْ عَذَابًا فَوْقَ ٱلْعَذَابِ بِمَا كَانُوا۟ يُفْسِدُونَ ﴿٨٨﴾ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِى كُلِّ أُمَّةٍ شَهِيدًا عَلَيْهِم مِّنْ أَنفُسِهِمْ ۖ وَجِئْنَا بِكَ شَهِيدًا عَلَىٰ هَٰٓؤُلَآءِ ۚ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿٨٩﴾

﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ مِنْ كُلِّ اُمَةٍ شَهِيْداً ﴾ وە تۆ بیری ئەو ڕۆژە بکەرەوەو بت پەرستانی پێ بترسێنە ئێمە زیندوو ئەکەینەوە لەهەمو نەتەوەیە شایەتی ئەدا لەسەریان بەباوەڕهێنان و بەباوەڕنەهێنانیان لەڕۆژی دواییدا .

﴿ ثُمَّ لايُؤْذَنُ لَهُمْ وَلاهُمْ يُسْتَعتَبُونَ ﴾ لەپاشا بێباوەڕان دەستوریان پێنادرێ بیانو بهێننەوەو بەوان ئەبێژرێ ئەمڕۆ جێگەی گفتوگۆ و بیانوهێنانەوە نیەو، ڕێگە بەوان نادرێ داوای ڕەزامەندی خوا بکەن بەگفتوگۆ یابەکردار، چونکە ڕۆژی دوایی ڕۆژی پرسیار و پاداشتە نەك ڕۆژی داواکردنی ڕەزامەندی وکاکردن. یانی دوای شایەتی دانی پێغەمەرەکان گیرۆدەی شتێکی گرانتر ئەبن و نایەڵن گفتوگۆ بکەن .

﴿ وَإذا رَأى الَّذِيْنَ ظَلَمُوا الْعَذابَ فَلا يُخَفِّفُ عَنْهُمْ وَلاهُمْ يُنْظَرُونَ ﴾ وە کاتێ کەسانێکی ئەوتۆ ستەمیان کردوە لە خۆیان بەبێ فەرمانی چاویان ئەکەوێ بەسزای خواو سزایان ئەدرێ لەڕۆژی دواییدا، دوایی ئەو سزایە سوك ناکرێ لەوان و ئەوان مۆڵەتیان نادرێ و سزایان دواناخرێ .

﴿وَإِذا رَأى الَّذِيْنَ أشْرَكُوا شُرَكاءَهُمْ قالُوا رَبَّنا هَؤُلاءِ شُرَكاؤُنا الَّذِيْنَ نَدْعُوا مِنْ دُونِكَ﴾
وە کاتێ لەدوا ڕۆژدا کەسانێکی ئەوتۆ هاوبەشیان بۆ خوا دائەنا هاوبەشـەکانی خۆیانیـان بینی ئەلێن: ئەی پەروەردگاری ئێمە هاوبەشـەکانی: ئێمـەن ئەوکەسانەی ئـەوتۆن ئێمـە ئەمان پەرستن و هاوارمان لێیان ئەکرد لەجگەی تۆ.

﴿ فَألْقُوا إلَيْـهِمْ الْـقَـوْلَ إنَّكُـمْ لَكـاذِبُونَ ﴾ دوایـی خواکـانی بـت پەرسـتان گفتوگـۆ فڕەئەدەن بۆ لای بت پەرستان وەلاَمیان ئەدەنەوە بەڕاستی ئێـوەی بـت پەرسـتان درۆتـان کردوە لەناونانی ئێمەدا بەخوا وئێمە بـانگی ئێوەمـان نـەکردوە بـۆ لای پەرسـتنی ئێمـە. ئەگەر پرسیار بکرێ وببێژرێ دور نیە خوا گیان بکا بە بەریاناو ئـەقڵیان بداتـێ لـەڕۆژی دواییدا، بۆ ئەوەی بت پەرستان بەدرۆ بخەنەوە. یاخوا جۆرەگیانی بدایە بەوان و هەموشتێ بۆ خوا ئاسانە .

﴿ وَ ألْقَوْا إلَـى اللهِ يَوْمَئِـذٍ السَّـلِمَ وَضَـلَّ عَنْـهُمْ ماكـانُوا يَفْـتَرُونَ ﴾ وە بـت پەرسـتانو خواکانیان بچوکی وسەرشۆڕی فڕەئەدەن لەو ڕۆژەدا بۆ لای خواو فەرمانبـەرداری خـوا ئەبەن ولائەچێ و پوچ ئەبێتەوە لەلای بت پەرستان شتێ ئەوان بـەدرۆو بـەبوختان ئـەیان ووت ئەوا نەخوای ئێمەن ویارمەتیمان ئەدەن وبتەکان بێزاری خۆیـان لـەوان دەرئـەبڕن، هەمو بوختان کەرێ تۆڵەی بوختانەکەی خۆیان وەرئەگرن لەورۆژە سەختەدا .

﴿ الَّذِيْنَ كَفَرُوا وَصَدّوا عَنْ سَبِيْلِ اللهِ زِدْناهُمْ عَذاباً فَوْقَ الْعَذابِ بِماكـانُوا يُفْسِـدُونَ ﴾ کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە ورێگەیان گرتوە لەئادەمیزاد بۆ باوەڕهێنـان بەرێگـەی ئایینی خوا ئێمە زۆرئەکەین بۆیان سزا لەژوور سـزاوە بـەهۆی شـتێکەوە ئـەوان بلاَویـان ئەکردەوە لەخراپە، سزایەکیان لـەبەر رێگەگرتنیان، سزایە تریان لـەسەر باوەڕ نەهێنانیان .

﴿ وَيَوْمَ نَبْعَثُ فِي كُلِّ اُمَةٍ شَهِيْداً عَلَيْهِمْ مِنْ أنْفُسِـهِمْ ﴾ وە تـۆ بـیری ڕۆژێ بکـەرەوە ئێمە زیندوو ئەکەینەوە لـەنێو هەمو نەتەوەیـەکدا پێغەمـەرێ لەڕەگـەزی خۆیـان شـایەتی ئەدەن لـەسەر ئەوشتانەی کردویانە لـە کردەوەیچاك و خراپ. بێگومان هەمو پێغەمـەرێ ئەبێ بەشایەتی نەتەوەکەی خۆیان .

﴿ وجئنا بك شهيدا على هؤلاء ﴾ وە ئینە تۆیش ئەهێنین بۆ ئەوەی شایەتی بدەی لەسەر کردەوەی نەتەوەکەی خۆت لەجیهاندا بەگشتی .

پرسیار/ بێگومان پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ نێرراوە بۆ لای هەمو بونەوەران.کەواتە چۆن بەتایبەتی شایەتی ئەدا لەسەر نەتەوەکەی خۆی ؟

وەلام / پێغەمەر رای گەیاندوە بە نەتەوەکەی خۆی و رای سپاردوون کەئایینی ئیسلام رابگەیەنن بەئادەمیزاد چین لەدوای چین لەپاش مردنی خۆی لەهەمو وجێگەوکاتێکا، لەرۆژی دواییدا شایەتی ئەدا لەسەر نەتەوەکەی خۆی رایان گەیاندوەیاکۆلیان داوە .

﴿ ونزلنا عليك الكتاب تبيانا لكل شيء وهدى و بشرى للمسلمين ﴾ وە ئێمە ناردومانەتە خوارەوە نامەیە کەقورئانە لەبەرئەوەی رون بکاتەوە بۆ ئادەمیزاد هەمو شتی پەیوەندی بەباوەر و دەستور و رەوشت هەیەو ، بەئامۆژگاری و تەمی کردنەوە هەبی وبۆئەوەی راغومایی کەربی بۆیان. رێگەی راست ئەگەر داوای راغومایی بکەن ومیهرەبانی ودیاریە بۆیان و موژدە دەرە بۆ هەم وئەو کەسانەی فەرمانبەردار و سەرشۆری فەرمانی خوان بەگشتی و بۆ مەسلمانان بەتایبەتی .

کاتی خوای مەزن رونی کردەوە بۆ ئادەمیزاد شتی شارەزایی کەرومیهرەبانی بی بۆ پەیروانی ئایینی ئیسلام، لەم ئایەتانەی دواییدا باسی ئەو شتانە ئەکا ئەبنە هۆی بەختیاری مرۆڤ لەهەردو وجیهاندا وئەفەرموی:

إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ
وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ
وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ يَعِظُكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَذَكَّرُونَ
﴿٩٠﴾ وَأَوۡفُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ إِذَا عَٰهَدتُّمۡ وَلَا تَنقُضُواْ ٱلۡأَيۡمَٰنَ

بَعْدَ تَوْكِيدِهَا وَقَدْ جَعَلْتُمُ ٱللَّهَ عَلَيْكُمْ كَفِيلًا إِنَّ ٱللَّهَ يَعْلَمُ مَا تَفْعَلُونَ ﴿٩١﴾ وَلَا تَكُونُوا۟ كَٱلَّتِى نَقَضَتْ غَزْلَهَا مِنۢ بَعْدِ قُوَّةٍ أَنكَٰثًا تَتَّخِذُونَ أَيْمَٰنَكُمْ دَخَلًۢا بَيْنَكُمْ أَن تَكُونَ أُمَّةٌ هِىَ أَرْبَىٰ مِنْ أُمَّةٍ إِنَّمَا يَبْلُوكُمُ ٱللَّهُ بِهِۦ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ مَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٩٢﴾ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن يُضِلُّ مَن يَشَآءُ وَيَهْدِى مَن يَشَآءُ وَلَتُسْـَٔلُنَّ عَمَّا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾

**﴿ إن الله يأمركم بالعدل والأحسان ﴾** بەراستی خوا فەرمان ئەدا بە دادپەروەری و بەچاکە کردن و بەجی هینانی فەرمانەکانی خوا چاکەش لەگەل کەسیکیش خراپەتان لەگەل بکا، خوا ئەبەخشی بەهەموخاوەن مافی مافەکەی خۆی وبەستەم نەکردن، فەرمان ئەدا بە دادپەروەری لەنیوان ئیمە ولەنیوان خوادا بەوەی فەرمانەکانی بەجیگەی خۆی بگەیەنین و دووربکەوینەوە لەبی فەرمانی خوا. فەرمان ئەدا بەداد پەروەری لە نیوان ئیمە وخۆمانا ودور بکەوینەوە لە چاوچنۆکی و رازی بین بەوشتانەی خوا پیمانی داوەو خۆمان قەدەغە بکەین لەوشتانە توشی زیانی هەردوو جیهانمان بکا ولەسنور لامان بدا. فەرمان ئەدا بەدادپەروەری لەنیوان خۆمان و لەنیوان ئادەمیزادا، ئامۆژگاریان بکەین و خراپەیان لەگەلنەکەینوەك خۆمان تەماشایان بکەین و ئازاریان نەدەین. فەرمانمان پی ئەدا بەچاکەکردن لەگەل ئادەمیزاد و جگەی ئادەمیزاد و ئەوپەری چاکەیان لەگەل بکەین بەگویرەی توانای خۆمان .

﴿ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرى ﴾ وە خـوا فـەرمان ئـەدا بـەوەی ببەخشـرێ بەخزمـەکان پێویستیەکانیان و لـەدارایی خۆمان بەشیان بدەین و ئامۆشۆیان بکەین و جنێو و گفتوگـۆی خراپیان پێ نەبێژرێ، ئەگەر بەجۆرە نـەبین پـەیوەندیمان لـەگـەڵ ئـەبچڕێ وخۆشەوسـتی لەنێوانمانا نامێنێ ورق و کینە لـەنێوانمانا گەشە ئەکا وپەرەئەسێنێ، هەتا دێ .

﴿ وَيَنْهى عَنْ الْفَحْشاءِ وَ الْمُنْكَرِ وَالْبَغِي ﴾ وە خوا ڕێگەی گرتوە لـەکردنی کاری بـێز لێکراوەو قەدەغەی کردوە وەك داوێن پیسی وخواردنەوەی مەی وکردنی قومار ودرۆ و بوختان و ڕێگە ئەگرێ لـەشتێ ئەقڵ و یاسای ئیسلام لای خراپ بێ وەکدەسـت درێـژی کردن بۆ سەر ئادەمیزاد بەکردەوەو بەگفتوگۆ، وەڕێگە ئەگرێ لـەدەست درێـژی کـردن لەسەر فەرمانەکانی خواو لـەسەر مافی ئادەمیزاد .

﴿ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴾ بۆئەوەی ئێوە ئامۆژگـاری وەربگـرن وکـردەوەی چاکبکـەن و خۆتان بپارێزن لـەکاری خراپ وبێز لێکراوەو لـەسنوری یاسای خوا لانەدەن .

﴿ وَأَوْفُوا بِعَهْدِ اللهِ إِذا عاهَدْتُمْ ﴾ وە هەر کاتێ ئێوە پەیمانێکتان دا بەکردنی شتێ ئێـوە ئەو پەیمانە جێبەجێ بکەن. جێبەجێکردنی پەیمان بە دووجۆرە: یەکەم ئەوەیـە ئـادەمیزاد بڵێ: پەیمان ئەدەم بەخوا ئەوشتە بکەم یائەو شـتە ئەکـەم لـەوکاتـەدا پێویسـتە ئەوپەیمانـە جێبەجێ بکا بەتەواوی. دووهەمیان ئەوەیە بـاوەڕ بـەخوا بـهێنی، چونکـە ئـەو کەسـەی باوەڕی هێناوە بەڕاستی ئەو باوەڕهێنانە پەیمان دانە بەوەی بەفەرمانـەکانی خـوا هەڵسـێو واز لـە بێفەرمانی خوا بهێنێ، هەرچەندە هەردوو پەیمانەکـە پێویسـتە جێبـەجێ بکرێـت. بەڵام مەبەست لێرە یەکەمیانە.

﴿ ولاتَنْقُضُوا الأَيْمانَ بَعْدَ تَوْلِيْدِها ﴾ وە ئێوە ئەوسوێندانەی خوادروتانە مـەیان شـکێنن لـەدوای ئەوەی ئە وسوێندانەتان بەهێزکردوە بەهۆی ناوی خواوە کـەکارێ بکـەن، ئیـتر ئەو سوێندانە بەڵێندانە بە پێغەمەر یا هەمو سوێندێ بێ، بەمـەرجێ سـوێند خواردنتـان بـۆ کردنی گوناە نەبێ، چونکە سوێند بۆ کردنی گوناە دانابەسترێ. لێرەدا گومانێ پەیدائـەبێ هەرسوێندێ بەتوندی نەبەسترابێ پێویست نیە جێبەجێ بکرێ. بەڵام هەمو سوێندێ ئـەبێ

جیٚبەجیٚ بکریٚ بەهەر جۆریٚ بیٚ هەرچەندە ئەوەیان بەهیٚز کرابیٚ ئەبیٚ چاکتر جیٚبەجیٚبکریٚ .

﴿ وَقَدْ جَعَلْتُمْ اللهَ عَلَيْكُمْ كَفِيْلاً إنَّ اللهَ يَعْلَمُ بِما تَفْعَلُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئیٚوە خواتان کردوە بەئاگادارو زامن بۆ ئەو بەڵیٚنەی داوتانە بەپیٚغەمەر و جگەی پیٚغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، هەرکەسیٚ سویٚند بخواو خوا بکا بەشایەت و زامنی سویٚندەکەی، دوایی ئەگەر دژی سویٚندەکەی هەڵسا بەڕاستی خەیانەتی لەخوا کردوە و شایانی تۆڵەو سزادانە. بەڕاستی خوا ئەزانیٚ بەشتیٚ ئیٚوە ئەیکەن هەرکەسیٚ بەڵیٚن و سویٚندی خۆی بباتە سەر خوا پاداشتی ئەداتەوە بەچاکە ،هەرکەسیٚ بەدژیان هەڵسیٚ خوا سزای ئەداوتۆڵەی لیٚئەکاتەوە .

بیٚژراوە: ژنیٚکی بیٚئەقڵ لەمەکەدا هەبوە بەیانیان خوریەکەی ئەڕیٚسا و ئیٚوارە هەڵی ئەوەشاندەوە، خوای مەزن ئەوکەسانەی سویٚندەکانیان بشکیٚنن بەویٚنەی ئەو ژنەی داناون، وەك خوا ئەفرمویٚ :

﴿ وَ لاتَكُونُوا كالَّتِي نَقَضَتْ غَزْلَها مِنْ بَعْدِ قُوَّةٍ أنْكاثاً ﴾ وە ئیٚوە لەشکاندنی پەیمانا بەویٚنەی ئەوژنە مەبن ڕیٚسراوەکەی خۆی هەڵوەشانەوەو خاوی ئەکردەوە لەدوای ڕیٚسانی ڕیٚسەکەی و بادانی بەباشی کاتیٚ ئەو ڕیٚسەی هەڵئەوەشانەوەو پارچە پارچەی ئەکرد ئەو کچە ناوی (بربطة) کچی سەعد بووە.

﴿ تَتَّخِذُوان إيْمانَكُمْ دَخَلابَيْنَكُمْ أنْ تَكُونُوا اُمَّةٌ هِيَ أرْبى مِنْ اُمَةٍ ﴾ ئایا بۆ ئیٚوە سویٚندەکانتان وەرئەگرن بەکاریٚکی ناڕەواو پوچەڵ لەنیٚوان خۆتانا لەبەرئەوەی نەتەوەیە ژمارەیان زۆرترە و داراییںا فراوانترە سویٚندیان بۆ ئەخۆن هەتا بڕواتان پیٚ بکەن و، ئیٚوە لەهەمان کاتدا لەدڵی خۆتانا نیازی شکاندنی سویٚندەکەتان پەنهان داوە، کەهەرکاتیٚ تاقمیٚ ترتان دەست کەوت توانایان زۆرتر بوو واز لەوان ئەهیٚنن بۆ ئەمان .

﴿ إنَّما يَبْلُونَكُمْ بِهِ وَلَيُبَيِّنَنَّ لَكُمْ يَوْمَ الْقِيامَةِ ما كُنْتُمْ فِيْهِ تَخْتَلِفُونَ ﴾ بەڕاستی خوائیٚوە تاقی ئەکاتەوە بەوەی فەرمان ئەدا بەجیٚبەجیٚکردنی پەیمان وسویٚند خواردن بەبیٚ فیٚڵ و فڕ و بۆ ئەوەیش خوا ڕونی بکاتەوە بۆ ئیٚوە لە ڕۆژی دواییدا شتیٚ ئیٚوە دژی یەکترین

لەوشتەدا لەجیهاندا و بیرو ڕاتان جیاوازە ، هەندێ باوەڕ بهێنی بەسەربەستی و هەندێ تر بێفەرمانی خوا بکا، دوایی خوا پاداشتی هەمویان ئەداتەوە بەگوێرەی کردەوەی خۆیان.

﴿ وَلَوْ شاءَ اللهُ لَجَعَلْتُكُمْ أمّةً واحِدَةً ﴾ وە ئەگەر خوا ئارەزۆی هەبوایە ئێوەی ئەگێڕا بەیەك تاقم و بەیەك ئاین ولەسەر ئایینی ئیسلام ئەبون. بەلام واز لەئادەمیزادئەهێنی بەئارەزووی خۆیان ئایینێ هەلبژێرن، ئەگەر سەربەستیان نەکا بەوێنەی ئاژاڵ و جانەوەر ئەبوون .

﴿ وَلَكِنْ يُضِلُّ مَنْ يَشاءُ وَيَهْدِي مَنْ يَشاءُ وَلَتُسْألُنَ بِما كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ وە بەلام لائەدا لەڕێگەی ڕاست کەسێ ئارەزووی هەبێ، چونکە ڕێگەی ناڕاست بۆ خۆی هەلئەبژێرێ وڕاغویی کەسێ ئەکا ئارەزۆی هەبێ، چونکە ئەزانێ ڕێگەی ڕاست بۆ خۆی هەلئەبژێرێ وئەقلی داوە بەهەردوو لایان و سەربەستی کردوون و، بەڕاستی ئێوە پرسیارتان لێئەکرێ لەشتێ ئێوە ئەیکەن لەچاك و لە خراپ .

وَلَا تَتَّخِذُوٓاْ أَيۡمَٰنَكُمۡ دَخَلَۢا بَيۡنَكُمۡ فَتَزِلَّ قَدَمُۢ بَعۡدَ ثُبُوتِهَا وَتَذُوقُواْ ٱلسُّوٓءَ بِمَا صَدَدتُّمۡ عَن سَبِيلِ ٱللَّهِۖ وَلَكُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَشۡتَرُواْ بِعَهۡدِ ٱللَّهِ ثَمَنٗا قَلِيلًاۚ إِنَّمَا عِندَ ٱللَّهِ هُوَ خَيۡرٞ لَّكُمۡ إِن كُنتُمۡ تَعۡلَمُونَ ﴿٩٥﴾ مَا عِندَكُمۡ يَنفَدُ وَمَا عِندَ ٱللَّهِ بَاقٖۗ وَلَنَجۡزِيَنَّ ٱلَّذِينَ صَبَرُوٓاْ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٦﴾ مَنۡ عَمِلَ صَٰلِحٗا مِّن ذَكَرٍ أَوۡ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَنُحۡيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةٗ طَيِّبَةٗۖ وَلَنَجۡزِيَنَّهُمۡ أَجۡرَهُم بِأَحۡسَنِ مَا كَانُواْ يَعۡمَلُونَ ﴿٩٧﴾ فَإِذَا قَرَأۡتَ ٱلۡقُرۡءَانَ

فَاسْتَعِذْ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ إِنَّهُ لَيْسَ لَهُ سُلْطَانٌ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا وَعَلَى رَبِّهِمْ يَتَوَكَّلُونَ ﴿٩٩﴾ إِنَّمَا سُلْطَانُهُ عَلَى الَّذِينَ يَتَوَلَّوْنَهُ وَالَّذِينَ هُمْ بِهِ مُشْرِكُونَ ﴿١٠٠﴾

﴿ وَ لا تَتخِذُوا أيْمانَكُمْ دَخَلاً بَيْنَكُمْ ﴾ وە ئێوە سوێندەکانتان مـەگێڕن و مـەیان کـەن بەکارێکی نارەوا و پیلان و فێڵ لەنێو خۆتاناو بتانەوێ ناڕاستی لەگـەڵ بکـەن بەپەنـهانی، یانێ بەدەم شتێ بڵێن و لەدڵتانا شتێ تر شاراوە بێ .

﴿ فَيَزِلَّ قَدَمَ بَعْدَ ثبوتِها ﴾ ودوایی هەڵ بخلیسکێنێ پێتان ولەشـەقامی ئیسـلام لابـدەن ودوای ئەوەی خوا باوەڕی لەدڵتانا چەسپاندوە. ئەو ڕستەیە هەڕەشەیە لەو کەسانە وازلە ڕاستی بهێنن بۆ شتێکی پوچ  ووازلەشارەزایی بهێنن بۆ لای ڕێگەی خوارو خێچ .

﴿ وَتَذوَقُوا الْسُوَ بِما صَدَدْتُمْ عَـنْ سَـبِيْلِ اللهِ وَلَكُـمْ عَـذابٌ عَظِـيْمٌ ﴾ وە دوایـی ئێـوە سەختی سزاو ئازار ئەچێژن لەجیهاندا بەهۆی شـتێ لاتـان داو لەبەجیچـهێنانی بـەڵێن و لادانی جگەی خۆتان لەڕێگەی ئایینی خواو، بۆ ئێوە ئەبێ سزایەکی زۆر گەورە لـەڕۆژی دواییـدا، یـانێ هەرکەسـێ ڕێگـە بگـرێ لەبلاوبونـەوەی ئـایینی ئیسـلام لەهـەرکات و جێگەیەبێ پێویستە بیگێڕنـەوە بـەئامۆژگاری کردنـی، دواتـر بەجـەنگ کـردن لەگـەڵیا بەکوشتن یابەدیل کردن لەجیهاندا، لەپاشەڕۆژی دوایشدا سزای گەورەتر ئەدرێ .

﴿ وَ لا تَشْـتَرُوا بِعَـهْدِ اللهِ ثَمَنـاً قَلِيْـلاً ﴾ وە ئێـوە بـەڵێنێ داوتانـە بـەخواو بەپێغەمـەر مەیگۆڕنەوە بـەنرخێکی کـەم و بـەو بەڵێنـەی قورەیشـەکان داویانـە پێتـان ئەگـەر ئێـوە وەرگەڕێن لەئایینی ئیسلام بەڵام ئێوە بەڵێنی خۆتان ببەنەسەر چونکە:

﴿ إنَّ ما عند اللهِ هُوَ خَيْرٌ لَكُمْ إنْ كُنْتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾ بەڕاستی شتیٚ‌لای خوایە ئەو شتە چاكترە بۆ ئێوە لەوسودەی جیهان دەستتان بكەویٚ بەهۆی لادانتان لەپەیمانەكانتان ئەگەر ئێوە بزانن بەو جیاوازیەی نێوان سودی جیهان وسودی ئەوەی لای خوایە بۆ دوارۆژ ،دوایی خوای مەزن ئەو جیاوازییە ڕون ئەكاتەوەو ئەفەرمویٚ :

﴿ ما عِنْدَكُمْ يَنْفَدُ وَ ما عِنْدَ اللهِ باقٍ ﴾ شتیٚ لای ئێوەیە لەدارایی جیهان نامێنێتەوەو ئەوشتەی لای خوایە ئەمێنێتەوەو بەردەوامە لەكردەوە چاكەكان وخوا پاداشتەكانیانی بۆ ئامادەكردوون لەپاشەڕۆژدا بەبیٚ ئەوەی خۆتانی بۆ ماندوو بكەن .

﴿ وَ لَنَجْزيَنَ الَّذِيْنَ صَبَرُوا أجْرَهُمْ بِأحْسَنِ ما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە پاداشتی كەسانێكی ئەوتۆ ئەدەینەوە ئارامیان گرتوە بەرانبەر هەژاری و سەختی وبەردەوامبون لە سەر پەرستنی خوا بەپاداشتیٚ بۆ ئەوان چاكتر و شیرینتر لەپاداشتیٚ ئەیكەن، ئەو پاداشتە بریتیەلە بەهەشت كەزۆر چاكترە لەسوودو پاداشتی جیهان .

﴿ مَنْ عَمَلَ صالِحاً مِنْ ذَكَرٍ أَو أنْثى وَهُوَ مِنْ مُؤمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَهُ حَياةً طَيِّبَةً ﴾ هەركەسیٚ كردەوەی چاكی كردبیٚ لەپیاوان یا لەژنان و ئەو كەسەباوەڕی بەخواو بەپێغەمەر هێنابیٚ، دوایی ئێمە ئەژێنن و بەخێویٚ ئەكەین بەژیانێكی پاك وڕەوا: ئەو ژیانە پاكە بەو جۆرەیە: ئەگەر خاوەن سامانبیٚ بەدڵێكی فراوانەوەو بەسوپاسەوە بەشی هەژاران ئەدا ولەجێگەی چاكا دای ئەنیٚ. ئەگەر هەژار بیٚ خۆی بەبەختیار ئەزانیٚ كەباوەڕدارەو بەبەشی خوا ڕازیەو باوەڕی بەفەرمودەی پێغەمەر هەیە: جیهان بەندیخانەی باوەڕدارانەوە بەهەشتی بیٚ باوەڕانە .

ئەو ئایەتە بەلگەیە لەسەرئەوەی پیاو و ژن بەراوردیان بەكردەوە ئەكریٚ لای خواو ڕێز بۆ پیاو دانانریٚ بەجگەی خۆپاراستن لەبیٚ فەرمانی خوا، ئەگەر ژن كاری چاك بكا وباوەڕداربیٚ وپیاو بیٚ‌فەرمانی خوا بكا ئەو ژنە چاكترە لەو پیاوە لای خوا .

﴿ وَ لَنَجْزِيَنَّهُمْ أجْرَهُمْ بِأحْسَنِ ما كانُوا يَعْمَلُونَ ﴾ وە بەڕاستی ئێمە پاداشتیان ئەدەینەوە بەوەی پاداشتی ئەوان لەڕۆژی دواییدا چاكتر وشیرینترە لەشتیٚ پاداشتی ئەوانی پیٚ دراوەتەوە لە جیهاندا ئەو پاداشتەیش بریتیە لە بەهەشت وڕەزامەندی خوا .

﴿ فإذا قَرَأتَ الْقُرآنَ فَاسْتَعْذِ بِاللهِ مِنَ الْشَيْطانِ الَرَجِيْمِ ﴾ دوای تـۆ هـەرکاتیٚ ویستت قورئانیٚ بخوێنی لەپێشەوە تۆ بلٚیٚ: من پەنا ئەگرم لەگومان پەیداکردنی شەیتانیٚ دەرکراوە لەمیهرەبانی و بەزەیی خوا، ئەوفەرماندانە بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرماندانـە بەنەتەوەکەیشـی، بەلای زۆربەی زانایانەوە ئەوپەناگرتنە لەشەیتان چاك وایە بکـریٚ و پێویست نیـە، ئیتر لەنوێژ دابیٚ یا لەجگەی نوێژ .

﴿ إنّهُ لَيس لَهُ سُلْطانٌ عَلى الّذِيْنَ آمَنُوا وَعَلى رَبّهِمْ يَتوَكَلُونَ ﴾ بەڕاستی شـەیتان هیـچ دەستەلاٚتێکی بەسەر کەسانێکی ئـەوتۆدا نیـە باوەڕیـان هێنـاوە بـەنیازی پاکـەوەو پشـت ئەبەستن لەسەر خوای پەروەردگاری خۆیـان و هـەموو کـارێکی خۆیـان ئەدەنـە دەسـت پەروەردگاری خۆیان .

﴿ إنّما سُـلْطانُهُ عَلَـى الّذِيْـنَ يَتوَلّوْنَـهُ وَالّذِيْـنَ هُـمْ بِـهِ يُشْـرِكُونَ ﴾ بەڕاسـتی شـەیتان دەستەلاٚتی بەسەر کەسانێکی ئەوتۆدا هەیە فەرمانبەرداری شەیتان ئەکەن و شەیتان ئەکەنە کارگوزاری خۆیان و بەسەر کەسانێکی ئەوتۆدا هەیە بەهۆی شەیتانەوە ئەوان هاوبەش بـۆ خوا دائەنێن. هەندیٚ لەزانایان ئەلٚێن: ڕاناوی ( به ) ئەگەڕێتەوە بۆ لای پەروەردگار .

وَإِذَا بَدَّلْنَآ ءَايَةً مَّكَانَ ءَايَةٍ وَٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا يُنَزِّلُ قَالُوٓاْ إِنَّمَآ أَنتَ مُفْتَرٍۭ بَلْ أَكْثَرُهُمْ لَا يَعْلَمُونَ ﴿١٠١﴾ قُلْ نَزَّلَهُۥ رُوحُ ٱلْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ لِيُثَبِّتَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَهُدًى وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ ﴿١٠٢﴾ وَلَقَدْ نَعْلَمُ أَنَّهُمْ يَقُولُونَ إِنَّمَا يُعَلِّمُهُۥ بَشَرٌ لِّسَانُ ٱلَّذِى يُلْحِدُونَ إِلَيْهِ أَعْجَمِىٌّ وَهَٰذَا لِسَانٌ عَرَبِىٌّ

مُّبِينٌ ﴿١٠٣﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ لَا يَهْدِيهِمُ ٱللَّهُ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١٠٤﴾ إِنَّمَا يَفْتَرِي ٱلْكَذِبَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْكَٰذِبُونَ ﴿١٠٥﴾

﴿ وإذا بدلنا آية مكان آية ﴾ وە هەرکاتێ ئیمە فەرمانی ئایەتی بگۆڕین و لەجیگەی ئەو فەرمانەدا فەرمانی ئایەتی تر دابنیین لەجیگەی ئەودا. بیگومان ئەو گۆڕانکاریە لەبەر سوودی ئادەمیزادەو گونجاوی کاتیکی تایبەتیە ئەوانە .

﴿ والله يعلم بما ينزل ﴾ وە خوا ئەزانی بەشتی ئەی نیرینە خوارەوە بەسروش بۆ لای پیغەمەر و هەر خوا بەسوود و بەبەختیاری و چاکەی ئادەمیزاد بەلابردنی فەرمانی و دانانی فەرمانی تر لەجیگەیا ئەزانی، چونکە سوودی ئادەمیزاد داوا ئەکاو خوای بالادەست فەرمانی بدا بەشتی بۆ ماوەیەکی دیاری کراو ئەو ماوەیە کۆتایی پیهات فەرمانی تر لەجیگەیا دائەنی بەگویرەی سوودی ئادەمیزاد .

﴿ قالوا إنما أنت مفتر بل أكثرهم لا يعلمون ﴾ بت پەرستان ئەیان ووت بەپیغەمەر ﴿ﷺ﴾: تۆ لەلایەن خۆتەوە ئەم قورئانەت داناوەو بەدرۆ بەبوختان ئەیدەیتە پال خوا. بەلام زۆرتر لەوان نازانن ئەو گۆڕان کاری قورئانە لەلایەن خواوە هاتوە و ئیوە بەو گفتوگۆیەتان بوختان ئەکەن و ئەلین: پیغەمەر خۆی دایناوە .

قورەیشیەکان ئەیان ووت: موحەمەد گالتە ئەکا بەهاوریکانی، ئەمرۆ فەرمانیان پیئەدا بەفەرمانی، بەیانی ئە وفەرمانە قەدەغە ئەکا وخۆی لەخۆیەوە دای ئەنی، خوا وەلامیان ئەداتەوەو ئەفەرموی :

﴿ قل أنزله روح القدس من ربك بالحق ﴾ تۆ بلی: ئەو قورئانە گیانی ریزگیراو کە جبرەئیلە هیناویەتیە خوارەوە لەلایەن پەروەردگاری تۆوە بەراستی و بەگویرەی ویستی خواو بەدانانی هەمو شتی لەجیگەی شیاوی خۆیا .

﴿ لیثبت الذین آمنوا وهدی وبشری للمسلمین ﴾ لەبەرئەوەی پەروەردگاری تۆ بەهۆی قورئانەوە بچەسپینێ لەدلی کەسانیکی ئەوتۆدا باوەریان هیناوە و باوەرەکەیان و زیاتر بروایان بەهیزبی و، بۆ ئەوەیش ئەو قورئانە شارەزایی کەر و موژدەدەربی بەموسلمانان بەچاکەی بەردەوام بۆیان لە رۆژی دواییدا. بیگومان بی‌باوەرانیش ئەترسینی لەسزای بەردەوام .

ئەگیرنەوە دوو کور هەبوون لەدانیشتوانی ( عین التمر) هاتبونە مەکە شمشیریان دروست ئەکرد ناویان یەسارو جەبربو تەورات و ئینجیلیان ئەخویندەوە، پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بەلایانا ئەرۆیشت و گوی‌ی لی‌ئەگرتن. بت پەرستان ئەیان ووت: موحەمەد لەوانەوە فیری دانانی قورئان بوە. خوای مەزن بەدرۆیان ئەخاتەوەو ئەفەرموی:

﴿ لقد نعلم أنهم یقولون إنه یعلمه بشر ﴾بەراستی ئیمە ئەزانین بت پەرستان ئەیان ووت: بەراستی ئەو قورئانە ئادەمیزادی فیری موحەمەدی ئەکاو بەدرۆو بەبوختان ئەیداتە پال خوا .

بۆ زانین: هەمو کاتی هەر لەکۆنەوە هەتا ئیستا پیاو خراپان پروپاگەندەی خراپ لەدژی پیاوچاکان بلاوئەکەنەوە ،بۆ ئەوەی رژیمی خراپی خۆیان سەرنگون نەبی، لەم سەردەمەی ئیمەیشدا پرو پاگەندەی زۆر پەرەی سەندووە لەدژی ئایینی ئیسلام و زۆر کەسی‌ساویلکە ئەقل خەلەتاون، ئەو بت پەرستانە خۆیان درۆزن و بوختان هەلبەستن کەئەلین ئەو قورئانەئادەمیزاد فیری موحەمەدی کردوە، ئەوەتە خوای مەزن ئەفەرموی:

﴿ لسان الذي یلحدون إلیه أعجمی﴾ زمانی کەسانیکی ئەوتۆ ئاماژە ئەکەن بۆ لای کە ئەو قورئانی فیری موحەمەد کردوە جگە زمانی عەرەبیە. کەواتە جیگەی سەرسورمانە

ئەو کەسانەی زمانی عەرەبی نازانن چۆن ئەوقورئانە فیری موحەمـەد ئەکـەن، بـەو هـەمو پاراوی و زمان رەوانیەدا هەیە کەبەزمانی عەرەبی هاتوەتە خوارەوە .

﴿ وهذا لسان عربي مبين ﴾ وە ئەم قورئانە زمانی عەرەبیەو خـاوەنی خـۆش رەوانیـەو پاراو و ئاشکرایە. ئیوەی بت پەرستی عەرەب بەو زمانە پاراوە عەرەبیەوە هەتانەو خاوەنی پەخشان و هۆنراوەن بەزمانی عەرەبی ناتوانن بچوکترینی سورەتی قورئان دابنین و وینـەی ئەو بی .

دوژمنانی ئایینی ئیسلام لـەسەردەمی پیغەمەرە وە هەتا ئەم سەردەمەی ئیمە ئەو بوختـان و درۆیانەیان کاویژ ئەکەنەوە. لـەم سەردەمەی ئیمەدا موژدەرانـی گـاور ئـەو بوختانـەیان دووپات کردوەتەوە، یا نەزانن خۆیان گیل ئەکەن کە بەراستی قورئـان بـەدەیان زانسـت وزانیاری تیدایە وینە و شوینەواریان لـەو سـەردەمەدا نـەبوە، نـازانن رۆژ لـە دوای رۆژ زانست و هونەری تیدا دەرئەکەوی ، کات مانای قورئان لیك ئەداتەوە رۆژ بە رۆژ .

﴿ إن الذين لا يؤمنون بآيات الله لا يهديهم الله ولهم عذاب اليم ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ باوەر بەئایەتە پەك خەرەکانی قورئان نەهینن وبەردەوامبن لـەسەر بـی بـاوەری خـوا ریگەی راستیان نیشان نادا و بۆیان هەیە لـە دوا رۆژدا سـزایەکی خـاوەن ئـازار بـەهۆی باوەرنەهینانیانەوە .

﴿ إنما يفتري الكذب الذين لا يؤمنون بآيات الله و أولئـك هـم الكـاذبون ﴾ بەراسـتی کەسانیکی ئەوتۆ درۆ دروست ئەکەن بـۆ قورئـان و بـۆ موحەمـەد بـاوەر بەئایەتـە پـەك خەرەکانی خوا ناهینن و بروایان بە زیندوو بونەوە نیەو، ئەوان هەر ئەوانەن خۆیان درۆزن و بوختان دروست کەرن .

پاش ئەوەی بت پەرستان بۆیان دەرکەوت کە هاوری هـەژارەکانی پیغەمـەر باوەریـان هیناوە بەخواو بەپیغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەوینـەی عـەمار و یاسـیر و بـاوکی عـەمار و سـومەیەی دایکی عەمار و سوهەیب و خەتاب وسالم و بیلال. بت پەرستان دەسـتیان کـرد بـە ئـازار دانیان، ئەیان ووت: پیویستە لـەو ئایینەی خۆتان وەرگەرین، ئەوەبو یاسیر یـان کوشـت و

سونەیەیشیان بەست بەدوو هوشترەوە هەر یەکەیان بۆ لایە تی خوری و بو دوولەتەوە. بەلام عەمار بەدەم وەرگەرا لەئایین و دلی پربو لە باوەر، بەو بۆنەوە بیژرا عەمار لەئایین وەرگەراوە، پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: هیچ خراپەیەك توشنابی بەهۆی ئەو کارەوە کردوتە. بت پەرستان پەتیکیان خستە ملی بیلال و دایانە دەست منالان و بەنیو مەکەدا ئەیان گیراو گالتەیان پی ئەکرد. بەلام ئەو هەر ئەیووت: خوا یەکە، دوایی ئەوەبو ئەبو بەکر کری و ئازادی کرد. بەو بۆنەوە خوای مەزن ئەم ئایەتانەی نادرە خوارەوە . فەرموی :

مَن كَفَرَ بِٱللَّهِ مِنۢ بَعۡدِ إِيمَٰنِهِۦٓ إِلَّا مَنۡ أُكۡرِهَ وَقَلۡبُهُۥ مُطۡمَئِنُّۢ بِٱلۡإِيمَٰنِ وَلَٰكِن مَّن شَرَحَ بِٱلۡكُفۡرِ صَدۡرٗا فَعَلَيۡهِمۡ غَضَبٞ مِّنَ ٱللَّهِ وَلَهُمۡ عَذَابٌ عَظِيمٞ ﴿١٠٦﴾ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمُ ٱسۡتَحَبُّواْ ٱلۡحَيَوٰةَ ٱلدُّنۡيَا عَلَى ٱلۡأٓخِرَةِ وَأَنَّ ٱللَّهَ لَا يَهۡدِي ٱلۡقَوۡمَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿١٠٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ طَبَعَ ٱللَّهُ عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ وَسَمۡعِهِمۡ وَأَبۡصَٰرِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡغَٰفِلُونَ ﴿١٠٨﴾ لَا جَرَمَ أَنَّهُمۡ فِي ٱلۡأٓخِرَةِ هُمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴿١٠٩﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ هَاجَرُواْ مِنۢ بَعۡدِ مَا فُتِنُواْ ثُمَّ جَٰهَدُواْ وَصَبَرُوٓاْ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعۡدِهَا لَغَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١١٠﴾

﴿ يَوْمَ تَأْتِي كُلُّ نَفْسٍ تُجَادِلُ عَن نَّفْسِهَا وَتُوَفَّىٰ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ وَهُمْ لَا يُظْلَمُونَ ﴿١١١﴾

﴿ من كفر بالله من بعد إيمانه ﴾ هەر كەسی بی باوەر ببی بەخوا لەدوای باوەرهینانی و لە ئایینی خوا وەرگەرا لەسەر ئەو كەسەیە خەشم و سزای خوا بەهۆی وەرگەرانی لەئایین .

﴿ إلا من أكره و قلبه مطمئن بالأيمان ﴾ مەگەر كەسی زۆری لی كرایی و بەسەر زمانیدا بروا شتی ببیتە هۆی بی‌باوەری بەگویرەی رووالەت و لەو كاتەدا دلی ئارام بگری لەسەر باوەری خۆیی و بیرو باوەری نەگۆرابی، ئەو كەسە خاوەن باوەرە لای خوا. بەوینەی عەمار .

﴿ ولكن من شرح بالكفر صدرا فعليهم غضب من الله ولهم عذاب عظيم ﴾ وە بەلام هەر كەسی دلی بەبی‌باوەری كرابیتەوە و بەخۆشییەوە بی باوەر بوبی، دوایی ئەو كەسانە لەسەریانە خەشمی سەخت لەلایەن خواوە بۆیشیان هەیە سزایەكی زۆر گەورە لەدوا رۆژدا .

﴿ ذلك بأنهم استحبوا الحياة الدنيا على الآخرة إن الله لا يهدي القوم الكافرين ﴾ ئەو خەشم و سزا گەورەیەش بەوبۆنەوە بوە كە بەراستی ئەوان ژیانی جیهانیان هەلبژاردوە و ریزیان داوە بەسەر دوا رۆژدا. بەراستی خوا شارەزایی تاقمی بی باوەرانە ناكا بۆ لای ریگەی راست چونكە ئەوان بەئارەزوی خۆیان باوەریان نەهیناوەو بی باوەریان بۆ خۆیان هەلبژاردووە .

﴿ أ ولئك الذين طبع الله على قلوبهم و سمعهم و أبصارهم و أولئك هم الغافلون ﴾ ئەوانە كەسانیكی ئەوتۆن خوا مۆری داوە ەبەسر دلیاناو چاكەی تی نارواو بەسەر گویچكەیا ناراستی نابیسن و بەسەر چاویانا چاكە نابینن، بەهەمو جۆری لەچاكەوە

دوورن، ئەو کەسانە ئەوانەن بیئاگان لەراستی و خۆیانیان گیـل کـردوەو نـازانن بەسـەر هاتی پاشەرۆژی خۆیان چۆنە .

﴿ لا جرم أنهم في الآخرة هم الخاسرون ﴾ بیگومان بەراستی ئـەو کەسـانە ئەوانـەن زیانیان توش ئەبی لـەدوا رۆژدا و بەبی سەرمایە جیهانیان لـەکیس چوە .

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی کەسیکی فەرمو کە لـەدلـەو ەبەراستی باوەری هینـابو. بەلام بەرووالـەت بی باوەری دەربری، دوایی خوای گەورە باسی ئەکا باوەری بە پیغەمـەر و خوا هیناوە. بەلام لـەمەکەدا ماوەتەوەو کۆچـی نـەکردووە لـەمەکـەوە بـۆ لای مەدینـە لـەگەل پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾، هەندی لـەو شتانەی بت پەرستان داوایان ئـەکرد بـەوانیان ئـەدا، لـەپاشا پەشیمان بونەوە و کۆچیان کرد و لـەگەل پیغەمەر جەنگیان کرد وئارامیـان گـرت لـەسەر جەنگ کردنی بت پەرستان وترسان پەشیمان بونـەوەیان لی وەرنـەگیری، خـوای مەزن ئەم ئایەتانەی ناردە خوارەوە ئەفەرموی :

﴿ ثم إن ربك للذين هاجروا من بعد ما فتنوا ثم جاهدوا و صبروا إن ربـك مـن بعدهـا لغفور رحيم ﴾ لـە پاشا بەراستی پەروەردگاری تۆ بۆ کەسانیکی ئەوتۆ کۆچیان کردوە لـە دوای ئەوەی تاقی کرانەوەو گیرۆدەی هەندی شت بون لـەلایەن بـت پەرستانەوە پاشـتر جەنگیان کرد لـەگەل بت پەرستان وئارامیان گرت لـەسەر جەنگ کردن. بەراستی خـوای پەروەردگاری تۆ لـە پـاش ئـەو شـتانەی ئـەوان کردویانـە لی بوردنـی زۆرە بـۆ ئـەوان و میهرەبان و خاوەن بەزەییە بۆیان کە بی بـاوەری بـەدەمیانا هـاتوە لـەبـەر ئـەوەی خۆیـان بپاریزن لـەئازاری بت پەرستان بەلام دلیان بەردەوام بو لـەسەر باوەر بەخوا وبـە پیغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ .

﴿ يوم تأتي كل نفس تجادل عن نفسها و توفى كل نفس ما عملت و هم لا يظلمون﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە رۆژێ دێ هەمو کەسی لـە ئادەمیزاد بەرگری لـەخۆی ئەکا لـە رۆژی دواییدا و گرنگی بەکەسـی تـر نـادا وئەدریتـە دەسـتی هـەمو کەسـی پاداشـتێ کردویانە لـە جیهاندا و ئەوان ستەمیان لی ناکری بەکەم کردنەوەی پاداشتی چاکـەکانیان.

پیاو چاکان ئەلین: خۆزگایە چاکەی زۆرترمان بکردایە. پیاو خراپان ئەلین: خۆزگایە بی فەرمانی خوامان نەکردایە .

دانیشتوانی مەکە لەخۆشی وئاسایش وبی ترسیدا ئەژیان ،نەئەترسان هیچ کەسی دەست دریژی بکاتە سەریان لەبەر ریزی خانەی خوا، دووایی دەستیان دایە بت پەرستی و کاری خراپ، خوای مەزن سزای دان بەگرانی و برسیتی لەجیهاندا، بەوەیشەوە نەوەستان بەرەنگاری نیشانە رونەکانی خوایان کرد و پیغەمەریان بەدرۆخستەوە و ریگەیان لەراستی ئایین ئەگرت، لەو بارەوە خوا ئەفەرموی :

وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴿١١٢﴾ وَلَقَدْ جَآءَهُمْ رَسُولٌ مِّنْهُمْ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَهُمُ ٱلْعَذَابُ وَهُمْ ظَٰلِمُونَ ﴿١١٣﴾

﴿ و ضرب الله مثلا قرية كانت آمنة مطمئنة يأتيها رزقها رغدا من كل مكان ﴾ وە خوا رونی کردەوەتەوە بۆ هەمو تاقمی خوا چاکەی لەگەل کردبن و سوپاسی خوایان نەکردە وینەی گوندی خاوەنی ئاسیش و ئارام و نەترسان بون لەناکاودا پەلاماریان بدری لەنیشتمانی خۆیانا دانیشتبون لەهەم وجیگەیەکەوە بیت بۆ لایان خواردەمەنی بەفروانی بەبی ماندوبون .

﴿ فكفرت بأنعم الله فأذاقها الله لباس الجوع و الخوف بما كانوا يصنعون ﴾ دوایی دانیشتوانی ئەو گوندە سوپاسی چاکەکانی خوایان نەکرد کە بەوانی بەخشی بو باوەریان نەهینا، دوایی خوا چیژانی بەدانیشتوانی ئەو گوندە و سزای دان بە بەرگی برسیتی و ترس بەهۆی شتی ئەوان ئەیان کرد، بەو بۆنەوە پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لە خوا پارایەوە لە خوا توشی ناخۆشیان بکا، خوا بۆ ماوەی حەوت سال توشی گرانی کردن و دواتر پەلاماری کاروانەکانیان ئەدرا لەلایەن هۆزەکانی عەرەبەوە، بەجۆری توشی گرانی بون گۆشتی مردارۆبو و ئیسکی سوتاو خوینیان ئەخوارد .

﴿ و لقد جاءهم رسول منهم فكذبوه فأخذهم العذاب وهم ظالمون ﴾ وە بەراستی چو بۆ لای دانیشتوانی ئەو گوندە پیغەمەری لەخۆیان، دوایی ئەوان باوەریان پی نەهیناو بەدرۆیان خستەوە، دوایی سزای خوا ئەوانی گرت و بی باوەربون و ستەمیان کرد لە خۆیان .

زانایان بۆ دیاری کردنی ئەو گوندە بیریان جیاوازە: ئایا ئەو گوندە گوندیکی دیاری کراو بوە لەوەوبەر یا بریتی بوە لەمەکە، بەهەر جۆری بی دانیشتوانی مەکە ئەگریتەوە ، کەترسیان لەخۆیان نەبو بەوینەی هۆزەکانی تری عەرەب و پیویستیان بەوە نەبو برۆن بۆ شارانی تر لەهەمو لایەکەوە خواردەمەنی و پیویستی تریان بۆ ئەهات دوایی خوا پیغەمەری بۆ نادرن و باوەریان پی نەهینا و ئازاری خۆی و هاوریکانیان داو، خوای مەزن توشی گرانی وئازاری کرد ن. لەپاشا خوا روی فەرمودەی خۆی ئەکا بۆ لای ئادەمیزاد و ئەفەرموی:

فَكُلُوا۟ مِمَّا رَزَقَكُمُ ٱللَّهُ حَلَـٰلًا طَيِّبًا وَٱشْكُرُوا۟ نِعْمَتَ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ إِيَّاهُ تَعْبُدُونَ ﴿١١٤﴾ إِنَّمَا حَرَّمَ عَلَيْكُمُ ٱلْمَيْتَةَ وَٱلدَّمَ وَلَحْمَ ٱلْخِنزِيرِ وَمَآ

أُهِلَّ لِغَيْرِ ٱللَّهِ بِهِۦ ۖ فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٥﴾ وَلَا تَقُولُوا۟ لِمَا تَصِفُ أَلْسِنَتُكُمُ ٱلْكَذِبَ هَٰذَا حَلَٰلٌ وَهَٰذَا حَرَامٌ لِّتَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَفْتَرُونَ عَلَى ٱللَّهِ ٱلْكَذِبَ لَا يُفْلِحُونَ ﴿١١٦﴾ مَتَٰعٌ قَلِيلٌ وَلَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١١٧﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُوا۟ حَرَّمْنَا مَا قَصَصْنَا عَلَيْكَ مِن قَبْلُ ۖ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿١١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ رَبَّكَ لِلَّذِينَ عَمِلُوا۟ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٍ ثُمَّ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوٓا۟ إِنَّ رَبَّكَ مِنۢ بَعْدِهَا لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿١١٩﴾

﴿ فكلوا مما رزقكم حلالا طيبا و اشكروا نعمة الله إن كنتم إياه تعبدون ﴾ دوایی ئیوە بخۆن لەو شتەی خوا بەئیوەی بەخشیوە بەرەوایی و پاکی ئیتر چۆنی پەیدا ئەکەن رەوابی ئەو شتانە مەخۆن دارایی خۆتان نەبن و بەستەم و بەتالان پەیدا کراون وپیس وبیز لی کراوە نەبن، ئیوە سوپاسی چاکەی خوا بکەن ئەگەر ئیوە خوا پەرستن و باوەرتان بەو هەبی .

﴿ إنما حرم عليكم الميتة و الدم و لحم الخنزير و ما أهل لغير الله به ﴾ بەراستی خوا قەدەغەی کردوە لەسەر ئیوە خواردنی هەمو گیانداری مردار بوبیتەوە و خواردنی خوین و گۆشتی بەراز و شتی دەنگ بەرز کرابیتەوە بۆ جگەی خوا لەکاتی سەررینی ئەو شتە و بۆ جگەی خوا سەر برابی. کەواتە ئەو هوشترانەی گویچکەتان دادرین و ئەتانەوی ریزیان

بگرن، چونکه ئەو هوشترە ( ۱۰ ) جار زاون. کەعەرەب پییان ئەوتن (البحیرة ) و ئەو هوشترانەی بەرەلایان ئەکەن و ریزیان ئەگرن وپیان ئەوتری (السائبة ) ئەو هوشترانه خواردنی گۆشتیان و کارپی‌کردنیان قەدەغه نیه.

﴿ فمن اضطر غیر باع ولا عاد فأن الله غفور رحیم ﴾ دوایی کەسی ناچار کرابی بۆ خواردنی ئەو شتانه لەبەر گرانی و برسیتی و شتی تری دەست نەکەوی لەسنور دەرنەچی و بەئەندازەی پیویستی خۆی بیخواو دەست دریژیش نەکاتە سەر کەسی تر و بەزۆر شتیان داگیر بکا، دوایی ئەگەر لەو شتانه بخوا خوا لی خۆشبونی زۆر زۆره بۆ ئەو کەسانه ناچار بن بیان خۆن میهربانه بۆ ئەوەی دەستوریان پی بدری به خواردنی ئه وشتانه.

﴿ و لا تقولوا لما تصف ألسنتكم الكذب هذا حلالا و هذا حرام لتفتروا على الله الكذب ﴾ وە ئیوه درۆ مەلین لە بەر شتی زمانتان باسی ئەکا: ئەو شتە رەوایه بەبی بەلگه و ئەوەیان قەدەغەیه و ئەوەی لەسکی ئەو بی زمانه دایه رەوایه بۆ نیرینەکانمان و قەدەغەیه بۆ ژنانمان وئەو هوشترە بەرەلا کراوه یا گویچکەی دادراوه خواردنی گۆشتەکانیان و کارپی کردنیان قەدەغەیه، لەبەرئەوەی درۆ هەلبەستن و بیدەن بەسەر خواداد و بلین خوا رەوای کردوون و قەدەغەی کردۆن .

﴿ إن الذين يفترون على اله الكذب لا يفلحون ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ درۆ هەلئەبەستن و ئەیدەن بەسەر خوادا رزگاریان نابی لەسزای خوا و توشی چاکه نابن .

﴿ متاع قليل و لهم عذاب أليم ﴾ رابواردن و خۆشی جیهان ماوەکەی کەمه و ئەبریتەوەو بۆ ئەو کەسانه هەیه لەرۆژی دواییدا سزایەکی ئازار دەر و گران و نەبراوەو بەوینەی رابواردنی جیهان نیه کەم دەوامبی .

﴿ و على الذين هادوا حرمنا ما قصصنا عليك من قبل ﴾ وە ئیمه قەدەغەمان کردوه لەسەر کەسانیکی ئەوتۆ بون بەجولەکه شتی ئیمه خویندمانەوە بەسەر تۆدا لەمەوبەر و لەسورەتی ئەنعامدا باسیان کراوه لە ئایەتی ( ١٤٦ ) کە قەدەغەیە لەسەریان بەز وچەوری گاو بزن و مەر و خواردنی هەمو نینۆك داری لەبالنده .

﴿ و ما ظلمناهم و لكن كانوا أنفسهم يظلمون ﴾ وە ئیمە ستەممان لەوان نەکردوە بەقەدەغەکردنی ئەو شتانە لەسەریان و بەلام خۆیان ستەمیان لەخۆیان کردوە، لەبەرئەوەی ئەوان بێ فەرمانی خوایان کردوە و لەسنوور دەرچوون، دوایی خوا بەقەدەغەی کردنی ئەو شتە سزای دان .

﴿ ثم إن ربك للذين عملوا السوء بجهالة ﴾ لەپاشا بەراستی پەروەردگاری تۆ بۆ کەسانیکی ئەوتۆ کاری خراپیان کردوە نەزان بون و بیریان لەداوڕۆژی خۆیان نەئەکردەوە .

﴿ ثم تابوا من يبعد ذلك و أصلحوا إن ربك من بعدها لغفور رحيم ﴾ لەپاشا ئەو کەسانە پەشیمان بونەتەوە لە دوای کردنی ئەو کارە خراپەیە و کردەوەی چاکیان کردوە دوای ئەو کارە خراپە. بەراستی پەروەردگاری تۆ لەدوای ئە وکارە خوا لی بوردنی بۆ کەسی پەشیمان بوەتەوەو باوەری هیناوە، زۆر بە میهرەبانە بۆ وەرگرتنی پەشیمان بونەوە.

لە پاش ئەوەی خوای مەزن پوچی کردەوە ریگەی چەوتی بت پەرستان لە هاوبەشدانان بۆ خواو تاوانج گرتنیان لە پیغەمەرایەتی موحەمەد، رەوا کردنیان بۆ شتی قەدەغە کرابون و قەدەغە کردنی شتی رەوا کرابون، لەم ئایەتەی دواییدا هەر بەکردەوەی ئیبراهیم بۆریان ئەداو ئەفەرموی :

إِنَّ إِبْرَٰهِيمَ كَانَ أُمَّةً قَانِتًا لِّلَّهِ حَنِيفًا وَلَمْ يَكُ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٠﴾ شَاكِرًا لِّأَنْعُمِهِ ٱجْتَبَىٰهُ وَهَدَىٰهُ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿١٢١﴾ وَءَاتَيْنَٰهُ فِى ٱلدُّنْيَا حَسَنَةً وَإِنَّهُۥ فِى ٱلْءَاخِرَةِ لَمِنَ ٱلصَّٰلِحِينَ ﴿١٢٢﴾ ثُمَّ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ أَنِ ٱتَّبِعْ مِلَّةَ إِبْرَٰهِيمَ حَنِيفًا وَمَا كَانَ

مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٢٣﴾ إِنَّمَا جُعِلَ ٱلسَّبْتُ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ ۚ وَإِنَّ رَبَّكَ لَيَحْكُمُ بَيْنَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فِيمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَخْتَلِفُونَ ﴿١٢٤﴾

﴿ إن إبراهيم كان أمة قانا لله حنيفا و لم يك من المشركين ﴾ بەراستی ئیبراهیم پیشەوایەکە بەتەنها بەرانبەر ئەکری بە نەتەوەیە لەو کارە گەورانەی لەوا کۆبوەتەوە، فەرمانبەردارە بۆ خوا و بەهەموو فەرمانەکانی خوا هەلساوە، ریگەی راستی گرتوەو دوای راستی کەوتووەو وازی لەکاری پروپوچ هیناوەو هەرگیز لەبت پەرستان نەبوە، ئیوەی بت پەرست بی فەرمانی خوا ئەکەن و دوای ریگەی خوار وخیچ کەوتوون و هاوبەش بۆ خوا دائەنین، ئیتر چۆن خۆتان بە ئیبراهیمەوە هەلئەکیشن .

زانایان ئەلین: (أمة) بەزۆر مانا هاتوە: دوو مانایان هەلبژاردووە: یەکەمیان بەمانای پیشەوایە، دووهەمیان ئەوەندە گەورەیە بەرانبەر ئەکری بە نەتەوەیە، هەر چۆنی بی مەبەست ئەوەیە مرۆڤیکی زۆر گەورە بوە .

﴿ شاكرا لأنعمه اجتباه ﴾ ئیبراهیم بە نیازی پاکەوە سوپاسی چاکەکانی خوای کردوە رەوشت بەرز ومیوان بەخیوکەر بوە، ئیوەی بت پەرست سوپاسی خوا ناکەن و دژی چاکەکانی خوا ئەوەستن، خوا ئیبراهیمی هەلبژاردوە بۆ پیغەمەرایەتی و بۆ دۆستایەتی خوا و بۆ ئەوەی خانەی خوا دروست بکا .

﴿ و هداه إلى صراط مستقيم ﴾ وە خوا راغوبی ئیبراهیمی کردووە بۆ لای ریگەی راست و ئایینی ئیسلام نەك بۆ لای ئایینی جولەکایەتی و گاورایەتی کە دوای ئیبراهیم پەیدا بوون و دەست کاری کراون .

﴿ وَ آتَيْناهُ فِي الدُّنيا حَسَنَةً وَ إِنَّهُ فِي الآخِرَةِ لَمِنَ الْصّالِحِيْنَ ﴾ وە ئێمە بەخشیومانە بە ئیبراهیم لە جیهانا چاكەیەكی گەروەی وا هەمو ئاینەكان بەگەورەی دائەنێن و بەلایانەوە وایە كە پێغەمەری خوایە و بەڕاستی لە ڕۆژی دوایشدا لەڕیزی پیاو چاكانایە و پلەی بەرزی ئەدرێتیٚ و ئەو پاڕانەوەی لیٚ وەرگیراوە لەلایەن خواوە كە داوای لە خوا كرد: ئەی خوایە: تۆ زانست بەمن ببەخشە لە ڕیزی پیاوچاكانم دابنیٚ .

﴿ ثُمَّ أَوْحَيْنا إِلَيْكَ أَنْ اتبعْ مَلَّةَ إِبْراهِيْمَ حَنِيْفاً وَما كانَ مِنَ الْمُشْرِكِيْنَ ﴾ لە پاشا ئێمە سروشمان ناردوە بۆ لای تۆ كە تۆ دوای ئایینی ئیبراهیم بكەوی ئیبراهیم ڕێگەی ڕاست و ئایینی ئیسلام یاسا و دەستوری بوەو لەهاوبەشدانەرانی خوا نەبوە. ئەو ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ئایینی ئیسلام و ئایینی ئیبراهیم یەك ئایین بوون لەبارەی بیرو باوەڕ و وازهێنان لەبت پەرستی، كەواتە هەر كەسیٚ بلّیٚ: من لەسەر ئایینی ئیبراهیمم پێویستە باوەڕ بەپێغەمەری ئیسلام بهێنیٚ و خوا بەیەك دابنیٚ .

پرسیار/ بەڕاستی موحەمەد ﴿ ﷺ﴾ گەورەی هەمو پێغەمەرانە، چۆن فەرمانی پیٚ ئەدریٚ دوای جگەی خۆی بكەویٚ لەپێغەمەرانیتر ؟

وەلاّم/ مەبەست لە دواكەوتن لێرە ئەوەیە وەلاّمی بت پەرستان بداتەوە كە ئەیان ووت: ئێمە باوەڕمان بەئایینی ئیبراهیم هەیە و بڕوامان بە ئایینی موحەمەد نیە كەچی هەردوو لایان یەك ئایینن، گومانیشی تێدا نیە پێشكەوتنی ئایینی ئیبراهیم ئەوە ناگەیەنیٚ لەهەمو ئایینیٚ گەورەتر بیٚ و لەئایینی موحەمەد گەورەتر بیٚ .

موسا ﴿ د.خ ﴾ داوای لە جولەكەكان كرد ڕۆژیٚ بۆ خۆیان هەڵبژێرن لە هەفتەیەكدا و ڕێزی بگرن و خۆیان تەرخان بكەن لەو ڕۆژەدا بۆ پەرستنی خوا و ڕاوە ماسی تێدا نەكەن، موسا ڕۆژی هەینی بۆ دیاری كردن، كۆمەڵێكیان ووتیان: ڕۆژی هەینی هەڵنابژێرین و ڕۆژی شەممە بۆ خۆمان هەڵئەبژێرین ؟، دوایی خوا وەلاّمی دانەوە بەمەرجیٚ لەو ڕۆژەدا ڕاوە ماسی نەكەن و ئەوانیش مەرجەكەیان وەرگرت. دوایی دژی فەرمودەی خوا و بەڵێنی خۆیان هەڵناسن و ڕاوە ماسیان بەپیلانێكی خراپ دەست پێكرد، لەو ڕۆژەدا خوای مەزن بەو بۆنەوە سزای دان، بۆ ڕون كردنەوەی ئەو ڕوداوە خوا ئەفەرمویٚ :

﴿ إنّما جَعَلَ السّبْتُ عَلى الّذِيْنَ اخْتَلَفُوا فِيْهِ ﴾ بەڕاستی ئێمە پێویستمان کرد ڕێز گرتن لە ڕۆژی شەممە و وازهێنان لە کارکردن و لە ڕاوە ماسی لەو ڕۆژەدا لەسەر کەسانێکی ئەوتۆ بیریان جیاواز بو لە ڕێزگرتنی ڕۆژی شەممە و ڕێز گرتن لەو ڕۆژە پێویست نەکراوە لەسەر هیچ کەسێ بەر لەوان دووای ئەوان خوای مەزن ڕونی نەکردوەتەوە جیاوازی و ناکۆکی جوەکان، ئایا لەدروست بوونی کارکردنە لەو ڕۆژەدا یا لبەڕێزگرتنی شەممەدایە ؟ هەندێکیان ئەیان ووت: ڕۆژی جەژن شەممەیە، هەندێ تریان ئەیان ووت: ڕۆژی جەژن جگەی ڕۆژی شەممەیە، ئەوەی بەهێزتر بێ ناکۆکیان لەقەدەغەکردنی ڕاوە ماسیدا بو بەجۆرێکی فێلاوی و پیلانێکی خراپ، هەندێکیان ئەیان ووت: قەدەغە نیە، هەندێکی تریان ئەیان ووت: بەجۆرێکی فێلاویش هەر قەدەغەیە .

﴿ وَ إنَّ رَبَّكَ لَيحكم بَيْنَهُمْ يَوْمَ الْقِيامَةِ فِيْما كانُوا فِيْهِ يَخْتَلِفُونَ ﴾ وە بەڕاستی پەروەردگاری تۆ لە ڕۆژی دواییدا فەرمان ئەدا لە نێونیانا لەبارەی ئەو شتە بیرو بۆچونیان دژی یەکترین، فەرمانەکەیشی ئەوەیە: پاداشتی چاکەکانیان ئەداتەوەو سزای خراەپکانیان ئەدا، هەریەکەیان بەگوێرەی شایستەی خۆیان .

کاتێ بۆ پێغەمەر دەرکەوت کە بت پەرستان درۆ ئەکەن لەگومانی خۆیان کە لەسەر ئایینی ئیبراهیمن، زانیشی ئەو جۆرە ناکۆکیان بوە لەنێو خۆیانا و بت پەرستانیش لەسەر ئایینی ئیبراهیم نین و پێغەمەریان بەدرۆ خستەوەو زۆری خەفەت خوارد، خوای مەزن دڵخۆشی ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

ٱدْعُ إِلَىٰ سَبِيلِ رَبِّكَ بِٱلْحِكْمَةِ وَٱلْمَوْعِظَةِ ٱلْحَسَنَةِ ۖ وَجَٰدِلْهُم بِٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِۦ ۖ وَهُوَ أَعْلَمُ بِٱلْمُهْتَدِينَ ﴿١٢٥﴾ وَإِنْ عَاقَبْتُمْ فَعَاقِبُوا۟ بِمِثْلِ مَا عُوقِبْتُم بِهِۦ ۖ وَلَئِن صَبَرْتُمْ

لَهُوَ خَيْرٌ لِّلصَّـٰبِرِينَ ﴿١٢٦﴾ وَٱصْبِرْ وَمَا صَبْرُكَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ وَلَا تَحْزَنْ عَلَيْهِمْ وَلَا تَكُ فِى ضَيْقٍ مِّمَّا يَمْكُرُونَ ﴿١٢٧﴾ إِنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّٱلَّذِينَ هُم مُّحْسِنُونَ ﴿١٢٨﴾

﴿ أدْعُ إلى سَبِيْلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ ﴾ تۆ بانگی ئادەمیزاد بکە بۆ لای ئایینی پەروەردگاری خۆت کە ئایینی ئیسلامە بە گفتو گۆیەکی ڕاست و شیاوی هەمو کەس لە هەمو شوێنێ بێ و بە ئامۆژگاریێکی شیرین بە جۆرێ کار بکاتە سەر مێشکی ئادەمیزاد و هۆشیاریان بکاتەوە، پێویستە بانگ کردنەکەیش دور بێ لەبەدەست هێنانی پلەوپایە و خۆپەرستی، وێنەی هەندێ لە پیاوانیئایینی. پێویستە ئەو بانگ کردنە بە گفتو گۆو بەئامۆژگاری بێ بەگوێرەی ئەقڵ بێ بەجۆرێ ڕاست وخراپ لەیەك جوێ بکرێنەوە، هەتا بزانێ چ کاتێ لەسەر خۆ و هێمنانە بێ و چ کاتێ بە توندی و بە تورەیی بدوێ. یەکەم جار بەنەرم و نیانی بدوێ هەتا ئە وئامۆژگاریە کاربکاتە سەر هەستی و بە هەڵەی خۆی بزانێ ، دواتر بەتوندی ئەگەر بە چاکی زانی .

﴿ وَ جادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنَ ﴾ وە تۆ گفتو گۆ بکە لەگەڵ ئادەمیزاد بەشتێکی ئەوتۆ شیرینتر بێ لە هەمو کارێ، نەرم و نیان و لەسەر خۆ بدوێ لەگەڵیان و ڕێگەیان پێ بدە بیرو ڕای خۆیان دەربڕن، مەبەستت دەرکەوتنی ڕاستی بێ، نەك بتەوێ بیری خۆتی بەسەردا بسەپێنی .

﴿ إنَّ رَبَّكَ هُوَ أعْلَمُ بِمَنْ ضَلَّ عَنْ سَبِيْلِهِ وَهُوَ أعْلَمُ بِالْمُهْتَدِيْنَ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاوری تۆ زاناترە بەکەسێ لایداوە لەڕێگەی ئایینی ئەو، ئەو زاناترە بەکەسێ ڕێگەی ڕاستی وەرگرتوە. کەواتە پێویستی تۆیە ڕاگەیاندنی پەیامی خوا بە نەرم و نیانی و پرسیاری ئەوان لە تۆ ناکرێ کە توندو تیژی وتورەیی لەهەمو کاتێکا چاك نیە .

لـە جـەنگی ئوحـود دا بـت پەرسـتان کـردەوەی زۆر ناشـیرینیان بـەکارهینا لـەگـەل کوژراوەکانی باوەرداران. بە تایبەتی لـەشی هەمزەی مامی پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ کـە جگـەریان دەرهینا و لـوت و گـویچکەیان بری. پیغەمەر فەرموی: جاری تر سەرکەوتین بـە یـاریدەی خوا ئیمە خراپتر بەوان ئەکەین بە زیندوو بەمردوویان. خوای مەزن فەرموی:

﴿ و إن عاقبتم فعاقبوا بمثل ما عوقبتم ﴾ وە ئەگەر ئیوە سـزای دوژمنتـان دا، دوایـی ئیوە سزای ئەوان بدەن بەوینەی شتی وینەی ئەو شتە بی سزای ئیوەی پی دراوە، پیویستـە دادپەروەربن .

﴿ و لئن صبرتم لهو خير للصابرين ﴾ وە ئەگەر ئیوە ئارام بگـرن و سـزایان نـەدەن و رقی خۆتان بخۆنەوە لـەکاتی توانادا بەراستی ئەو ئارام گرتنە چاکترە بۆ ئەوکەسانە خـاوەن ئارامن سەرکەوتن چاکترە لە تۆلـە سەندن و ئازاردان .

﴿ وماصبرك مأصبرك إلا بالله ﴾ وە تۆ ئارام بگرە لـەسەر ئەو ئازارەی توشی تۆ ئەبێ و ئارام گرتنی تـۆ پـەیدا نـابی مەگـەر بـەهۆی یـاریدان و کۆمـەکی خـواوە، ئـارام گرتـن گەورەترین ریزگرتنی خوایە بۆ تۆ وهیزی دل گەورەترە لـەهیزی لـەش .

﴿ و لا تحزن عليهم و لاتك في ضيق مما يمكرون ﴾ وە تۆ خەفـەت مـەخۆ لـەسـەر باوەرنەهینانی بێ باوەران و پەیرەوی نەکردنی ئەوان بۆ تۆ و لـەسەر ئاازردانی تۆ، تـۆ لـە دلتەنگیدا مەبە لـەشتی بت پەرستان ئەیانەوی پیلان بۆ تۆ دروست بکەن و ئەوان نـاتوانن ئەو پیلانە جی بەجی بکەن .

﴿ إن الله مع الذين اتقوا والذين هـم محسـنون ﴾ بەراسـتی خـوا لـەگـەل کەسـانیکی ئەوتۆیە لە خوا ترساون و خۆیانیان پاراستوە لـە بـی فـەرمانی خـوا ولـەگـەل کەسـانیکی ئەوتۆیە چاکە ئەکەن و خوا ئەپەرستن و نیازیان پاکە و جەنگ ئەکەن لـەبەر بەرزی ئایینی خوا و لی بوردنیان زۆرە لـەگەل دوژمنانی خۆیان و ئەوانەی خراپەیان لـەگەل ئەکن .

**بەیاریدەی خوا کۆتایی بەمانای جزمی چواردەهەم هات**

**لەرۆژی هەینی ٢٨ / ١ /٢٠٠١ بەرانبەر ( ٢٨ ) ی شەوال ( ١٤٢٠ ) کۆچی**

**لەشاری سلیمانی و لەمالی خۆمان**

تەفسیری زمناکۆیی

## ﴿ سورەتی ئەلئیسرا ﴾ یا سورەتی ﴿ بەنی ئیسرائیل ﴾

لەمەکـە هاتوەتـە خـوارەوە. هـەندی لـە زانایـان ئـەلین: جگـە لــە ئایەتـەکانی (٢٦-٣٢- ٣٣- ٥٧) هەندی تریان ئەلین: جگە لەئایەتەکانی (٧٣ - ٧٤ - ٧٥ - ٧٦ - ٧٧ - ٧٨ - ٧٩ - ٨٠ ) کـە لـە مەدینـە هاتونەتـە خـوارەوە، ژمـارەی ئایەتـەکانی (١١١) ئایەتن .

## بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

## ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

سوپاس بۆ خوای هەمو بونەوەران. درودی بی پایان لەسـەر پیغەمـەر و لەسـەر یـارو یاوەران و خیزان و پەیرەوانی پیغەمەر بی .

زانایان ئەلین: کاتی پیغەمەری خوا موحەمەدی کـوری عـەبدولا ﴿ ﷺ﴾ لـە هـۆدەی هیندی کچی ئەبو تالیب و کە ئوم هانیئیشیان پی ئەووت، بەسـال و نیـوی بـەر لـەکۆچ کردنی پیغەمەر ﴿ ﷺ﴾، لە ( ٢٧ ) ی مانگی رەجەبدا، کوتوپر جبرەئیل هـات و لەخـەو هەلیساند، دوایی سواری بوراقی کرد بە زین و لەغاو کراوی، بوراق گیانەوەریکـە لـە گوی دریژ گەورەتر و لەهیستر بچووکـتر، بـە سـواری بـوراق رۆیشـت هـەتا گەیشتە بەیتولموقەدەس لەوی دابەزی و چوە نیو بەیتولموقەدەسەوە دوو رکـات نویـژی کـرد. لـە پاشا جبرەئیل بە دەستوری خوا پیغەمەری بەرز کردەوە بۆ لای ئاسمانەکان هەتا بردیـە لای سەیدەتولمونتەها، لەوی خوا سروشی نارد بۆلایی و پەنجا نویژی لەسەرخۆی و ئۆمەتەکەی پیویست کرد لە شەو و رۆژیکا، پیغەمەر ﴿ ﷺ﴾ داوای کرد لەخوای مـەزن بـۆی کـەم بکاتەوە هەتا بۆی کرد بە پینج نویـژ لـە شـەو ورۆژیکـا و پاداشـتەکەی بـە ئـەندازەی پاداشتی پەنجا نویژ بی .

موسڵمانان بە گشتی پێك هاتوون لەسەر پەیدابوونی شەو ڕەوی پێغەمەر و بەرزبونەوەی بۆلای ئاسمانەکان بە گوێرەی فەرمودەی خواو پێغەمەری خوا. بەڵام بیرو بۆچوونی زانایان جیاوازە: ئایا بە گیان و خەو بوە بەبێ لەشەکەی یا بەگیان و بە لەشەوە بوە. بێگومان بە لەش و بەگیانەوە بوە، لێرە و لەم سورەتەدا باسی شەو ڕەوی ئەکرێ، لە سورەتی نەجمدا باسی بەرز بونەوەی پێغەمەر ئەکرێ بۆ لای ئاسمانەکان، بەڵگەیش لەسەر ئەوە کە شەوڕەوی پێغەمەر بەگیان و لەش بوە ڕستەی ( أسْرى بِعَبْدِهِ ) یانی خوا شەوڕەوی کرد بە بەندەی خۆی و ووشەی عەبد بریتیە لە تەواوی گیان و لەش، بەگوێرەی ئەقڵیش شەو ڕەوی بەو جۆرە نەگونجاو نیە، هەرشتێ سروش بیفەرموێ و دژی فەرماندانی ئەقڵ نەبێ پێویستە باوەڕی پێ بهێنرێ . ئەگەر شەو ڕەوی بەگیانی تەنها بێ و بە خەوبێ جێگەی سەرسوڕمان نیە و بت پەرستان کوتوپڕ پێغەمەریان بەدرۆ نەئەخستەوە. ئەوەبو کاتێ پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ گەڕایەوە بۆ جێگەی خۆیی و بۆ هۆدەی هیندی ئامۆزای پێغەمەر فەرموی: من نوێژی خەوتنم لەلای تۆکرد، لە دواییدا چووم بۆ بەیتولموقەدەس و دوو ڕکات نوێژم لەوێ کرد ئێستاش نوێژی بەیانی لەگەڵ ئێوە ئەکەم بەم شێوەیەی کە ئەم بینی، هیند ووتی بەپێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾: ئەم دەنگ و باسە مەگێڕەوە بۆ دانیشتوانی مەکە نەوەك بەدرۆت بخەنەو و ئازارت تووش بێ، پێغەمەر فەرموێ: سوێندم بە خوا بۆیان ئەگێڕمەوە .

کاتێ ئەو هەواڵە بڵاو بویەوە و گەیشت بە قورەیشیەکان بەدرۆیان خستەوەو بە شتێکی نەگونجاویان دانا، چەند کەسێ لەوانە موسڵمان بوبون لە ئایین وەرگەڕان، چەند پیاوێ ئەو ڕوداوەیان بیستبو چون بۆ لای ئەبوبەکر گێڕایانەوە بۆی، ئەبوبەکر فەرموی: ئەوەی ئێوە ئەیڵێن ڕاستبێ، موحەمەد ڕاستی کردوە. بە ئەبوبەکریان ووت: ئایا تۆ بڕوای پێ ئەکەی ؟ ئەبو بەکر ووتی: بڕوای پێ ئەکەم لەوەش زۆرتر بێ، بڕوای پێ ئەکەم لە هەواڵی ئاسمانەکانیشدا، لەو کاتەوە ئەبوبەکر ناونراوە بە ( صدیق ) یانی ڕاستگۆ .

هەندێ لە قورەیشیەکان که چوبونە بەیتولموقەدەس داوایان لە پێغەمەر کرد باسی ئەو جێگایانەی بەیتولموقەدەسیان بۆ بکا، پێغەمەر زۆر بە ووردی بۆی باسکردن، ووتیان: باسەکەت ڕاستە. بەڵام هەواڵمان بدەرێ بەو کاروانەی ئێمە کە بە ڕێگەوەیە ئەوەیان لای ئێمە گرنگە، پێغەمەریش ژمارەی هوشترەکان و نیشانە و چۆنیەتی کاروانەکەی بۆ باسکردن و فەرموی: دێنەوە لەگەڵ خۆر کەوتنی فلان ڕۆژدا و هوشترەێکی ڕەنگ خۆڵاوی لە پێشیانەوەیە، دوو گوێنی دوراوی بە سەرەوەیە، ئەوانیش چون بە دەم کاروانەکەیانەوە، بەو جۆرەی پێغەمەر فەرموبوی هاتە دیی، لەگەڵ ئەوەیشدا ووتیان: ئەمە جادوێکی زۆر گەورەو ئاشکرایە .

بۆ زانین: وەك لەمەوبەر باسمان کرد شەوڕەوی پێغەمەر بەگیان و بە لەشەوە بوە ئەگەر بە گیان و بە خەو بێ جێگەی سەرسوڕمان نیە و کوتوپڕ بت پەرستان پێغەمەریان بەدرۆ نە ئەخستەوە. کەواتە ئەوەی لە دایکی موسڵمانانەوە ئەی گێرنەوە کە عایشە ووتویەتی شەو ڕەوی پێغەمەر بەگیان بوە نەك بە لەشی پیرۆزی و لەشی پێغەمەر لەو جیا نەبوەتەوە لەو شەوەدا دورە لە ڕاستیەوە، چونکە عایشە لە کاتی شەوڕەوی پێغەمەردا منداڵ بوە و ژنی پێغەمەر نەبوە. شەو ڕەوی پێغەمەر بە لەش و بەگیان ئاماژە ئەکا بۆ لای ئەوەی کە ئادەمیزاد پێویستە کار بکەن بۆ مانەوەی لەش و گیانیان نەك بۆ یەکێکیان بە تەنها. شەو ڕەوی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بە سواری بۆراق زۆر ڕون و ئاشکرایە پێویستی بە وولاغ و جگەی وولاغ نیە ئەگەر بە گیانی تەنها و بەخەو بێ .

سوار بوونی پێغەمەر لەسەر بوراق ئامۆژگاری کردنی ئێمەیە بەوەی پێویستە هەمو کارێ ببەسترێ بەهۆێکەوەو هیچ شتێ بە بێ هۆیە پەیدا نابێ کەواتە گران نیە لەسەر خوای پەروەردگاری ئێمە پێغەمەر بگوێزرێتەوە لەمەکەوە بۆ قودس بەبێ هۆیەك و بەبێ بوراق کوتوپڕ پێغەمەر خۆی ببینێ لەبەردەم دەرگای مزگەوتی بەیتولموقەدەسا. بەڵام خوای مەزن فەرمانی داوە بەوەی هەموو کارێ بەگوێرەی دەستوری خۆی بڕوا بەڕێوە و گۆڕان کاری تێدا نەکرێ .

بەکارهێنانی بوراق کە ئەو ماوە دوورودرێژە ببڕێ لەماوەیەکی زۆر کەمدا هاندانە بۆ ئەقڵی ئادەمیزاد بیر بکاتەوە بۆ پەیدا کردنی چەندین هۆی تایبەتی تازە کەماوەی دورو درێژ ببڕن لەماوەی کەمدا. لێرەدا ئێمە پرسیار ئەکەین لە کەسانێکی ئەوتۆ زانا و ئاگادارن: لای ژورەوی خێرایی شتێ لەم بونەورانەدا چەندە بەگوێرەی زانیاری ئێوە ؟ لە وەلامدا ئەڵێن: بەبێ گومان خێرایی ڕوناکی خێرا تر ەلە هەمو شتێ و سێ هەزار کیلۆ مەتر ئەبڕێ لە چرکەیەکدا. کەواتە ئەو بوراقەی پێغەمەر سواری بوە خێراییەکەی بە ئەندازەی خێرایی ڕووناکییە، چونکە بوراق لە بەرق دروست کراوە .

لە ڕوی هەوڵدانی زانیاری ئەم سەردەمەوە ئادەمیزاد زۆر شتیان لە نهێنیەکانی گەردون فێر بوون بەلام ئەو زانیاریە دروست کەری گەردون و ڕوداوی شەو ڕەوی و بەرز بونەوەی پێغەمەریان لە بیر چوەتەوە، بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی شەوڕەوی و بەرزبونەوە خوا ئەفەرموێ:

**بسم الله الرحمن الرحيم**

**بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

سُبۡحَٰنَ ٱلَّذِيٓ أَسۡرَىٰ بِعَبۡدِهِۦ لَيۡلٗا مِّنَ ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡحَرَامِ إِلَى ٱلۡمَسۡجِدِ ٱلۡأَقۡصَا ٱلَّذِي بَٰرَكۡنَا حَوۡلَهُۥ لِنُرِيَهُۥ مِنۡ ءَايَٰتِنَآۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلۡبَصِيرُ ﴿١﴾

﴿ سُبْحانَ الَّذي أسْرى بِعَبْدِهِ لَيْلاً مِنَّ الْمَسْجِدِ الْحَرامِ إلى الْمَسْجِدِ الأَقْصى ﴾ پاك وگەورەیی و دوور لە شتێ نا شایستە بۆ کەسێکی ئەوتۆیە شەوڕەوی کردوە بەندەی خۆی بە لەش و بە گیان شەوێك لە مزگەوتی ڕێزدار لە مەکە بۆ لای مزگەوتێ ناوبراوە

بە ئەقسا لەبەرئەوەی دوورە لە مەسجیدول حەرام لە فەلەستین وئەوکاتە جگە لەو مزگەوتە مزگەوتێ تر نەبوە لە وێدا .

بۆ زانین: مەسجیدول حەرام و مەسجیدلئەقسا وەك یەك وان لە ڕێزگرتنیانا لەچەند لایەکەوە:

١- هەردووکیان پیرۆزن لای مەسلمانان، چونکە بۆ ماوەی سێزدە ساڵ موسلمانان فەرمانیان پێ درابو لە نوێژ کردندا ڕوبکەن بۆ لای مەسجیدولئەقسا لەمەکەوەو چەند مانگێکیش لە مەدینە. لە پاشا فەرمانیان پێدرا لە نوێژ کردندا ڕوبکەن بۆ لای مەسجیدولحەرام، لە ڕێز گرتندا مەسجیدولئەسا لە پلەی سێهەمدا دوای مزگەوتی ڕێزدار و مزگەوتی مەدینەیە .

٢- هەردوکیان لە ڕۆژهەلاتی ناوەندان، مێژووی هەردوو لایان ئەگەڕێتەوە بۆ لای ماوەیەکی کۆن. بەلام مزگەوتی ڕێزدار لەمەکەدا کۆنترو گەورەترەو یەکەم خانوە دروست کرابێ بۆ پەرستنی خوا و خوا پێویستی کردوە لەسەر موسلمانان بڕۆن بۆ لای ئەو مزگەوتە بۆ بەجێهێنانی حەج و عەمرە. مەسجیدولحەرام ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی دروستیان کردوە، ئیسماعیل یەکەم پێغەمەرە بە زمانی عەرەبی گفتوگۆی کردبێ لە جگەی زمانی باوکی. بەلام قودس هۆزی بوەیسیەکانی کەنعانی باری خۆیانیان خست لە کێوێ ناوبراوە بەسەهوین دووهەزار و پێنج سەد ساڵ بەر ەلدایکبوونی عیسا بە سەرۆکایەتی شێخ سالی بوەیسی و بۆ یەکەم جار شاری قودسیان دروست کرد. دوای ئەوەی موسلمانان قودسیان داگیر کرد مزگەوتیان دروست کرد بەناوی مزگەوتی عومەر مزگەوتێ تر بەناوی (قبة الصخرة ) لەنێو مزگەوتی ئەقسادا کە عەبدولمەلیك کوڕی مەروان دروستی کرد و موسلمانان بەڕەوای دانانێن جگەی موسلمانان بچنە نێو ئەو دوو مزگەوتەوە. گێڕراوەتەوە پێغەمەر بوراقی بەستەوە بە سەخرەی پیرۆزەوە و ئێستا پێی ئەوترێت دیواری بوراق و پێغەمەر لەبەردی سەخرەوە بەرزکرایەوە بۆ لای ئاسمانەکان، دوای ئەوەی بەرنوێژی کرد بۆ پێغەمەران .

ئەم قورئانە پیرۆزە ئێمە ئەیخوێنین و گوێی لێ ئەگرین وانەو دەرسێکی زۆر گرنگە کە خوای گەورە فێری پێغەمەری کردوە، هەتا ئەویش لە لایەن خۆیەوە ڕای بگەیەنێ بە هەمو ئادەمیزاد، ئەو وانانەش بریتین لە ناسینی خوا و ئەو شتانەی خوا کردوونی بە یاسا بۆ باوەڕداران، بەوێنەی کردەوە ڕەواکان و ئەو شتانەی قەدەغە کراون، فەرماندان بە جەنگ کردن لە ڕێگەی ئایینی خوادا، بە نیازی پاکە و ئارام بگرن لەسەر ئازارو ناخۆشی بۆ بەدەست هێنانی هەمووشتێکی ڕاست و لە هەمویان گەورەتر باوەڕ کردنە بە گەورەیی خوا لەسەر بنچینەی زانیاری بێگومان. نەك لەسەر لاسایی ودواکەوتنی شتی پڕو پوچ .

بەبێ ووردبونەوە لە جوێ کردنەوەی ڕاستی و ناراستی. لە پاش ئەوەی کە خوا سروشتی نارد بۆ لای فروستادەی خۆی بەو وانە گەورانەوە کە بەڵگەن لەسەر گەورەیی دەسەڵاتی بێ وێنەی خوا کە ئەو ئاسمانەو زەوی و هەمو بونەوەرانی دروست کردوە، خوای مەزن لە نێو هەمو ئادەمزاد پێغەمەری ئیسلامی هەڵبژارد بۆ گەشتێ لە زەویدا و لە مەسجیدولحەرامەوە بۆ لای مەسجیدولئەقسا. لە داویشدا بۆ گەشتێ تر بۆ لای ژوروی ئاسمانەکان، مەبەست لەو دوو گەشتە ئەوەیە کە پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ دەرسێك و وانەیەکی کرداری وەربگرێ لەدوای وانە بیریەکان، بۆ ئەوەیش ئەو وانە سەرسوڕێنەرانە ببینێ کە هیچ ئەقڵێ ڕێگەی پێ نەبردبێ، بۆ ئەوەیش ئادەمیزادی دوای ئەو خۆیان ببەستن بە وانەی کرداری نەك تەنها بە وانە بیریەکانەوە، هەتا خوایەتی و گەورەیی خوایان بۆ دەرکەوێ لە وشتانەی دایناون لە ئاسمانەکان و لە زەویدا بە جۆرێکی زانیاری و دوای ئەفسانە و چیرۆکی پڕوپوچ نەکەون، زۆر جێگەی سەرسوڕمانە بۆ ئەو کەسانەی گومانیان لە گەورەیی خوادا هەبێ و ئەم هەمو بونەوەرانە بەچاوی خۆیان بینێ و بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستانە خوا ئەفەرموێ :

﴿ الَّذِي بارَكْنا حَوْلَهُ لِنَرِيَهِ مِنْ آياتِنا ﴾ ئەو مزگەوتە ئەقسایەی ئەوتۆ ئێمە دەوروبەر وئەملای ئەو مزگەوتەمان پیرۆز و فەڕدار کردوە بەوەی نیشتمانی پێغەمەرانەو بەوەی میوە و باخ و باخات هۆی ژیان و هەرزانی زۆر و روباری ئاوی شیرین و هەوای مام ناوەندیمان لەوا دروست کردوە، لەبەرئەوەی نیشانی ئەو بەندەی خۆمانی بدەین هەندێ بەڵگە و نیشانەی ڕون وگەورە لەسەر توانا و گەورەیی ئێمە لەو جێگە پیرۆزەدا کە جێگەی پەرستنی پێغەمەرەکانە، شەوڕەوی بکرێ بەو بەندەی خۆمەوە بۆ لای ئەو جێگە پیرۆزەدا لە مەکەوە بەڕۆیشتنی ئاسایی بە چل شەو وڕۆژ ئەبرڕێ و درێژی نێوان ئەوە دوو مزگەوتە هەزار و دوو سەد وسی کیلۆمەترە، بەگوێرەی لێکۆڵینەوەی هەندێ لە زانایانی بڕوا پێ کراو کە بەماوەیەکی زۆر کەم لەشەوێکدا بڕیوێتی .

﴿ إِنَّهُ هُوَ السَّمِيْعُ الْبَصِيْرُ ﴾ بەڕاستی خوا ئەبیستێ گفتوگۆی بێ باوەڕان و بەدرۆخستنەوەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئەبینێ ئەو کەسانەو بەسەرهاتیان و بەسەرهاتی باوەڕداران و ڕۆیشتنی بەندەی خۆیی و چاودێری کردنی لە تاریکی شەودا و ڕێز گرتنی و پلەی بەرز و بەرزکردنەوەی بۆ لای ئاسمانەکان .

وَءَاتَيْنَا مُوسَى ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلْنَٰهُ هُدًى لِّبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ أَلَّا تَتَّخِذُوا۟ مِن دُونِى وَكِيلًا ﴿٢﴾ ذُرِّيَّةَ مَنْ حَمَلْنَا مَعَ نُوحٍ إِنَّهُۥ كَانَ عَبْدًا شَكُورًا ﴿٣﴾

﴿ وَ آتَيْنا مُوسى الْكِتابَ وَ جَعَلْنا هُدىً لِبَنِي إِسْرائِيْلَ ﴾ وە ئێمە بەخشیومانە بە موسا نامەیەکە تەوراتە ئێمە ئەو نامەیەمان گێڕا بو بە ڕاغومایی کەر وشارەزایی کردن بۆ نەوەکانی ئیسرائیل، ئیسرائیل ناوی یەعقوبی کوڕی ئیسحاقی کوڕی ئیبراهیمە، ئێمە ووتمان: بە بەنو ئیسرائیلیەکان .

﴿ ان لا تتخذوا من دوني وكيلا ﴾ كە ئیوە وەرمەگرن بۆ خۆتان كەسیك كاری خۆتانی پی بسپیرن لە جگەی من. بەلام ئەوان دەست كاری ئەو نامەی خوایەیان كردو دەستیان كرد بە گویرەكە پەرستن و پیغەمەرەكانی خۆیانیان بەدرۆ خستەوە، زەویان پڕكرد لە ستەم كردن بەهەموو توانای خۆیانەوە. یانی ئیمە وەك ریزی ئەوانمان گرت ریزی پیغەمەری ئیسلاممان گرت بە شەورەوی كردن و بەرز بونەوە .

﴿ ذر ية من حملنا مع نوح ﴾ ئەی منال و نەتەوە و خاو خیزانی كەسی ئیمە هەلمانگرتن لەگەل نوحدا و سواری كەشتی بون رزگارمان كردن لە خنكاندن بە ئاوی لافاو لەو كاتەدا بۆئەوان پەروەردگاری نەبو بۆ ئەوان لە جگەی خوا پەنای بۆ ببری. كەواتە ئیوە هاوبەش بۆ ئیمە دامەنین: ئەو كەسانە خوا سواری كەشتی كردوون و رزگاریانبوە لەخنكان بریتی بون لە سی كوری نوح: حام، سام، یافیس و ژنەكانیان، لە نەوەی ئەوان بون بەنو ئیسرائیلیەكانی كاتی موسا كە لە بەرەی دووازدە كوری یەعقوبن، ئیبراهیم و نەوەی ئیسماعیل لە سامی كوری نوحن. خوای مەزن بەو ئایەتە بیری كوران و نەوەكانیان ئەخاتەوە خوا ئەو چاكانەی لەگەل كردوون كەچی سوپاسی خوا ناكەن و خراپە بلاو ئەكەنەوە بەسەر زەویدا .

﴿ إنه كان عبدا شكورا ﴾ بەراستی نوح كە باپیری ئیوەیە رزگارمان كردن لە خنكاندن بەندەیەكە زۆر سوپاسیخوای ئەكردلە كاتی خۆشی و ناخۆشیدا. ئیمە بە هۆی سوپاس كردنی نوحەوە ئیوەمان رزگار كرد لە خنكان. كەواتە ئیوەیش سوپاسی خوا بكەن و جگەی خوا مەپەرستن وینەی باپیرە گەورەی خۆتان كاتی خوای مەزن فەرمانی خۆی ئاراستەی بەنو ئیسرائیلیەكان كرد، لەمەودوا باسی ئە وشتانە ئەفەرموی خوا بەوانی بەخشیوە و باسی بەسەرهات و پاشەرۆژیان ئەكا و ئەفەرموی:

وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا

عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُوْلِي بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُواْ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَاۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْأٓخِرَةِ لِيَسُـٓـُٔواْ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُواْ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُواْ مَا عَلَوْاْ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾ عَسَىٰ رَبُّكُمْ أَن يَرْحَمَكُمْۚ وَإِنْ عُدتُّمْ عُدْنَاۚ وَجَعَلْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ حَصِيرًا ﴿٨﴾

خوای مەزن هەوال ئەدا بە بەنو ئیسرائیلیەکان لـەم ئایەتانـەی دواییـدا کـە دووجـار خراپە و ستەمیان بلاو کردەتەوە لە زەویدا، جاری یەکەم خـوای مـەزن کەسـانیکی بـۆ ناردن رسوا و سەر شۆریان کردن بە کوشتن و دیـل کـردن و تـالان کردنـی سامانیان و دەربە دەری‌کردنیان، لـەدوای ئەو دەربەدەریە خوا هیز و توانای پی بەخشینەوە بۆ جـاری تر. بەلام ئەوان بۆ جاری تری دووهەم دەستیان کردەوە بە خراپە و ستەم بلاوکردنەوە لـە زەویدا، خوای مەزن دووبارە کەسـانی تـری نـاردە سـەریان، ئـەوانیش بـۆ جـاری تـری دووهەم سەرشۆر ورسوای کردنەوە، بۆ ئـەو مەبەسـتانە خـوای مـەزن بـەدریژی رونـی ئەکاتەوە و ئەفەرموی:

﴿ و قضينا إلى بني إسرائيل في لكتاب لتفسدن في الأرض مرتين ﴾ وە ئيمە بەنو ئيسرائيليەكانمان ئاگادار كرد و هەوالمان دانی لە نامەی ئيمە دا كە تەوراتە: بەراستی خراپە و بی فەرمانی خوا بلاو ئەكەنەوە لە زەوی فەلەستينا دوو جار خراپ لەدوای خراپ: يەكەميان بە هەلسانتان لەدژی فەرمانی خوا، بەتايبەتی بەند كردنی ئيرميا پيغەمەر لە چاليكدا وبريندار كردنی كە موژدەی دا بە ئيوە بە هاتنی موحەمەد. دووهەم جار لەپاش دوو سەد سال بە كوشتنی زەكەريا و يەحيا و هەوالدانتان بۆ كوشتنی عيسا، لە هەردوو جارەكەيشدا بە خواردنی سود وگۆبەن و پيلان لە دژی دانيشتوان .

﴿ و لتعلن علو كبيرا ﴾ وە ئيوە خۆتانتان بە گەورە و بەرز دانەنا بەبەرزكردنەوەيەكی گەورە و لەستنوور دەرچوون و خۆتانتان لادرا لە ئاستی ياسای خوا ولادانتان لە پەرستنی خوا و هيز و توانای خۆتانتان بەكار ئەهينا بۆ بلاو كردنەوەی خراپە و ستەم كردن لە پياو چاكان و خوا پەرستان و پی شيل كردنی ريزی جيگە پيرۆزەكان ،قورئانی پيرۆز زۆرجار ووشەی ( علو ) بەكار ئەهينی لە بۆ شتی لە بی فەرمانی خوا و لەستەم كردندا و بلاوكردنەوەی خراپە لەزەويدا .

﴿ فإذا جاء وعد أولاهما بعثنا عليكم عبادا لنا أولي بأس شديد ﴾ دوايی كاتی هات ئە وسزايە بەلينی پی درابو لەبەر بلاوكردنەوەی خراپە لە جاری يەكەمی ئەو دووجارەی بەنو ئيسرائيليەكان ئەيان ئيمە رەوانەمان كرد بۆ سەر ئيوە چەندين بەندە ئيمەی خاون شكۆ و خاوەن هەلمەتی سەخت ،مەرج نيە ئەو بەندانەی خوا باوەرداربن .

﴿ فجاسوا خلال الديار ﴾ دوايی ئەو بەندانەی ئيمە هاتوچۆيان ئەكرد بەناو شار ونيشتمانی ئيوەدا بۆ كوشتن و پەلامار دانتان و تۆلەی هەمو خراپەيەكی خۆتانی لی كردنەوە بە ئەوپەری رسوايتانەوە .

بۆ زانين: ئە وتاقمە خاوەن هيز و شكۆيانە بريتی بون لە بابوليەكان بەسەرۆكايەتی بەختە نەسر، ئيوەيان بەزۆری كوشت و خۆتان و منالەكانتانيان بەديل گرتن، تەوراتيان سوتاند. ئەو روداوە بەر لەدايك بوونی عيسا بە ( ٥٩٦ ) يا لە نزيكەی ( ٥٨٦ ) . يانی نزيكەی هەزار سال بەر لە ناردنی پيغەمەری ئيسلام .

﴿ و كان وعدا مفعولا ﴾ وەكاتی سزادانی ئەوان بە لینیك بو پیویست بو جـی بـەجی بكرایە بەبی گومان، پوختەی مانای ئە وئایەتانە ئەوەیە: كاتی بەنو ئیسرائیلیەكان لەجاری یەكەمدا خراپەیان بلاو ئەكردەوە خوا تاقمیكی هیزداری نارده سەریان پیاوەكانیان كوشتن و دیلیان كـردن و دەربـەدەریان كـردن، ژنـەكانیان كـران بـە كارەكـەر و شـارەكانیان روخاندن و تالانیان كردن.

قورئـانی پـیرۆز رونـی نەكردوەتـەوە جیگـە و كـاتی خراپـە بـلاو كردنـەوەی بـەنو ئیسرائیلیەكان بەلام میژوو نوسـان ووتویانـە: لـە پـاش روداوی دەشـتی ( تەیـها ) بـەنو ئیسرائیلیەكان بەفەرمانی خوا پەلاماری فەلـەستینیاندا بەسـەرۆكایەتی یوشـەع پیغەمـەر و كوری نون جیگەداری موسای كوری عیمران و فەلـەستینیان داگیر كرد و هەمو سامان و دارایی دانیشتوانی ئەو شوینانەیان داگیر كرد وبون بەخاوەنی پیت و فەری ئە وجیگایانـە، زۆربەی دانیشتوانی ئە وجیگایانە كەنعانیەكان بون، هەموویان بنەبر بوون یا كردیـانن بـە بەندە و خزمەتكاری خۆیان. دوایی هەلویست و هەلسانی جولـەكەكان لـەگەل یوشـەعدا هەروەك هەلویستیان بو لـەگەل موسادا لـە خراپە كردن و بی شەرمی و بـی رەوشـتی لـە گەلیان، ئەو رووادوە و سزادانی جولـەكەكان بـە دەسـتی بەختـە نەسـر بـوە لـە جـاری یەكەمدا. بەلام جاری دووهەم بە دەستی رۆمەكان بوە كوشتن ودیل كردنیان ئەو باسانەی رابوردون جیگەی متمانە و بروان، هەرچەندە هەندی لە زانایان لایان وایـە لـەناوبوردنی جوەكان بۆ جاری دووهەم هیشتا نەهاتوە و لـەمەوپاش بە دەستی موسلمانان پـەیدا ئـەبی لـە فەلـەستیندا. بەلام بەلگەیان بەدەستەوە نیە .

﴿ ثم رددنا لكم الكرة عليهم ﴾ لە پاشـا ئیمـە بـۆ ئیوەمـان گـیرابوەوە دەسـەلات و سەركەوتنتان بەسەر ئەوانەدا ئیمە رەوانەمان كردبون بۆ تەفرو تونا كردن و سزدانی ئیـوە كە بابولیەكان بون .

﴿ و امدناكم بأموال و بنين و جعلناكم أكثر نفيرا ﴾ وە ئيمە يارمـەتی ئيوەمـاندا و بـە ئيوە بە خشيبو سامان و دارايی و كوری زۆر. دوای پەشيمان بونەوەتان لـە خراپە كـردن و گيرابومان بۆ ئيوە ژمارەی زۆر لـە پياوان، لـەبەرئەوەی ئيوە بتوانن مافی زەوت كـراوی خۆتان وەربگرنەوە دوژمنەكانتان تەفر و تونا بكەن وبچنەوە بۆ لای فەلـەستين .

ئەوەی زانرابی بەنو ئيسرائيليەكان جەنگيان نەكردوە لـەگـەل بابوليـەكان بـۆ رزگـار كردنی خۆيان .بەلام ئيمە خستمانە دلی بەهمەنی كوری ئەسفەنديارى پاشای فارسـەكان بەر لـەدايكبونی عيسا بە ( ٥٣٨ ) سال بەزەيی بيتەوە بە جولـەكـە دەربـەدەركراوەكاندا، ئەوەبو فارسەكان پەلاماری بابولـيان دا دەستيان گرت بەسەر فەلـەستينا و ئەوەی مابونەوە لە پياوانی بەختە نەسر دەريان كرن. ئـەو جولـەكانـەی بـەند كرابـون رزگاريـان كـردن، لـەدواييدا چونەوە بۆ فەلـەستين بە پشتيوانی فارسەكان لــەجاری پيشـوو باشـتر وبـەهيزتر بوون. بەكورتی پاشای فارسەكان پەلاماری بابوليـــەكانی داو داگـيری‌كردن، ژنيكـی لــە جولـەكـەكان خواسـت و ئەوژنـە داوای لـەپاشـا كـرد كـە خزمـەكانی بگيريتـەوە بــۆ بەيتولموقەدەس، پاشای فارسەكان لـەبەر دلــی ژنەكـەی ناردنيـەوە بـۆ جيگـەی پيشـووی خۆيان بەلام جوەكان كە پشويان داو كەوتنە خۆشی گەرانەوە بۆ لای رەوشتە خراپەكەی خۆيان و لاياندا لـە ئايينی خوا، زەكەريا ويەحيايان كوشت و نيازی كوشـتنی عيسايشيان كرد .

﴿ إن أحسنتم احسنتم لأنفسكم و إن أسأتم فلها ﴾ ئەگەر ئيوە چاكەتان كردبـی ئيـوە چاكەتان بۆ خۆتان كردوە ئەگەر ئيوە خراپەتان كردبی، دوايی تۆلـەی خراپـــەكانتان هـەر بۆ خۆتانە .

﴿ فأذا جاء وعد الآخرة ﴾ دوايی كاتی چو بۆ لای جوەكان ئەو ســزايەی تـر بـەلينی پی درابوو توشيان ببی ئازارە پيشوەكانيان نەما و بۆ جاری دووهەم دەستيان كـردەوە بـە خراپە كردن نۆرەی سزادانی جاری دووهەم هات و خوا تاقمی تری ئـادەميزادی رەوانـە كرد بۆ لای بەنو ئيسرائيليەكان:

﴿ ليسو أوجوهكم و ليدخلوا المسجد كما دخلوه اول مرة ﴾ لەبەرئەوەی ئەو تاقمە ئازاری ئیوە بدەن و پاش ماوەی ئازارەکەیان بەرومەتتانەوە دیاربی و بۆ ئەوەیش ئەوتاقمە بچنە نیو مزگەوتەوە لەشاری قودس و ئەم لاولای شارەکە بەوجۆرەی جاری پیشو تاقمەکەی تر چونە ناوی بە سەرۆکایەتی بەختە نەسر. ئەو تاقمانەمان رەوانەکرد بۆ لاتان:

﴿و ليتبروا ماعلوا﴾ وە بۆ ئەوەیش لەناو بن هەموو شتی ئەوان دەستیان گرتوە بەسەریا بە لە ناوبردنیکی زۆر گەورە. یانی بەنو ئیسرائیلیەیکان کاتی لەجاری دووهەمدا دەستیان کردەوە بەخراپە کاری لە زەوی فەلەستینا خوا ناردیە سەریان کەسی سزایان بدا، دوا رۆژیان وەك جاری یەکەم لی بکا بەکوشتن و دیل کردن و دەربەدەر کردنیان و کاو ل کردنی جیگەکانیان .

بۆ زانین: ئەو کەسەی جاری یەکەم پەلاماری جوەکانی دا وبەیتولموقەدەسی کاول کرد بەختە نەسر بوو ئەوکەسەیش جاری دووهەم پەلاماری دان پاشای روم بوو ئەویش دووبارەبەیتولموقەدەسی کاول کرد ئەوەیشمان لە بیر نەچی هەردوو خراپەکانیان و سزدانیان بەر لەئاپینی ئیسلام بوە، ماوەی هەردوو پەلاماردانەکانیان نزیکەی پینج سەد سالی خایاندوە .

﴿ عسى ربكم أن يرحمكم ﴾ بۆ ئەوەی پەروەردگاری ئیوە میهرەبانی بکا لەگەل ئیوەوە بەزەیی پیتانا بیتەوە لە دووای جاری دووهەم ئەگەر ئیوە پەشیمان ببنەوە .

﴿ و إن عدتم عدنا ﴾ وە ئەگەر ئیوە بگەرینەوە بۆ لای خراپە کردن و بۆ لای خۆ بە گەورە دانان بەرانبەر بە ئیمە ئیمەیش ئە گەرییینەوە بۆ لای سزادانی ئیوە و سەرشۆریتان بۆ جاری سیهەم و گەلیکی تر بەسەرتانا زال ئەکەین بەوینەی دووجارەکانی پیشوو. بەلام جوەکان کۆلیان نەداو تەمی خوار نەبوون و گەرانەوە بۆ لای خراپەکانی پیشویان، پیغەمەری ئیسلامیان بە درۆ خستەوەو نیازی کوشتنیان کرد، هەروەك ویستیان عیسا بکوژن. بەو بۆنەوە خوا مەسلمانانی بەسەریانا زال کرد، هۆزی بەنو قورەزیان کوشت و هۆزی بەنو نەزیریان دەرکرد و خەیبەریان داگیر کرد و نیوەدورگەی عەرەبیان

لەوان پاك كردەوەو سەرانەیان لەسەر پیویست كردن، هەندی لە زانایان ئەلین: بۆ جاری سیهەم خوا ئەكاسیرەكانی بەسەردا زال كردن و سەرانەیانی لەسەر دانان .

﴿ و جعلنا جهنم للكافرین حصیرا ﴾ وە ئیمە دۆزەخمان گیراوە بە بەندیخانە و ژیرخەر بۆ بی باوەران. بگرە و بەردەی بەردەوام هەبوەو هەیشە لە نیوان زانایانی موسلمانندا لە بارەی ئەو دوو خراپانە جوەكان كردویانە و لەبارەی ئە ودووسزایەش ئەوانی پی سزا دراوە كە لەمەوبەر باسیان كرا؟ دوبارە ئایا ئەو جارەی سیهەم كەخوا باسی فەرموە بەرستەی (و إن عدتم عدنا) ئایا لەمەوبەر پەیدا بوە یا لەمەوپاش دیت. لە ماناكردنی ئایەتەكاندا رون كرایەوە، هەرشتی بیژری گۆترەكارریە و رەگەز خۆشەویستیە .

بۆ زانین: لەكانونی دووهەمی سالی ( ١٩٦٩ ) بگرەو بەردەیە هیمنانە لەسەر لاپەرەكانی رۆژنامەی (الأخباري) میسردا رویداوە دەربارەی فەرمودەی خوا لە بۆدیار ی كردنی ئەو دوو خراپە بەنوئیسرائیلیەكان كردویانە، لەو بگرە و بەردەدا ژمارەیەكی زۆر لە پیاوانی خاوەن ئەقل و زانست هاوبەشیان تیدا كردبوو، ئەو كارە ماوەیەكی زۆر دەوامی كرد، رۆژنامەی ناوبرا و لە ژمارەی رۆژی هەینی لەو مانگە دا بلاوی كردەوە، هاوبەشانی ئەو گفتوگۆیانە بون بە دوو بەشەوە :

تاقمی یەكەمیان ئەلین: لیدان و داگیر كردنی جوەكان پەیدا بوە لەسەر دەستی موسلمانان لەكاتی عومەری كوری خەتابا. لیدانی جوەكان بەوە ئەبی خوا لەمەودووا دەستەلات ئەدا بەموسلمانان و زاوینیەكان لەناو ئەبەن و زەوی داگیركراو دیتەوە بۆ ژیر فەرمانی موسلمانان، ئەو تاقمە سەرچاوەی راستی نیە بۆیان مەگەر خۆشەویستی بۆ نەتەەی موسلمانان، پیویستە قورئان لەو جۆرە بیرو بۆچونە پاك بكرینەوە، چونكە قورئان نامەی زانست و روناكیە لەلایەن خواوە، یاساو دەستوری گەردون گۆرانكاری بۆ نیە و بۆ هەمو بونەوەران دانراوەو بەخۆشەویستی نابی مانای نامەی خوا بكری .

تاقمی دووهەمیان ئەلین :بەراستی ئەو دوو خراپانەی جوەكان بلاویان كردەوەتەوە و ئەولیدان و تەمی كردنانەی ئەوان بۆ هەردوو جارەكەیان پەیدا بوە بەر لەهاتنی ئایینی

ئیسلام. یەکەم لێدانیان پەیدا بوە بەر لـەپەیدا بوونی ئیسلام بەهەزار ساڵ لـەسـەر دەستی بەختە نەسر یا سەنجاریبی باوکی نەسر کە قودسیان کـاول کـرد و هەیکـەلی سـولەیمانیان سوتان و قەسابخانەیان دانا بۆکوشتی جوەکان و ئەوانەیان مابونەوە بـە پیـاو ژن ومناڵـەوە کردنیان بەیەندە و بردنیان بۆ بابول .

لێدانی دووهەمی بەنوئیسرائیلیەکان پەیدا بوە بەر لـە ( ٧٠ ) سـاڵی زایینـی لەسـەر دەستی ( تەبتوسی ) ڕۆمانی و پـەلاماری شـاری جولـەکـەکانی داو قـەڵاکانی ڕوخـاند و چوەنێو شارەکانیان و هەیکەلیان ڕوخاند و نزیکەی ملیۆنێکیان کوژران وزۆریـان کـرد نبە بەندە و لـە بازاڕ فرۆشتنیان وئەوانی تریان لـە ڕوی زەویدا بڵاو بونەوە .

هەر ئەو تاقمەی دووهەم ئەڵێن: قورئانی پیرۆز ڕونی نەکردوەتەوە بە هیچ جـۆرێ بـۆ جاری سێهەم بەنو ئیسرائیلیەکان فەلەستین داگیر ئەکەن و بێگومان بەنو ئیسـرائیلی ئـەو کەسانەن لـە کوڕ ونەوەی ئەو دووازدە کوڕی ئیسحاقی کوڕ یەعقوبن. کەواتـە ئەوانـەی لـەم سەدەمەدا فەلـەسـتینیان داگـیر کـردوەو نـاوی خۆیانیـان نـاوە بـەڕژێمی ئیسـرائیلی پەیوەندییان بە ئیسرائیلەوە نیە. بەڵکو ئەوانە کۆمەڵێکن دروست کراون لـەلایـەن داگـیر کـەرانی ڕۆژئـاواوە بـۆ تـالان کردنـی زێـڕی ڕەش و سـامانی ڕۆژهـەڵاتی نـاوەند، ئـەو پڕوپاگەندەیە بەناوی تەلمود و تەوراتەوە بڵاوی ئەکەنەوە فەلـەستین نیشتمانی کۆنی ئەوانـە و بۆی ئەگەڕێنەوە دەست هەڵبەتی خۆیانە لـە دژی موسڵمانان و دانیشتوانی فەلـەستین .

کاتێ خوای مەزن ڕونی کردەوە ئـەو شـتانەی خـوا دابونـی بـە پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ لـە شەوڕەوی بۆ بەیتولموقەدەس ئەوەیشی ڕون کردەوە بەخشیبوی بە موسا تەورات و باسـی یاخی بوونی بەنو ئیسرائیلی کرد، دوایی بۆ مانی ڕوون ئەکاتەوە ڕێگەی شارەزایی بۆ لای خوا بەجگەی پەیرەوی قورئان پەیدا نابێ و ئەفەرموێ :

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ وَيُبَشِّرُ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا كَبِيرًا ﴾ (٩)

وَأَنَّ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْآخِرَةِ أَعْتَدْنَا لَهُمْ عَذَابًا أَلِيمًا ﴿١٠﴾ وَيَدْعُ ٱلْإِنسَٰنُ بِٱلشَّرِّ دُعَآءَهُۥ بِٱلْخَيْرِ ۖ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ عَجُولًا ﴿١١﴾ وَجَعَلْنَا ٱلَّيْلَ وَٱلنَّهَارَ ءَايَتَيْنِ ۖ فَمَحَوْنَآ ءَايَةَ ٱلَّيْلِ وَجَعَلْنَآ ءَايَةَ ٱلنَّهَارِ مُبْصِرَةً لِّتَبْتَغُوا۟ فَضْلًا مِّن رَّبِّكُمْ وَلِتَعْلَمُوا۟ عَدَدَ ٱلسِّنِينَ وَٱلْحِسَابَ ۚ وَكُلَّ شَىْءٍ فَصَّلْنَٰهُ تَفْصِيلًا ﴿١٢﴾

﴿ إنَّ هذا الْقُرآنَ يَهْدِي لِلَّتِي هِيَ أَقْوَمُ ﴾ بە ڕاستی ئەم قورئانە ڕاغویی و شارەزایی هەموو ئادەمیزاد ئەکا بۆ لای ڕێگەیەکی ئەوتۆ کە ڕاستترینی هەموو ڕێگەکانە لە هەموو کات و جێگەیەکا وبۆ هەمو کەسێ. بەڵگە بۆ ڕاستی قورئانی پیرۆز ڕەوشتی پاکی پێغەمەرە کە زەوی پڕکردوە لە زانین و زانیاری و دادپەروەری پاش ئەوەی نەزانین و بێ باوەڕی و ستەم جیهانی تاریك کردبو .

﴿ وَ يُبَشِّرُ الْمُؤمِنِيْنَ الَّذِيْنَ يَعْمَلُونَ الصّالِحاتِ اَنَّ لَهُمْ اَجْراً كَبِيْراً ﴾ وە قورئان مژدە ئەدا بەو باوەڕدارانەی ئەوتۆ کردەوە چاکەکان ئەکەن کە بەڕاستی بۆ ئەوان هەیە پاداشتێکی گەورە وەك بەهەشتی پان وبەرین بەردەوام

﴿ وَ إنَّ الَّذِيْنَ لايُؤمِنُونَ بالآخِرَةِ اَعْتَدْنا لَهُمْ عَذاباً اَلِيْماً ﴾ وە بەڕاستی ئێمە مژدە ئەدەین بەکەسانێکی ئەوتۆ باوەڕ بە ڕۆژی دوایی نایەرن ئێمە ئامادەمان کردوە بۆ ئەوان سزایەکی خاوەن ئازار بە ئاگری دۆزەخ .

بۆ زانین: لە ماناکردرنی ئایەتەکانی ڕابوور\دودا باسی زۆر شتێ کرا لە بیروباوەڕی بەرزی ئیسلام لە کاتی دروست بوونی مرۆڤەوە لە سەر پاکی، لەمەودوایش باسی هەندێ تر لە بیر و باوەڕ و ئامۆژگاریە گرنگ و چاکەکانی ئەکەین .

١- ئایینی ئیسلام هەمو بنچینەی، بیرو باوەڕ و هەمو لقەکانی دەستور و یاسای و هەمو فەرمانەکانی دانراون لەسەر ئەو پاکیە پوختەی ئادەمیزادی لەسەر دروست کراوە، ئایینی ئیسلام بە ئاشکرایی وەڵامی داواکانی پاکی مرۆڤ ئەداتەوە دەستی ڕائەکێشێ بۆ لای هەمو شتێکی تازە پەیدابوی خاوەن سود لە هەر جێگەیەکەوە بۆ لای بێت .

٢- ئایینی ئیسلام بڕوا ئەهێنێ بە زانست و زانیاری و بە دانانی ژیانی لەسەر زانیاری بە گوێرەی فەرمودەی خوا: ( ئێوە پرسیار بکەن لە خاوەن زانستەکان. پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ ئەفەرموێ : ( پێوسی زانایان لە ڕۆژی دواییدا بەرانبەر بەخوێنی شەهیدان دائەنرێ.

٣- ئایینی ئیسلام داوا لە ئەقڵ ئەکا بۆ لای تێ فکرین و بۆ لای بیر کردنەوە وتێبینی کردن بۆ سروشت و بگەڕێ و دەربهێنێ نهێنیەکانی سروشت و سودەکانی، پەیوەندی سروشت بە خوا و بە ئادەمیزادەوە، داوا ئەکا ئایین و زانیاری دابنرێن لەسەر ئەو زانیاریانەی زانراون لە ماموسا یانی پێشەوەو ئوروپاییەکان بردیان بۆ خۆیان و ئێمە وازمان لێ هێنا .

٤- ئایینی ئیسلام سەربەستی بەخشیوە بە هەمو کەسێ رلە گفتوگۆو بیرکردنەوەدا، بۆ نمونە فریشتەکان بە خوای گەورەیان ووت: تۆ بۆ کەسێ دروست ئەکەی خراپە بڵاو بکاتەوە خوێنی ناڕەوا بڕێژێ ئیبراهیم لە بارەی لە ناوبردنی گەلی لوتەوە گفتوگۆی توندی ئەکرد لەگەڵ فریشتەکان .

٥- هەمو وانەی ئیسلام دانراوە بۆ هەمو کەسێ و نەك بۆ تاکە کەسێ یا تاقمێ یا ڕەگەزێ. خوا ئەفەرموێ: بەڕاستی ڕێزترین کەسی ئێوە لای خوا ئەوانەتانە لە خوا ئەترسن، فەرمودەی پێغەمەر ە: هەموتان بەرپرسیارن لە ژێر دەستەی خۆتان و ئادەم لە خاك دروست کراوە .

٦- ئاینی ئیسلام پێویستی کردوە ئادەمیزاد بە گیان و بە دارایی خۆیان لە دژی ستەم کردن و خراپە ڕاوەستن بە گوێرەی توانای خۆیان، فەرمودەی قورئان لەو بارەوە زۆر ئاشکرایە .

٧- هەموو شتێ لەم گەردونەدان بۆ خوانو ئادەمیزادی لەسەر داناون وپێویستە هەڵیان سوڕێنین بە گوێرەی دەستور و فەرمانی خوا .

٨- ئایینی ئیسلام داوا لە ئادەمیزاد ئەکا بە جۆرێکی ڕێك و پێك و هاوکات بژین لەگەڵ پەیڕەوی گەردون و پیوێستیەکانی. بەسە بۆ موسڵمانان ( ویلفر سمیس ) لە نامەیەکی خۆیا ئەڵێ: بەڕاستی موسڵمانان خاوەنی توانان بەبۆنەی ئایینەکەیانەوە لەگەڵ داواکاری زانیاری تازەدا بڕۆن و بەشداری بکەن لەگەڵ کۆمەڵگای پێش کەوتوی ئەم سەردەمە .

﴿ وَ يَدْعُوا الأِنْسانَ بِالشَّرِ دُعاءَ بِالْخَيْرِ وَ كانَ الأِنْسانُ عَجُولاً ﴾ وە ئادەمیزاد داوا لە خوا ئەکا بۆ ئەوەی خراپە و زیان توشی خۆی ودارایی و خێزانی ببێ لە کاتی توڕەییدا بە وێنەی داواکردنی چاکە بۆ خۆیان. ئەو جیهانە ئادەمیزاد ژیانی تێدا بەسەر ئەبا بریتیە لە خەفەت و لە خۆشی و ڕابواردن و ئازار و هیچ کامیان بەردەوام نین، کاتێ مرۆڤ دوو ڕۆژە: ڕۆژێکیان بۆ سودی تۆیە، ڕۆژێ تریان بۆ زیانی تۆیە. بەڵام هەندێ لە ئادەمیزاد کاتێ ئازاریان توش ببێ بە هۆی شتێکەوە ئەقڵی ئەڕوخێ و گومان ئەبا ئەو گیر و گرفتە چارەسەر ناکرێ، دوایی ئەپاڕێتەوە لە خوا بەوەی خۆی توشی ئازار ببێ ئەوەیش جۆرە بێ ئەقڵیە کە ئەگەر کەمێ ئارامی بگرتایە ئەو ئازارە نەئەماو، ئادەمیزاد پەلە ئەکا بۆ لای ئەوەی لە دڵیدایەو دێت بە مێشکیا بەبێ بیرکردنەوەو ئارام گرتن، ئادەمیزاد وا ئەبێ ئەڵێ: ئەی خوایە من لەناو ببە یا ئەڵێ: ئەی خوایە ئەو کوڕە توشی خراپە بکەی دوایی بە گورجی پەشیمان ئەبێتەوە .

کاتێ خوای مەزن ڕوونی کردەوە گەورەیی و چاکەی خۆی بۆ بونەوەران بەهۆی قورئانەوە دوایی یاسی ئەوشتانە ئەکا بەوانی بەخشیوە لەچاکەکانی جیهان و ئەفەرموێ:
﴿ وَ جَعَلْنا الَّيْلَ وَ الْنَهارَ آيَتَيْنِ ﴾ وە ئێمە گێڕاومانە شەو و ڕۆژ بە دوو بەڵگەی زۆر بەهێز لەسەر بون و توانای خوا، ڕێك و پێك و هاتنیان بە دوای یەکا بە گویرەی یاسای نەگۆڕا و پەیڕەوی بەردەوام، لە هەزاران ساڵەوە ساڵێ لە ساڵێ تر جیاواز نیە، هەموو ئەوانە بەڵگەی تەواون لەسەر بەڕێوەبەر و دانانی هەموو شتێ لە جێگەی شیاوی خۆیا و لەسەر ئەندازیارێکی بێ وێنە .

ئەوەی شایانی ئاماژە بێ خوا داوا لەزانایان و خاوەن بیرەکان ئەکا بۆ لای باوەڕهێنان لە ڕێگەی تێ فکرین و ووردبوونەوە لە دروستکردنی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی لەنێو ئەواندایە بە ووردی، وەك بە شوێنا هاتنی شەو ورۆژ بە دووای یەکتریدا و بیر کردنەوە لە دەرکەوتوەکانی گەردون. بەلاّم داوا لە نەخوێنەواران ئەکا بۆ لای باوەڕهێنان لە ڕێگەی ئامۆژگاری وەرگرتن بەهۆی چاکەکانی خواوە .

﴿ فَمَحَوْنا آيَةَ الْلَّيْلِ ﴾ دوایی ئێمە نیشانەو تاریکی شەو لائەبەین لە بنچینەدا بە جۆرێ هیچ شتێکی تێدا ناناسرێ هەتا ئێوە لەشەودا پشو بدەن و بخەون وماندویی ڕۆژتان نەمێنێ، ئەگینا شەو هەر ماوەو ئەمێنێ .

﴿ وَ جَعَلْنا آيَةَالْنَهارِ مُبْصِرَةً ﴾ وە ئێمە نیشانەی ڕۆژ ئەگێڕین بەوەی هەموو شتێ دەربخا بۆ ئادەمیزاد بەهۆی هەلّهاتنی خۆرەوە .

﴿ لِتَبْتَغُوا فَضْلاً مِنْ رَبِّكُمْ ﴾ وە بۆ ئەوەی ئێوە پەیدا بکەن بۆ خۆتان بەهۆی ڕوناکی ڕۆژەوە هۆی ژیان و گوزەرانی خۆتان بە ئارەقی ناوچاوانتان نەك بەهۆی فێلّ و دەست برینەوەو بەهۆی بەکرێ گیراوی، بێگانەوە پلە و پایە وسامان پەیدا بکەن و دژی دانیشتوان بووەستن، ئیتر بەهۆی کار بەدەستانەوە ئەو شتانە وەربگرن ڕاستەوخۆ یا بەهۆی سیخوڕوکانیانەوەو خۆیانیان پی بفرۆشن .

﴿ وَ لِتَعْلَمُوا عَدَدَ الْسِّنِيْنَ وَ الْحِسابِ ﴾ وە بۆ ئەوەیش ئێوە بزانن و فێری ژمارەی سالّەکان و فێری کاتی هەندێ شتی پەیوەندی دار بە پەرستنی خوا ببن و فێری کاتی دیاری کراو بۆ مامەلّەی کڕین و فرۆشتن ببن. بزانن کاتی نوێژ و ڕۆژ و حەج و عەمرە و مامەلّەکانتان چ کاتێ دێن .

﴿ وَ كُلِّ شَيءٍ فَصَلْناهُ تَفْصِيلاً ﴾، وە ئێمە ڕونمان کردوەتەوە یاسای هەمو شتێ بە ڕون کردنەوەیەکی زۆر ئاشکراو کارە ڕەواکان و قەدەغەکراوەکانمان لەیەك جوێ کردونەتەوە و قورئان یاسای تایبەتە بۆ ئادەمیزاد لە هەمو کات و جێگەیەکا .

پاش ئەوەی خوای مەزن باسی قورئان و مزدەدان بە باوەڕداران وترساندنی بێ باوەڕانی کرد و باسی هەندێ لە چاکەکانی خۆی کرد، باسی هەندێ شتی پێویستی ترمان بۆ ئەکا و ئەفەرموێ:

وَكُلَّ إِنسَٰنٍ أَلْزَمْنَٰهُ طَٰٓئِرَهُۥ فِى عُنُقِهِۦ ۖ وَنُخْرِجُ لَهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ كِتَٰبًا يَلْقَىٰهُ مَنشُورًا ﴿١٣﴾ ٱقْرَأْ كِتَٰبَكَ كَفَىٰ بِنَفْسِكَ ٱلْيَوْمَ عَلَيْكَ حَسِيبًا ﴿١٤﴾ مَّنِ ٱهْتَدَىٰ فَإِنَّمَا يَهْتَدِى لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۚ وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ ۗ وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا ﴿١٥﴾

﴿ وَ كُلَّ إنسانٍ أَلْزَمْناهُ طـائِرَهُ فِـي عُنُقِـهِ ﴾ وە ئێمـە دامـان نـاوە کـردەوەی هـەموو ئادەمیزادێ لە ژن و لە پیاو کردەوەی خۆی لە چاك ولەخراپ لە گەردنی خۆیاو لەوان جوێ نابێتەوە. ووشەی ( فِي عُنُقِهِ ) هێمایە لە جـوێ نەبونـەوەی کردەوەکـانی بەوێنـەی ملوانکەیە بکرێتە ملی .

﴿ وَ نُخْرِجُ لَهُ يَـوْمَ الْقِيامَـةِ كِتاباً يَلْقـاهُ مَنْشُـوراً ﴾ وە ئێمـە بـۆ هـەموو ئـادەمیزادێ دەرئەهێنین نامەی کرداری خۆی و توشی ئەبێ بە کراوەیی و نەپێچراوە تەوە هەتا ئاسـان بێ خوێندنەوەو نەتوانێ بیشارێتەوە هیچ شتێ لە کردەوەکانی خـۆی لـە ڕۆژی دواییـدا. ئیتر ئەو ئادەمیزادە خوێنەوار بوبێ لە جیهاندا یا نەخوێچنـەوار، لـەو ڕۆژەدا خوێنـەوارە، خۆی ئەخوێنێتەوە ناتوانێ بیشارێتەوە، هەموو شتێ پـێ‌ی ئـەوترێ و ئەیخوێنێتـەوە، پـێ‌ی ئەبێژرێ .

﴿ إقْرَأْ كِتابَكَ كَفى بِنَفْسِكَ الْيَوْمَ حَسِيْباً ﴾ تۆ خـۆت هـەر بـەخۆت نامـەی کـرداری خۆت بخوێنەرەوە تۆ خۆت بەسە بەوەی پرسیار لەخۆت بکەی و پێویستت بە شایەت نیە،

چونکە کاتی لەو رۆژەدا کردار و پاداشت و سزای کردەوەکانی ئەبینی نوسراوە بە داد پەروەرانە بە بی ئەوەی پاداشتەکەی کەم بۆ بیتەوە وسزاکەی زۆرتر کرابی بروا ئەکا و بەلگەی بۆ ئامادە ناکری .

﴿ من إهتدى فأنما يهتدي لنفسه و من ضل فأنما يضل عليها ﴾ هەر کەسی ریگەی راستی وەرگرتبی و دوای راستی کەوتبی، دوایی بەراستی راغوبی بۆ خۆی وەرگرتوە و پاداشتەکەی هەر بۆ خۆیەتی و هەر کەسی ریگەی راستی وون کردبی و لە ریگە لایدا بی، دوایی بە راستی سزای ریگەلادانەکەی لەسەر خۆیەتی، چونکە ئەقلی خۆی نەخستوەتە کار بۆ دۆزینەوەی ریگەی راست .

﴿ و لا تزروا زرة و زر أخرى ﴾ وە هیچ کەسی هەلناگری گوناهو باری قورسی کەسی تر و سزای نادری بەهۆی گوناهی کەسی ترەوە، گوناهی هەمو کەسی پەیوەندی بە خۆیەوە هەیە .

﴿ و ماكنا معذبين حتى نبعث رسولا ﴾ وە ئیمە سزای هیچ کەسی نادەین هەتا پیغەمەری رەوانە نەکەین بۆ لای لەلایەن خۆمانەوەو بەزمانی خۆیان بەلگەیان بۆ نەیەری هەتا بیانویان نەمینی، لەرەگەزی خۆیان بی‌یا بەهۆی نوینەری خۆی بی بۆلای نەتەوەیە تری جگەی رەگەزی خۆی، فەرمانەکانی خوایان بۆ رون بکاتەوە هەر نەتەوەیە بەزمانی خۆی .

هەر کەسی بانگەوازی ئایینی ئیسلامی پی نەگەیشتبی یا بەو جۆرەی پیویستی بی نەزانی بە چ جۆری بە فەرمانی خوا هەلسی، ئەو کەسە سزای نادری بەهۆی دادپەروەری خواوە، هەر گەلی خوای مەزن پیغەمەریان بۆ نەنیری یا ئامۆژگاری کەری نەچوبیتە ناویان تاوانبار نین. بەلام ئەگەر هەر گەلی پیغەمەری ئا یامۆژگاری کەری چوە ناویان و فەرمانی خوایان وەرنەگرت و بەدرۆیان خستنەوەو لە سنوری خوا دەرچوون و ساماندار و کار بەدەستان یارمەتیان نەدان بۆ وەرگرتنی پەیامی خوا ئەو گەلە بەهەمویانەوە بەبی جیاوازی خوا لەناویان ئەبا بەهەر شتی دور بی یا نزیك وەك خوای مەزن ئەفەرموی :

وَإِذَآ أَرَدْنَآ أَن نُّهْلِكَ قَرْيَةً أَمَرْنَا مُتْرَفِيهَا فَفَسَقُوا۟ فِيهَا فَحَقَّ عَلَيْهَا ٱلْقَوْلُ فَدَمَّرْنَٰهَا تَدْمِيرًا ﴿١٦﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا مِنَ ٱلْقُرُونِ مِنۢ بَعْدِ نُوحٍ ۗ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ بِذُنُوبِ عِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿١٧﴾ مَّن كَانَ يُرِيدُ ٱلْعَاجِلَةَ عَجَّلْنَا لَهُۥ فِيهَا مَا نَشَآءُ لِمَن نُّرِيدُ ثُمَّ جَعَلْنَا لَهُۥ جَهَنَّمَ يَصْلَىٰهَا مَذْمُومًا مَّدْحُورًا ﴿١٨﴾ وَمَنْ أَرَادَ ٱلْءَاخِرَةَ وَسَعَىٰ لَهَا سَعْيَهَا وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَأُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ سَعْيُهُم مَّشْكُورًا ﴿١٩﴾ كُلًّا نُّمِدُّ هَٰٓؤُلَآءِ وَهَٰٓؤُلَآءِ مِنْ عَطَآءِ رَبِّكَ ۚ وَمَا كَانَ عَطَآءُ رَبِّكَ مَحْظُورًا ﴿٢٠﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ فَضَّلْنَا بَعْضَهُمْ عَلَىٰ بَعْضٍ ۚ وَلَلْءَاخِرَةُ أَكْبَرُ دَرَجَٰتٍ وَأَكْبَرُ تَفْضِيلًا ﴿٢١﴾

﴿ و إذا أردنا أن نهلك قرية امرنا مقر فيها ففسقوا فيها ﴾ وە هەرکاتی ویستی ئیمە بەسزابی بەوەی کە ئیمە لەناو ببەین دانیشتوانی گوندی ئیمە فەرمان ئەدەین بەو کەسانەی ئەوتۆ ئەیانەوی رابویرن بەئارەزۆی خۆیان بە پەرستن و بە دادپەروەری، دوایی ئەو کەسانە دەست ئەکن بەگەناهکردن و لەسنوری خوا لائەدەن، ئەوانەیشیان خۆش رانابویرن پەیرەوی ساماندارەکان ئەکەن و ریزیان ئەگرن و کردەوەکانی ئەوانیان لاچاکە و خوا هەمویان لەناو ئەبا .

﴿ فحق عليها القول فدمرناها تدميرا ﴾ دوایی پیویست بوە لەسەر دانیشتوانی ئەو گوندە کە ئەوان ئەو پەریان گرتبو لەبی فەرمانیخوادا پاش نادرنی پیغەمەران بۆسەریان وبەدرۆخستنەوەیان ، دوای ئەوەی ئیمە دانبشتوانی ئەو گوندەمان بنەبر کرد و هەموياغان لەناو بردن .

خوای مەزن دانیشتوانی هیچ شار وگوندی لەناو نابا مەگەر ئەوان شایستەی بنەبر کردن بن، کاتی شایستەی ئەوە بوون خوای مەزن پیغەمەران یا زانایانی ئایینی ئەنیری بۆ لایان و فەرمان و فەرمودەی خوایان پی رائەگەیەنن بۆ کردنی چاکە و نەکردنی خراپە و ئەیان ترسینین لەسزای خوا، ئەو گەلە کەلەسنوور لایان دا خوا لەناویان ئەبا .

ئەبی بزانین: هەر کۆمەلگایە کاربەدەستان و ساماندارەکانیان لەسەر پەیرەویکی خراپ و ستەمداربوون، بەتایبەتی سەرۆکی ئەو رژیمە وپیاوەکانی دەستیان دایە کردەوەی ناهەموار و دانیشتوانی تری نیو ئەو رژیمە لەدژیان رانەئەپەرین بۆگەرانەوەیان بۆ لای ریگەی راستی خوا پەرستی وبگرە ریزیان لی ئەگرتن و ناو و نازناوی زۆر گەورەیان بۆ بەکارئەهینان و بروا و متمانەیان ئەدانی، لەکاتی هەلبژاردندا دەنگیان بۆ ئەدان و پروپاگەندەیان بۆ ئەکردن و هەلیان ئەبژاردن بۆ پلەی بەرز وپیشەوایەتی، ئەوکۆمەلگایە هەمویان هاوبەشی ئەو خراپەیەن لە تاوان و خراپەکردن دا و ئەبنە جیگەی خەشمی خوا و ئەنجامیان بنەبربونە بەکارەسات وەك لافاو و رۆچونی زەوی وبومەلەرزە و هەورەگرمەو گرانی و جەنگ و ئامادەکردنی ستەمکاران بۆیان هەتا دی . خوای مەزن سزای موسلمانان ئەدا هەر کاتی واز لەجیهاد بهینن. بەلام نەك بە کوشتنی منالان و ژنان و بی تاوانان.

﴿ وكم أهلكنا من القرون من بعد نوح ﴾ وە ئیمە زۆر نەتەوەی گوناهبارمان بنەبر کردوون لە دانبشتوانی هەمو کاتەکانی رابووردوو لە دوای کاتی نوح کە لایان دا لەسنووری خوا، وەك گەلی عاد و سەمود و جگەی ئەوان. ( قرن ) بریتیەلە سەدوبیست سال یا سەد و چل سال یا هەشتا سال یاماوەی تەمەنی ئاسایی هەر نەتەوەیە، ئەو ژمارانە بیر

وبۆچوونی هەندی لە زانایانـە. بـەلام ئـەوەی شـایانی باسـی مەبەسـت تەمـەنی ئاسـایی نەتەوەکانە. لـەم سەردەمەی ئیمەدا خولـەك بۆ سەدسال بەکار ئەهینری .

﴿ و کفی بربك بذنوب عباده خبیرا بصیرا ﴾ وە بەسە پەورڕەدگاری تۆ ئاگـادارە بـە گوناهی بەندەکانی خۆی، ئەبینی گوناهی نهینی و ئاشکرایان. ئەو ئایەتانـە هەرەشـەن بـۆ ئەوانەی پیغەمەری ئیسلام بـەدرۆ ئەخەنـەوە، پاشـەرۆژ و بەسـەرهاتیان وینـەی گـەلانی پیشوون .

﴿ من کان یرید العاجلة عجلنا له فیها مانشاء لمن نرید ﴾ هەر کەسی لـە رووی بـەد بەختیەوە ئارەزووی جیهان بکا ومەبەستی رابواردنی جیـهانی بکـا بـەزوویی ئـەروا ئیمـە بەگورجی ئەبەخشین بەو کەسە شتی ئیمە ئارەزۆی ئەکەین نەك شتی ئەو ئارەزۆی بکا بـۆ کەسی ئیمە بمانەوی ئەوشتەی بدەینی لـە جیهاندا .

بۆ زانین: مەبەست ئەوە نیە هەرکەسی داوای هەرشتی بکا خوا بیداتی. بـەلکو ئیـمـە داوای زۆر شت ئەکەین و نایان بینین. بەلکو مەبەست ئەوەیە لـەو ئایەتە: هەر کەسبی بـە تەنها کار بۆ رابواردنی جیهان بکا و بروای بە هیچ شتی نەبی جگەی سودی خـۆی نـەبی ئەو کەسە بەرهەمی کۆششی خۆی ئەدریتی بەلام بە گویرەی ویستی خوا نەك بـەگویرەی ویستی ئەو کەسە. بەراستی ئیمە داوای زۆر شت ئەکەین و زۆریمان بۆ نابی .

﴿ ثم جعلنا له جهنم یصلاها مذموما مدحـورا ﴾ لـە پاشـا ئیمـە دۆزەخ ئـەگیرین بـە جیگەی ئەوکەسەی باوەری بە جگەی سوودی خۆی نەبی ئەچیتە نیو دۆزەخ بە ناوبردنی بەخراپە و بە دوورکەوتنەوەی لـە بەزەیی و میهرەبانی خوا .

﴿ و من أراد الآخرة و سعی لها سعیها وهو مؤمـن ﴾ وەهـەر کەسـی ئـارەزۆی لـە رابواردنی رۆژی دوایی بی و کۆشش بکا بۆ بەدەسـت هینـانی خۆشـی رۆژی دوایـی بـە کۆششی شایستەی ئەو رۆژە بی وباوەری بە راستی ئەو رۆژە هەبی، دوو روی خراپـەی تیدا بەدی نەکری، دوایی ئەو کەسە بەهۆی ئەو سی مەرجانەوە پاداشتی کۆششـی خـۆی وەرئەگری .

﴿ فأولئك كان سعيهم مشكورا ﴾ دوایی ئەو کەسانە کۆششەکانیان لای خوا وەرگیراوە و پاداشتیان ئەدریتەوە بەریزەوە .

﴿ كلا نمد هؤلاءوهؤلاء من عطاء ربك ﴾ هەمو کەسی لەو دوو تاقمە، ئەو کەسانەیان هەر کاری بۆ سوودی خۆی کردووە بەتەنها و ئەو کەسانەی کار ئەکەن لەبەر رەزایەتی خوا وسودی گشتی ئیمە یارمەتیان ئەدەین لە بەخشش ورۆزی پەروەردگاری تۆ، دوارۆژیان جیاوازە لەیەکتری .

﴿ و ماكان عطاء ربك محظورا ﴾ وە بەخشش و چاکەی پەروەردگاری تۆ قەدەغە ناکری بۆ هیچ کەسی لە باوەرداران وبی باوەران لە جیهاندا. بەلام لە رۆژی دواییدا چاکەی خوا هەر بۆ باوەردارانە .

﴿ أنظر فضلنا بعضهم على بعض ﴾ تۆ تەماشا بکە چۆن ئیمە ریزی هەندی لە ئادەمیزادمان داوە بەسەهەندی تریانا لە جیهاندا بەلەش ساغی و تەمەن دریژی و خوادرەمەنی وەرگرتنیمیرات و جگەی ئەوانەبش کە بە جۆریکی رەوا پەیدا بکرین. بەلام چینایەتی وریزی مرۆڤ لە رۆژی دواییدا نرخی بۆ دانانری وریز هەر بەهۆی لە خوا ترسانەوە پەیدا ئەبی، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ و للآخرة أكبر درجات و أ كبر تفضيلا ﴾ وە بەراستی رۆژی دوایی پلەکانی گەورەتر بۆ باوەرداران وریز گرتنیان گەورەترە. یانی هەرچەندە پلەو پایەی جیهان جیاوازن بەزۆری و بەکەمی لە نیوان ئادەمیزادا. بەلام جیاوازی پلەو پایەی رۆژی دوایی و ریز گرتن گەورەترە و بەریزترە لەوانەی جیهان. جیاوازی لە نیوان ئادەمیزاددا بە زانیاری و لەش ساغی وگوزەرانی خۆش وتەمەن دریژ و کورتی، ئەوانە هەمویان بەهۆی مردنەوە کۆتاییان پی دی. بەلام جیاوازی رۆژی دوایی بەسوتانی ئاگری دۆزەخ و بەوەرگرتنی پاداشت و بەهەشت بی کۆتایین و بەردەوامن .



يَبْلُغَنَّ عِندَكَ ٱلْكِبَرَ أَحَدُهُمَآ أَوْ كِلَاهُمَا فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا ﴿٢٣﴾ وَٱخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ ٱلذُّلِّ مِنَ ٱلرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ٱرْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِى صَغِيرًا ﴿٢٤﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا فِى نُفُوسِكُمْ ۚ إِن تَكُونُوا۟ صَٰلِحِينَ فَإِنَّهُۥ كَانَ لِلْأَوَّٰبِينَ غَفُورًا ﴿٢٥﴾

﴿ و لاتجعل مع الله إلها آخرا فتقعد مذموما مخذولا ﴾ وەتۆ دامەنی لەگەل خوادا چەند خوایە بۆ پەرستن، دوایی تۆ دانیشی لە دۆزەخدا بە لۆمەکراوی و هەمو کەسی خراپەت بلین بەبی یاریدەدەر، لەهەردوو جیهاندا بەدناوی و خراپەت بلین ولەسەر زمانی زانایان چاکەت نەبیژری بەبی یاریدەدەردانیشی .

﴿ و قضی ربك أن لاتعبدوا إلا إياه ﴾ وە پەروەردگاری تۆ فەرمانی داوە کەئیوە هیچ کەسی نەپەرستن مەگەر هەر پەورەدگاری تۆ بە تەنها و بە نیازی پاکەوە، ئەبی بزانری پەرستن تەنها بریتی نیە لە نویژ و رۆژ وهەرکەسی پەیرەوی پیاوانی ستەمکار وتاوانباران بکا ئەو کەسەی پەرستوە .

﴿ و بالوالدين إحسانا ﴾ وە فەرمانیشیداوە بە ئیوە چاکە بکەن لەگەل باوك ودایکتانا بە چاکە کردنی تەواو بەم جۆرانەی خوارەوە:

١- ﴿ إما يبلغن عندك أحدهما أو كلاهما فلا فتقل لهما أف ولا تنهرهما ﴾ ئەگەر یەکی لە باوك و دایکتان یا هەردووکیان گەیشتنە کاتی لاوازی و تەمەن دریژی لەلای تۆ لە کۆتایی تەمەنیانا یا لەهەر کاتیکا بی، بەوجۆرەی تۆیان لی هات لەکاتی منالیدا لاوازبون، دوایی تۆ نەلی: بەوان ئوف ووشەی خراپیان پی نەلی و سەرزەنشتیان نەکەن گفتوگۆی رەق و بەقیراندن بەسەریانا .

٢- ﴿ و قل لهما قولا كريما ﴾ وە تۆ بەباوك و دايكت بلـــی "گفتوگۆيـەكی چـاك و بەريز، بەنەرم و نيانی لـەسەر خۆ بدوی لـەگـــەليان و دور بـی لــە زوشـتی و گفتوگـۆی ناشيرين و شايستەی ريزی ئەوان نەبی .

٣- ﴿ و اخفض لهما جناح الذل ﴾ وەتۆ رابخە بۆيان بالی كزۆلی و بچوكی بەرانبەر بەوان، ئەوپەری ميهرەبانی بەكاربهێنە لـەگەليان، چونكە ئەوان بۆ تۆ باليـــان كـراوە بـوە بەوينەی بالـندە بۆ بيچوەكانيان .

٤- ﴿ و قل ربي إرحمهما كما ربياني صغيرا ﴾ وە تۆ بلـــی كەئـەی پـەروەردگاری من: تۆ بەزەيت بيتەوە بەو دايك وباوكەی منا و ميهرەبانبە لـەگەليان بـەوجۆرەی ئـەوان منيان پەرورەدە ئەكرد و بەخيويان ئەكردم بە منالی و لـە كاتيكا من بەبی توانا بوم .

﴿ ربكم أعلم بما فـي نفوسـكم إن تكونـوا صـالحين ﴾ پـەروەردگاری ئيـوە زانـاترە بەوشتەی لـەدەرونی ئيوەدايە و لـە نەوازش وچاكـــەكردن لـەگـەليان، بـە پـاكی وپيسـی دلتان ئەزانی ئايا ئيوە نيازتان پاكە ؟ ئەگەر ئيوە پياوچاك بن و نيازی چاكەتان هەبی خــوا ئاگادارە .

﴿ فأنه كان للأوابين غفورا ﴾ دوايی بەراستی پەورەدگاری ئيوە لی خۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو كەسانەی پەشيمانن لـە خراپەی خۆيان .

لـە پاشا خوای مەزن هانمان ئەدا ئەو مافانەی لـەسەرمان پيويست كراوە بيدەينە دەست ئەو كەسانەی شايانی وەرگرتنـــی مـافی خۆيـانن، چۆنيـەتی بەخشـينەكەيمان فـير ئـەكا و ئەفەرموی:

وَءَاتِ ذَا ٱلْقُرْبَىٰ حَقَّهُۥ وَٱلْمِسْكِينَ وَٱبْنَ ٱلسَّبِيلِ وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا ﴿٢٦﴾ إِنَّ ٱلْمُبَذِّرِينَ كَانُوٓاْ إِخْوَٰنَ ٱلشَّيَٰطِينِ ۖ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِرَبِّهِۦ كَفُورًا ﴿٢٧﴾

وَإِمَّا تُعْرِضَنَّ عَنْهُمُ ٱبْتِغَآءَ رَحْمَةٍ مِّن رَّبِّكَ تَرْجُوهَا فَقُل لَّهُمْ قَوْلًا
مَّيْسُورًا ﴿٢٨﴾ وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَىٰ عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا
كُلَّ ٱلْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا ﴿٢٩﴾ إِنَّ رَبَّكَ يَبْسُطُ ٱلرِّزْقَ
لِمَن يَشَآءُ وَيَقْدِرُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٣٠﴾ وَلَا تَقْتُلُوٓا۟
أَوْلَٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلَٰقٍ ۖ نَّحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَإِيَّاكُمْ ۚ إِنَّ قَتْلَهُمْ كَانَ
خِطْـًٔا كَبِيرًا ﴿٣١﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ
سَبِيلًا ﴿٣٢﴾ وَلَا تَقْتُلُوا۟ ٱلنَّفْسَ ٱلَّتِى حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلْحَقِّ ۗ وَمَن
قُتِلَ مَظْلُومًا فَقَدْ جَعَلْنَا لِوَلِيِّهِۦ سُلْطَٰنًا فَلَا يُسْرِف فِّى
ٱلْقَتْلِ ۖ إِنَّهُۥ كَانَ مَنصُورًا ﴿٣٣﴾ وَلَا تَقْرَبُوا۟ مَالَ ٱلْيَتِيمِ إِلَّا بِٱلَّتِى
هِىَ أَحْسَنُ حَتَّىٰ يَبْلُغَ أَشُدَّهُۥ ۚ وَأَوْفُوا۟ بِٱلْعَهْدِ ۖ إِنَّ ٱلْعَهْدَ كَانَ
مَسْـُٔولًا ﴿٣٤﴾ وَأَوْفُوا۟ ٱلْكَيْلَ إِذَا كِلْتُمْ وَزِنُوا۟ بِٱلْقِسْطَاسِ ٱلْمُسْتَقِيمِ ۚ
ذَٰلِكَ خَيْرٌ وَأَحْسَنُ تَأْوِيلًا ﴿٣٥﴾ وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ ۚ
إِنَّ ٱلسَّمْعَ وَٱلْبَصَرَ وَٱلْفُؤَادَ كُلُّ أُو۟لَٰٓئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْـُٔولًا ﴿٣٦﴾
وَلَا تَمْشِ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَحًا ۖ إِنَّكَ لَن تَخْرِقَ ٱلْأَرْضَ وَلَن تَبْلُغَ

ٱلْجِبَالَ طُولًا ﴿٣٧﴾ كُلُّ ذَٰلِكَ كَانَ سَيِّئُهُۥ عِندَ رَبِّكَ مَكْرُوهًا ﴿٣٨﴾ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ۗ وَلَا تَجْعَلْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ فَتُلْقَىٰ فِى جَهَنَّمَ مَلُومًا مَّدْحُورًا ﴿٣٩﴾

﴿ وَ آتِ ذا الْقُرْبى حَقَّهُ ﴾ وە تۆ ببەخشە بە خزم و خوێشە نزیکەکانت مافی خۆیان بەخێویان بکەن و بژین لەگەڵیان و سەریان لێ بدەن و کۆمەکیان پێ بکەن لەکاتی تەنگانەدا .

بۆ زانین: پێشەوا حەنەفی ئەفەرموێ : پێویستە هەموو خزمێ بەخێو بکرێ. بەلای پێشەوا شافیعی جگە لە باوك و دایك و کوڕ وکچ بەخێو کردنیان پێویست نیە و هەندێ لە زانایان فەرمویانە کە مەبەست لەخزمی نزیك لەو ئایەتەدا خزمە نزیکەکانی پێغەمەرە ﴿ ﷺ ﴾ .

﴿ وَ الْمِسْكِيْنَ وَإبْنَ الْسَبِيْلِ ﴾ وە تۆ ببەخشە بە هەژار و بەوکەسەی بەڕێگەوەیەن و لە نیشتمانی خۆی نیە بەهۆی کارێکی ڕەواوە مافەکانی خۆیان، بەو ئەندازەیە پێویستیانە .

﴿ وَ لا تُبَذِرْ تَبْذِيراً إن المبذرين كانُوا إخوانَ الشَّياطين ﴾ وەتۆ مەبەخشە دارایی خۆت و دای مەنێ لە جگەی شوێنێ شایانی خۆیی نەبێ، ئیتر زۆر بێ یاکەم. بەڕاستی ئەو کەسانەی دارای خۆیان لە شتی ناڕەواو بێ جێگەی خۆی دائەنێن لە خواردنی مەیی و کردنی قومارو جگەرە کێشان و تریاك و شتی خراپی تردا بە وێنەی داوێن پیسی ئەو کەسانە براو دۆستی شەیتانەکانن لە دەرچوونیان لە سنوری دیاری کراوی خوار دەرچوون، بە فیڕۆدای ئەنێن و خۆیان و خێزان و کەس و کاریان ئەخەنە مەترسی هەژاری و سەرشۆڕییەوە.

﴿ وَكانَ الشَيْطانُ لِرَبِهِ كَفُوراً ﴾ وە شەیتان سوپاس پەروەردگاری خۆە ناکاو بێ پەیمانە، خراپە بلاّو ئەکاتەوە لە نێو ئادەمیزادا هانیان ئەدا بۆ بێ فەرمانی خوا.

ئەگێڕنـەوە: مەجـەع و بیـلال و سـوهەیب و سـالم و خـەباب داوایـان لـە پێغەمـەر ئەکردشتێ پێویستیان بەو شتە هەبوو لە هەندێ کاتاو پێغەمەر هیچ شـتی نـەبوو بیاتداتی بەشەمەوە ڕۆی لێ وەرئەگێڕان وولامیانی نەئەدانەوە، خوای مەزن فەرموی:

﴿ وَإما تُعْرِضَنَ عَنْهُمْ إبتغاءَ رَحْمَةٍ مِنْ رَبِكَ تَرْجُوها فَقلْ لَهُمْ قَوْلاً مَيْسُـوراً ﴾ وەئەگـەر تۆ ڕوو وەرئەگێری لـە خزمان و هەژارو ڕێبواران کاتێ داوای شتیان لـە تـۆ کـردو هیـچ شتێکت لانەبو لـەبەر ئەوەی تۆ چـاوەڕوانی میـهرەبانی و بـەزەیی خـوای پـەروەردگاری خۆتت ئەکرد شتێکت بۆ بەنێری بەوانی بدەی، دوایـی تـۆ گفتوگۆیـەکی نـەرم و ئاسـان بەوان بلێ و بەلێنیان بدەرێ ئەگەر خوا شتێکی بۆ ناردم ئەتان دەبێ.

﴿ وَلا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إلى عُنُتِكَ ﴾ وەتۆ دەستی خۆت مەبەستە بـە ملـی خۆتـەوەو هیچ شتێ نەبەخشێ لە دارایی خۆت و بەشی خزمان و هـەژارو ڕێـواری لێ نـەدەی لـە کاتێکا خاوەنی سامان بۆی. یانێ تۆ دەست مەگرەوە لە بەخشین بەو ێنەی کەسی دەستی خۆی ببەسێ بە ملیەوە.

﴿ وَلا تَبْسُطَها كُلَ الْبَسْطِ فَتَقْعُدْ مَلوما مَحْسورا ﴾ وەتۆ دەستی خۆت درێژ مەکـە لـە دارایی خۆتا بە هەموو جۆرێ و لـە سنوری ئاسایی دەرچـێ و هیـچ شـتێك بـە دەسـتەوە نەمێنێ، دوایی تۆ دانیشی بە لۆمە لێ کراوی خواو لای ئادەمیزاد، چونکە دەست بـلاوی لای خوا چاك نیە، دەستت لـە هەموو لایە بـبڕێ و بـە ڕوتـی دانیشـی و نـەتوانی بچێتـە دەرەوە.

﴿ إنَ رَبَكَ يَبْسُطُ الرِزْقَ لِمنْ يشاءُ وَيَقْدِرُ ﴾ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ دارایی بۆ هـەر کەسێ ئارەزۆی هەبێ فراوان ئەکاو، کەمی ئەکاتەوە بۆ کەسێ ئارەزۆی هەبێ بە گوێرەی زانیاری خۆی هەموو شتێ لـە جێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ، چاکـەو خراپـەی بـەندەکانی خۆی ئەزانێ بەدارایی کەم و زۆر بۆیان، وەك ئەفەرموێ .

﴿ إنَهُ كان بِعبادهِ خَبـيراً بَصـيراً ﴾ بەڕاسـتی پـەروەدگاری تـۆ ئاگـادارە بـۆ سـوودی بەندەکانی خۆی و ئەبینی پێویستی ئەوان، دارایی فراوان ئەبەخشێ بە هەندێ کەس، کـەم ئەدا بە هەندێ ترو ئەیانبابەڕێوە بە گوێرەی سودی تایبەتی خۆیان.

بیروباوەڕو دەستوری ئایینی ئیسلام فەرمانی پێ دراوە مام ناوەندی بێ بۆ زۆرشت. ئەبێ لای وانەبێ خوا نیەو باوەڕی بەچەند خوایە نەبێ، خوایەکی تەنها بپەرستێ. فەرمانی نەداوە هیچ کەسێ خاوەنی سامان نەبێ یا خاوەنی دارایی بێ شوماری لە سنور دەرچوبێ. فەرمانی نەداوە تاکە کەسێ یا تاقمێ دارایی دانیشتوان زەوت بکەن. فەرمانی نەداوەو هیچ کەسێ ئەو شتەی ئارەزۆی بکا بۆی پەیدا ببێ و خۆی بسەپێنێ بەسەر دانیشتوانا بە نارەوایی بۆ بەدەست هێنانی ئارەزۆی خۆی.

فەرمانی نەداوە بە واز هێنان لە جیهان و چۆڵ پەرستی و کەنارگیری لە تێکەڵاوی دانیشتوان. فەرمانی نەداوە دوای هەوەسی ئاژەڵی خۆت بکەوی. بەڵکو فەرمانی داوە مرۆڤ لە سنوری بۆ دیاری کراوی خۆیابوەستێ. کارگوزاربێ. سنورێ دانێ بۆ دەستەڵاتی خۆی. دادپەروەربێ. توانا داربێ لە راپەڕاندنی کاری دانیشتوانا. سنورو ئەندازەی سامانی بە گوێرەی یاسابێ. بەخشینی خاوەنی سنوربێ، ئەوانە هەمویان سنورێکیان بۆ دانرا لەو سنورە وەرنەچن نەبۆ سەرەوە نەبۆ خوارەوە.

بەڕاستی ئاینی پیرۆزی ئیسلام چاکەی دیاری کردوە. فەرمانی خوای بەو جۆرە ناسیوە کە دەستورەکەی لەسەر بنچینەی تاقە کەسی یا کۆمەڵێکی تایبەتی دانەنراوە، هەر شتێ ئادەمیزادی پێوە بەسترابێ و گەشە بکاو پێش کەوێ ژیانیان بەو شتە پێویستە لەسەر کار بەدەستان ئەو شتە بۆ خۆیان و بەدانیشتوانی بسازێنن بەر پرسیارن لە نەدانیا، پێویستە دانیشتوانیش بۆخۆیانی ساختە بهێنن بەبێ دژی کەسێ تر. کەواتە هەر شتێ خاوەنی سودبێ بۆهەر لایە، ئەو شتەی پێویستی سەر شانی هەموو کەسێ بێ یا واچاکبێ، ئەبێ بیکات و پێی هەڵسێ.

﴿ وَلا تَقْتُلوا أوْلادَكُم خَشْيَةَ إمْلاقٍ نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَ إياكُمْ إنْ قَتلَهُمْ كانَ خَطْأً كَبِيراً ﴾ وە ئێوە منداڵەکانتان مەکوژن لەبەر ترسی هەژاری نێر بن یا مێینە و نابێ زیندە بەچاڵ بکرێن یا بکوژرێن بەجۆرێ تر، ئێمە رۆزی ئەدەین بەو منداڵانە و بە ئێوەیش، پێویستمان کردووە هەموو لایەکتان بەخێو بکەین، ئیتر بۆچی خەفەتی برسێتی ئەخۆن .بەڕاستی

کوشتنی منالّ کانتان هەڵەیەکی زۆر گەورەیە و گوناهێکی خراپ و زوشتە، ئەبێتە هۆی بنەبڕ بوونی مرۆڤ و کۆتایی پی هاتنی ڕەگەزی خۆتان، بەبێ ناونیشان و بێ یاریدەدەر ئەڕۆن، بێ بەش ئەبن لە چاکەی خوا پەرستی ئەوان، نیشتمان بەبێ خزمەت ئەمێنێتەوە .

﴿ وَ لاتَقْرَبُوا الزِّنا إِنَّهُ كانَ فاحِشَةً وَ ساءَ سَبِيْلاً ﴾ وە ئێوە نزیکی داوێن پیسی مەکەون، خۆتان لە پێشەکیەکانی داوێن پیسی دوور بگرن ،وەك تەماشاکردنی ژنانی بێگانە و منالانی جووان و دەست بازی و ماچ کردنیان، چونکە ئەوانە ئەبنە هۆی داوێن پیسی لە ئەنجامدا. بەڕاستی داوێن پیسی کردەوەیەکی زۆر قێزەون و ناجۆرە و ئەوپەڕی خراپەی تێدایەو ڕێگەیەکی خراپە داوێن پیسی، لە گوناهە گەورەکانە، مایەی هورووژاندنی دوژمنایەتی و کینەو بێ متمانەییە، پێ شێل کردنی ناموسی بێ تاوانانە، ئەبێتە هۆی تێکەڵاوبونی ڕەگەزی یەکتری، ئەبێتە هۆی تواندنەوەی کۆمەڵ. بەسە بۆ خراپی داوێن پیسی: ئەگەر کەسێ بیەوێ جنێو بدا بەکەسێ تر لە داوێن پیسی خراپتری دەست ناکەوێ جنێوی پی بدا، کەواتە پێویستە ئەو دەرگایە دابخرێ ونەکرێتەوە .

﴿ وَ لاتَقْتُلُوا النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللهُ إِلا بِالْحَقِّ ﴾ وە ئێوە کەسێکی ئەوتۆی وا مەکوژن خوا قەدەغەی کردوە کوشتنی مەگەر بەفەرمانێکی ڕاستی و شایستە، وەك ئەوەی کەسێکی بێ تاونی کوشتبێ یا داوێن پیسی کردبێ دوای ژن هێنانی یا لە ئایینی ئیسلام وەرگەڕابێ .

﴿ وَ مَنْ قُتِلَ مَظْلُوماً فَقَدْ جَعَلْنا لِوَلِيِّهِ سُلْطاناً ﴾ وە هەر کەسێ بێ تاوانی بکوژرێ کە شایانی کوشتن نەبێ دوایی ئێمە گێڕاومانە بۆ بەڕێوەبەری کوژراوەکە هێز و توانا بۆ تۆڵە کردنەوە لە بکوژەکە، بۆ میرات گر و کاربەدەستان هەیە کوشتنی ئەوکەسەی ئەوبێ تاوانەی کوشتوە، یاخوێن وەرگرتن بە گوێرەی فەرمانی خوا یا لێ خۆشبونی لەو بکوژە .

﴿ فَلا يُسْرِفْ فِي الْقَتْلِ إِنَّهُ كانَ مَنْصُوراً ﴾ دوایی کار بەدەستی ئەو کوژراوە لە کوشتنی ئەو بکوژەدا لە سنووری دیاری کراوی خوا دەرنەچێ وبەگوێرەی یاسای خوا

بێ، بەهەر شێوەیە ئاسانە بەو جۆرە بیکوژێ، یانی دووای کوشتن ڕێزی مرۆڤایەتی بدرێتێ، نەی سوتێنن و ڕای نەکێشن و ئەندامەکانی نەبڕن، جگە لە بکوژەکە کەسی تر نەکوژرێ. بەڕاستی کاربەدەستی کوژراوەکە یاریدەی دراوە لەلایەن یاساو کاربەدەستانەوە تۆڵە سەندن لە بکوژەکە .

﴿ وَ لاتَقْرَبُوا مالَ الْيَتِيْمِ إلاّ بِالَّتِي هِيَ أحْسَنُ حَتّى يَبْلُغَ أشُدَّهُ ﴾ وەئێوە نزیکی دارایی هەتیوی بێ باوك مەکەون، نەوەك ئێوە ڕابکێشێ بۆ لای دەست کاری کردنی بەخوادرنی یا بەجگەی خوادرن و کە ببنە هۆی زیان بۆ ئەو داراییە مەگەر بە ڕێگەیەکی ئەوتۆ ئەو ڕێگەیە چاکتر بێ بۆ دارایی ئەو هەتیوە، وەك ئەوەی بخرێتە ئیشەوە بۆ پەیدا کردنی قازانج و گەشەپێکردنی یا بەکاربهێنرێ بۆ بەخێو کردن و خوێندنی هەتیوەکە، ئێوە نزیکی ئەو داراییە مەکەون هەتا هەتیوەکە ئەگا بە تەواوی ئەقڵی خۆیی و تەمەنی ئەگاتە پازدەساڵی یا هەژدە ساڵی و قازانج و زیانی خۆی جویچ ئەکاتەوەو ئەتوانێ کاروباری خۆی ببا بەڕێوە .

﴿ وَ أوفُوا بِالعَهْدِ إنّ الْعَهْدَ كانَ مَسْؤلاً ﴾ وە ئێوە جێ بەجێبکەن ئەو پەیمانەی داوتانە بە خوا کە بەفەرمانەکانی هەڵسن و داوتانە بەیەکتری کە یارمەتی یەکتری بدەن و پێتان سپێراوە چاودێری دارایی هەتیوان بکەن. بەڕاستی خاوەنی پەیمان بۆجێ بەجێ کردنی ناوەڕۆکی پەیمانەکە پرسیاری لی ئەکرێ پاداشتی چاکە وخراپەی وەرئەگرێ .

﴿ وَ أوفُوا الْكَيْلَ إذا كِلْتُمْ وَ زِنُوباَ بِالْقِسْطاسِ الْمُسْتَقِيْمِ ﴾ وە ئێوە بە تەواوی منەکانتان بپێون .

بۆ بکرەکان هەرکاتێ پێوانەتان کردو، ئێوە کێشانە بکەن بە ترازوییەکی ڕاست و سەنگ و مەنی دیاری کراو. بەکارهێنانی پێوانەو کێشانە بەتەواوی پەیوەندی بە ئاینێکی تەنهاوەو داب و نەریتێکی تەنهاوە نیە. پەیوەندارە بەهەمو ئادەمیزادەوە .

﴿ ذلِكَ خَيْرٌ وَ أحْسَنُ تَأوِيْلاً ﴾ ئەو پێوانەو کێشانە بەتەواوی و ڕاستی چاکترن لەبۆ دووارۆژی ئێوە لەجیهاندا بۆ بڵاو بونەوەی ڕاستی ودەست پاکی ئێوە لەکڕین و

فرۆشتندا، ئەبێتە هۆی ڕاکێشانی دانیشتوان بۆتان و ئەنجامەکەی شیرینترە بۆ پاشەڕۆژی هەردوو جیهان .

﴿ وَ لاتَقْفُ مالَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ ﴾ وە تۆ دوای شتێ مەکەوە زانینی بێ گومانت پێی نەبێ، دوای لاسایی کردنەوەو گۆترەکاری مەکەوە بەبێ بەڵگەی بێگومان و پەسەند، تەمەنی خۆت بەفیڕۆ مەدە، دواکەوتنی بەبێ بەڵگە پەشیمانی لە دواوەیە .

﴿ إنَّ الْسَمْعَ وَالْبَصَرَ وَ الفؤاد كُلٌّ ذلِكَ كانَ عَنْهُ مَسْئُولاً ﴾ بەڕاستی هەریەکە لە گوێچکە و چاو ودڵ پرسیاریان لێ ئەکرێ لەو شتەی خاوەنەکانیان کردویانە لەچ شتێکا بەکاریان هێناوە .

بۆ زانین: لاسایی کردنەوەی جگەی خۆت و دواکەوتنی لەفەرمانی ئاینیدا بەبێ ئەوەی بەڵگەت بۆ دەرکەوێ قەدەغەیە و نیشانەی ناتەواوی خۆتە، پێویستە ئەوپەڕی توانای خۆت بخەیتە کار بۆ دۆزینەوە و زانینی هەموو شتێ، هەرکەسێ شایانی فتوادان نەبێ و چاك و خراپ جوێ نەکاتەوە، ئەو کەسە بەگۆترەکاری فتوا و فەرمان دەربکا ، ئەو کەسە بوختانی بە خوا و پێغەمەردا کردوە. بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا فتوا دەرکەری نەزان و نەخوێنەوارو بوختان هەڵبەستێ زۆر پەیدا بوون بازرگانی پێوە ئەکەن، هەر بۆ ئەوەی پارە و پول پەیدا بکەن و خۆیانی پێ بەخێو بکەن، دوکانی تەلاق چاك کردنەوەو جگەی تەلاقیشی داناوە، وایش ئەبێ بەوبۆنەوە درۆ وبوختان و بەکرێ گیراوی خۆی ئەشارێتەوە بەفێڵ وچاوبەست کردنی دانبشتوانی کردوە بە پیشە بۆ خۆی بەناوی ئیسلامەوە، هەر لەو دەست بڕانەیە هەندێ کەس پارت وڕێکخراو و حیزبی ساختە ئەهێنن بە پارە و بە پول بۆ هاندانی بێ باوەڕان و داگیرکەران، پڕو پاگەندە ئەکەن بۆ ئیسلام بە ڕواڵەت لە ژێرەوە تیرەو خەنجەری ژەهراوی ئاراستەی ئیسلام ئەکەن .

﴿ وَ لا تَمْشِ فِي الأَرْضِ مَرحاً إنَّكَ لَنْ تَخرِقْ الأَرْضَ وَ لَنْ تَبْلُغَ الْجِبالِ طُولاً ﴾ وە تۆ مەڕۆ بە نێو زەویدا بە دەعیە و دەمارەوە، هێدی و لەسەر خربە لە ڕۆیشتندا و خۆت بەگەورە مەگرە، بەڕاستی تۆ ناتوانی کون بکەیتە زەوی بەو ڕۆیشتنە و ناگەیتە کێوەکان

بەدرێژی خۆت و بە گەورەیی لەشت. زۆرجاران بەدی ئەکرێ مرۆڤی نـەزان و ناکـەس بەچە خۆی هەڵئەکێشێ بەبێ نیشانە و بەڵگە گەورەیی بـۆ خـۆی دائـەنێ لـەو کاتانـەدا خاوەنی دارایی و سامان و پلە بن. بەلاّم لـەکاتی تەنگانـەدا و لـەکاتی ڕوودانـی خراپـە سەرگەردان ئەبێ و نازانێ سەر بۆ چ لایە دەرکا وبـەبێ دۆسـت ئەمێنێتـەوە، لـەکاتێکا دەستی لەکار کێشرایەوەو سـامان و پلەکـەی نـەما بـە وێنـەی کـەوڵی کـۆن لـە نێـو خێزانەکانیانا دائەنیشن بەبێ نرخ و کەس باسیان ناکا. بەلاّم مرۆڤی ژیـر و خـاوەن بـیر و کارا مەخۆی لێ ناگۆڕێ، بیر لە مناڵی و هەژاری خۆی ئەکاتەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان دەمـار بەسەر هیچ کەسا ناکا. بەجگەی خۆی تەمێ خوار بـووە، ئـەو مرۆڤـە لای هەموکەسـێ بەڕێزە لەکاتی سـامانداری و خـاوەن پلـەییدا و لـەکاتی نـەمانی پلـەیی و هـەژاریش دا بەڕێزە.

﴿ كُلُّ ذَلِكَ كَانَ سَيِّئُهُ عِنْدَ رَبِّكَ مَكْرُوهاً ﴾ هەمو یەکێ لەو شتانەی پێشوو کە خوا فەرمانی پێداون هەر لە فەرمودەی خوا ( لا تَجْعَلْ مَـعَ اللهِ إلهـاً آخـراً ) هـەتا دوایـی کـە قەدەغە کراون گوناهەکانیان خراپن لای خواو ئەو کەسانەی بیـان کـەن شـایانی سـزا و تۆڵە لێ سەندنن. بەڕاستی ئـەو یاسـایانە گـەورەترین یاسـان و گونجـاوی هـەمو کـات و جێگەیەکن .

﴿ ذَلِكَ مِمَّا أَوْحَى إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ الْحِكْمَـةِ ﴾ ئـەو فـەرمان ویاسـایانە هـەمویان کـە باسکران لە وانەی فەرماندرا بە کردنی هەندێکیان و نەکردنی هەندێکیان لەو شتانەی بـە سروش پەروەردگاری ناردبێتی بۆ لای تۆ لەو شتانەن ئەقڵ فەرمانیان پێ ئەدا و هەموویان لە جێگەی خۆیانا دانراون، هەرکەسێ کاریان پێ بکا بەڕاستی دەستی بـە دادپەروەریـەوە گرتوە لە هەردوو جیهانا تووشی گیروگرفت و خراپە نابێ .

﴿ وَلا تَجْعَلْ مَعَ اللهِ إِلهاً آخَرَ فَتُلْقَى فِي جَهَنَّمَ مَلُوماً مَدْحُوراً ﴾وە تـۆ مـەگێرە لەگـەڵ خواداو دای مەنێ لەگەڵ خودا چەند خوایە بۆ پەرستن، دوایی تۆ فڕێ بدرێتە نێو ئـاگری دۆزەخ بەلۆمەکراوی و دور لە میـهرەبانی و بـەزەیی خـوا و تانـەت لێ بـدرێ لەلایـەن فریشتەکان و باوەڕدارانەوە .

بت پەرستان بڕوایان وابو کە خوا لەڕەگەزی فریشتەکان چەندین کچی هەیە، بڕوایشتان وابو کوڕ چاکترە لە کچ، لەگەڵ ئەوەیشدا کوڕ یان بۆ خۆیان دائەنا و کچیان بۆ خوا بە ڕەوا ئەزانی خوای مەزن بەسەر زەنشتەوە بەوان ئەفەرموێ:

أَفَأَصْفَىٰكُمْ رَبُّكُم بِٱلْبَنِينَ وَٱتَّخَذَ مِنَ ٱلْمَلَٰٓئِكَةِ إِنَٰثًا ۚ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلًا عَظِيمًا ﴿٤٠﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِى هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِيَذَّكَّرُوا۟ وَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤١﴾ قُل لَّوْ كَانَ مَعَهُۥٓ ءَالِهَةٌ كَمَا يَقُولُونَ إِذًا لَّٱبْتَغَوْا۟ إِلَىٰ ذِى ٱلْعَرْشِ سَبِيلًا ﴿٤٢﴾ سُبْحَٰنَهُۥ وَتَعَٰلَىٰ عَمَّا يَقُولُونَ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤٣﴾ تُسَبِّحُ لَهُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ ٱلسَّبْعُ وَٱلْأَرْضُ وَمَن فِيهِنَّ ۚ وَإِن مِّن شَىْءٍ إِلَّا يُسَبِّحُ بِحَمْدِهِۦ وَلَٰكِن لَّا تَفْقَهُونَ تَسْبِيحَهُمْ ۗ إِنَّهُۥ كَانَ حَلِيمًا غَفُورًا ﴿٤٤﴾

﴿ افأَصْفاكُمْ رَبُّكُمْ بِالْبَنِينَ وَ اتَّخَذَ مِنَ الْمَلائِكَةِ إناثاً ﴾ ئایا دوایی چۆن پەروەردگاری ئێوە کوڕەکان ئەدا بەئێوە بەتایبەتی ئەیان بەخشێ بە ئێوە کە کوڕ گەورەتری منالآنە لاتان و بۆ خۆی وەرگرێ چەندین کچێ لە فریشتەکان کە لای ئێوە بێ نرخە، چاکەکان بدا بەئێوە کە کورە وخراپەکان دانێ بۆ خۆی کە کچە لە فریشتەکان .

﴿ إِنَّكُمْ لَتَقُولُونَ قَوْلاَ عَظِيماً ﴾ بەڕاستی ئێوەی بت پەرست گفتوگۆیەکی زۆر گەورەی خراپ ئەڵێن: خوا کچی هەیە لە فریشتەکان، چونکە خوا هاوبەشی بۆ نیە و بێ وێنەیە، خوا لەوە دوورترە منالّی هەبێ .

﴿ و لقد صرفنا في هذا القرآن ليذكروا ﴾ وە بەراستی ئیمە رونمان کردوەتەوە چـەند جاری لـەم قورئانەدا بەلـگەی ئاشـکرای بـەهیز لـەسـەر بونـی خـوا و بـی وینـەیی خـوا لـەبەرئەوەی ئەوان ئامۆژگاری وەرگرن و تەمی خوا بن و واز لـەبی باوەری بهینن و یادی خوا بکەنەوەو منال بۆ خوا دانەنین .

﴿ و ما يزيدهم إلا نفورا ﴾ وە ئەو رونکردنەوە و دووپات کردنەوەی بەلـگـەکان بـۆ ئەوانی زۆر نەئەکرد مەگەر دوورکەوتنەوە لـەراستی، دواکەوتنی لاسایی کردنـەوەی بـاو باپیریان لـە ناراستیدا .

﴿ قل لو كان معه آلهة كما يقولون إذا لا تبتغوا إلى العرش سبيلا ﴾ تـۆ بلـی: ئەگـەر لـەگەل خوادا چەندین خوایە تر هەبوایە وەك ئیوە ئەیلین، ئەو کاتە بەراستی ئـەو خوایانـە ئەچون بۆ لای ئەو کەسەی کە خاوەنی بونـەوەران و پاشـا و پـەروەردگاری هەمویانـە و ریگەیەکیان پەیدا ئەکرد بـۆ خۆیـان بـۆ ئـەوەی بچـن بـەگژیا و سـەربکەون بەسـەریا . بیگومان ئەو کاتە جیهان تیك ئەچو. بەوینەی پاشایانی ئیستا .

﴿ سبحانه وتعالى عما يقولون علوا كبيرا ﴾ پاك و خاوینی و بالا دەستی بۆ خوای تـاك و تەنهایە و دورە لـەوەی ئیوە ئەیلین بەو بالا دەسـتی زۆر گـەورەو دوورە لـەوەی ئیـوە ئەیلین لـە هاوبەشدانان بـۆ خـوا. بیگومـان هـەر خوایـەکی تەنـها هەیـە بۆیـە سروشـتی بونەوەران وەك خۆی ماوەتەوەو ناگۆری .

بەم جۆرەیش مانای ئەو رستەیە کراوە. ئەگەر لـەگەل خوادا چەند خوایـەتر هەبوایـە، ئیتر ئەو خوایانە ئەستیرە بن یا ئادەمیزاد یا بەردی بی گیـان یاشـتی تـر، ئـەوان هـەمویان دروست کراوی خوان ئەبی خـوا بپەرسـتن کەواتـە ئیـوەی بـت پەرسـت جگـەی خـوا مەپەرستن، چۆن ئەوانە ئیوە لـەخوا نزیك ئەکەنەوە ؟

﴿ تسبح له السماوات السبع و الأرض ومن فيـهن ﴾ حـەوت ئاسمانـەکان و زەوی و کەسی لـە نیوان ئاسمانەکان و زەویدان پاك وبەرزی دەرئەبرن بۆ خوا و دوری ئەخەنـەوە لـەو شتانەی نارەوان بۆ خوا، هەریەکـەیان بـەجۆرە زمـانیکی تایبـەتی خۆیـان، هـەمویان بەلـگەن لـەسەر توانا و یەکیتی خوا و پاکی لـە منال بۆی دەرئەبرن .

﴿ و إن من شيء إلا يسبح بحمده و لكن لا تفقهون تسبحهم ﴾ وە هیچ شتی لەبونەوەران نیە مەگەر ئەوشتانە خوا دور ئەخەنەوە لەکاری ناشایستە بەهۆی سوپاسی خواوەو بەلام ئیوەی بت پەرست نازانن بەجۆری دوورخستنەوەی ئەوان لەکاری ناشایستە بۆ خوا، چونکە بەزمانی ئەیلین ئیوە نایزانن .

﴿ إنه كان حليما غفورا ﴾ بەراستی خوا خاوەنی هیمنی زۆرە و پەلەی نیە بۆ سزادانی بی باوەران کە هاوبەش بۆ خوا دائەنین، لی خۆشبوونی زۆرە بۆ ئەو کەسانەی پەشیمان ئەبنەوە لە کردەوەی خراپ .

هەموو شتی پاك وخاوینی دەرئەبرن بۆ خوا، بەلام ووتنی ئەو پاك و خاوینی یە ئەگۆری بەگویرەی جیاوازی جۆری ئەو شتانە: ئەوانەیان خاوەنی ئەقلن بە زمانی گفتوگۆی خۆیان ئەیکەن، جگەی ئەوان بەزمانێ تر بەو ژیوارەکە بەلگەن لەسەر نەخشە کیشیکی بی وینە. زمانی ژیوار خۆی لە خۆیا بەهیزترە لەسەر یەکیتی خوا لەزمانی گفتوگۆ، چونکە پیویستی بەبەلگە هەیە .بەلام ئەوان خۆیان بەلگەن لەسەر یەکیتی خوا. بی خواکان وبت پەرستان لەپاکی وخاوینی خوا ناگەن و نایانەوی بیزانن و خۆیانی لی کویر ئەکەن بۆ زانینی نهینیەکانی خوا. ئەبی بزانین خوا خاوەنی دوو نامەیە بۆ باوەرهینان بەخوا. یەکەمیان قورئانی پیرۆز بە گفتوگۆی پەك خەر خوای پی ئەناسینی. دووهەمیان بونەوەران کە بەزمانی ژیوار و بژیو خوامان پی ئەناسینی .

کاتی خوای مەزن باسی قورئان و دووپات کردنەوەی قورئانی کرد. لەمەودوا بۆمان روون ئەکاتەوە شیوازی باوەرداران و هەلویستی پیغەمەر بەرانبەریان. ئەگیرنەوە کاتی خوای مەزن سورەتی ( تبت ) ی ناردە خوارەوە، ژنەکەی ئەبو لەهەب بەردیکی هەلگرت هات و ئەبوبەکر لەخزمەت پیغەمەردا بوو، ئەو ژنە پیغەمەری نەبینی، بەئەبوبەکری ووت: هاوریکەت لەچ شوینیکە باسی خراپەی منی کردوە. ئەبوبەکر ووتی: سویندم بەخوا: هیچ خراپەیەکی بەتۆ نەوتوە و نایشی لی، ئەو ژنە گەرایەوەو ئەی ووت: ئەم بەردەم هینا بیدەم بەسەریداو برینداری بکەم. ئەبو بەکر ووتی: ئەی پیغەمەر: ئەو ژنە هات و تۆی نەدی. پیغەمەر فەرموی: بەلی: نەیدیم، فریشتەیە لەنیوان من وئەودا بو، بۆ ئەو رووداوە خوا فەرموی:

وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْـَٔاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَـٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَسْتَمِعُونَ بِهِۦٓ إِذْ يَسْتَمِعُونَ إِلَيْكَ وَإِذْ هُمْ نَجْوَىٰٓ إِذْ يَقُولُ ٱلظَّـٰلِمُونَ إِن تَتَّبِعُونَ إِلَّا رَجُلًا مَّسْحُورًا ﴿٤٧﴾ ٱنظُرْ كَيْفَ ضَرَبُوا۟ لَكَ ٱلْأَمْثَالَ فَضَلُّوا۟ فَلَا يَسْتَطِيعُونَ سَبِيلًا ﴿٤٨﴾

﴿ و إذا قرأت القرآن جعلنا بينك و بين الذين لايؤمنون بالآخرة حجابا مستورا ﴾ وە هەركاتی تۆ قورئانت ئەخويند ئيمە گيرابومـانو دامـان نـابو لـەنيوان تـۆو لـە نيـوان بـی باوەرانی ئەوتۆ باوەر بەرۆژی دوايی نايەرن پەردەيە تۆ داپۆشی و بـی بـاوەران نـەتبينن و ئازارت بدەن و ريگە لـەدليان بگری و سود لـە قورئان وەرنەگرن. وەك خوا ئەفەرموی:

﴿ و جعلنا على قلوبهم آكنة أن يفقهوه ﴾ وە ئيمە دامان نابو لـەسەر دلی بی باوەران پەردەيە كە لـەو قورئانە نەگەن و سود لـە مانا و ناوەرۆكەكەی وەرنەگرن .

﴿ و في آذانهم وقرا ﴾ وە ئيمە دامان نابو لـە گويچكەكانيانا قورسايی و كەری هــەتا ئەو قورئانە نەبيسن .

بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو رستانەی رابوردوون ئەم هۆيەشيان بـۆ گيراوەتـەوە كـە بت پەرستان كاتی پيغەمەر قورئانی بخويندايە بەردەمی پيغەمەريان ئەگرت و هەوليان ئـەدا

کە نەیەڵن بیخوینی، خوا فەرموی: تۆ برۆ و قورئانی خۆت بخوینەو بانگی دانیشتوان بکە بۆ لای ئایینی خوا نرخ بۆ بی باوەران دامەنی. ئیمە تۆ ئەپاریزین وریگە لەوان ئەگرین ئازاری تۆ بدەن .

﴿ و إذا ذكرت ربك في القرآن وحده و لوا على أدبارهم نفورا ﴾ وە هەر کاتی تۆ باسی پەروەردگاری خۆتت بکردایە لە قورئاندا بەتەنها و بت ووتایە ( لاإله إلا الله ) بی باوەران پشتیان ئەکردە تۆ و وازیان لەگوی گرتنی قورئان ئەهینا ودوور ئەکەوتنەوە، ئەیان ووت: زۆر سەیرە چۆن بەتەنها باسی یەك خوا ئەکاو ناوی خواکانی تر نابا؟ مەبەست لەراکردنیان و پشت تی کردنیان ئەوەبو ئەیانزانی نهینی ووشەی (لاإله إلا الله) ئەوە ئەگەیەنی چینایەتی باوی نەماوەو مرۆڤ تەماشای ئەکری بەگویرەلای شایستەی خۆی، نەك بەهۆی دارایی و رەگەز و شتی ترەوە .

﴿ نحن أعلم بما يستمعون به إذ يستمعون إليك و إذ هم نحوى ﴾ ئیمە زاناترین بەهۆی شتیکی ئەوتۆ ئەوان گویی بۆ ئەگرن لە گاڵتە کردن بەتۆ و بە قورئان کاتی ئەوان گوی ئەگرن لە تۆ قورئان ئەخوینی و کاتی ئەوان چپە ئەکەن لەگەڵ یەکتری و ئەیانەوی پلانیکت بۆ دروست بکەن .

بەکورتی ئەوان بەدلیکی پاکەوە گوی لە تۆ ناگرن. بەلکو بەدلیکی پیس و رقەوە گوی لە تۆ ئەگرن و ئەڵین: موحەمەد جادوگەرە و جادوی بۆ ئەکری ئەگینا مرۆڤیکی نەخوینەوار چۆن ئەو کارە پەك خەرانە ئەهینی؟ وەك خوا ئەفەرموی:

﴿ إذ يقول الظالمون إن تتبعون إلا رجلا مسحورا ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ستەمکاران ئەڵین: ئیوە دوای هیچ شتی ناکەون مەگەر دوای پیاوی ئەکەون جادوی لی کراوە ئەگینا ئەو پیاوە ئادەمیزادە وەك ئیمە وایە و خوا ئەفەرموی:

﴿ أنظر كيف ضربوا لك الأمثال فضلوا فلا يستطيعون سبيلا ﴾ تۆ تەماشا بکە بت پەرستان چۆن وینە لی ئەدەن بۆ تۆ چەندین وینە، هەندیکیان ئەڵین: موحەمەد شیتە، یا

جادوگەر و پۆشە زان و شایەرە، دوایی لەریگەی راست لایان داوە، دوایی توانای ئەوەیان نیە ریگەی راست بدۆزنەوەو تانە بدەن لەتۆ بەجۆری مرۆڤی ژیر و بی لایەن وەری بگری .

کاتی خوای مەزن لەمەوبەر باسی زیندووبونەوەو کۆبونەوەی ئادەمیزادی کرد دوای مردنیان لە رۆژی دواییدا، لەم ئایەتەی دواییدا باسی ئەوە ئەکا بی باوەران بەچ شتی و بە چ بەلگەیە ئەتوانن بلین: زیندو بونەوە نیە و تانە لە تۆ ئەدەن و ئەفەرموی:

وَقَالُوٓاْ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمٗا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبۡعُوثُونَ خَلۡقٗا جَدِيدٗا ﴿٤٩﴾ ۞قُلۡ كُونُواْ حِجَارَةً أَوۡ حَدِيدًا ﴿٥٠﴾ أَوۡ خَلۡقٗا مِّمَّا يَكۡبُرُ فِي صُدُورِكُمۡۚ فَسَيَقُولُونَ مَن يُعِيدُنَاۖ قُلِ ٱلَّذِي فَطَرَكُمۡ أَوَّلَ مَرَّةٖۚ فَسَيُنۡغِضُونَ إِلَيۡكَ رُءُوسَهُمۡ وَيَقُولُونَ مَتَىٰ هُوَۖ قُلۡ عَسَىٰٓ أَن يَكُونَ قَرِيبٗا ﴿٥١﴾ يَوۡمَ يَدۡعُوكُمۡ فَتَسۡتَجِيبُونَ بِحَمۡدِهِۦ وَتَظُنُّونَ إِن لَّبِثۡتُمۡ إِلَّا قَلِيلٗا ﴿٥٢﴾

﴿ و قالوا أئذا كنا عظاما ورفاتا أننا لمبعثون خلقا جديدا ﴾ وە بی باوەران ئەلین: ئایا کاتی ئیمە ببین لەدوای مردن بەچەندین پارچەی ئیسك وبەخۆلی رزاو ئایا بەراستی ئیمە ئەکریینەوە بەبونەوەریکی تازە، چۆن شتی وا بی و ئەو زیندوبونەوەیە زۆر دورە. وەلامی ئەو بی باوەرانە ئەدریتەوە کەسی توانیبیتی ئیوە دروست بکات یەکەم جار لەنەبونەوە بۆ لای بون ئاسانترە لای ئەو جاری تر زیندووتان بکاتەوە بۆ جاری دووهەم لەسەر بنچینەی ئەندامەکانتان، وەك خوا ئەفەرموی:

﴿ قل كونوا حجارة أو حديـدا أو خلقـا ممـا يكـبر فـي صدوركـم ﴾ تـۆ بلـی بـەبی باوەران: ئیوە بەردبونایە یا ئاسن لـە رەقی و هیزدا یابونـــەوەری بونایـە گـەورەبی لـەدلی ئیوەدا و بەدوری بزانن گیان بكـری بەبـەریدا. ئیـوە ئەگـەر ئەوانەیشـن ئیمـە ئـەتوانین بتانكەین بە مرۆڤیكی وەك ئیوەی زیندو، كەسی بتوانـی ئەوانـە بكـا بـەمرۆڤیكی زینـدوو ئەتوانی ئیوەیش لـەدوای مردن زیندوتان بكاتەوە و پارچە رزیوەكانتان كۆبكاتـەوەو گیـان بكا بە بەرتانا.

﴿ فسيقولون من يعيدونا قل الذي فطركم أول مرة ﴾ دوایـی بـی بـاوەران ئـەلین: چ كەسی ئیمە ئەگیریتەوە بۆ لای زیندوبونەوە دوای ئەوەی بووین بـە تـۆزی بـا بـردو، تـۆ بلی: كەسیكی ئەوتۆ ئیوە ئەگیریتەوە یەكەم جار ئیوەی دروست كردوە و ئیوە خاك بون.

﴿ فسينغضون إليك رؤوسهم و يقولون متى هو قل عسى أن يكون قريبا ﴾ دوایی بـی باوەران سەری خۆیان بەرز ئەكەنەوە بۆ لای تۆو سەری خۆیان رائەوەشینن بە گالتـــەو و ئەلین: چ كاتی ئەو زیندوبونەوەیە پەیدا ئەبی، تۆ بلی: لـەوانەیـە ئـەو زیندوبونەوەیـە زۆر نزیكبی .

﴿ يوم يدعوكم فتستجيبون بحمده وتظنون إن لبثتم إلا قليلا ﴾ ئـەو رۆژەی خـوا داوا ئەكا ئیوە بینە دەرەوە لـە گۆرەكانتان وزیندوتان ئەكاتەوە، دوایی ئیوە بە سـوپاس كردنـی خواوە ئیوە وەلامی خوا ئەدەنەوە بەسەر شۆری و لاوازیەوە، ئیوە گومان ئەبـەن لـەبـەر سامناكی ئەو رۆژە دانەنیشتون لـە جیهاندا مەگەر ماوەیـەكی كـەم رۆژی یـا هـەندی لـە رۆژ.

لـەدواییدا خوای مەزن فەرمان ئەدا بە بەندەكانی خۆی كە پـەیرەوی گفتوگـۆی چـاك بكەین و ئەفەرموی:

وَقُل لِّعِبَادِى يَقُولُوا۟ ٱلَّتِى هِىَ أَحْسَنُ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ يَنزَغُ بَيْنَهُمْ ۚ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلْإِنسَٰنِ

عَدُوًّا مُّبِينًا ﴿٥٣﴾ رَّبُّكُمْ أَعْلَمُ بِكُمْ إِن يَشَأْ يَرْحَمْكُمْ أَوْ إِن يَشَأْ يُعَذِّبْكُمْ وَمَا أَرْسَلْنَاكَ عَلَيْهِمْ وَكِيلًا ﴿٥٤﴾ وَرَبُّكَ أَعْلَمُ بِمَن فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَىٰ بَعْضٍ وَآتَيْنَا دَاوُودَ زَبُورًا ﴿٥٥﴾ قُلِ ادْعُوا الَّذِينَ زَعَمْتُم مِّن دُونِهِ فَلَا يَمْلِكُونَ كَشْفَ الضُّرِّ عَنكُمْ وَلَا تَحْوِيلًا ﴿٥٦﴾ أُولَٰئِكَ الَّذِينَ يَدْعُونَ يَبْتَغُونَ إِلَىٰ رَبِّهِمُ الْوَسِيلَةَ أَيُّهُمْ أَقْرَبُ وَيَرْجُونَ رَحْمَتَهُ وَيَخَافُونَ عَذَابَهُ إِنَّ عَذَابَ رَبِّكَ كَانَ مَحْذُورًا ﴿٥٧﴾

**﴿ قل لعبادي يقولوا التي هي أحسن ﴾** تۆ بلی بە بەندەکـانی مـن بـە بـاوەردار و بـی باوەریانەوە گفتوگۆی چاك بكەن و گفتوگۆی راستی و دادپەروەری ئەوتۆ بكەن چاكتر بی ونرخەكەی هەرشتی بی، یانی ئەگەر لـەگەل تۆدا كەسی شتیكی ناخۆشی بەكارهینا تۆ بە نەرمی و بەبی تورەبون وەلامی بدەرەوە. هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەوەبوە بت پەرستان ئازاری موسلمانیان ئەدا، دوای شكاتەكەیان هینایـە خزمـەت پیغەمـەر و خـوای مەزن ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە .

**﴿ إن الشيطان ينزغ بينهم إن الشيطان كان للأنسان عـدوا مبينـا ﴾** بەراسـتی شـەیتان خراپە ئەخاتە نیوان ئادەمیزادەوە، زۆرجـاران بـەكارهینانی تورەیـی بەرانبـەری بـەتورەیی سەرئەكیشی بۆ لای روداوی زۆر نالـەبار گفتوگۆی نابەجی وائەبی خراپە دروست بكات لەنیوانیانا. بەراستی شەیتان دوژمنیكـی ئاشـكرایە بـۆ ئـادەمیزاد هـەرگیز تیناكۆشـی بـۆ چاكبوونی نیوان ئادەمیزاد. ئەوەبو جاری عومەری كوری خەتاب لـەگەل بی‌باوەریكا تیـك چون، ئەگەر پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ئامۆژگاری خودای بەعومەر رانەگەیاندایە خراپتری لی پـەیدا ئەبوو .

﴿ ربكم أعلم بكم إن يشأ يرحمكم أو إن يشأ يعذبكم ﴾ پەروەردەکەری ئیوه زاناتره لە بەسەرهاتی ئیوەو بەوشتەی ئەبی بەهۆی چاکبوونی ئیوەو خراپ کردنی ئیوه ئەگەر خوا ئارەزۆی کرد میهرەبانی ئەکا لەگەل ئیوەو لە ئیوه خۆش ئەبی ئەگەر شایانی ئیوه بی، یا ئەگەر ئارەزۆی کرد سزای ئیوه ئەدا کاتی شایستەی سزابوون. بەلام کاتی پیغەمەر فەرمودەی ئیمەی بەوان راگەیاند .

﴿ و ما أرسلناك عليهم وكيلا ﴾ وه ئیمە تۆمان نەکردو ەبۆ سەر بی باوەران بەسپیرراوی کاری ئەوان و نەیەلی بی باوەری بکەن یا باوەرداریان بکەی. گەیاندنی فەرمانی ئیمەت لەسەره بەوان .

﴿ و ربك أعلم بمن في السماوات و الأرض ﴾ وه پەروەردگاری تۆ زاناتره بەکەسی و بەوشتانه لە ئاسمانەکان و لەزەویدان، هەر ئەو ئەزانی بەسودو بە زیانیان و بەشتی شایانی ئەوانبی .

﴿ و فضلنا بعض النبيين على بعض ﴾ وه ئیمە ریزی هەندی لە پیغەمەرانمان داوه بەسەر هەندی تریانا. هەر بەوجۆرەی خوا هەندی لە فریشتەکانی هەلبژاردوەو ناردونی بۆ لای پیغەمەران بەوینەی جبرەئیل نادرویتی بۆ لای پیغەمەران کەموژده بدەن بەئادەمیزاد و بیان ترسینن، هەر بەوجۆرەی ریزی هەندی لە فریشتەکانی داوه بەسەر هەندی تریانا، هەروایش ریزی هەندی لە پیغەمەرانی داوه بەسەر هەندی تریانا.

﴿ و آتينا داود زبورا ﴾ وه ئیمە بەخشیومانه بەداود زەبور کە جگە لە پارانەوه و سوپاسی خوا هەندی لەفەرمانی خوا زیاتری تیدا نیە. ئەو جوی کردنەوەی زەبور وباسکردنی داود بۆ وەلامدانەوەی بی باوەران کە ئەیان ووت: چۆن ئەبی موحەمەد پیغەمەر بی بە هەتیوی و هەژاری ژیاوه، بەراستی خوا پەیامی خۆی بەکەسی ئەدا شایستەی ئەو پەیامە بی ئیتر هەتیو و هەژار بی وەك موحەمەد ساماندار بی وەك داود، بۆ ئەوەیشه هەندی لەمیژوو نوسان ناوی داودیان بە پاشا ناوبردوه نەك بە پیغەمەر .

پرسیار/ بەراستی ئیسلام راوەستاوە لەسەر یـەکبونی ئـادەمیزاد و یەکسـانیان، دوایـی مانای ئەو ریزە چ شتیکە؟ چۆن هەندی لە فریشتە و هەندی لە پیغەمـەران ریزیـان دراوە بەسەر هەندی تریانالەگەل ئەوەیشدا هەمویان بەندەی خوان و ریزدارن ؟

وەلام/ بەلی: زۆر راستە. ریزدان لەبەر پەرستن و بی گوناهی و دۆسـتایەتی خـوا نیـە خۆی لە خۆیا. بەلام لەبەر هەندی رەوشتە لەهەندیکیانا، وەك ریز خـۆی لـەخۆیا هـەمو جۆرەکانی بەریزە، بەلام هەندیکیان بەنرخترن. هەروایش رەوشـتی چـاك جیاوازیـان تیـدا هەیە لە ئەندازەی جوانی و پلە و پایەدا .

﴿ قل ادعوا الذین زعمتم من دونه فلا یملکون کشف الضر عنکم و لا تحویلا ﴾ تـۆ بلی بە باوەرداران: ئیوە بانگی کەسانیکی ئەوتۆ بکەن گومانتان وابوە خـوان لـە جگـەی خوا، با ئەو خوایانەیش لە ئەوپـەری بـەرزی و گـەورەییدا بـن وەك عیسـا و عوزەیـر و فریشتەو جنۆکەکان هەتا لە گیروگرفت و چەرمەسەری رگارتـان بکـەن، دوایـی بۆتـان دەرئەکەوی ئەوان خاوەنی ئەوەنین لایدەن لە ئیوە ەسختی لەنەخۆشی و هەژاری وگرانـی و خاوەنی ئەوە نین ئەو سەختیە بگۆرن بۆ لای جگەی ئیوە و بۆ لای تـاقمی تـر، کەواتـە ئەوانەی جگەی خوا شایستەی پەرستن و هاوار لی کردن نین .

﴿ أولئك الذین یدعون یبتغون إلی ربهم الوسیلة ﴾ ئەو کەسـانەی ئـەوتۆ بـی بـاوەران هاواریان لی ئەکەن و ئەیان پەرسـتن خۆیـان داوا ئەکـەن و هـاواری لای پـەروەردگاری خۆیان ئەکەن نزیك ببنەوە لە خواو پلەی بەرزیان بداتی، ئەو بی باوەرانە تەماشاکەن:

﴿ أیهم أقرب و یرجون رحمته و یخافون عذابه ﴾ چ کەسی لە خواوە نزیکـە دوایـی ئەوان پەنا ببەن بۆلایان و ئەوانـە بـە ئومیـدی میـهرەبانی وبـەزەیی وبەهەشـتی خـوان و لەسزای خوا ئەترسن؟ بیگومان هەمو یەکی لە فریشتەکان و عوزەیر خۆیان ماندو ئەکـەن بۆ پەرستنی خوا بەنیازی پاکەوە هەتا نزیك ببنەوە لە بوردنی خواو بەزەیی خوا .

﴿ إن عذاب ربك کـان محـذورا ﴾ بەراسـتی سـزای پـەروەردگاری تـۆ پیغەمـەران ودۆستانی خوا و مرۆڤـی ژیـر خۆیـانی لی ئـەپاریزن و جگـەی ئـەوان چـۆن خۆیـانی لی ناپاریزن، هەموو مرۆڤیکی ژیر ئەبی چەکی خۆی بۆ دوارۆژ ئامادە بکا هەر پلەو پایەیەکی هەبی .

وَإِن مِّن قَرْيَةٍ إِلَّا نَحْنُ مُهْلِكُوهَا قَبْلَ يَوْمِ ٱلْقِيَـٰمَةِ أَوْ مُعَذِّبُوهَا عَذَابًا شَدِيدًا ۚ كَانَ ذَٰلِكَ فِى ٱلْكِتَـٰبِ مَسْطُورًا ﴿٥٨﴾ وَمَا مَنَعَنَآ أَن نُّرْسِلَ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّآ أَن كَذَّبَ بِهَا ٱلْأَوَّلُونَ ۚ وَءَاتَيْنَا ثَمُودَ ٱلنَّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا۟ بِهَا ۚ وَمَا نُرْسِلُ بِٱلْـَٔايَـٰتِ إِلَّا تَخْوِيفًا ﴿٥٩﴾ وَإِذْ قُلْنَا لَكَ إِنَّ رَبَّكَ أَحَاطَ بِٱلنَّاسِ ۚ وَمَا جَعَلْنَا ٱلرُّءْيَا ٱلَّتِىٓ أَرَيْنَـٰكَ إِلَّا فِتْنَةً لِّلنَّاسِ وَٱلشَّجَرَةَ ٱلْمَلْعُونَةَ فِى ٱلْقُرْءَانِ ۚ وَنُخَوِّفُهُمْ فَمَا يَزِيدُهُمْ إِلَّا طُغْيَـٰنًا كَبِيرًا ﴿٦٠﴾

﴿ و إن من قرية إلا نحن مهلكوها قبل يوم القيامة ﴾ وە دانیشتوانی ستەمکار وخراپەکەری هیچ گوندی نیە مەگەر ئیمە دانیشتوانی ئەو گوندە لەناو ئەبەین وبنەبریان ئەکەین بەر لەهاتنی رۆژی دوایی و بەرلەوەی زیندوو بکرینەوەو بینەدەر لە گۆڕەکانیان.

﴿ أو معذبوها عذابا شديدا كان ذلك في الكتاب مسطورا ﴾ یا ئیمە سزای دانیشتوانی ئەو گوندە ئەدەین بە سزایەکی نوسرا و لەنامەی ئیمە کە بریتیەلە لەوحەل مەحفوز و ئەبی ئەوانە بکرین، ئەوەی بۆمان رون بیبتەوە لە ناوەرۆکی مانای ئەو ئایەتەوە ئەوەیە ئادەمیزاد هەموویان بەر لەهاتنی دوارۆژ بنە بر ئەکرین بەجۆری کاتی رۆژی دوایی پەیدا ئەبی روی زەوی ئادەمیزادی زیندووی تیدانامینی، هەندیکیان بەمردنی ئاسایی لەناو ئەچن و هەندی تریان بەسزای سەخت، خوای مەزن چۆنیەتی ئەو لەناوبردن و سزداانە رون نەکردوەتەوە .

بۆ ئەوەی مانای ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە بەشێوەیە بێ بگونجێ لەگەڵ ناوەڕۆکی مانای ئایەتی یەکەمی سورەتی ئەلحەج کە ئەفەرموێ: ئەو ڕۆژەی ئادەمیزاد سەختی ڕۆژی دواییی ئەبینن ژنی شیردەر واز لەمناڵە شیرەخۆرەکەی خۆی ئەهێنێ لەبەر سەختی ئەو ڕۆژە، ئەو ئایەتە وا ئەگەیەنێ ئادەمیزاد ئەمێنێتەوە.کەواتە مەبەست لە دانیشتوانی ئەو گوندە لەو ئایەتەی ئێرە تاقمێکی ستەمکار و خراپەکەر بن بە تایبەتی، بەلاّم کۆمەڵە چاکەکەرەکان بەردەوام ئەبن هەتا ئەو ڕۆژە سەختە ئەبینن. ئەبێ بزانرێ شۆڕش بەرپابوون و ڕاپەڕینی دانیشتوان لەهەمو جێگەیە بۆ ڕزگارکردنی دانیشتوان لەستەم و لەهەژاری بەڵگەی ئاشکران لەسەر ئەوەی کۆمەڵی ستەمکار بنەبڕ ئەبن ماوەکەی نزیکبێ یا دوور.

قورەیشیەکان داوایان لە پێغەمەر ئەکرد کارێکی پەکخەریان بۆ بسازێنێ ،وەك ئەوەی کێوی سەفایان بۆ بکا بەزێڕ و کێوەکانی مەککە نەمێنن وبن بە دەشت و دەست بدەن بۆ کشتوکاڵ و باخ و بێستان بڕوێنرێ وڕوباری ئاویان تێدا پەیدا ببێ، خوای مەزن وەلاّمیان ئەداتەوە فەرموی:

﴿ وَ مامَنَعْنا اَنْ نُرْسِلَ بِالآیاتِ إلاّ اَنْ کَذَّبَ بِها الأَوَّلُونَ ﴾ وە وازی لە ئێمە نەهێناو ڕێگەی لە ئێمە نەگرت کە ئێمە ڕەوانە بکەین ئەو نیشانە ڕونانەو کارە پەکخەرانەی قورەیشیەکان داوای ئەکەن مەگەر بەدرۆخستنەوە و باوەڕنەهێنانی گەلانی پێشوو، ئەوەبو ئێمە لەسەر داخوازی خۆیان ئەوەی داوایان ئەکرد لە پێغەمەرەکانیان بۆمان ئەکردن و باوەڕیان نەئەهێنا و ئەبون بە شایستەی سزا و ئێمە بنەبڕمان ئەکردن. بەلاّم ئێمە بەویستی خۆمان داخوازی قورەیشیەکان جێ بەجێ ناکەین، چونکە ئەگەر باوەڕنەهێنن بنەبڕیان ئەکەین. ئێمە مۆڵەتیان ئەدەین و وەلاّمیان نادەینەوە چونکە هەندێکیان باوەڕئەهێنن و خزمەتی زۆری ئایینی پیرۆزی ئیسلام ئەکەن و هەندێ تریان منالّی وایان ئەبێ زانا و سودبەخش ئەبن بۆ ئایین .

﴿ وَ آتَیْنا ثَمُودَ النّاقَةَ مُبْصِرَةً فَظَلَمُوا بِها ﴾ وە بۆ نمونە ئێمە بەخشیومانە بە گەلی سەمود هوشترێ بەڵگەیەکی ڕون بو بۆ ئەو کەسەی ئەی بینی بەگوێرەی داخوازی

خۆیان، دوایی باوەڕیان بەگەورەیی نیشانەی ئەو هوشترە نەهێناو ستەمیان لەخۆیان کرد و هوشترەکەیان سەربڕی و ئێمە بنەبڕمان کردن .

﴿ وَ مانُرْسِلُ بِالْآياتِ إلاّ تَخْوِيْفاً ﴾ وە ئێمە ئەو کارە پەك خەرانەی دوایان ئەکرێ ڕەوانەیان ناکەین مەگەر ترساندنی دانیشتوانە بەهاتنە خوارەوەی سزا بۆ سەریان و بنەبڕبونیان ، ئەگەر نەترسان ئێمە سزایان بۆ ئەنێرین .

﴿ وَ إذْ قُلْنا لَكَ إنَّ رَبَّكَ أحاطَ بِالْنّاسِ ﴾ وە تۆ بیری ئەوکاتە بکەرەوە ئێمە بەتۆمان ووت: خەفەت مەخۆ بەڕاستی پەروەردگاری تۆ بەتواناو دەستەلاّتەکەی خۆی چواردەوری ئادەمیزادی گرتوەو لەژێر توانای ئەودان، تۆ مەوەستە لە ڕاگەیاندنی پیشەی خۆت بەبێ ترس ئێمە تۆ ئەپارێزین .

زۆربەی زانایان ئەڵێن: پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ لەخەویا بینی کەلەگەڵ هاوڕێکانیا ئەچێتە مەککە بەلاّم کاتێ پێغەمەر لە ساڵی حودەیبیە نیازی کرد بچێ بۆ مەدینە بت پەرستان ڕێگەیان پێ گرت و نەیان هێشت بچێتە مەککە، دوایی هەندێ لە موسڵمانان گومانیان پەیدا کرد لەبارەی ئەو خەوەی پێغەمەرەوە ووتیان: ئایا نۆ هەواڵت بە ئێمە نەدا ئەچینە نێومەککە بەبێ ترس، پێغەمەر فەرموی: بەڵێ وتومە. بەلاّم نەم ووتوە ئەم ساڵ بەیاریدەی خوا ساڵی داهاتو ئەچینە نێو مەککەوە، خوای مەزن لەوبارەوە فەرموی:

﴿ وَ ماجَعَلْنا الرُّؤيا الَّتِي أرَيْناكَ إلاّ فِتْنَةً لِلْنّاسِ ﴾ وە ئێمە نەمان گێڕا ئەو خەوەی ئەوتۆ ئێمە نیشانی تۆماندا مەگەر هەر لەبەر تاقی کردنەوەی ئادەمیزاد، هەتا دەرکەوێ و بزانرێ چ کەسێ بڕوای تەواوی بە ئەوخەوەی تۆ هەیە و چ کەسێ گومان ڕوی تێ ئەکا. هەندێ لە زانایان بۆ هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە چەندین شتی تریان ووتوە. بەلاّم ئەوەی بیر و بۆچونی زۆربەی زانایانە هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە ئەوەی پێشوە .

بت پەرستان کاتێ بیستیان کە لە سورەتی ( سافاتا ) خوا فەرموی: درەختی زەقوم خواردەمەنی گوناهبارانە، ووتیان بە گاڵتەوە: موحەمەد ئەڵێ: بەڕاستی دۆزەخ بەرد ئەسوتێنێ و لەپاشا ئەیشڵێ درەختێ لە دۆزەخدا ڕوواوە. بۆ وەلاّمدانەوەی بت پەرستان خوا فەرمووی:

﴿ وَ الشَّجَرَةَ الْمَلْعُونَةَ فِي الْقُرآنِ ﴾ وە ئێمە نەمان گـێڕاوە ئـەو درەختـە نـەفرەتی لێ ئەكرێ لەقورئاندا و باسی فەرموە مەگەر هەر لـەبەر تاقی كردنەوەی ئادەمیزاد. یانێ ئـەو درەختە كاتێ گوناهباران ئەی خۆن نەفەرتی لێ ئەكەن لەبەر ناخۆشی و بۆنی خراپی ئـەو درەختە .

بۆ زانین: بونی درەختێ لە دۆزەخدا و ئـاگری دۆزەخ نەیسـوتێنێ لـەگـەڵ ئەوەیشـدا ئاگری دۆزەخ بەرد ئەتوێنێتەوە بۆ توانای خوا جێگـەی سەرسوڕمان نیـە، چونكـە خـوا جۆرە درەختێ دروست بكا لە ڕەگەزێ ئاگری دۆزەخ نەیسوتێنێ، هوشتر مورغ پشكۆی ئاگر ئەخوا وزیانی پێ ناگەیەنێ، هەموو درەختـێ ئـاگری تێدایـە و نایسـوتێنێ. لەنامـەی (لسان العرب) دا هاتوە باڵندەیە هەیە ناوی سەمەندەل كاتێ پیر بو لـەبێچوكردن كـەوت خۆی فڕێ ئەداتە نێو ئاگر و جوان ئەبێـەوە، هەروەها لە توكی ئەو سەمەندە لە دەستەسڕ دروست ئەكەن كاتێ چڵكن ئەبێت ئەخرێتە نێو ئاگر چڵكەكەی ئەسوتێ وخۆی ناسوتێ. ئەو خوایە بتوانێ ئەوانە دروست بكا، ئەیشـتوانێ درەختـێ سـەوز بكـا لـە دۆزەخـدا و ئاگری دۆزەخ نەیسوتێنێ. ئەبێ بزانرێ عەرەب بەهەموو خواردەمەنێكی خراپ و ئـازاردا ئەڵێن: مەلعون .

﴿ وَ نُخَوِّفُهُمْ فَما يَزِيدُهُمْ إلاّطغيانا كَبِيْراً ﴾ وە ئێمە بـێ بـاوەڕان ئەترسـێنین بەچـەند جۆرێ، دوای ئەو ترساندنەی ئێمە هیچ شتێ بۆ ئـەوان زۆر ناكـا مەگـەر یـاخی بونێكـی گەورەو لە سنور دەرچون.

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ قَالَ ءَأَسْجُدُ لِمَنْ خَلَقْتَ طِينًا ﴿٦١﴾ قَالَ أَرَءَيْتَكَ هَٰذَا ٱلَّذِى كَرَّمْتَ عَلَىَّ لَئِنْ أَخَّرْتَنِ إِلَىٰ يَوْمِ ٱلْقِيَٰمَةِ لَأَحْتَنِكَنَّ

ذُرِّيَّتَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٦٢﴾ قَالَ ٱذْهَبْ فَمَن تَبِعَكَ مِنْهُمْ فَإِنَّ جَهَنَّمَ جَزَآؤُكُمْ جَزَآءً مَّوْفُورًا ﴿٦٣﴾ وَٱسْتَفْزِزْ مَنِ ٱسْتَطَعْتَ مِنْهُم بِصَوْتِكَ وَأَجْلِبْ عَلَيْهِم بِخَيْلِكَ وَرَجِلِكَ وَشَارِكْهُمْ فِى ٱلْأَمْوَٰلِ وَٱلْأَوْلَٰدِ وَعِدْهُمْ ۚ وَمَا يَعِدُهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ إِلَّا غُرُورًا ﴿٦٤﴾ إِنَّ عِبَادِى لَيْسَ لَكَ عَلَيْهِمْ سُلْطَٰنٌ ۚ وَكَفَىٰ بِرَبِّكَ وَكِيلًا ﴿٦٥﴾

﴿ و إذا قلنا للملائكة اسجدوا لأدم فسجدوا إلا إبليس ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیمە ووتمان بە فریشتەکان: ئیوە سوژدە ببەن بۆ ئادەم و ریزی لی بگرن، دوایی فریشتەکان هەمویان سوژدەیان برد بۆ ئادەم مەگەر ئیبلیس کە سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد.

﴿ قال أأسجد لمن خلقت طينا ﴾ ئیبلیس ووتی: ئایا من سوژدە ببەم بۆ کەسی تۆ دروستت کردوە لە خاك. من سوژدە نابەم بۆ کەسی بەوجۆرەی تۆ دروستت کردوە، دوایی خوای مەزن دەری کرد لە قاپی میهرەبانی خۆی و دووری خستەوە لەبەزەیی خۆی.

﴿ قال أرأيتك هذا الذي كرمت علي لئن أخرتن إلى يوم القيامة لأ حتنكن ذر يته إلا قليلا ﴾ ئیبلیس بەهەموو بێشەرمیکەوە ووتی بەخوای گەورە: تۆ هەوال بدە بەمن ئەو کەسەی تۆ ریزت داوە بەسەر مندا چ کەسیکە و بۆچی گیراوتە بە بەریزتر و گەورەتر لەمن؟ پیچەوانەکەی راستە؟ چونکە منت لە ئاگر دروست کردووەو ئەو لە خاك. بەراستی ئەگەر تۆ من دوابخەی هەتا رۆژی دوایی و هەلسانەوەی ئادەمیزاد لە

گۆرەکانیان بەراستی من منالـەکانی ئادەم رائەکیشم بۆ لای هەر شتی ئارەزۆم هەبی لـە بی فەرمانی تۆ مەگەر کەمی لـە منالـەکانی نەبی .

﴿ قال اذهب فمن تبعك منهم فأن جهنم جزاؤكم جزاء موقـورا ﴾ خـوا فـەرموی بـە ئیبلیس: تۆ کاری خۆت جی بەجی بکە، دوایی هەر کەسی لـەمنالـەکانی ئـادەم دوای تـۆ کەوت و لـەریگەی راست لایدا بەئارەزۆی خۆیان، دوای ئەوەی من ئەقلم دایە وریگەی چاك و خراپم بۆ جوی کردەوە، دوایی بەراسـتی دۆزەخ پاداشـتی ئیوەیـە بـە پاداشـتیکی بەردەوام و فراوان.

﴿ و استفزز من استطعت منهم بصوتك ﴾ وە تۆ سوکایەتی بکە بە کەسی ئەتوانی لـە ریگە لایاندەی لـە ئادەمیزاد و رایان پەرینە بۆ لای کاری خراپ بـەهۆی دەنگـی ناپـاکی خۆتەوەو گۆرانی وجوزەلـەی خۆتەوە و داوایان لی بکە بۆ لای خراپە بلاو کردنەوە .

﴿ و اجلب عليهم بخيلك و رجلك ﴾ وە تۆ بەهۆی لادانـی سـوارەو پیـادەی خۆتـەوە بانگی سەربازەکانی خۆت بکـەو کۆیـان بکـەرەوە بەسـەر منالـەکانی ئـادەمدا، ئیبلیـس سەربازی سوارەو پیادەی نیە، بەلام هیمایە بۆ ئەو کەسانە خراپـە کـار و هـەوەس بـاز و ناپاك و بەکری گیراوی شەیتانن .

﴿ و شـارکهم فـي الأمـوال و الأولاد ﴾ وە تـۆ ببـە بەهاوبەشـی منالـەکانی ئـادەم و لـەپەیداکردنی داراییەکانیان بە جۆریکی نارەوا لـە تالان و داگیرکردن وسود خـواردن و نرخی ناپاکی وبەکری گیراوی و دەست بلاوی نـاجۆرو کردنـی قومـار وخواردنـەوەی مەی و بەشداریان بکـەن لـە منالـەکانی نـەوەی ئادەمـا لـە داویـن پیسـیدا و کوشـتنی منالـەکانی خۆیان و لـە ترسی هەژاری و بەخیوکردنیان لـەسەر رەوشتی خراپ .

﴿ و عدهم وما يعد الشيطان إلا غرورا ﴾ وە تۆ بەلـینی خراپ بدە بە منالـکانی ئـادەم بەبەلـینی خراپ وەك ئەوە بتەکان بپەرستن و ریـزی پیاوخراپـان بگـرن کـە گوایـا بۆیـان ئەپارینەوە لای خوا ولـە جیهاندا ئازاریان نەدەن ئەو پیاوخراپانە، وەشـەیتان هیـچ بـەلینی نادا بەوان مەگەر فریودانیان و یاخی بونیا لـەخوا، برازینیـەوە بۆیان کاری خراپ .

﴿ إن عبادي ليس لك عليهم سلطان وكفى بربك وكيلا ﴾ بەراستی بەندە پاك و نیاز پاكەكانی من بۆ تۆ نیە هیچ دەستەلاتی بەسەر ئەواندا و لایان دەی لەپەرستنی من و، پەروەدگاری تۆ بەسە بۆ بەندەكانی من ئاگادرایان بكا و لەگومانی شەیتان بیانپاریزی و پەنا بە خوا بگرن .

رَّبُّكُمُ ٱلَّذِى يُزۡجِى لَكُمُ ٱلۡفُلۡكَ فِى ٱلۡبَحۡرِ لِتَبۡتَغُواْ مِن فَضۡلِهِۦٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ بِكُمۡ رَحِيمًا ﴿٦٦﴾ وَإِذَا مَسَّكُمُ ٱلضُّرُّ فِى ٱلۡبَحۡرِ ضَلَّ مَن تَدۡعُونَ إِلَّآ إِيَّاهُۖ فَلَمَّا نَجَّىٰكُمۡ إِلَى ٱلۡبَرِّ أَعۡرَضۡتُمۡۚ وَكَانَ ٱلۡإِنسَٰنُ كَفُورًا ﴿٦٧﴾ أَفَأَمِنتُمۡ أَن يَخۡسِفَ بِكُمۡ جَانِبَ ٱلۡبَرِّ أَوۡ يُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ حَاصِبًا ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ وَكِيلًا ﴿٦٨﴾ أَمۡ أَمِنتُمۡ أَن يُعِيدَكُمۡ فِيهِ تَارَةً أُخۡرَىٰ فَيُرۡسِلَ عَلَيۡكُمۡ قَاصِفًا مِّنَ ٱلرِّيحِ فَيُغۡرِقَكُم بِمَا كَفَرۡتُمۡ ثُمَّ لَا تَجِدُواْ لَكُمۡ عَلَيۡنَا بِهِۦ تَبِيعًا ﴿٦٩﴾

﴿ ربكم الذي يزجي لكم الفلك في البحر لتبتغوا من فضله ﴾ پەروەردگاری ئیوە كەسیكی ئەوتۆیە بۆ سوودی ئیوە ئەبا بەریوە لە ناو، روباردا كەشتیەكان لەبەرئەوەی ئیوە پەیدا بكەن هەندی لە رۆزی خوا بەهۆی بازرگانی و جگەی بازرگانی.

﴿ إنه كان بكم رحيما ﴾ بەراستی پەروەردگاری ئیوە زۆر میهرەبان و خاوەن بەزەییە بۆ ئیوە، چونكە ئامادەی كردوە بۆ ئیوە هەمووشتی ئیوە پیویستیتان پیی هەبی، گیروگرفتی بۆتان ئاسان كردوە .

﴿ و إذا مسكم الضر في البحر ضل من تدعون إلا إياه ﴾ وە هەر كـاتی تووشـی ئیـوە ئەبو ترس و سەختی خنكاندن لـەنیو دەریادا لیتان وون ئەبی كەسی ئیـوە ئـەی پەرسـتن و هاواری لی ئەكەن رزگارتان بكا لـەو مەترسیە مەگەر هەر پەوروەدگاری ئیوەیـە رزگارتـان بكا و پەنای بۆ لای ببەن .

﴿ فلما نجاكم إلى البر أعرضتم وكـان الأنسـان كفـورا ﴾ دوایـی كـاتی پـەروەردگار ئیوەی رزگار كردن لـە خنكان و ئیوەی ئەبردەوە بۆ لای ووشكایی ئیوە وازتـان هینـا لـە باوەرهینان بەیەكیتی پەروەردگار، ئادەمیزاد سوپاسی خوا ناكـا بەرانبـەر بـە چاكـەكانی، لـەتەنگانەدا نەبی خوا ناناسی .

﴿ أفآمنتم أن يخسف بكم جانب البر ﴾ ئایا دوای ئـەوەی رزگارتـان ئـەبی لـەخنكانی دەریا ئیوە ناترسن پەروەردگارئیوە بباتە خوارەوە لـەكەناری ووشكاییدا و بچن بە زەویدا، هەمو لایە لـە روبار و لـە زەوی لـە ژیر دەستەلاتی پەروەردگاری ئیوەدا. ئەگـەر ئیـوە لـە نیو روباردا بین بەژیر ئاو و لـەزەویشدا ئەبن بەژیر خاك وخۆلـەوە .

﴿ أو يرسل عليكم حاصبا ثم لاتجدوا لكـم وكيـلا ﴾ یـا پەروەردگـاری ئیـوە بنـیری بەسەر ئیوەدا بایەكی زۆر سەخت بریژی بەسەرتانا بەرد و خۆل باوەكو ئیوە لـەقەلایـەكی قایم دابن، لـە دواییدا ئیوە دەستتان ناكەوی بۆ خۆتان كەسی بتانپاریزی لـەناوچوون وەك گەلانی راوردو .

﴿ أم أ نتم أن يعيدكم فيه تارة أخرى فيرسـل عليكـم قاصفـا مـن الريـح ﴾ ئایـا ئیـوە ناترسن كە پەرورەدگاری ئیوە بگیریتەوە بۆ نیـو روبـاری ئـاو جـاری تـر و بچنـەوە نیـو كەشتی، دوایی پەروەردگار بەنیری بۆ سەر ئیـوە بایـەكی كـاول كـەر و روخینـەری زۆر سەخت و كەشتیەكان بشكینی وئیوە بخنكین و دەرچونتان نەبی .

﴿ فيغرقكم بما كفرتم ثم لاتجدوا لكـم علنيـا بـە تبيغـا ﴾ دوایـی پـەوەردگاری ئیـوە بخنكینی بەهۆی بـت پەرسـتی و سـوپاس نەكردنتاننـەوە كـە خـوا ئیـوەی رزگـاركردوە لـەخنكان، دوایی ئیوە دەستتان ناكەوی بۆ خۆتان هیچ كەسی تۆلە بسینی لـە مـن بـەهۆی ئەو خنكانەی منەوە .

پوختەی مانای ئەو ئایەتە: مرۆڤی نەزان ئەگەر ترسا بە ناچاری لە خوا ئەپاریتەوە، ئەگەر نەترسا واز لەخوا پەرستی ئەهێنی و لەخۆی بایی ئەبێ. لەگەل ئەوەیشدا خوا توانای بەسەر قازانج و زیانی ئەودا هەیە لەهەموو کاتیکا. بەلام مرۆڤی ژێر ئامۆژگاری وەرئەگری بەهۆی خۆشی و ناخۆشیەوە، ئەترسی لە خوا لەکاتی ناخۆشیدا، بەئومێدی یاریدەی خوایە لەکاتی خۆشیدا .

دوای رابواردنی گفتوگۆی شەیتان لە خزمەت خوادا کە ئەیووت: بۆچی ریزی ئادەمت داوە بەسەر مندا، لەمەودوا باسی ریزگرتنی ئادەمیزاد ئەکا بەچەند شتی و ئەفەرموێ:

وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ وَحَمَلْنَٰهُمْ فِي ٱلْبَرِّ وَٱلْبَحْرِ وَرَزَقْنَٰهُم مِّنَ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَفَضَّلْنَٰهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلًا ﴿٧٠﴾ يَوْمَ نَدْعُواْ كُلَّ أُنَاسِۭ بِإِمَٰمِهِمْ فَمَنْ أُوتِيَ كِتَٰبَهُۥ بِيَمِينِهِۦ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَقْرَءُونَ كِتَٰبَهُمْ وَلَا يُظْلَمُونَ فَتِيلًا ﴿٧١﴾ وَمَن كَانَ فِي هَٰذِهِۦٓ أَعْمَىٰ فَهُوَ فِي ٱلْأٓخِرَةِ أَعْمَىٰ وَأَضَلُّ سَبِيلًا ﴿٧٢﴾

﴿ ولقد كرمنا بني آدم ﴾ وە بەراستی ئیمە ریزی ئادەمیزادمان گرتوەو بەوانمان بەخشیوە زۆر شتی وا بیان گیری بەوەی ریزیان بگیری، لەو شتانەیە لەشی ریک وپیك و شیرین، گفتوگۆ کردن و نوسین و ریگە دۆزینەوەی راستی و جۆری هۆی ژیان. بەتایبەتی ریزمان گرتوون بەم شتانە:

١- ﴿ و حملناهم في البر و البحر ﴾ وە ئیمە ئادەمیزادمان هـەلگرتوە لەسـەر زەوی بەهۆی ماشین و ئولاخ و شتی ترەوە، لـە دەریـادا بـەهۆی کەشـتی و زۆر شـتی تـرەوە، لەهەوادا بەهۆی فرۆکەوە، هەموو ریگەی بەیەك گەیشتنتانم بۆ ئامادەکردوون کـە ئەبنـە هۆی ژیانتان .

٢- ﴿ و رزقناهم من الطیبات ﴾ وە ئیمە گیراومانە رۆزی و خو اردن و خواردنەوەی ئادەمیزاد لـەهەمو شتیکی پاك و خۆش، هەرشتی سـودی بـۆ ئـەوان ببـی پـاك و خاوینـە، هەرشتی زیان بدا بەوان پیس ونارەوایە، وەك خواردنەوەی مەیی وجگەرەکیشان و تریاك و بەکارهینانیان. بەراستی خوادرەمەنی گیا بی یا جگـەی گیـا پیویسـتە پـاکبی و قـیزەون نەبن.

٣- ﴿ و فضلناهم علی کثیر ممن خلقنا تفضیلا ﴾ وە ئیمە ر یـزی ئادەمیزدمـان داوە بەسەر زۆر کەس لـەو بونەوەرانەی ئیمە دروسـتمان کـردوون بـەریزدانیکی زۆر گـەورە بەزانین و زانیاری و ئەقل و بەوەیش ئاژال و بالـندە و زۆر شتی ترمان بۆئامادە کـردوون و بۆمان رام کردوون .

زانایان زۆریان مانای ووشەی (کثیر ) یان بەوە لیـلك داوەتەوە کە بە ماناهــەموو بـی، بەو بۆنەوە ووتویانە ئادەمیزاد گەورەترە لـە هەموو بونـەوەران بەفریشتەکانیشـەوە. بـەلام ئەوەی جیگەی متمانە بی ووشەی (کثیر ) بەمانای دەرکەوتویی خۆیەتی. مانای ئایەتەکـە بەم جۆرەیە: ئیمە ریزی ئادەمیزادمان داوە بەسەر زۆر لـە بونەوەران و ریزدار نین بەســەر کەمیکیانا و، لـەو کەمانەیە فریشتەکان .

بۆ زانین: زانایان بیرو بۆچونیان جیاوازە ئایا ئادەمیزاد گەورەترن لـە فریشتەکان یا نە؟:

هەندیکیان ئەلـین: ئادەمیزاد لـەهەموو بونەوەر و لـە فریشتەکانیش گەورەترن ووشـەی (کثیر ) بەمانا ( کل ) یانی هەموو. حەنەفیەکان ئەلـین: زانا تایبەتیــەکانتی ئـادەمیزاد وەك پیغەمەران لـەهەمو فریشتەکان گەورەترن. زانــا تایەبتیـەکانی فریشـتەکان گـەورەترن لــە ئادەمیزادی جگەی پیغەمەران، وەك جبرەئیل و میکائیل و ئیسرافیل و ئـیزرائیل. زاناکـانی ئادەمیزاد جگەی پیغەمەران گەورەترن لـە فریشتەکان جگەی زاناکـانی فریشـتەکان. ئـەو ئایەتە زۆر دوورە لـەوەی بەلـگە بی لـەسەر گەورەیی ئادەمیزاد لـەهەمو بونەوەران .

پیویستە ئەوە بزانری ئادەمزیدا گەورەو بەریزە بەبی گومان. بەلام گەورەتر نیە لە هەمو بونەوەران بەلکو یەکیکە لە گەورەکانی بونەوەران. بۆ نمونە ئادەمیزاد زانستی بەزۆرترینی بونەوەران نیە و ەبەزۆربەی ئەو شتانە نازانی لە زەویدان چ جای ئەوانەی لەسەرەوەی ئادەمیزادن لە ئاسمانەکان، دوابی ئەوانە لەمەودوا ئیمە ئاماژە ئەکەین بۆ لای هەندی لەو تایبەتیانەی ریزی ئادەمیزادی پی گیراوە:

١- وەك لەمەوبەر باسکرا خوا ئادەمیزادی دروست کردوە بەجۆریکی جوان وبە دوو پی ئەروا بەریوە .

٢- خوای مەزن ئەقل و هۆشی داوە بە ئادەمیزاد و ئەقلی نەبوایە بەهیچ شتی باسی نەئەکرا، ئەگەر لەم گەردونەدا چەندین ئەستیرەی بریقەدار هەبی لە ئەقلدا چەندبن ئەستیرەی بریقەدارتر هەیە، بیگومان گەردون گەورەیە وئەقلیش گەورەیە و خوای مەزن لەهەموو شتی گەورەترە، گەورەیی خواو گەردون بە ئەقل ئەزانری .

٣- ئادەمیزاد جیگەی چەندین نهینیە. زانین و نەزانین. ئایین و بی باوەری. خۆشەویستی و رق. ترس و ئازایی. دەست پاکی ودەست پیسی ... هەتادی. مرۆڤ بونەوەریکی تەنها نیە. بەلکو ملیۆنات بونەوەری ژیر و شیت و خاوەن شارستانی و دوواکەوتوی تر هەن .

٤- ئادەمیزاد بە بەردەوامی هەولی ژیانی خۆشتر ئەدا با لەژیانیکی خۆشدا بی ،ئەگەر ئادەمیزاد کیویکی هەبووایە لەزیر یا لەزیو هەولی ئەدا سیهەمیکی بەنرختری‌هەبیّ.

٥- ئادەمیزاد خاوەنی یاسا و رەوشتی بەرزە و ئەبی سەرشۆری یاسا بی و کاری پی بکاو پرسیار بکا وبەرپرسیاریش بی، وائەبی بەریز و پیرۆز ئەبی وائەبی بی نرخ ئەبی .

٦- ئادەمیزاد بەکەسانی رابوردو تەمی خوا ئەبی و کاریگەرە بۆ کەسی لەمەوپاش دیت. لەگەل دانیشتوانی هەمو کاتی ئەروا بەریوە، بۆ میژوو دووا رۆژیکی تایبەتی هەبی جگەی بونەوەرانی تر .

٧- ئادەمیزاد جگە لەژیانی جیهان ژیانیکی تری تایبەتی هەیەو پرسیاری کردەوەی پیشووی لی ئەکری .

﴿ یوم ندعو کل أناس بأمامهم ﴾ تۆ بیری ئەو رۆژە بکەرەوە ئیمە بانگی هەمو ئادەمیزادی ئەکەین بە پیشەوا کانی خۆیانەوە لە پیغەمەرانو پیاوچاکان و جگەی ئەوانەیش کە پەیرەویان کردبون، ئیتر ئەو پیشەوایانە پیغەمەران بن یا ئەقل و هەواو هەوەس. بۆ وینە بانگیان ئەکەین: ئەی کۆمەلانی موحەمەد: ئەی کۆمەلانی فلان ...هەتا دوایی .

﴿ فمن أوتي کتابه بیمینه فأولئك یقرأون کتابهم ولا یظلمون فتیلا ﴾ دوایی هەرکەسی کرداری خۆی بدری بەدەستی راستیەوە و ریزی لی بگیری، دوایی ئەو کەسانە نامەی خۆیان ئەخویننەوە بە خۆشی و بەدلخۆشی‌یەوە، لەرۆژی دواییدا بانگ ئەکری لەچ جیگەیەکن ئەی پەیرەوانی پیغەمەران وپیاوچاکان، لەچ لایەکن ئەو کەسانەی کارتان بەیاسای ئایین کردوە بەگویرەی ئەقلی خۆتان، دوایی ئەچنە خزمەتی دادوەری دادپەروەری خۆیان و نامەکانیان وەرئەگرن بەدەستی راستیانەوەو پاداشتی چاکەی خۆیان وەرئەگرن، دووبارە بانگ ئەکرینەوە پەیرەوانی ستەمکاران و نامەکەیان بەدەستی چەپ وەرئەگرن و پاداشتی خراپەی خۆیان وەرئەگرن و ستەمیان لی ناکری بە ئەندازەی دەزولەی نیو دەنکی خورما وچاك و خراپ بەگویرەی کرداری خۆیان پاداشت وەرئەگرن .

﴿ ومن کان في هذه الدنیا أعمی فهو في الآخرة أعمی و أضل سبیلا ﴾ وەهەر کەسی لەم جیهانەدا کویر بی ویاسای خوا نەبینی و گیرۆدەی نەزانین وگومرایی بن، دوایی ئەوکەسە لەرۆژی دواییدا کویری ریگەی رزگاری ئایینە وگومراترە لەلایەن ریگەی راستەوە، چونکە لەو رۆژەدا مۆلەتیان نادری بەوینەی جیهان مۆلەتیان ئەدرا هەتا بیری لە خۆیان بکەنەوە، پاداشت و سزا پەیوەستە بەتەواوی بەکردەوە جیهانەوەو ئادەمیزاد کۆئەکرینەوە لەسەر نیازی خۆیان .

ئەگیرنەوە نوینەری لە هۆزی سەقیف لەدانیشتوانی شاری تایف هاتنە خزمەت پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ ووتیان بە پیغەمەر تۆ بۆ ماوەی سالی وازمان لی بهینی (لاتی) خوای خۆمان بپەرستن و لەوسالەدا ببورە لیمان نویژ نەکەین ریزیش بۆ ئەم شیوەی تایف دانی

به باخ و بالندەیه و بەوینەی ئەوانەی مەکە بپاریزرین، پیغەمەر وەلامی داواکەیانی نەدایەوە، جاری تر دووپاتیان کردەوە، ئیمە پیمان خۆشە عەرەبەکان بەو ریزە بزانن، ئەگەر ئەترسی عەرەبەکان بلین: بۆچی ریزی ئیمە ئەکری ؟ بلی: خوا فەرمانی پیداوم پیغەمەر وەستاو وەلامی نەداتەوە، وابەتەمابون کە پیغەمەر پرسیارەکەیان وەرگری. عومەر کوری خەتاب ووتی: ئایا ئیوە نابینن پیغەمەر بی دەنگە لەداواکاری ئیوە .

خوای مەزن بەو بۆنەوە فەرموی :

وَإِن كَادُوا لَيَفْتِنُونَكَ عَنِ الَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ لِتَفْتَرِيَ عَلَيْنَا غَيْرَهُ وَإِذًا لَّاتَّخَذُوكَ خَلِيلًا ﴿٧٣﴾ وَلَوْلَا أَن ثَبَّتْنَاكَ لَقَدْ كِدتَّ تَرْكَنُ إِلَيْهِمْ شَيْئًا قَلِيلًا ﴿٧٤﴾ إِذًا لَّأَذَقْنَاكَ ضِعْفَ الْحَيَاةِ وَضِعْفَ الْمَمَاتِ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ عَلَيْنَا نَصِيرًا ﴿٧٥﴾ وَإِن كَادُوا لَيَسْتَفِزُّونَكَ مِنَ الْأَرْضِ لِيُخْرِجُوكَ مِنْهَا وَإِذًا لَّا يَلْبَثُونَ خِلَافَكَ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٧٦﴾ سُنَّةَ مَن قَدْ أَرْسَلْنَا قَبْلَكَ مِن رُّسُلِنَا وَلَا تَجِدُ لِسُنَّتِنَا تَحْوِيلًا ﴿٧٧﴾

﴿ وإن كادوا ليفتنونك عن الذي أوحينا إليك ﴾ وە بەراستی نزیک بو نوینەرەکانی هۆزی سەقیف تۆ لابدەن لە شتیکی ئەوتۆ ئیمە بەسروش ناردومانە بۆ لای تۆ و وەلامی داخوازیەکەیان بدەیتەوە .

﴿ لتفتري علينا غيره و إذا لأتخذوك خليلا ﴾ بۆ ئەوەی بوختـــان دروسـت بکـەی و بیدەی بەسەر ئیمەدا جگەی ئەو شتەی ئیمە بەسروش ناردمـــان بـۆ لای تـۆ، ئەگـەر تـۆ وەلامی داخوازی ئەوانت بدایەتەوەو ئەوکاتەی تـۆ وەلامـی ئـەوانت دایـەوە ئـەوان تـۆ وەربگرن بەدۆستی خۆیان، بەلام پیغەمـــەر ﴿ ﷺ﴾ دوورتـرە لـــەوەی وەلامـی ئـەو بـت پەرستانە بداتەوە، مرۆڤی یارمەتی درابی لەلایـەن خـواوە یارمـەتی لــەدژی ئـایینی خـوا وەرناگری .

﴿ و لولا أن ثبتناك لقد كدت تركن إليهم شيئا قليلا ﴾ وە ئەگەر تۆمان نەپاراستایە بە یارمەتیدانی ئیمە بۆ تۆ بەراستی نزیك بو تۆ مەیلت بدەی بەلای ئەو بت پەرستانەوەو بە شتیکی کەم وەلامیان بدەیتەوە. بەلام بەراستی ئیمەو یارمەتی دانی ئیمە بـۆ تـۆ کـاریکی وای کرد کە تۆ هەرنیازی مەیلی لای ئەوانت نەبی .

﴿ إذا لأذقناك ضعف الحياة و ضعف الممات ثم لاتجد لك علينا نصيرا ﴾ ئەوکاتـەی مرخت بروایـــە بـۆ لای دۆسـتایەتی بـت پەرسـتان بەراسـتی ئیمـە ئـەمان چیـژا بـە تـۆ دووچەنانەی سزای جیهان ودووچەنانـەی سـزای دوای مـردن لــەرۆژی دواییـدا، یـانی سزامان ئەدای بەدوو ئەوەندەی سزای جگەی خۆت لەهەردوو جیهاندا ئەگـەر تـۆ ئـەو کارەت بکردایە، چونکە سزای مرڤی گەورە ئەبی ئەندازەی گەورەیی خۆی بـی، لـەپاشـا پەیداناکەی بۆ خۆت یاریدەری لەدژی ئیمە و سزای ئیمە لـەتۆ لادا .

کاتی پیغەمەر کۆچی کرد بۆ مەدینە و دەنگی ئایینی پیرۆز پـەرەی سـەند لەمەدینـەو دەوروبەری مەدینە جوەکان لایان گران بوو، ووتیان بە پیغەمەر شام جیگـەی پیغەمەرانـە ئەگەر تۆ پیغەمەری برۆ بۆشام هەتا ئیمە باوەرت پی بهینین، پیغەمەر چوە دەرەوە بەنیازی چوونی بۆ شام، دوایی پیغەمەر گەرایەوەو بوبەهۆی کوشـتنی بـەنوقورەیزە و دەرکردنـی بەنو نەزیر، وەك خوا ئەفەرموی:

﴿ و إن يكادوايستغفرونك في الأرض ليخرجـوك منـها ﴾ وە بەراسـتی نزیـك بۆبـت پەرستانی مەککە ئـازاری تـۆ بـدەن بـەهۆی دوژمنایـەتی خۆیانـەو لـەزەوی مەککـەدا، لەبەرئەوەی تۆ دەربکەن لەو زەویەدا و تۆ بی نرخ بکەن .

﴿ و إذا لايلبثون خلفك إلا قليلا ﴾ وە ئەو كاتە تۆ برۆيشـتيتايەتە دەرەوە لـەمەككـە ئەوان نەئەمانەوەو لـەدوای چونە دەرەوەی تۆ مەگەر ماوەيـەكی كـەم بمانايەتـەوە، دوای ئەو ماوەيە بنەبر ئەبوون و تيری ژەهراوی خۆيان ئەگەرايەوە بـۆ سـەردلی خۆيـان ئـەبێ لـەبيرمان نەچێ‌هەر گەلی پيغەمبەری خۆيان راوبنين يا فيل وفری بسازينن بـۆ دەرچوونـی ئەو گەلـە لـەناوئەچن، هەندێ لــەزانايان ئـەلين ئـەو ئايەتەلـەمەدينـە هاتوەتـە خـوارەوە، ئەوەبو خوا فەرمانی دا بەكوشتنی بەنی قورەيزە و دەركردنی بەنو نەزير .

زۆربەی زانايان ئەلين: لـە مەككە هاتوەتە خوارەوەو مەبەست لـەو زەويە مەككەيـە . يانی كاتی بت پەرستان نەيان توانی پيغەمكە بخەلـەتينن هەوليان دا ئازاری پيغەمــەر بـدەن بەهەر جۆری لـەمەككە دەربچی، بيگومان ئەگەر پيغەمەريان دەربكردايــە بـت پەرسـتان هەموويان بنەبر ئەبوون ئەگەر پيغەمەريان بەزۆر دەربكردايە و نەيزانيبايــە بـۆچ جيگەيـە بروا هەرچەندە بت پەرستان هەولی كوشتنی پيغەمەريان دا هەتا ناچاری بكەن لـەمەككـە دەرچی بەلام بۆيان نەكرا و پيغەمەر كە لـە مەككەوە دەرچو بەفەرمانی خوا هـەتا برواتـە لای تاقمی خۆيان و سامانی خۆيان و خيزانی خۆيان بكەنە فيداكاری پيغەمەر كـە بريتـی بوون لـەدانيشتوانی مەدينە .

﴿ سنة من قد أرسلنا قبلك من رسلنا ولاتجد لسنتنا تحويلا ﴾ ئيمــە ياسـامان دانـاوە ئەگەر بی باوەران تۆيان دەربكردايە ئيمە لـەدوای دەرچوونی تۆ ئيمە ئەوانمان لـەناوئـەبرد و بنەبرمان ئەكردن، بەوينەی دەستوری ئيمە لـەناو كەسانی لـەپيش تۆوە بــوون بنـەبرمان كردوون بەهۆی دەركردنو بەدرۆخستنەوەی پيغەمەرەكانيان و، تۆ دەستت ناكەوی هيـچ گۆرانكاريە بۆ دەستوری ئيمەو پوچ بونەوەی. بەلكو جيگەی خۆی ئەگری لــە هـەموو كات وجيگەی .

لـەداوی دانانی بەلـگە لـەسەر يەكيتی خواو باسـكردنی مـوژدوو هەرەشـەكانی خـوا، خوای مەزن فەرمان ئەدا بەراوەستان و كردنی نويژ و جۆری پارانەوە لــەخوای مـەزن و روئەكاتە پيغەمەر و فەرمانی پی ئەدا بەچ جۆری نويژەكانی بكا لــەكاتی ديـاری كـراوی خۆيانا وئەفەرموی:

أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ إِلَىٰ غَسَقِ ٱلَّيْلِ وَقُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ ۖ إِنَّ قُرْءَانَ ٱلْفَجْرِ كَانَ مَشْهُودًا ﴿٧٨﴾ وَمِنَ ٱلَّيْلِ فَتَهَجَّدْ بِهِۦ نَافِلَةً لَّكَ عَسَىٰٓ أَن يَبْعَثَكَ رَبُّكَ مَقَامًا مَّحْمُودًا ﴿٧٩﴾ وَقُل رَّبِّ أَدْخِلْنِى مُدْخَلَ صِدْقٍ وَأَخْرِجْنِى مُخْرَجَ صِدْقٍ وَٱجْعَل لِّى مِن لَّدُنكَ سُلْطَـٰنًا نَّصِيرًا ﴿٨٠﴾ وَقُلْ جَآءَ ٱلْحَقُّ وَزَهَقَ ٱلْبَـٰطِلُ ۚ إِنَّ ٱلْبَـٰطِلَ كَانَ زَهُوقًا ﴿٨١﴾

﴿ أقم الصلاة لدلوك الشمس إلى غسق الليل ﴾ تۆ نویژ بکە لەکاتی لادانـی خـۆر لەناوەراستی ئاسمان هەتا کاتی هـاتنی تـاریکی شـەو، مەبەسـت ئەوەیـە لەوماوەیـەدا هەموونویژەکان لەکاتی دیاری کراوی خۆیانا بکەن، مەبەست ئەوە نیە بە بـەردەوامی نویژ بکەن لەنیوان ئەو دووکاتەدا، نیوانی ئەو دووکاتەی نویـژی نیـوەرۆ و عەسـر و مەغریب و عیشا ئەگریتەوە، کاتی نویژی نیـوەرۆ دەسـت پـی ئـەکا لـەلادانی خـۆر لەناوەراستی ئاسمان هەتا سیبەری هەموو شتی بە ئـەندازەی خـۆی و کـەمی زۆرتـری لیبی لە سیبەری لادانەکـەی لەهـەندی لـە هەریمـەکانی جگـەی ناوەراسـتی زەوی، نویژی عەسر دەست پی ئەکات لەدووای کاتی نویژی نیوەرۆ هەتا خـۆر لەبـەرزترینی کیوی ئەو ناوچەیە ئاوائەبی. نویژی مەغریب دەست پی ئەکا لەدوای کـاتی ئـاوابونی خۆر لەسەر کیوە بەرزەکان هەتا نەمانی سپیەتی کەناری ئاسمان، نویژی عیشـا دەسـت پی ئەکا لە دوای کاتی نویژی مەغریب هەتا کـەناری ئاسمـان سـپی ئەبیتـەوە بـەهۆی خۆرەوەو ئەداتە کیوە بەرزەکان .

﴿ وقرآن الفجر ﴾ وەتۆ نویژی بەیانی بکە، زانایان لایان وایە مەبەست بەقورئانی بەیانی شتیکە لەنویژی بەیانیدا ئەخوینری، کاتی نویژی بەیانی دەست پی ئەکا لەکاتی دەرکەوتنی سپیەتی خۆر لەکەناری ئاسماندا هەتا بیبنی خۆر لەسەر بەرزترینی کیودا .

﴿ إن قرآن الفجر كان مشهودا ﴾ بەراستی فریشتەکانی شەو و رۆژ کۆئەبنەوە بۆ ئەوەی ئامادەی نویژی بەیانی بن. لەکاتی نویژی بەیانیدا توانای خوا ئاشکرا ئەبی بەلابردنی تاریکی و پەیدابوونی روناکی، مرۆڤ رزگاریان ئەبی لەخەو کەبرای مردنە و هۆشیان بەخۆیاناديتەوە، نویژی بەیانی شایستەی ئەوەیە کۆمەلیکی زۆر ئامادەبن بۆ کردنی .

﴿ ومن الليل فتهجد به نافلة لك ﴾ وەتۆ لەکاتی هەندی لەشەودا واز لەخەوتن بهینە بۆ خویندنی قورئان لەنویژداو پیویستیەکی ترە لەسەر تۆ جگە لەو پینج نویژانەی پیویست کراون لەسەر تۆ و جگەی تۆ .

ئەونویژە ناوئەبری بەشەونویژ و کاتەکەی دەست پی ئەکات لەدوای نویژی عیشا و پیویستبوە لەسەر یغەمەر ﴿ ﷺ﴾ و چاك بوە کردنی بۆ جگەی پیغەمەر .

﴿ عسى أن يبعثك ربك مقاما محمودا ﴾ ئومید وایە پەروەردگاری تۆ زیندوت بکاتەوە لەرۆژی دواییدا و تۆ دابنی لەجیگەیەکا سوپاسی خوای تیدا ئەکری لەلایەن هەموو کەسیکەوە کە جیگەی پارانەوەی پیغەمەرە بۆ هەموو ئادەمیزاد. ووشەی (عسی) لەبۆ پیویستی بەخشینە لە فەرمودەی خوادا، ئادەمیزاد بەکاری ئەهینن بۆ چاوەروانی و ئومیدی شتی بۆیان پەیدا ببی. بەراستی شەونویژ ئەبیتە هۆی پلەی بەرز بۆ ئادەمیزاد، بۆ پیغەمەری خوا لەماوەی تەمەنیدا دوای هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتە وازی لەشەونویژ نەهیناوە، خوا فەرمانی داوە بە پیغەمەر بپاریتەوە بەم جۆرە:

﴿ و قل ربي أدخلني مدخل صدق و أخرجني مخرج صدق ﴾ وەتۆ بپاریرەوە بلی: ئەی پەروەردگاری من تۆ من بخەرە جیگەی راستی و نیازی پاك لە بیر وباوەر و بۆچونمان لەهەلسان و دانیشتنما وە تۆ من دەربهینە لەکاتی زیندووبونەوەدا بەدەرهینانیکی پەسەند

و ریزلی‌گیراو. بیگومان ئەوکەسەی چەکدار بکری بەچەکی راستی خوا یارمەتی ئەدا بەبەلگەی پەکخەر و دلیکی پاکی پی ئەبەخشی .

﴿ واجعل لي من لدنك سلطانا نصيرا ﴾ وەتۆ بلی: ئەی پەروەردگاری من تۆ بگیرە بۆ من لەخزمەت خۆتا هیزو سەرکەوتنم بەسەر دوژمندا ویارمەتیم بدە بۆ فراوان کردنی ئایینی ئیسلام .

بۆ زانین: چ شتی گەورەترە لەو هیزە کە پیغەمەر ناوی ئەبری لەکاتی بانگدانی نویژداو لە هەموو نویژیکا بەلای کەمەوە پینج جار و فەرمانی داوە هەرشتی خوا بۆی ناردوە وەری‌بگری وەکاری پی بکا. خوای مەزن هیزیکی وای بەخشی بە ئایینی ئیسلام بلاوبویەوە لەهەریمەکانی فارس و رۆمدا، پاراستی لەهەموو دوژمنانی خۆی .

﴿ وقل جاء الحق و زهق الباطل إن الباطل كان زهوقا ﴾ وە تۆ بلی: راستی پەیامی خوا هاتوە وپەیدا بوەو بیروباوەری راستی دەرکەوتوەوجگەی ئاینی ئیسلام شۆراوەتەوەو پوچە لای خوا هەرچەندە هەمو ئادەمیزاد باوەر بە جگەی ئایینی ئیسلام بهینن. بەراستی شتی پوچ و نارەوا پیویستە بروا و نەمینی و نابی کاری پی بکری و ئەبی هەول بدری بۆ نەمانی .

پرسیار/ ئەو رستەیە وائەگەیەنی کردەوەی پوچ و خاوەنەکانی نامینن لەروی زەویدا کەچی زۆرجاران ئەبینری سەرئەکەون و پەرەئەسینن، راستی و خاوەنەکانیان بەراژەی پوچ وخراپەکاران زۆرکەمن ؟

وەلام/ بیگومان کردەوەی راست خۆی لەخۆیا بەهیزە و هەرگیز ئەو هیزەی لی جوی نابیتەوە، ئەو هیزە کاری خۆی ئەکاو روی خۆی دەرئەخا لەدلی پاکدا و ستەمکاران و کاری پوچ لەترسی ئەو هیزە ئارام ناگری ولە مەترسیدان، بەجۆری راستی خۆی ئەنوینی و چەکی کوشندە وسی دارەی ستەمکاران ریگە بەبزوتنەوەی شۆرشی راستی ناگرن وکۆل نادا هەتا دادپەروەری بلاوئەبیتەوە بەروی زەویدا، کردەوەی پوچ و ستەمکردن هیزی نامینی و دریژە ناکیشی، چونکە مانەوەی کاری پوچ بەهۆی بەرتیل و فرۆشتنی ناموسەوە ئەمینیتەوە هەتا سەر دریژ ناکیشی وهیزی راستی سەرئەکەوی دوربی یا نزیك .

وَنُنَزِّلُ مِنَ ٱلْقُرْءَانِ مَا هُوَ شِفَآءٌ وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ وَلَا يَزِيدُ ٱلظَّٰلِمِينَ إِلَّا خَسَارًا ﴿٨٢﴾ وَإِذَآ أَنْعَمْنَا عَلَى ٱلْإِنسَٰنِ أَعْرَضَ وَنَـَٔا بِجَانِبِهِۦ وَإِذَا مَسَّهُ ٱلشَّرُّ كَانَ يَـُٔوسًا ﴿٨٣﴾ قُلْ كُلٌّ يَعْمَلُ عَلَىٰ شَاكِلَتِهِۦ فَرَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَنْ هُوَ أَهْدَىٰ سَبِيلًا ﴿٨٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلرُّوحِ قُلِ ٱلرُّوحُ مِنْ أَمْرِ رَبِّى وَمَآ أُوتِيتُم مِّنَ ٱلْعِلْمِ إِلَّا قَلِيلًا ﴿٨٥﴾

﴿ و ننزل من القرآن ماهو شفاء ورحمة للمؤمنين ﴾ وە ئیمە ئەنیرین شتی لە قورئـان ئەوشتە رزگارکەرە بۆ باوەرداران لەنەخۆشی دلیان و ئاینیان رائەوەستی و دەرونیان پاك ئەكاتەوەو میهرەبان ولابەری خەفەت و لایەری سزای خوایەو لابەری گوناهیانە، قورئان هەموی رزگارکەرو میهرەبانی و خۆشیە بـۆ بـاوەرداران بەتایبـەتی فاتیحـا وئایەتـەکانی شیفا، لەفەرمودەکانی پیغەمەرە هەرکەسی داوا رزگاری نـەکا بـەهۆی قورئانـەوە، خـوا رزگاری ناکا وشیفای بۆ نانیری .

﴿ ولایزید الظالمین إلا خسارا ﴾ وە قورئان هیچ شتی زۆرناکا بۆ سـتەمکاران مەگـەر هەر زیاندانیان بۆ زۆر ئەکا و لەناوئەچن، چونکە بەهۆی باوەرنەهینانیان بەقورئان دلیـان پر ئەبی لە رق و خەم و دل پیسی، هەموو کاتی ئەوان بـی فـەرمانی خـوا زۆرتـر بکـەن گوناهو سزایان زۆرتر ئەبی.

﴿ و إذا أنعمنا علی الأنسان أعرض ﴾ وە هەرکاتی ئیمە چاکـە و بەخششـی خۆمـان بریژین بەسەر ئادەمیزادا لەتەندروستی و سامان و ئاسایش و ناردنی پیغەمەران بۆ لایان و

چاك و خراپیان بۆ روون كرایەوە واز لەپەرستن و یـادی ئیمـە ئـەهێنن و رو لەفـەرمانی ئیمە وەرئەگیرن وەك پیویستیان بە ئیمە نەمابی.

﴿ ونأى بجانبه ﴾ وە لـەفەرمانی ئیمە دوور ئەكەویتەوەو واز لــە نزیكبونـەوەی ئیـمە ئەهینی ولە ئیمە ناپارینەوەو خۆی بەگەورە دائــەنی. رسـتەی ( بجانبـە ) هیمایـە لـەخۆ بەگەورە دانان .

﴿ و إذا مسه الشر كان يؤسا ﴾ وە هەركاتی تووشــی ئـادەمیزاد ببوایـە خراپەیـە لـە بیماری و هەژاری و نەخۆشی و ترس ئەو كەسە بەتەمای میهرەبانی وبەزەیی خوا ئــەبو، بی ئومید بوو لەوشتانە لابچن .

﴿ قل كل يعمل على شاكلته ﴾ تۆ بلی: هەموو كەسی كار ئەكا لەسەر ریگـەو نیـاز وئەو فەرمانە لەسەریەتی لە گومرایی وراستی وەرگرتن بـەگویرەی بنچینـەی دەروونـی خۆی. بەلام ئەگەر ریگەی هەمو كاریكی لی گیراو ناچـاربو دزی بكـا بـۆ بـەخیوكردنی خیزانەكەی ئەوكەسە لای خوا شایستە سزادانی نیە .

﴿ فربكم أعلم بمن هو أهدى سـبيلا ﴾ دوایـی پـەروەردگاری تـۆ زانـاترە بەكەسـی ریگەی راستی دۆزیوەتەوە پەیرەوی راستی كردوەو ریگەكەی چاكە .

جوەكان بەقورەیشیەكانیان ووت: ئیوە پرسیار لـە موحەمەد بكەن ئەسحابولكەهف چ كەسیكن و زولقەرنەین چ كەسیكە و رۆح چ شتیكە: ئەگەر وەلامی هەندیكیان دایەوەو وەلامی هەندیكیان نەدایەوە پیغەمەری خوایە. پیغەمەر وەلامی دووە پیشوەكانی دایــەوەو وەلامی روحی نەدایەوە، بۆ رون كردنەوەی ئە وپرسیارانە خوا فەرموی :

﴿ يسألونك عن الروح قل الروح من أمري ربي ﴾ پرسیار ئەكەن لەتۆ لەو گیانە خوا بەهۆی ئـەوەوە زیندویـەتی و ژیـانی بەخشـیوە بـەوان وئـەیانبا بـەریوە، تـۆ بلـی گیـان لەوشتانەیە خوا بەفەرمانی خـۆی دروسـتی كـردوەو فەرمویـەتی ببـەو ئـەویش كوتوپـر پەیدابوە، زانینی چۆنیەتی گیان لای خوایە هەر بۆ خۆی داناوە: نهینیەكانی خوایــەو ئیـوە هەستی پی ناكەن .

بۆ زانین: دروست کراوانی خوا دوو جۆرن: یەکەمیان دروست کراون لەریگەی هۆیەکی دیاری کراو، وەك ئادەمیزاد وچەندین شتی لەخاك دروست کراون، ئەم جۆرەیان ئادەمیزدا هەستی پی ئەکاو ئەیزانن، جۆری دووهەمیان دروست کراون بەبی ئەوەی لەسەر بنچینەی شتی دروستیان بکا، وەك گییان، خوا بەووشەی ( کن ) دروستی کردون و جگەی خوا هیچ کەسی نایانزانی، ئادەمیزاد دوای خۆماندو بونیکی زۆرو تاقی کردنەوەیەکی بەهیز ئەو راستەیەیان بۆ دەرکەوت و باوەریان هینا کە گیان لەو جۆرەی دووهەمیانەو کەس نایزانی، ئەگەر گیان لەجۆری یەکەمیان بوایە زانایان ئەیان توانی گیان تاقی بکەنەوە لەکارخانەی پیشەسازیەکانی خۆیان، دوای هەولی زۆریان پەکیان کەوت، بۆیە خو ئەفەرموی:

﴿ وما أویتم من العلم إلا قلیلا ﴾ وە نەبەخشراوە بەئیوە و بەهەموو کەسی لە زانینی خوا مەگەر کەمی لەزانست و زانین کەسودیان لیو ەربگرن بەهۆی هەستەکانتانەوە، هەرچەندە ئیوە بتوانن شتی زۆر سەرسورینەر دروست بکەن ئەو شتانە بەرانبەر بەخانەیە لەخانەکانی میش نرخی بۆ دانانری چەجای دروست کردنی میشەکەیش. بۆ روون کردنەوەی ئەو مەبەستە و رون کردنەوەی مانای ئەو ئایەتە لەگۆڤاری رۆزلیوسوفی ژمارە ( ٧ ) ی نیسانی سالی ( ١٩٦٩ ) هاتوە ئەمەی دووایی:

( لەشی ئادەمیزاد پیك هاتوە لەبەلاینن خانە، ئەو خانە لەبەر بچووکی خۆی نابینری مەگەر بەهۆی میکرۆسکۆبەوە ببینری، چەندین سالیکی کەم نەئەگونجا زانینی خانەکانی پەیدا بکری چونکە زانایان نەیان ئەتوانی شانە بکەنەوە یا دەرمانیکی دیاری کراوی بۆ بەکاربهینن، چونکە ئەو کارە پیویستی بەنەشتەرگەریکە وەهەبو پەنجەکەی لەبچوکیدا بە ئەندازەی بەشی بی لە هەزاران بەشێ لە میلمەتری و ئەو دەرزیە ئەوکارەی پی بکری بچوکتربی لەبەشیکی ملیۆنی لە میلمەتری. دوایی توانیان ئەوخانەیە بکەنەوە لەریگەی روناکی خۆرەوە، بۆ زانایان دەرکەوت ئەو خانەیە کۆمەلگایەکە پرە لەدەیان دروست کراوانی جیاواز و هەریەکەیان شیوەیەکی تایبەتیان هەیە و ئەتوانن پەیوەند بە خانەکانی ترەوە بکەن، ئەو پەیوەندیانە زانینیان چەند سالی تریان ئەوی، ئیستا ئەزانین خانە چەندین

دەمار و لەشیان هەیە وجگەی ئەوانەیش کەئەبنە هۆی سەرگەردانی هەمو خاوەن ئەقلی) .

هەورەك خوای مەزن چەندین شتی دروست کردوە ئادەمیزاد نایانزانن، بۆیە زانایان ناچاربوونباوەر بەتوانای بی وینەی خوا بهینن کە گیان کەس نازانی چ شتیکە و نازانن لەچی دروست کراوە .

وَلَئِن شِئْنَا لَنَذْهَبَنَّ بِالَّذِي أَوْحَيْنَا إِلَيْكَ ثُمَّ لَا تَجِدُ لَكَ بِهِ عَلَيْنَا وَكِيلًا ﴿٨٦﴾ إِلَّا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ إِنَّ فَضْلَهُ كَانَ عَلَيْكَ كَبِيرًا ﴿٨٧﴾ قُل لَّئِنِ اجْتَمَعَتِ الْإِنسُ وَالْجِنُّ عَلَىٰ أَن يَأْتُوا بِمِثْلِ هَٰذَا الْقُرْآنِ لَا يَأْتُونَ بِمِثْلِهِ وَلَوْ كَانَ بَعْضُهُمْ لِبَعْضٍ ظَهِيرًا ﴿٨٨﴾ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ فَأَبَىٰ أَكْثَرُ النَّاسِ إِلَّا كُفُورًا ﴿٨٩﴾

دوایی خوای مەزن روونی ئەکاتەوە هەر بەوجۆرەی پیغەمەر و جگەی پیغەمەر نازانن گیان چۆنە و چۆن دروستبوە، ئەگەر خوا ئارەزۆ بکا ئەو سروشەی خوا ناردوییە بۆ پیغەمەر لە دلیا ئەسریتەوە و ئەفەرموی:

﴿ و لو شئنا لنذهبن بالذي أوحينا إليك ﴾ وە ئەگەر ئیمە ئارەزۆمان هەبوایە بەراستی ئیمە ئەمان سرییەوە لەنیو نامەکان ولە دلی ئیوەدا شتیکی ئەوتۆ ئیمە بەسروش نادرومانە بۆلای تۆو شوینەوارمان نەئەهیشت وەك ئەو کاتەی نەت ئەزانی نامەی خوا چ شتیکە .

﴿ ثم لاتجد لك به علينا وكيلا ﴾ لەپاش سرینەوەی ئەو سروشە تۆ پەیدا ناکەی بۆ خۆت کەسی دەستەلاتی بەسەر ئیمەدا هەبی ئە وسروشە بگیریتەوە بۆ تۆو نەیسریتەوە وبپاریزری .

﴿ إلا رحمة من ربك إن فضله كان عليك كبيرا ﴾ مەگەر خوا میهرەبانی لەگەل تۆ بکا و بەزەیی پیتا بیتەوە وئەو سروشە بگیریتەوە بۆ تۆ . بەراستی گەورەیی و چاکەی پەورەردگاری تۆ زۆر گەورەیە، تۆی هەلبژاردوە بۆ پیغەمرەایەتی وقورئانی بۆ ناردووی وئەیپاریزی لەدلی تۆدا و بۆیشی نوسیوی لەنیو نامەکانا، لەرۆژی دوایشدا پلەی باسکراو چاکت ئەداتی سەرەرای ئەوانەی جیهان .

﴿ قل لئن اجتمعت الأنس والجن على أن يأتوا بمثل هذا القرآن لايأتون بمثله ﴾ تۆ بلی: ئەگەر ئادمیزاد و جنۆکە کۆببنەوە لەسەر ئەوە وینەی ئەم قورئانە بهینن ناتوانن وینەی ئەو قورئانە بهینن کەوەك قورئان ئەو هەموو ئامۆژگاری و دەستور و هەوال و میژووانەی تیدا بی بەوشیرینی وپاراوییەوە .

﴿ ولو كان بعضهم لبعض ظهرا ﴾ وەبا هەندی لە ئادەمیزاد و جنۆکە یاریدەی هەندی تریان بدەن بۆ دانانی وینەی ئەو قورئانە، بگرە وینەی سورەتیکی بچوکیشی ناتوانن داینین .

﴿ و لقد صرفنا في هذا القرآن من كل مثل ﴾ وە بەراستی ئیمە رونمان کردوەتەوە و دووپاتمان کردوەتەوە بۆ ئادەمیزاد و جنۆکە هەموو شتی پەیوەندی هەبی بە بیروباوەر و بەدەستور و بەرەوشتی چاك بەلگەی رون وپەکخەری وا وەك لیدانی وینەن لەسەر سوراندنی ئادەمیزاد وجنۆکەدا. جاری بەهاندان و جاری تر بە هەرەشەوە. جاری بەموژدەدان و جاری تر بەترساندن ... هەتادی .

﴿ فأبى أكثر الناس إلا كفورا ﴾ دوایی زۆرترینی ئادەمیزاد هیچ شتیکیان وەرنەگرت لەو ئامۆژگاریانە مەگەر بی باوەری و ناسوپاسی بەرانبەریان، چونکە راستی وسوپاس لای ئەوان زۆر گرنگ نەبو، مەگەر لای کەمیکیان .

کاتی خوای مەزن رونی کردەوە بۆ بت پەرستانی بی توانایی ئەوان بۆ دانانی وینەی قورئان، دوایی باسی هەندی لە داخوازی بی جیگەی ئەوان ئەکا داوایان لە پیغەمەر ئەکرد و ئەفەرموی:

وَقَالُواْ لَن نُّؤْمِنَ لَكَ حَتَّىٰ تَفْجُرَ لَنَا مِنَ ٱلْأَرْضِ يَنۢبُوعًا ﴿٩٠﴾ أَوْ تَكُونَ لَكَ جَنَّةٌ مِّن نَّخِيلٍ وَعِنَبٍ فَتُفَجِّرَ ٱلْأَنْهَٰرَ خِلَٰلَهَا تَفْجِيرًا ﴿٩١﴾ أَوْ تُسْقِطَ ٱلسَّمَآءَ كَمَا زَعَمْتَ عَلَيْنَا كِسَفًا أَوْ تَأْتِىَ بِٱللَّهِ وَٱلْمَلَٰٓئِكَةِ قَبِيلًا ﴿٩٢﴾ أَوْ يَكُونَ لَكَ بَيْتٌ مِّن زُخْرُفٍ أَوْ تَرْقَىٰ فِى ٱلسَّمَآءِ وَلَن نُّؤْمِنَ لِرُقِيِّكَ حَتَّىٰ تُنَزِّلَ عَلَيْنَا كِتَٰبًا نَّقْرَؤُهُۥ قُلْ سُبْحَانَ رَبِّى هَلْ كُنتُ إِلَّا بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٣﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓاْ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓاْ أَبَعَثَ ٱللَّهُ بَشَرًا رَّسُولًا ﴿٩٤﴾ قُل لَّوْ كَانَ فِى ٱلْأَرْضِ مَلَٰٓئِكَةٌ يَمْشُونَ مُطْمَئِنِّينَ لَنَزَّلْنَا عَلَيْهِم مِّنَ ٱلسَّمَآءِ مَلَكًا رَّسُولًا ﴿٩٥﴾ قُلْ كَفَىٰ بِٱللَّهِ شَهِيدًۢا بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ إِنَّهُۥ كَانَ بِعِبَادِهِۦ خَبِيرًۢا بَصِيرًا ﴿٩٦﴾

﴿ و قالوا لن نؤمن لك حتى تفجر لـنا من الأرض ينبوعا ﴾ وە قورەيشـيـەكان ووتيـان بە پيغەمەر: ئيمە باوەر بەتۆ نايەرين هەتا تۆ هەلنەقولينی بۆ ئيمە سەرچاوەيەكی پر لـەئاو لەزەوی مەككەدا و هەرگيز ووشك نەكا .

﴿ أو تكن لك جنة من نخيل و عنب فتفجر الأنهار خلالها تفجيرا ﴾ يا پەيدا ببی بـۆ تۆ بيستانی لەخورما و لەتری، دوای ئەوەيش تۆ هەل بقولينی چەندين روبار لەئاو وينەی روبارەكانی شام برۆن بەناوەراسـتـی ئـەو بيسـتانەدا بەهـەلقولينيكی زۆر سەرسـورينەر. هەركاتی تۆ بەوشيوەيە بوی پلـەت بەرز ئەبی و ئـەبی بـە شايسـتـەی گـەورەيی، تـۆ كـە ئەوانەت نەبی پيويستە گوی رايەلی خاوەن داراييەكانبی و بچوكيان بكەی، نەيان ئەزانی پيغەمەراەيتی سامانيكی مرۆڤايەتی و بوژانەوەی رۆشنبيری و گـەورە كەلـەپوری مرۆڤـە، پيغەمەران ميهرەبانی و دياری خوان بۆ هەموو دانيشتوانی روی زەوی، خاوەن سامان بـە نەزانستی خۆيان وابير ئەكەنەوە كە هەر سامانە نرخ بدا بە مرۆڤ و بيكا بە گەورەو بـە پيشەوا .

﴿ أو تسقط السماء كما زعمت علينا كسفا أو تأتي بـالله و الملائكـة قبيـلا ﴾ يـا تـۆ ئاسمان بخەيتە خوارەوە بەسـەر ئيمـەدا پارچـە پارچـە وەك ئـەوەی تـۆ گومـان ئەبـەی و هەرەشەمان لیئەكەی، يـا تـۆ خـوا و فريشـتـەكان بـهينی روبـەرو شـايەتی بـدەن كـەتۆ فروستادەی خوای .

﴿ أو يكون لك بيت من زخرف أو ترقـى فـي السـماء ﴾ ياكاتـێ ئيمـە بـاوەرت پـی ئەهينن تۆ خانويەكت هەبی رازابيتـەوە بـەزير و لـەناويا دانيشـی ئـەو كاتـە شايسـتـەی پيغەمەرايەتيت، ياكاتی تۆ بەرز بيتەوە بۆ ئاسمان بەپەيژەيە بۆی سەركەوی .

﴿ ولن نؤمن لرقيك حتى تـنزل عليـها كتابـا نقـرؤه ﴾ وە ئيمـە بەتەنـها بـاوەر بـەو بەرزبونەوەی تۆيە نايەرن هەتا ئەهينيتە خوارەوە بەسـەر ئيمـەدا نامەيـە بـەزمانی خۆمـان بيخوينينەوە و فەرمانمان پی بدا باوەر بەتۆ بهينين .

﴿ قل سبحان ربي هل كنت إلا بشرا رسولا ﴾ تۆ بلی: پاکی بۆ خوای پەروەردگاری منە کە خوا بیت بۆ لای ئیوەو فەرمانی خۆتانی بەسەردا پیویست بکەن. مـن هیـچ شـتی نیم مەگەر ئـادەمیزادم وەك ئـادەمیزدانی تـر، نـیراویکم وەك پیغەمـەرانی تـر کـە هیـچ شتیکیان نەهینا بۆ گەلەکانیان مەگەر شتی شیاوی گەلەکەیان بوبی، من ناتوانم هیچ شتی بکەم بەجگەی دەستوری خوا .

﴿ ومامنع الناس أن يؤمنوا إذ جاءهم الهدى إلا أن قالوا أبعث الله بشرا رسـولا ﴾ وە ریگەی لە ئادەمیزاد نەئەگرت کە باوەر بهینن کاتی هات بۆ لای ئەوان راغویان مەگـەر ئەوەی ئەوان ئەیانووت: ئایا خوا رەوانە ئەکا ئادەمیزادی بەوەی بیکا بـە پیغەمـەر، هیـچ گومانیان نەمابوو باوەر بە قورئان و پیغەمەر بـهینن ئـەو گفتوگۆیـەی خۆیـان نـەبی کـە لەمەوبەر داوایان ئەکرد.

﴿قل لو كان في الأرض ملائكـة يمشـون مطمئنيـن لنزلنـا عليـهم مـن السـماء ملكـا رسولا﴾ تۆ بلی: ئەگەر لە سەرزەوی فریشتەکان هەبونایـە بـرۆن بـەریوە لـەزەویدا و دانیشن لەسەر زەوی بەراستی ئیمە ئـەمان نـاردە خـوارەوە بـۆ سـەر ئـەوان فریشـتەیە لەئاسمانەوە بۆ پیغەمەری ئەوان و لەرەگەزی خۆیـان نـەك لەرەگـەزی جگـەی خۆیـان. کەواتە ئیوەی ئادەمیزاد ئەبی پیغەمەرەکەتان لەرگەزی خۆتان بی، بت پەرستان ئـەوەیان ئەزانی بەلام فیل و فریان بەکاردەهینا .

پرسیار/ بەراستی جوبەرئیل فریشتەیە و موحەمەد ئادەمیزادە، چۆن جوبرەئیل نـیرراوە بۆ لای موحەمەد ؟

وەلام/ لەنیوان ئەو دووانەدا جۆرە لەیەك چونیـك هەیـە لـەو بـارەوە هـەردووکیان نیرراون لەلایەن خواوە. هیچ جۆرە لەیەك چونی لەنیوان فریشتەو نەتەوەکەی پیغەمەدرا نیە بەهیچ جۆری .

﴿ قل كفى بالله شهيدا بيني وبينكم إنه كان بعباده خبيرا بصيرا ﴾ تۆ بلی: خوا بەسە بۆ ئەوەی شایەتی بدا لەنیوان من و لەنیوان ئیوەدا لەسەر راستی من و لەسەر ئەوەی من

فەرمانی خوام گەیاندوە بە ئیوەشایەتیش بدا کەئیوە باوەرتان نەهیناوەو دژی فەرمان خـوا وەستاون بەراستی خوا ئاگادارە بەکردەوەی نهینی وئاشکرای بـەندەکانی خـۆی ئـەبینی کردار وگوفتاریان.

وَمَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُمْ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِهِۦ ۖ وَنَحْشُرُهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ عَلَىٰ وُجُوهِهِمْ عُمْيًا وَبُكْمًا وَصُمًّا ۖ مَّأْوَىٰهُمْ جَهَنَّمُ ۖ كُلَّمَا خَبَتْ زِدْنَٰهُمْ سَعِيرًا ﴿٩٧﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُم بِأَنَّهُمْ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا وَقَالُوٓا۟ أَءِذَا كُنَّا عِظَٰمًا وَرُفَٰتًا أَءِنَّا لَمَبْعُوثُونَ خَلْقًا جَدِيدًا ﴿٩٨﴾ ۞ أَوَلَمْ يَرَوْا۟ أَنَّ ٱللَّهَ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ قَادِرٌ عَلَىٰٓ أَن يَخْلُقَ مِثْلَهُمْ وَجَعَلَ لَهُمْ أَجَلًا لَّا رَيْبَ فِيهِ فَأَبَى ٱلظَّٰلِمُونَ إِلَّا كُفُورًا ﴿٩٩﴾ قُل لَّوْ أَنتُمْ تَمْلِكُونَ خَزَآئِنَ رَحْمَةِ رَبِّىٓ إِذًا لَّأَمْسَكْتُمْ خَشْيَةَ ٱلْإِنفَاقِ ۚ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ قَتُورًا ﴿١٠٠﴾

﴿ من يهدي الله فهو المهتد ومن يضلل فلن تجد لهم أولياء من دونه ﴾ وەهەر کەسی خوا ریگەی راستی پی نیشان بداو یاریدەیان بدا دوایی ئەو کەسـە شـارەزایی و ریگـەی راست وەرئەگرن وەهەر کەسی خوا ریگـەی راسـتی لی وون بکـا، دوایـی تـۆ دەسـتت ناکەوی بۆ ئەوان ولـەجگەی خوا هیچ دۆستی یاریدەیان بدا. بەراستی پیاو چـاك ئەوەیـە دوای چاکە بکەوی پیاو خراپ ئەوەیە لای خوا خراپەکار بیت .

تەفسیری زمناکۆیی

﴿ ونحشرهم يـوم القيامـة علـى وجوهـهم عمياناوبكمـا و صمـا ﴾ وە ئيمـە ئـەوان كۆئەكەينەوە لـە رۆژی دواييدا بەكويری ولالی وكەری هيـــچ شـتی نـابينن ونابيســن و نايلين .

﴿ مأواهم جهنم كلما خبت زدناهم سـعيرا ﴾ دۆزەخ جيگـەی ئەوانـە هـەموو كـاتی بكوژينەوەو گرو كلپەی پيسيان نەسوتينی ئيمە زۆرتر ئەكەين بـۆ ئـەوان سـووتەمەنی و گرەكەی و گەرماكەی زۆر ئەبی .

﴿ ذلك جزاؤهم بأنهم كفروا بآياتنا ﴾ ئەو سـزادانەيان لـەدۆزەخدا سـزاو بەشـيانە بەبۆنەی ئەوەوە باوەريان بەئايەتەكانی قورئـانی ئيمـەيان نـەهيناوە و بروايـان بەبەلـگـەی يەكخەری ئيمە نەبوە .

﴿ وقالوا أإذا كنا عظاما و رفاقا أإنا لمبعثون خلقـا جديـدا ﴾ وە بـی بـاوەران ئـەيان ووت: ئايا ئيمە كاتی مردين و بووين بەئيسك وخۆلی رزاو، ئايا ئيمە بەراسـتی زينـدوو ئەكريينەوەو ئەبين بەدروستكراويكی تازە؟.

﴿ أو لم يروا أن الله خلق السماوات والأرض قادر أن يخلــق مثلـهـم ﴾ ئايـا ئـەوبی باوەرانە نەيان زانيوە كەبەراستی خوايە ئاسمانەكان وزەوی دروست كردوە توانای بەسـەر ئەوەدا هەيە كە دروست بكا وينەی ئەوان دوای مردنيان .

﴿ وجعل لهم أجلا لاريب فيه فأبى الظالمون إلا كفورا ﴾ وەخوا داينـاوە بـۆ ئـەو بی باوەرانە كاتی بۆ سزادان و مردنيان و دواتر زيندوويان بكاتـەوە لـەرۆژی دواييـدا بـەبی ئەوەی گومانی تيدا بيی، دوايی ئەو ستەمكارانە وەرناگرن هيچ ئامۆژگاری‌يە مەگەر هـەر بی باوەری بەبەلـگەی بەهيزو ئاشكرا لـەسەر زيندوو بونەوەی ئەوان .

﴿ قل لوكان أنتم تملكون خزائن من رحمة ربي إذا لأمسكتم خشـية ألأنفـاق وكـان ألأنسان قتورا ﴾ تۆ بلی بەبی باوەران: ئەگـەر ئيـوە خـاوەنی گەنجينـەی چاكـە و رۆزی پەروەردگاری من بن كەدوايی نايەت ئەوكاتە ئيوە خۆتان ئەگرنەوە لـەبەخشينی لـەترسـی نەمانی ئەوەی ئيوە ئەيبەخشن و ئادەميزادی بی باوەر رژد و دەست قوچراوەو ئەترسی لـە هەژاری .

لـەزۆر لـەئایەتەکانی رابوردودا باسی موسا و کارە پەکخـەرەکانی و باسـی فیرعـەون وپیاوماقولانی فیرعەون کـراوە، لـەم ئایەتانـەی دواییـدا باسـی داخوازیـەکانی فیرعـەون لەموسا ئەکری و ئەفەرموی:

وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا مُوسَىٰ تِسْعَ ءَايَـٰتٍۭ بَيِّنَـٰتٍ ۖ فَسْـَٔلْ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ إِذْ جَآءَهُمْ فَقَالَ لَهُۥ فِرْعَوْنُ إِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰمُوسَىٰ مَسْحُورًا ﴿١٠١﴾ قَالَ لَقَدْ عَلِمْتَ مَآ أَنزَلَ هَـٰٓؤُلَآءِ إِلَّا رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ بَصَآئِرَ وَإِنِّى لَأَظُنُّكَ يَـٰفِرْعَوْنُ مَثْبُورًا ﴿١٠٢﴾ فَأَرَادَ أَن يَسْتَفِزَّهُم مِّنَ ٱلْأَرْضِ فَأَغْرَقْنَـٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ جَمِيعًا ﴿١٠٣﴾ وَقُلْنَا مِنۢ بَعْدِهِۦ لِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱسْكُنُوا۟ ٱلْأَرْضَ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْـَٔاخِرَةِ جِئْنَا بِكُمْ لَفِيفًا ﴿١٠٤﴾

﴿ ولقد آتینا موسی تسع آیات بینات ﴾ وەبەر استی ئیمـە بەخشیبومان بەموسـا نـۆ بەلگەی پەك خـەرو رون وئاشـکرا وەك ئەمانـە: (١) داردەسـتی ئـەگیرا بـەماریك بـۆ پەکخستنی بی بـاوەران وچـەند سـودی تـری موسـا. (٢) دەسـتیکی سـپی بـی دەرد و نەخۆشی و روونا کی‌یەکی زۆری هەبوو. (٣) چەند سالیکی گرانـی ونـەبارینی بـاران و کەم بوونی ئاوی نیل. (٤) کەم بونەوەی بەروبوم بـەهۆی نەخۆشـی کشـتوکالەوە. (٥) لافاو بەهۆی بارانی زۆرەوە کـەخانوو کشـتوکالیانی دائەپۆشـی. (٦) کوللـەیـەکی زۆر بـەجۆری هـەموو کشـتوکالی ئـەخواردن. (٧) جـۆرە ئەسـپییەکی وەك گەنـەی ئـاژەل کەوتەنیو خواردەمەنی وخواردنەوەیان وبەرگ و لـەشیانەوە. (٨) بۆقیکی ئەوتۆ ئەکەوتنە

خواردەمەنی ئەوانەوە. (٩ ) خوینیکی وا ئاوەکانیان ئەبون بەخوین وتووشی لوت پژانیش بوبون. موسا کاری پەك خەری زۆری درابویە، ئـەو نۆیانـە بـۆ هـەمو دانیشـتوان بـوون کەلەهـەموویان گرنگـتر بـوون، هـەندی تریـان گـەزۆ. شـیلاقە بەرزکردنـەوە کیـوی بەسەریانەوە، ئەوانە بەتایبەتی بۆ گەلەکەی موسا بوون.

﴿ فسأل بني إسرائيل إذ جاءهم ﴾ دوایی تۆ پرسیار بکە لەبەنو ئیسرائیلیەکان کـاتی موسا چو بۆلایان چ شتی روی دا لە نیوان موسا وفیرعەونا، بۆئەوەی بـۆ خۆیـان و بـۆ جگەی خۆیان راستی تۆ لـەو سروشەدا خوا بۆ تۆی ناردوە کە موسا ئەیەویست جوەکان رزگار بکا لەدەسـتەمی فیرعـەون و داوای لەفیرعـەون کـرد بـاوەر بـهینی بـەخواو بـەنو ئیسرائیلیەکان بنیری لـەگەلیاو ریگەیان لی نەگیری بۆ هەر لایە برۆن .

﴿ فقال له فرعون إني لأظنك ياموسى مسجودا ﴾ دوایـی فیرعـەون ووتـی: بەراسـتی ئـەی موسـا مـن گومـان ئەبەمـە تـۆ جـادوت لی کـرا بـی لەوکاتـەدا ووتـی کەموسـا داردەستەکەی خۆی فریداو بوبەماریکی زۆر گەورەو دەستی کەگـەنم رونـگ بـو سـپی هەلگەراو دەروبەریانی رون کردەوە.

﴿ قال لقد علمـت مـا أنـزل هـؤلاء إلا رب السـماوات و الأرض ﴾ موسـا ووتـی: بەراستی تۆ ئـەزانی رەوانـەی نـەکردوە ئـەو بەلـگـە پەکخەرانـە هیـچ کەسـی مەگـەر پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەوی تەمی کردنن بۆ تۆ وبەلگەن لـەسەر راستی من. بـەلام خۆت فش ئەکەیتەوە لەنیو دانیشتواندا بۆ ئەوەی پلەو پایەو تـەخت و تـاجت بـەردەوام بی .

﴿ و إني لأظنك يا فرعون مثبورا ﴾ وە بەراستی ئەی فیرعـەون مـن بـروام هەیـە تـۆ مرۆڤیکی لادراوی لە راستی و لەناوبراوی من جادوگەر نیم و ئەو گومانەی تـۆ راسـت نیە و بروای من زۆر راستە .

﴿ فأراد أن يستفزهم من الأرض فأغرقناه ومن معه جميعا ﴾ دوایی فیرعـەون ویسـتی موسا و گەلـەکەی سوکایەتی پـی بکـا و دوریـان خاتـەوە لـەزەوی میسـر بەکوشـتن و دەربەدەری کردن، زەوی میسر هەر بۆ خۆی بمینیتەوە، بەلام پیلان و فیلەکەی بۆ خـۆی

گەرایەوەو کاری لەخۆی کرد و لەناوچو، دوایی ئیمە فیرعەونو ئەو کەســەی لەگـەلی بوون هەموویانمان خنکاند بەئاوی دەریای سور، کاتی دوای موسا و خزمـەکانی کـەوتبون بیانگیرنەوەو بیان کوژن. ئەو کارەساتە دوای ئامۆژگاری کردنی موسـا و باوەڕنـەهینانی ئەوان بو .

﴿ و قلنا من بعده لبني إسرائيل اسكنوا في الأرض ﴾ وەئیمە ووتمان لەدوای خنکـانی موسا و سوپاکەی بەبەنو ئیسرائیلیەکان ئیوە دانیشن لەزەوی میسر دا، بی باوەران ئەیان ویست ئیوە نەمینن. دوای نەمانی فیرعەون زەوی پەرەی سەند بـۆ بـەنو ئیسـرائیلیەکان، خوا بەوانی فەرمو: لـەهەر جیگەیە دائەنیشن ئارەزووی خۆتانە، ئەبوایە سوپاسی خوایـان بکردایە کەچی یاخی بون لـەخواو گویرەکەی‌یان پەرست، ووتیان: خوا دەستی بەسـتراوە و ئیمە ساماندارین. پیغەمەرەکانی خۆیانیان کوشت و تەوراتیان گۆری وهەولی کوشتنی عیسایان داو بوختانیان کرد بەدایکی داوین پاکی عیسادا .

﴿ فأذا جاء وعد الآخرة جئنا بكم لفيفا ﴾ دوایی کاتی هات وادەی رۆژی دوایی ئیمە ئیوەو ئەوان بەکۆمەلی جیاواز لەیەکتری ئەهینین و فەرمان ئەدەم بە بەختیاری هەندیکیان و بەد بەختی هەندی تریان .

وَبِٱلْحَقِّ أَنزَلْنَٰهُ وَبِٱلْحَقِّ نَزَلَ ۗ وَمَآ أَرْسَلْنَٰكَ إِلَّا مُبَشِّرًا وَنَذِيرًا ﴿١٠٥﴾ وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾ قُلْ ءَامِنُوا۟ بِهِۦٓ أَوْ لَا تُؤْمِنُوٓا۟ ۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهِۦٓ إِذَا يُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ يَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ سُجَّدًا ﴿١٠٧﴾ وَيَقُولُونَ سُبْحَٰنَ رَبِّنَآ إِن كَانَ وَعْدُ رَبِّنَا لَمَفْعُولًا ﴿١٠٨﴾ وَيَخِرُّونَ لِلْأَذْقَانِ يَبْكُونَ وَيَزِيدُهُمْ خُشُوعًا ۩ ﴿١٠٩﴾ قُلِ ٱدْعُوا۟ ٱللَّهَ أَوِ ٱدْعُوا۟ ٱلرَّحْمَٰنَ ۖ أَيًّا مَّا تَدْعُوا۟ فَلَهُ

ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ ۚ وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَٱبْتَغِ بَيْنَ ذَٰلِكَ سَبِيلًا ﴿١١٠﴾ وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِى لَمْ يَتَّخِذْ وَلَدًا وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ شَرِيكٌ فِى ٱلْمُلْكِ وَلَمْ يَكُن لَّهُۥ وَلِىٌّ مِّنَ ٱلذُّلِّ ۖ وَكَبِّرْهُ تَكْبِيرًۢا ﴿١١١﴾

﴿ و بالحق أنزلناه و بالحق نـزل ﴾ وە ئیمـە ویسـتومانە قورئـان بنیرینـە خـوارەوە بەجۆرە زانست وراستیکی ئەوتۆ داوای دانانی هەمو شتی بکا لـەجیگەی شیاوی خۆیاو، بەبی گومان بەو جۆرە راستی و رانومایی کردنەوە هاتە خوارەوەو هەموو شتیکی چـاکی تیدایە، هەروایش بو موسلمانان باوەریان پی هینا. پیاوچاکانو نیازپاکان کاریان پی کـرد، قورئان فەرمان ئەدا بەراستی و بەچاکەی لـەمەوبەر و لـەمەودوایش. کەواتە ئەبی قورئـان بکری بە یاسا و دەستوری رۆژانەی ئادەمیزاد و جنۆکە بـۆ لـەمـەوپاش و بـۆ ئیسـتایش. زانایان لـەجیاوازی ئەو دوو رستەیە بۆچونیان جیاوازە، بەتین تریان ئەو مانایەیە .

﴿ وما أرسلناك إلا مبشرا ونذيرا ﴾ وە ئیمە تۆمـان رەوانـە نـە کـردووە مەگـەر بـۆ ئەوەی مۆزدە بدەی بە پیاوچاکـان بەرەزامـەندی خـواو بەبەهەشـت و ترسـینەر بـی بـۆ گوناهباران بەئاگری دۆزەخ، ئیتر هەرکەسی ئارەزۆی هەیە باوەربهینی بەخواو هەرکەسی باوەرنایەری بە ئارەزووی خۆیەتی .

﴿ و قرآن فرقناه لتقرأه على الناس على مكث ﴾ وە ئیمـە نـاوەرۆکی قورئانمـان رون کردوەتەوەو بەهۆی قورئانەوە چاك و خراپمان جوی کردوەتەوە بۆ ئادەمیزاد و بەیەکجار نەمان ناردووەتە خوارەوە ئایەت ئایەت ناردوومانەتە خوارەوە لـەبەرئەوەی تۆ بخوینیتـەوە بەسەر ئادەمیزادا لـەسەر خۆت بۆ ماوەی بیست و سی سال .

﴿ و نزلناه تنزيلا ﴾ وە ئیمە قورئانمان ناردوەتە خوارەوە بەناردنەخوارەوەیە بەگویرەی روداو پیویستی ئادەمیزاد .

﴿ قل آمنوا أو لا تؤمنوا ﴾ تۆ بلی بەبی باوەران ئیوە باوەربهینن بە قورئان یا باوەری پی نەهینن خۆتان سەربەست و ئازادن، باوەرهینانی ئیوە قورئانی پی بەریز نابی و باوەرپی نەهینانی زیانی لە قورئان ناداو لەریزی کەم ناکاتەوە .

﴿ إن الذين أتوا العلم من قبله إذا يتلى عليهم يخرون للأذقان سجدا ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ بەخشرابو بەوان زانیاری و نامەی خوا بەر لەهاتنە خوارەوەی قورئان ورەوانەکردنی پیغەمەر کاتی خوینرایەوە بەسەریانا قورئان ئەکەوتن بەروا بەسوژدە بردن بۆ خوا لەبەر گەورەیی فەرمانی خوا وسوپاس کردن بۆ ئەو بەلینەی خوا دابوی بەناردنی پیغەمەر و لەنامە پیشوەکاندا چاویان پی کەوتبو .

﴿ و يقولون سبحان ربنا إن كان وعد ربنا لمفعولا ﴾ و ەئەلین: پاکی بۆ پەورەدەکەری ئیمەیە و دورە لەوەی ئەو بەلینەی دابوی بەناردنە خوارەوەی پیغەمەر لەنامەکانی پیشوودا جی بەجی نەکا، بەراستی بەلینی پەروەردگاری ئیمە جی بەجی کراو هاتەدی وپیغەمەر رەوانەکرا .

﴿ و يخرون للأذقان يبكون ويزيدهم خشوعا ﴾ وە ئەکەون بەدەماو سوژدە ئەبەن بۆ خوا و ئەوان ئەگرین لەبەر گەورەیی خواو قورئان زۆرتر ئەکا بۆئەوان نەرمی دلیان و تەری چاویان، دووپات کردنەوەی سوژدە بردن یەکەمیان لەبەر گەورەیی خوایە. دووهەمیان لەبەرکاریگەری قورئانە لەدەرونیانا .

بت پەرستان کاتی بیستیان پیغەمەر ئەفەرموی: یاخوا یا رەحمان: ووتیان: موحەمەد ریگە ئەگری لە ئیمە بۆ پەرستنی دوو خوا، خۆی هاوار لە دوو خوا ئەکا، خوای مەزن وەلامی دانەوە فەرموی:

﴿ قل ادعوا الله أو أدعوا الرحمن أيا ماتدعوا فله الأسماء الحسنى ﴾ تۆ بلی: ئیوە هاواری خوا بکەن و بیپەرستن یا هاواری رەحمان بکەن مەبەستەکە ناگۆری، چونکە هەردووکیان ناوی خوان، ئیوە هاواری خوابکەن یا هاوری رەحمان بکەن جیگەی شایستەی خۆیەتی ئەو شتەی ئەوتۆ لەو دووناوە ئیوە باسیان ئەکەن و چەند ناوی تر، دوایی بۆ خوا هەیە چەندین ناوی شیرین و بالاتر، ئیوە هەرکامیان هاواری پی بکەن زۆر راستە ئیتر ئیوە بلین: یاخوا یا رەحمان یا خاوەن توانا یا زانا و گەورە مەبەست ناگۆری:

﴿ ولاتجهر بصلاتك ولا تخافت بها واتبع بين ذلـك سـبيلا ﴾ وە تـۆ دەنگـی خـۆت بەرزمەکەرەوە بەخویندنی قورئان لـەنویژدا وبت پەرستان ببیسـن و جنیـوت پـی بـدەن و بەسوکیش مەیخوینە ئەوانەی لـەدوای تـۆ بـن نـەی بیسـن و تـۆ داوای ریگەیـەکی مـام ناوەندی بکە لـەنیوان دەنگ بەرزی و نزمی دەنگدا .

﴿ وقل الحمد لله الذي لم يتخذ ولدا و لم يكن له شريك في الملـك ﴾ وە تـۆ بلـی: هەموو سوپاس وچاکەبۆ خوایەکی ئەوتۆیە منالی بۆ خۆی وەرنـەگرتوە بـەهیچ جـۆری. نەك وەك جوەکان ئەلین: عوزەیر کوری خوایە، گاورەکان ئەلین: عیسا کـوری خوایـە، بت پەرستان لایان وایە فریشتەکان کچی خوان، وە هاوبەش بۆ خوا نیە لـەدەسـتەلات و خاوەنیەتی بونەوەراندا بەوجۆرەی بت پەرستان گومان ئەبەن .

﴿ ولم يكن لـه ولـي مـن الـذل وكـبره تكبـيرا ﴾ وە بـۆ خـوا نیـە هیـچ دۆسـت و یاریدەدەری کۆمەکی پی بکا لـەبەر بی دەستەلاتی و پیی گەورە ببی و، تۆ خوا بەگــەورە بگرە بەجۆرە گەورەییە نـەمنال و مـیرات گـری هـەبی ونەهاوبەشـی هەیـە لـەخوایـەتی بونەوەراندا، هەموو گەورەیە لای خوا بی توانایە .

## کۆتایی پی هات بەیاریدەی خوا ریکەوتی ١٢ / ٢ / ٢٠٠٠ زایینی

## ﴿ سورەتی ئەلكەهف ﴾

لەمەكەی هاتوەتە خوارەوە جگە لەئایەتی (٣٨) لەمەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەكانی (١١١) ئایەتن. خوای مەزن لەژمارەی زۆری ئایەتەكانی پێشوودا باسی ڕاستی وشارەزایی و روناك كردنەوەی ڕێگەی ڕاستی كرد، لەم سورەتەدا باسی موژدەدان بە پیاوچاكان و ئاشتی خوازان پاداشت وڕابواردنیان و باسی پیاو خراپان وسزدانیان ئەكات بەئاگری دۆزەخ .

### ﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

### بەناوی خوای بەخشندەو میهرەبان

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

ٱلۡحَمۡدُ لِلَّهِ ٱلَّذِيٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبۡدِهِ ٱلۡكِتَٰبَ وَلَمۡ يَجۡعَل لَّهُۥ عِوَجَاۜ (١)
قَيِّمٗا لِّيُنذِرَ بَأۡسٗا شَدِيدٗا مِّن لَّدُنۡهُ وَيُبَشِّرَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ٱلَّذِينَ
يَعۡمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمۡ أَجۡرًا حَسَنٗا (٢) مَّٰكِثِينَ
فِيهِ أَبَدٗا (٣) وَيُنذِرَ ٱلَّذِينَ قَالُواْ ٱتَّخَذَ ٱللَّهُ وَلَدٗا (٤)
مَّا لَهُم بِهِۦ مِنۡ عِلۡمٖ وَلَا لِأٓبَآئِهِمۡۚ كَبُرَتۡ كَلِمَةٗ تَخۡرُجُ مِنۡ
أَفۡوَٰهِهِمۡۚ إِن يَقُولُونَ إِلَّا كَذِبٗا (٥) فَلَعَلَّكَ بَٰخِعٞ نَّفۡسَكَ
عَلَىٰٓ ءَاثَٰرِهِمۡ إِن لَّمۡ يُؤۡمِنُواْ بِهَٰذَا ٱلۡحَدِيثِ أَسَفًا (٦) إِنَّا

جَعَلْنَا مَا عَلَى ٱلْأَرْضِ زِينَةً لَّهَا لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ﴿٧﴾ وَإِنَّا لَجَٰعِلُونَ مَا عَلَيْهَا صَعِيدًا جُرُزًا ﴿٨﴾

﴿ الْحَمْدُ لِلهِ الَّذِيْ أَنْزَلَ عَلَى عَبْدِهِ الْكِتَابَ وَلَمْ يَجْعَلْ لَهُ عِوَجاً ﴾ هەمو سوپاسو ستایش بۆ خوایەکی ئەوتۆیە ناردویەتیە خوارەوە بۆ سەر بەندەی خۆی نامەیە کەقورئانە نەی گێڕاوە بۆ ئەو قورئانە هیچ جۆرە لاری و خراپەیە نە لەڕستەکانیداو نە ماناکەیدا و دژی یەکتر نین .

بۆزانین: خوای مەزن قورئانی ناردوەتە خوارەوە بۆ ئێمە لەپەیڕەوی ناوەڕۆکەکەی بگەین و کاری پێبکەین، بیکەین بەدەستور و یاسا بۆ خۆمان لە هەمو ڕویێکەوە و لەهەمو کات وجێگەیەکا نەك بۆ ئەوەی ئایەتەکانی لەبەر بکەین. ئەگەر ئێمە کاری پێ نەکەین ئێمە وئەوانەی تانەی لێ ئەدەن ئێمەو ئەوان وەك یەك وایـن، کاربەدەستانی ئێستا کە یاسای دەستکرد دروست ئەکەن کەدژی قورئانن وکاری پێ ئەکەن بەموسڵمان دائەنرێن. کەچی ئەڵێن: ئێمە موسڵمانین. پێغەمەر فەرموی: کاتێ دێت بەسەر ئادەمیزاد باوەڕهێنان هەر شێوازی ئەمینێ و قورئان خوێندنی .

﴿ قَيِّماً لِيُنْذِرَ بَأْساً شَدِيْداً مِنْ لَدُنْهُ ﴾ بەڵکو خوا قورئانی گێڕاوە بەجۆرێکی ڕاست ورێك و بەنرخ لەبەرئەوەی بێباوەڕان بترسێنێ لەسزایەکی سەخت لای خواوە پەیدا ئەبێ.

﴿ وَيُبَشِّرَ الْمُؤْمِنِيْنَ الَّذِيْنَ يَعْمَلُونَ الصَّالِحاتِ أنَّ لَهُمْ أجراً حَسَناً ماكِثِيْنَ فِيهِ أَبَداً ﴾ وەموژدە ئەدا ئەو قورئانە بەوباوەڕدارانەی ئەوتۆ کارە چاکەکان ئەکەن بەڕاستی بۆ ئەوان هەیە پاداشتێکی شیرین وچاك لە بەهەشتا لەنێو ئەوپاداشتەدا دائەنیشن هەتا هەتایە .

﴿ وَيُنْذِرْ الَّذِيْنَ قالُوا اتَّخَذَ اللهُ وَلَداً ﴾ وە بۆئەوەی بترسێنێ ئەو کەسانەی ئەوتۆ وتوویانە خوا منالی بۆ خۆی داناوە، وەك هەندێ لەعەرەبەکان لایان وایە فریشتەکان کچی خوان وجوەکان ئەڵێن: عوزەیر کوڕی خوایە وگاورەکان ئەڵێن: عیسا کوڕی خوایە .

﴿ مالَهُمْ بِهِ مِنْ عِلْمٍ وَلا لآبائِهِمْ ﴾ بۆ ئەو کەسانەو بۆ باوکەکانیان هیچ بەڵگەو زانیاریە بۆ ئەو گفتوگۆیەی خۆیانە نیەو دوای لاسایی کردنەوەی باو وباپیرانیان کەوتوون.

﴿ كَبُرَتْ كَلِمَةً تَخْرُجُ مِنْ أَفْواهِهِمْ ﴾ ئەو گفتوگۆیە ئەوان ئەیکەن گفتوگۆیەکی زۆر گەورەیە لەناڕەواییدا کە دەرئەچێ لەدەمیانەوە بەبێ بەڵگەو بنچینە، ئەوەندە گەورەیە لە بێ شەرمی وناڕەواییدا کە ئاسمان بڕوخێنێ وکێوەکان لەبن هەڵکەنێ .

﴿ إنْ يَقُولُونَ إلا كَذِباً ﴾ ئەو کەسانەی بڕیاری مناڵ بوون بۆ خوا ئەدەن هیچ ناڵێن مەگەر درۆیکی زۆر گەورە ئەدەنە پاڵ خوا. قەدەغەیە شتێ بەو جۆرە بەبێ‌بەڵگە ببێژرێ.

﴿ فَلَعَلَكَ باخِعٌ نَفْسَكَ على آثارِهِمْ إنْ لَمْ يُؤمِنُوا بِهذا الْحَدِيْثِ أَسَفاً ﴾ دوایی لەوانەیە تۆ خۆت لەخەفەتا بکوژی لەسەر دوورکەوتنەوەی ئەوان و وازهێنان ئەگەر ئەوان باوەڕیان بەم گفتوگۆیەی خوا نەهێنا کە بریتیە لەقورئانی پیرۆز .

﴿ إنّا جَعَلْنا ما عَلَى الأَرْضِ زِيْنَةً لَها ﴾ بەڕاستی ئێمە گێڕاومانە شتێ بەسەر زەویە بەجوانی وئارایشت بۆ زەوی لە کانگا و کشت وکاڵ و ئاژاڵ ومناڵ وسامان، دوایی ئەوانە نامێنن، جێگەی سەرسوڕمانە ئەو کەسانە باوەڕناهێنن ودڵیان بەجیهانەوە بەستراوە.

﴿ لِنَبْلُوَهُمْ أَيُّهُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً ﴾ لەبەرئەوەی ئێمە ئەو کەسانە تاقی بکەینەوە چ کەسێکی ئەوتۆ لەوان کاری چاك ئەکەن و بەئادەمیزاد ڕابگەیەنرێ ئەو کەسانە کامیان خۆیان ئەپارێزن لەگوناه ئەگینا خوا هەموو شتێ ئەزانێ بەبێ تاقی کردنەوە .

﴿ وَ إنّا لَجاعِلُونَ ما عَلَيْها صَعِيداً جزراً ﴾ وە بەڕاستی ئێمە ئەگێڕین شتێ بەسەر زەوییەوەیە بەخاك و بە زەوییەکی ئەوتۆ گیای تێدا نەڕوابێ و جوانیەکەی نایەڵێن .

هەمووشتێ کەئادەمیزاد خۆیانی بۆ ماندو ئەکەن و خۆیانی بۆ ئەدەن بەکوشت بێگومان خوا ئەوانەی پێ بەخشیون، هەموو کەسێ ئەگەر بەبەشی خۆی رازی بێ ئەو کەسە بەبەختیای ئەژی وخەفەت ناخواو چاوی لەسامانی کەسەوە نیە کە داگیری بکا،

ئەگەر هەوڵی زۆرتر بدا بۆ خۆی و هەر خۆی مەبەستبێ و بیەوێ لەسەر دارایی جگـەی خۆی بژی ئەو کەسە هەمیشە خەفەتبار و بێئارامە وبەئاواتی خۆی ناگا .

لـەسورەتی ئەلئیسـراء داو لـەمانای ئایـەتی (٨٥) ڕون کرایـەوەوە کـە قورەیشیـەکان دووکەسیان نـارد بـۆ خزمـەت پێغەمـەر ﴿ ﷺ ﴾ سـێ پرسـیاری لێبکـەن (١) پرسـیاری لێبکەن: گیانی زیندەوەران چ شتێکە؟ پێغەمەر فەرموی: هەر خوا ئەزانێ گیان چ شـتێکە و کەسی تر نایزانێ. لەم ئایەتانەی دواییدا خوا باسی ئـەوە ئەفـەرموێ: جوەکـان ووتیـان بەنوێنەرانی قورەیش پرسیاری ئەم دووشتانەیشی لێ بکەن: (١) پرسـیاری لێ بکـەن: ئـەو کۆمەڵە لاوانە چ کەسانێ بوون باوەڕیان بەپـەروەردگاری خۆیـان هێنـا، لـەپێناوی بـیرو باوەڕی خۆیانا لەنیشتمانی خۆیانا دەرچوون بەسەرهاتیان چۆن بو؟ (٢) پرسیاری لێبکەن: ئەو پیاوە چ کەسێ بو ڕۆژهەلآت و ڕۆژئاوای پشکنی وزۆربەی دانیشـتوانی هێنایـە ژێـر فەرمانڕەوایی خۆی، نوێنەرانی قورەیشیەکان چوون ئـەو دوو پرسـیارەی تریـان لێ کـرد، پێغەمەر ووتی بەیانی وەلآمتان ئەدەمەوە، بەو بۆنەوەیە نەیفەرمو:

﴿ إنْ شاءَ اللهِ ﴾ خوا بۆ سەرزەنشتی کردنی پێغەمەر پـازدە ڕۆژ سروشـی بـۆ نەهاتـە خوارەوە و خەفـەتی زۆری خـوارد. بـەو بۆنـەوە دانیشـتوانی مەککـە کەوتنـە جموجـۆڵ هەریەکەیان بەجۆرێ باسیان ئەکرد، دوایی خوای مەزن سروشـی بۆنـارد و وەلآمـی ئـەو دوو پرسیارەی ڕون کردەوەو بەپێغەمەری فەرموو: جارێ تر نـەڵێی فلآن شـت ئەکـەم هەتا نەڵێی ﴿ إنْ شاءَ اللهِ ﴾. بەو بۆنەوە خوا فەرموی:

أَمْ حَسِبْتَ

أَنَّ أَصْحَـٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَـٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾

إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً

وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى

ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾

﴿ أمْ حَسِبْتَ أنَّ أصْحابَ الْكَهْفِ وَالرَّقيمِ كانُوا مِنْ آياتِنـا عَجَباً ﴾ ئایا تۆ گومانت بردوە کەبەڕاستی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە و مانەوەیان بەزیندوویی ماوەیەکی دوورودرێژ وتەختەیە ناوی دانیشتوانی ئە وئەشکەوتەیان تێدا نووسراوە نیشانەیکی سەرسوڕێنەرە لە نیشانەو بەڵگە وتوانای ئێمەیە .

ئەوشتەی زانراوە لەنامە کۆنەکاندا باسی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە کراوە،کەسانێکی ئەوتۆ ئەو نامەیەیان ئەخوێندەوە یا ئەیان بیست بەلایانەوە سەیر بوو چۆن ئەو ماوە دوورودرێژ وئەو ساڵە زۆرانە خەوتوون و بەبێ خواردن ماونەتەوە. دوایی خوای مەزن فەرموی بەو کەسانە: بەلاتانەوە سەیر نەبێ، هەموو نیشانەکانی خوا هەمو ئەقڵێ سەرگەردان ئەکا، ئەو کەسەی دانیشتوانی ئەشکەوت وهەموو بونەوەرانی دروست کردوە ئاسانە لەسەری ئەو لاوانە بهێڵێتەوە بەخەوتوویی ماوەیەکی زۆر دوواییی زیندوویان بکاتەوە. بەڵام زۆرتر لەئادەمیزاد بەو کارەی خوا نازانن .

بۆ زانین: کورتەی بەسەرهاتی ئەو لاوانەی خەویان پێدا کەوتبوو لە وئەشکەوتەدا بەم جۆرەیە: دانیشتوانی شاری ( ئەفسوس ) کە کۆنە شارێکی ( ئیغریقیەکانە ) کەکەوتوەتە سەر ڕووباری ( قەرەسو) لەئاسیای بچووك ( ئەناضولی )ئێستای تورکیا ئە وکاتە لەسەر ئایینی عیسا بوون، دوایی پاشایەکی زۆر ستەمکار کەناوی ( دەقیانوس ) بوو پەلاماری شارەکانی ڕۆمی دا هەموی داگیر کرد بەوشارەی ئەفسوسیشەوە، ئەو پاشایە فەرمانی دا بەدانیشتوانی ئە وشارانە ئەبێ بن بەبت پەرست، زۆر بەسەختی بەسەریانا ئەی سەپاند، هەرکەسێ پێچەوانەی فەرمانی ئە وپاشایە بکردایەو بتی نەپەرستایە ئەی کوشت و لەشەکەی بەسەر شورای شارەکەدا هەڵئەواسی. بەڵام حەوت لاوی خوێن گەرم

لەدانیشتوانی ئەو شارە زۆریان لاگران بو واز لـەئاینی عیسا بـهێنن، بەنـهێنی پەرستنی خوایان ئەکرد، ئەو هەڵوێستەی ئەوانیان بەپاشا گەیاند و بـە پاشایان ووت: ئـەو لاوانـە ئاینی تۆ ناپەرستن، خواکانی تۆ بەبێ نـرخ دائـەنێن و باوەڕیـان بـەوان نیـە، پاشا داوای کردن بچن بۆ بارەگای خۆی، فـەرمانی پێـدان ئـاینی ئـەو بپەرسـتن. لاوەکـان ووتیـان: پەروەردگاری ئێمەو ئاسمان و زەوی و تۆو هەمو بونەوەران هەر خوایەو جگە لـەو کەسـی تر ناپەرستین، دوایی پاشا بەوانی ووت: ئێوە لاوێکی سەربەستن و ئەقڵتان تەواو نیە، مـن پەلـەناکەم لـەسزادانی ئێوە، داواتان لێ ئەکەم بیر لـە خۆتان بکەنەوە، لـەدوای سێ ڕۆژی تر بێنەوە بۆ لام. لاوەکان بۆ دیاری کردنی پاشەڕۆژی خۆیان بەنـهێنی کەوتنـە ووتـو وێـژ، دوایی پێك هاتن لـەو شارە بڕۆنە دەرەوە، بۆئەوەی ئاینی خۆیان بپارێزن، بۆیـە یـەکێکیان ووتی: من ئەشکەوتێ ئەزانم کە باوکم مەڕەکانی ئەکردە ناوی، لاوەکان بە بیانوی یـاری تۆپێنەوە، بۆ ئەوەی کەس گومانیان لێ نەکا بەرەو ئەشـکەوتەکە کەوتنـە ڕێ، لـەڕێگـەدا دایان بەلای‌شوانێکا سەگێکی لابوو، شوانەکە خـۆی وسـەگەکەی دوایـان کـەوتن هـەتا گەیشتنە لای ئەشکەوتەکە ڕاکشان وخوا ( سێ‌سەد و نۆساڵ خەوی لێ‌خستن ) دوای ئەو ماوەیە لـەخەو ڕاپەڕین پرسیاریان لـەیەکتر ئەکرد ئـەبێ چـەند ماوەیـە بـێ خـەومان پێـدا کەوتبێ؟ وەڵامی یەکتریان ئەدایەوە: لـەوانەیە ڕۆژێ بێ یا هـەندێ لـەڕۆژێ بـێ، دوایـی ووتیان پەروەردگاری ئێمە ئـەیزانێ بەتەنـها، کەواتـە بایـەکێکمان بنێرین هـەتا هـەندێ خواردەمەنیمان بۆ بکڕێ وبیخۆین و ئاگای لەخۆی بێ و بەژیرانە بـڕوا، چونکـە ئەگـەر پێمان بزانن، ئەمان کوژن و بەردە بارانمان ئەکەن یائەمان گێڕنەوە بۆ لای ئـاینی خۆیـان، کاتێ نوێنەرەکەیان چوە بازاڕ خواردەمەنی بکـڕێ چـوە لای خواردەمـەنی فرۆشـێ کاتێ پارەی دایە دەستی بفرۆشەکە تەماشـای پارەکـەی کـرد کـەناوی دەقیانوسـی لـەسەر نوسراوە، گومانی برد ئەو لاوە گەنجینەی دۆزیوەتـەوە، کۆمـەڵێ لـەپیاوانی بازاڕ لـەوان کۆبونـەوە، ئـەو لاوە بەسـەرهاتی ڕابـووردوی خۆیـانی بـۆ گێڕانـەوە. دانیشتوان ووتیان: بـێ ونـەبێ ئـەم لاوە یەکێکـە لـەو لاوانـە باووباپیرمـان بۆیـان

گێڕاوینەتەوە لەدەست ستەمی (دەقیانوس) ڕایان کردوە، دەنگ و باس گەیشت بەپاشای شار، ئەو پاشایە زۆر چاك و دادپەروەر بوو لاوەکانی بانگ مردو ووتی: ئەم دراوەت لەکوێ بو، لاوەکە بەسەرهاتی خۆیانی بۆ گێڕایەوە، پاشا بەڕویەکی گەشەوە و زۆر بە ئاهیستەو نەرمی ووتی: هاوڕێکانت لەچ جێگەیەکن؟ ووتی: لەفلاَن ئەشکەوتن، پاشاو دانیشتوانی شار چونە دەرەوە بۆ لای ئەو ئەشکەوتە کەگەیشتنە لای ئەشکەوتەکە ولاوەکانیان چاوپێ‌کەوت و لەیەك گەیشتن لاوەکان لەپەروەردگاری خۆیان پاڕانەوە بیان مرێنێ، خوای مەزن وەلاَمی دانەوەو مراندنی، ئەو ئەشکەوتە کەوتوەتە نێوان (عەموریە) و نێوان (نیقیە) کە دووشاری کۆنن لەئاسیای بچووك = (ئەناضول)ی ئێستای تورکیا، خوای مەزن بەکورتی وبەپوختەتر و زۆر بەڕونتر ئە وڕووداوە لەمەودووا باس ئەکا .

بۆزانین: زانایان بیریان جیاوازە لەمانای (الرقیم) هەندێکیان ئەڵێن: ناوی سەگەکەی لاوەکانە. هەندێ تریان لایان وایە ناوە بۆ ئەو نامەیە ناوی ئەوانی تێدا نووسراوە، هەندێ تریان ئەڵێن: ناوی ئە وکێوەیە ئەشکەوتەکەی تێدایە، هەندێ تریان ئەڵێن ناوە بۆ ئەو گوندەی لاوەکان .

بەلاَم هەندێ لەزانایان ئەڵێن دانیشتوانی ڕەقیم کۆمەڵێ تر بوون جگەی ئەو لاوانەی پێشوو، سێ‌کەسبوون کەچونەتە دەرەوە بۆ پەیداکردنی خواردەمەنی بۆ خۆیان و خێزانەکانیان، دوایی باران ڕێگەیان پێ‌ئەگرێ و ئەچنە ناو ئەشکەوتێکەوە، دوایی بەردێ ئەکەوێتە خوارەوە ودەرگای ئەشکەوتەکەیان لێ ئەگرێ. یەکێکیان ئەڵێ: باهەریەکەمان باسێ کردەوەیەکی چاکی خۆمان بکەین بەڵکە خوا بەزەیی پێمانا بێتەوە بەهۆی پیرۆزی ئە وکارەمانەوەو ڕزگارمان بکا: یەکێ لەو سێ کەسانە ووتی: من ئیشم ئەکرد بەچەند کرێکارێ، لەنیوەی ڕۆژدا پیاوێ هات و کاری کرد لەگەڵ کرێکارەکانی تردا و بەئەندازەی تەواوی ئەو ڕۆژە کاری کرد منیش کرێی ڕۆژێکم دایە، یەکێ لەکرێکارەکان توڕەبوو ووتی: ئەوپیاوە نیوەی ڕۆژێ کاری کردوە، بۆ تەواوی کرێکەی ئەدەیتێ توڕەبوو کرێکەی وەرنەگرت، کرێکەیم لەگۆشەیەکی هۆدەیەکا دامنا، لەپاشا

گوێرەیەکی مێینەم پیْکڕی، ئە وگوێرەکە کەوتــە زاوزێ و بەویستی خـوا ئەندازەیـەکی زۆری ئولاٌخی لیٌپەیدا بوو، دوای ماوەیە هاتەوە بۆ لام و نـەم ناسی و پـیرو لاواز بوبـو، ووتی: من مـافێکم بەلاتەوەیـە، بـۆی بـاس کـردم و ناسـیمەوە هـەموو ولاٌغـەکانم دایـە دەستیەوە، خوایە ئەگەر من ئەو کارەم لـەبەرتۆ کردوە ڕزگارمان بفەرموو کێوەکە کەوتـە جولـە بەجۆرێ ڕوناکیان بەدی کرد .

پیاوێ تریان ووتی: من گوزەرانێکی خۆشم هـەبوو سـامانێکی لـەخۆم زۆرتـر هـەبوو ،دانیشتوانی تر تووشی گرانی بون، ژنیٌ هات بۆ لام و داوای خواردەمەنی لیٌکردم، دوایی من پیٌم ووت: سوێندم بەخوا، هەتا ئەوکارەم لـەگەڵ نەکەی نات دەمێ، ژنەکە نەی کـرد وگەڕایەوە، لـەپاشا سیٌجار هەر بەوجۆرە ئەهات وئەڕۆیشتەوە، دوایی ئـەو ڕوداوەی بـۆ مێردەکەی گێڕابوەوە، مێردەکەی وتبووی: وەلاٌمی بدەرەوەو خێزانەکەت ڕزگـار بکـە و بگەرە فریایان، ژنەکە گە ڕایەوەو خۆی دا بەدەستەوە، کاتیٌ خۆی دەرخسـت و ویسـتم بچمەلای لـەشی ئەلـەرزی. پیٌم ووت: بۆچ وا ئەلــەرزی، ووتـی: لـەترسـی خـوا. منیـش ووتم: تۆ لـەخوا ئەترسی لـەکاتی ناخۆشی و تەنگانەدا، من لـەخۆشی و هەرزانیدا لــە خـوا ناترسم، وازم لیٌ هێناو هەرچی داواکردبو دام پیێ، خوایە ئەگەر من ئـەوکارەم لـەبـەر تـۆ بوە بگەرە فریامان. کێوەکە کەوتە جوٌلـە بەجۆرێ یەکترمان ئەناسی .

پیاوی سێهەم ووتی: من باوك و دایکێکی پەك کەوتەم هـەبون هـەندێ مـەڕم هـەبون، ئەبوایە نان وئاوم بدانایە، دوایی ئەڕۆیشـتم بـۆ لای مـەڕەکانم، بەرێکـەوت ڕۆژێ بـاران نەیهێشت بگەڕێمەوە بۆ لایان، نەچومە لایان هەتا شەوی بەسەردا هات، دوایی چومـەوە بۆلای خێزانەکانم و کاسەی شیرەکەم برد و شیرەکەم دۆشی و پـرم کـرد، چـوم بـۆ لای باوك ودایکم سەیرم کرد خەوتبوون، لام گران بوو بێداریان بکەمەوە، وەستام و کاسـە شیرەکەم بەسەر دەستەوەبو، هەتا بەیانی بێداری کردنەوە، ئەو کاتە شـیرەکەم دەرخـوارد دان، خوایە ئەگەر من ئەو کارەم لـەبەر تۆ کردووە ڕزگارمان بکەی، بەردەکە بەتــەواوی لاچو، دوایی هەمویان چونە دەرەوە .

ئەوەی جێگەی بڕوای تەواو بێ دانیشتوانی کەهفو ڕەقیم هەریەکن، ڕەقیم ناوی ئەوشتەیە ناوی ئەو لاوانەی تێدا نووسراوەو بەسەرهاتیان ڕون کراوەتەوە، خوایش لەهەمو کەس زاناترە، خوای مەزن باسەکەمان بۆ ڕوون ئەکاتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ إذْ آوَى الفتية إلى الْكَهْفِ ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە کۆمەڵێ لەلاوانی پیاو ماقوڵانی ڕۆم چون بۆ لای ئەشکەوتەکەو کردیان بەجێگەی پشوودانەوەی خۆیان، لەدەستی پاشایەکی ستەمکار هەڵهاتن لەبەر پاراستنی ئایینی خۆیان، بۆ ئەو کەسانەی باس بکە پرسیاریان لەتۆ کردوە بەنیازی بریندارکردنی تۆو پەك خستنی تۆ .

﴿ فَقالُوا رَبّنا آتنا مِنْ لدنكَ رَحْمَةً وَ هَيِّئ لَنا مِنْ أمْرِنا رَشَداً ﴾ دوایی ئەو لاوانە وتیان: ئەی پەروەردگاری ئێمە: تۆ ببەخشە بەئێمە لەلایەن خۆتەوە شتێ هۆی لێبوردنی تۆ لەئێمە و خواردەمەنیمان بدەیتێ و لەدوژمن بمانپارێزی و ئامادەی بکەی لە م کارەی ئەوتۆ ئێمە تۆوشمان بوە لەجیابونەوەی بێباوەڕان شارەزایی و ڕاغومایی وەرگرتن بۆ لای ڕەزامەندی تۆ .

﴿ فَضَرَبْنا عَلى آذانِهِمْ فِي الْكَهْفِ سنِيْنَ عَدداً ﴾ دوایی ئێمە دامان بەسەر گوێچکەی ئەو لاوانەدا پەردەیە هیچ شتێ نەبیستن. یانێ ئێمە ئەوانمان خەواند لەنێو ئەو ئەشکەوتەدا چەندین ساڵێکی دیاری کراوی زۆر دورو درێژ .

﴿ ثُمّ بعثنا هم لِنَعْلَمَ أنّ الْحِزْبَيْنِ أحْصى لِما لَبِثُوا أمَداً ﴾لەپاشا ئێمە ئەو لاوانەمان زیندوو کردەوە لە خەو بێدارمان کردنەوە لەبەرەئوەی ئێمە بزانین چ تاقمێ لەو دووتاقمە ئەزانن بەئەندازەی مانەوەیان لەو ئەشکەوتەدا، زانیاری ئێمە بۆ ئادەمیزاد ڕون ببێتەوە .

زانایان لەدیاری کردنی ئەو دووتاقمانەدا بیریان جیاوازە: ئایا ئەو دوو تاقمە لە لاوەکانی دانیشتوانی ئەشکەوتەکەن یا لەدانیشتوانی ناو شارن، یابریتین لە دانیشتوانی ڕابووردو یابریتین لە باوەڕداران و بێ باوەڕان. ئایەتی (١٩) ی ئە مسورەتە وائەگەیەنێ ئەو دووتاقمە بریتین لە لاوەکانی ناو ئەشکەوتەکە .

لەدواییدا خوای مەزن بەدرێژی باسی بەسەرهاتی دانیشتوانی ئەشکەوت ئەکاو ئەفەرموێ:

نَّحۡنُ نَقُصُّ عَلَيۡكَ نَبَأَهُم بِٱلۡحَقِّۚ
إِنَّهُمۡ فِتۡيَةٌ ءَامَنُواْ بِرَبِّهِمۡ وَزِدۡنَٰهُمۡ هُدٗى ﴿١٣﴾ وَرَبَطۡنَا
عَلَىٰ قُلُوبِهِمۡ إِذۡ قَامُواْ فَقَالُواْ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ
لَن نَّدۡعُوَاْ مِن دُونِهِۦٓ إِلَٰهٗاۖ لَّقَدۡ قُلۡنَآ إِذٗا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰٓؤُلَآءِ
قَوۡمُنَا ٱتَّخَذُواْ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةٗۖ لَّوۡلَا يَأۡتُونَ عَلَيۡهِم
بِسُلۡطَٰنِۭ بَيِّنٖۖ فَمَنۡ أَظۡلَمُ مِمَّنِ ٱفۡتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبٗا ﴿١٥﴾
وَإِذِ ٱعۡتَزَلۡتُمُوهُمۡ وَمَا يَعۡبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأۡوُۥٓاْ إِلَى ٱلۡكَهۡفِ
يَنشُرۡ لَكُمۡ رَبُّكُم مِّن رَّحۡمَتِهِۦ وَيُهَيِّئۡ لَكُم مِّنۡ أَمۡرِكُم مِّرۡفَقٗا
﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمۡسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهۡفِهِمۡ ذَاتَ
ٱلۡيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقۡرِضُهُمۡ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمۡ فِي فَجۡوَةٖ
مِّنۡهُۚ ذَٰلِكَ مِنۡ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهۡدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلۡمُهۡتَدِۖ وَمَن
يُضۡلِلۡ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيّٗا مُّرۡشِدٗا ﴿١٧﴾ وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا
وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم
بَٰسِطٞ ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ

فِرَارًا وَلَمُلِئْتَ مِنْهُمْ رُعْبًا ﴿١٨﴾

﴿ نَحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُمْ بِالْحَقِّ ﴾ ئێمە ئەیخوێنینەوە بەسەر ئێوەدا هەواڵی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە بەڕاستیو بەبێگومان. دانیشتوان بەرلەهاتنی پێغەمەر ﴿ ﷺ﴾ باسی ئەو لاوانەیان ئەکرد هەریەکەیان لەنامەی خۆیانا نوسیبویان بەجۆرێ ئەوانە هەمویان ئەفسانەبوون و بەنەزانینەوە نوسرابون ولە ڕاستیەوە دووربوون .

﴿ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ آمَنُوا بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَاهُمْ هُدًى ﴾ بەڕاستی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە چەند لاوێ بون باوەڕیان هێنابو بە پەروەردگاری خۆیان و وازیان لەبت پەرستی هێناو ئێمە شارەزایی وباوەڕهێنانمان بۆیان زۆرکرد و یاریدەمان دان ڕێگەی ڕاست بدۆزنەوە و بەردەوامبن لەسەر بڕوای بێگومان .

﴿ وَرَبَطْنَا عَلَى قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا ﴾ وەئێمە دڵی ئەوانمان بەهێزکرد کاتێ لەبەردەم دەقیانووس ڕاوەستابون هەتا ئارام بگرن لەسەردەرچوونیان لەنیشتمانی خۆیانا و وازهێنانیان لەخزم و کەس وکاری خۆیان لەبەر پاراستنی ئایینی خۆیان کاتێ داوای وەرگەڕانیان لێ‌کردن .

﴿ فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَنْ نَدْعُوا مِنْ دُونِهِ إِلَهًا ﴾ دوایی ووتیان: پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویەئێمە ناپەرستین لەجگەی پەروەردگار هیچ خوایەتر، ئەو خوایانەی ئێوە پوچ وبێ نرخن .

﴿ لَقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا ﴾ بەڕاستی ئێمە ئەگەر بڵێین ئەو بتانە خوان ئەو کاتە ئێمە لەسنووری دیاری کراوی خوا دەرچووین و شتێکی ناشایستەمان ووتوەو هەرگیز ئێمە ئەو شتە ناڵێین .

﴿ هَؤُلَاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِنْ دُونِهِ آلِهَةً لَوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِمْ بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ ﴾ دانیشتوان ئەم شارەی ئێمە تاقمێکن وەریان گرتوە لەجگەی خوا چەند خوایە بۆ پەرستن لەژێر هەڕەشەی دەقیانووساو لەترسی کوشتنی خۆیان، ئەگەر ڕاست ئەکەن بۆ نایەرن

بەڵگەیەکی بەهێز لەسەر پەرستنی ئەو بتانەو بڵێن: خوا فەرمانی داوە بۆ پەرستنیان، هەر ئایینێ بەڵگەی نەبێ پوچ ولاسایی کردنەوەی پێشوانە، ئادەمیزادی ژیر دروست نیە وەری بگرێ .

﴿ فَمَنْ أَظْلَمَ مِمَّنْ افْتَرَى عَلَى اللهِ كَذِباً ﴾ دوایی چ کەسێ ستەمکارترە لەو کەسەی بوختان هەڵەبستێ بەدرۆ بیدا بەسەر خوادا کەبەگومانی خۆیان ئە وبتانە خوان .

ستەمکارانی خزمەکانی ئەو لاوانە تەنگیان هەڵچنی بەلاوە باوەڕدارەکان و هەوڵیان دا وەریان گێڕن لەئایینی خۆیان، بۆ ئەو مەبەستە هەندێ لەلاوەکان بەهەندێ تر لەخۆیانیان ووت:

﴿ وَإذا إعْتزَلْتُمُوهُمْ وَما يَعْبُدُونَ إلا اللهَ فَأوُوا إلى الْكَهْفِ ﴾ وەهەرکاتێ ئێوە وازبهێنن لەخزمەکانتان و لەو شتە ئەوان ئەیپەرستن لەجگەی خوا دوایی ئێوە پەنابەن بۆ لای ئەو ئەشکەوتە، هەتا ڕزگارتان بێ .

﴿ يَنْشِرُ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ رَحْمَتِهِ وَيُهَيِءْ لَكُمْ مِنْ أَمْرِكُمْ مُرفِقاً ﴾ پەروەردگاری ئێوە فراوان ئەکا بۆ ئێوە لەڕۆزی و بەزەیی خۆی و ئاسان ئەکا بۆ ئێوە بۆ ئەم کارەی خۆتان شتێ ئێوە دڵخۆش بکا و سودی لێوەربگرن .

دوای ڕاوێژ کردن لەنێوان خۆیانا بڕیاریاندا پەنا ببەن بۆلای ئەو ئەشکەوتە، چونکە چارەی تریان نەدۆزیەوە، دوایی چوونە ناوی کاری و خۆیانیان سپارد بەخواو ڕازی بون بەوەی خوا بۆ ئەوانی بکا بابیش مرن لەبرساناو بەتینویی .

ئەولاوانە بڕوایان بە خوای تاك وتەنها هێناو بیرو باوەڕی خۆیانیان ڕاگەیاندو بەناودانیشتواناو خۆیانیان نەفرۆشت بەبێباوەڕان بەپلەوپایەو سامان. بەداخەوە لەم سەردەمەی ئێمەدا زۆر کەس هەن ئایین و نیشتمانی خۆیان ئەفرۆشن بەتایبەتی مێزەر بەسەر و عابا لەبەر بەناوی ئایینەوە ڕێگە خۆش ئەکەن بەپەیڕەوی ستەمکاران و نیشتمانداگیرکەریان .

خوای مەزن، باسی چۆنیەتی ئەو ئەشکەوتە و بەسەرهاتی ئەو لاوانە ئەکا وباسی پاراستنیان لەتەڕایی وبۆنی ناوئەو ئەشکەوتە ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ وَتَرى الْشَمْسُ إذا طَلَعَتْ تزاور عَنْ كَهْفِهِمْ ذاتَ الْيَمِيْنِ ﴾ وەتۆو هەموو کەسێ خۆر ئەبینێ کاتێ هەڵدێ ڕوناکیەکەی لائەدا لەئەشکەوتی لاوەکان لەلای ڕاستیانەوەو گەرمایی خۆر لێیان نادا هەتا ئازاریان بدا. یانێ ئەو لاوانە لەجێگەیەکی زۆر باشا بوون و لەژێرچاودێری خوادا بوون لە ناوەڕاستی ئەشکەوتەکەدا، بەجۆرێ بەشێکی باش پشووی خۆیان وەرگرن لەهەوای پاك و بای بەیانێ بەجۆرێ تیشکی خۆر لەوان نەدا .

﴿ وَإذا غَرَبَتْ تقرضهم ذاتِ الْشِمالِ وَهُمْ فِي فَجْوَةٍ مِنْهُ ﴾ وەهەرکاتێ خۆر ئاو ببوایە لەلاوەکان لای ئەدا و بەلای چەپا وەرئەگەڕا و لاوەکان لەجێگەیەکی بەربلاو وفراوانی ئەشکەوتەکەدا بوون، ئەو ئەشکەوتە گەورە بوو کونێکی تێدابوو هەوای پێدا ئەهات و ڕوناکی خۆر ئەهاتە ناوی ئەشکەوتەکەو نەی ئەدا لەلەشیان نەلەکاتی هەڵهاتنی خۆرداو لەکاتی ئاوبونیا .

﴿ ذَلِكَ مِنْ آياتِ اللهِ ﴾ ئەوەی باسکرا لەبەسەرهاتی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە لەشتە سەرسوڕێنەرەکان و توانای زۆر گەورەی بەڵگەکانی خوایە و کاری پەك خەری خوایە، خوا هەموشتێ لەجێگەی شیاوی خۆیا دائەنێ و بیربکەنەوە بەچ جۆرێ خوا دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتەی پاراست لەستەمکاران .

﴿ مَنْ يَهْدِ اللهُ فَهُوَ الْمُهْتَدِ ﴾ هەرکەسێ خوا شارەزای ڕێگەی ڕاستی بکاو ڕزگاری بکا لەبێباوەڕی بەهۆی بیرکردنەوەو خستنەکاری ئەقڵ دوایی ئەو کەسە ڕێگەی ڕاست وشارەزایی وەرگرتوە وێنەی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە.

﴿ وَمَنْ يُضَلِلْ فَلَنْ تَجِدْ لَهُ وَلِيّاً مُرْشِداً ﴾ وەهەرکەسێ خوا ڕێگەی ڕاستی لێ وون بکا و ئەوکەسە ئەقڵی خۆی نەخاتەکار بۆ دۆزینەوەی ئایینی ڕاست، دوایی دەست ناکەوێ بۆ ئەوکەسە هیچ یاریدەرێ شارەزایی ڕێگەی ڕاستی بکا، بەوێنەی دەقیانووس و گەلەکەی .

﴿ وَتَحْسَبُهُمْ أيقاظاً وَهُمْ رُقُودٌ ﴾ وەتۆو هەموو کەسێ گومان ئەبا ئەو کەسانە لەوئەشکەوتەدا بێدارن، چونکە چاویان کرابوەوە بەوێنەی کەسانێ تەماشای بەردەمی

خۆیان بکەن و لەشیان تەڕو پاراوو خوێنیان هاتوچۆی ئەکرد بەدەمارەکانیانا و ئەوان لەڕاستیدا خەوتبوون .

﴿ وَ نُقَلِّبُهُمْ ذاتَ الْيَمِيْنِ وَذاتَ الْشِمالِ ﴾ وەئێمە لەشی ئەو لاوانەمان ئەو دیو دیو ئەکرد و ئەمان جولاّندن جارێ بەلای ڕاستاو جارێ تر بەلای چەپا بەگوێرەی پێویست نەوەك لەشیان برزێ و تووشی نەخۆشی بن بەدرێژایی مانەوەیان لەو ئەشکەوتەدا .

﴿ وَ كَلْبُهُمْ باسِطٌ ذِراعَيْهِ بِالْوَصِيْدِ ﴾ وەسەگی ئەو لاوانە هەر دوو دەستی ڕاکێشابوو لەبەردەم ئەئشکەوتەکەدا بەوێنەی پاسەوانێکی دڵسۆز و دەرگەوانێکی دڵپاك ودەست پاك .

﴿ لَوْ أطَّلَعْتَ عَلَيْهِمْ لَوْ ولَّيتُ مِنْهُمْ فِراراً ﴾ ئەگەر تۆو هەمووکەسانیتر ئاگاداریتان پەیدابکدرایە بە سەر ئەولاوانەدا لەو ئەشکەوتەدا تەماشایان بکردنایە بەڕاستی پشتتان ئەکردە ئەوان بە ڕاکردنێکی زۆر توند لەبەرترس و سامناکی ئەو جێگەیە .

﴿ ولَمَلِئْتَ رُعباً ﴾ وە تۆو کەسانێکی تر دڵیان پڕئەبوو لەترسی بەچاوییکەوتن ئەوان، چونکە ئەو جێگەیە چۆڵ و دوور لەئاوەدانی بوو کاری بەوجۆرە زۆر سەرسوڕێنەر بوو شتی وانەبینرابوو .

وَكَذَٰلِكَ بَعَثْنَٰهُمْ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيْنَهُمْ ۚ قَالَ قَآئِلٌ مِّنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ ۖ قَالُواْ لَبِثْنَا يَوْمًا أَوْ بَعْضَ يَوْمٍ ۚ قَالُواْ رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثْتُمْ فَٱبْعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمْ هَٰذِهِۦٓ إِلَى ٱلْمَدِينَةِ فَلْيَنظُرْ أَيُّهَآ أَزْكَىٰ طَعَامًا فَلْيَأْتِكُم بِرِزْقٍ مِّنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلَا يُشْعِرَنَّ

بِكُمْ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمْ إِن يَظْهَرُوا عَلَيْكُمْ يَرْجُمُوكُمْ
أَوْ يُعِيدُوكُمْ فِي مِلَّتِهِمْ وَلَن تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا ﴿٢٠﴾
وَكَذَٰلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللَّهِ حَقٌّ وَأَنَّ
السَّاعَةَ لَا رَيْبَ فِيهَا إِذْ يَتَنَازَعُونَ بَيْنَهُمْ أَمْرَهُمْ فَقَالُوا
ابْنُوا عَلَيْهِم بُنْيَانًا رَّبُّهُمْ أَعْلَمُ بِهِمْ قَالَ الَّذِينَ غَلَبُوا عَلَىٰ
أَمْرِهِمْ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيْهِم مَّسْجِدًا ﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَاثَةٌ
رَّابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُونَ خَمْسَةٌ سَادِسُهُمْ كَلْبُهُمْ رَجْمًا
بِالْغَيْبِ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثَامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ قُل رَّبِّي أَعْلَمُ
بِعِدَّتِهِم مَّا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا قَلِيلٌ فَلَا تُمَارِ فِيهِمْ إِلَّا مِرَاءً ظَاهِرًا
وَلَا تَسْتَفْتِ فِيهِم مِّنْهُمْ أَحَدًا ﴿٢٢﴾

﴿ وَكَذٰلِكَ بَعَثْنَاهُمْ لِيَسْأَلُوا بَيْنَهُمْ ﴾ وەهەر بەو جۆرەی ئێمە ئەو لاوانەمان خەواند ئێمە ئەوانمان بێدار کردەوە دوای ئەو ماوە دوورودرێژە نەلەشیان گۆڕابوو نەبەرگەکانیان کۆنە بوبو، بێگومان ئەوانە هەمویان بەگوێرەی توانای ئێمە بو، لەبەرئەوەی ئەو لاوانە پرسیار بکەن لەنێوان خۆیانان لەبەسەرهاتی خۆیان و لەئەندازەی ماوەی مانەوەیان لەوئەشکەوتەدا هەتا خۆیان و دانیشتوانی شارەکان توانای خوایان بۆ دەرکەوێ و بزانن هەر بەوجۆرەیش خوا مردووان زیندوو ئەکاتەوە .

پرسیار/ خـوای مـەزن لـەئایـەتی (١٢) دا ئەفـەرموێ: ئێمـە ئـەو لاوانـەمان زینـدوو کردنەوە لـەبەرئەوەی ماوەی مانەوەیان لـەو ئەشکەوتەدا بزانرێ، لـەم ئایەتەدا ئەفـەرموێ: لـەبەرئەوەی پرسیار لـەیەکتری بکەن، ئەو دووئایەتە چۆن دژی یەکتر نین ؟.

وەلام/ هیچ دژایەتیە لـەنێوان ئەو دووئایەتەدا نیـە، چونکـە خـوای مـەزن دانیشـتوانی ئەشکەوتەکەبێدار ئەکاتەوە لـەبەر دووشت: بەئایەتی یەکەم ئاماژە ئەکا بۆ ئـەو مەبەسـتە، بەم ئایەتەیش ئاماژە ئەکا بۆلای ئەمەی ئێرە .

﴿ قَالَ قائِلٌ مِنْهُمْ كَمْ لَبِثْتُمْ قالُوا يَوْماً أَوْ بَعْضَ يَومٍ ﴾ یەکێ لـەو لاوانە و گەورەکـەیان ووتی: چەند ماوەیە ئێوە ماونەتەوە لـەم ئەشـکەوتەدا، ووتیـان: ڕۆژێ دووایـی تەماشـای یەکیان کرد و خـۆر هێشـتا ئـاوا نـەبووە، ووتیـان. یـا هـەندێ لـەڕۆژ ماوینەتـەوە لـەم ئەشکەوتەدا، دوایی یەکە یەکە تەماشای خۆیانیان کرد نینۆك و موی سەریان درێـژ بـووە بۆیان دەرکەوت زۆرتر لـەڕۆژێ ماونەتەوە، بۆیە .

﴿ قالُوا رَبُّكُمْ أَعْلَمُ بِما لَبِثْتُمْ ﴾ هـەندێ تریـان ووتیـان: پـەروەردگاری ئێـوە زانـاترە بەئەندازەی ئەو ماوەیە ماونەتەوە، خۆمان ئاگادارین زۆرمان برسیە .

﴿ فَابْعَثُوا أَحَدَكُمْ بِوَرِقِكُمْ هذهِ إِلى المدينةِ فَلْيَنْظُرْ أَيُّها أَزْكى طَعاماً ﴾ دوایی ئێوە ڕەوانـە بکەن یەکێ لـە خۆتان بەم دراوە زیوەی خۆتانەوە بۆ لای شـاری ئەفسـوس، دوایـی ئـەو کەسە تەماشا بکا لای چ کەسێ لـەدانیشتوانی ئەو شارە خواردەمەنی ڕەواو پاکی هـەبوو بیکڕێ .

﴿ فَلْيَأْتِكُمْ بِرِزْقٍ مِنْهُ وَلْيَتَلَطَّفْ وَلايُشْعِرَنَّ بِكُمْ اَحَداً ﴾ دوایی ئەو کەسە بهێنێ بۆ ئێوە خواردەمەنیە لـەو خواردەمەنیە پاك و ڕەوایە و پێویسـتە ئـەو کەسـە نـەرمی بەکاربـهێنێ لـەکڕینی ئەو خواردەمەنیە و نەخەڵەتێ و لـەڕێگەدا لـەسـەر خـۆ بـڕوا و سـەرنجی کـەس ڕانەکێشێ و هیچ یەکێ بەو کەسە نەزانێ و هەستی پێ‌نەکا .

﴿ إِنَّـهُمْ إِنْ يَظْـهَرُوا عَلَيْكُـمْ يَرْجُمُوكُـمْ أَوْ يُعِيدُوكُـمْ فِـي مِلَّتِـهِمْ ﴾ بەڕاسـتی ئەگـەر دانیشتوانی شار بەجێگەی ئێوە بزانن و ئاگاداری پەیدا بکەن بەسەر ئێـوەدا بـەردەبارانتان ئەکەن و ئەتان کوژن یا ئەتان گێڕنەوە بۆ ئایینی خۆیان و بێ‌باوەڕتان ئەکەن بـەزۆر و بـە لێدان .

﴿ وَلَنْ تُفْلِحُوا إِذًا أَبَدًا ﴾ وەئێوە لەمەو پاش ڕزگارتان نابێ لەسزای خوا ئەوکاتە بگەڕێنەوە بۆ لای ئایینی ئەوان هەتا هەتایە، ئەو لاوانە نەیان وەزانی دانیشتوانی ئەو شارە جگەی ئەوانەی پێشوون و باوەڕدارن.

بۆ زانین: کاتێ ئەو کەسە چوو بۆ نێو شار بۆ کڕینی خواردەمەنی و خۆی ئەپاراست لەوەی هەستی پێبکەن بەو جۆرەی هاوڕێکانی ئامۆژگاریان کرد. بەڵام کوتوپڕ تووشی شتێ بو لەگومان‌دا نەبو، چونکە کاتێ پارەکەی دایە دەستی خاوەن خواردەمەنیەکە لێی ووردبویەوە ووتی: ئەم دراوە کۆنە دراوی کاتی دەقیانووسەو کەس مامەڵەی پێناکا، خاوەن دراوەکە ووتی: چۆن لەدوێنێوە تائەمڕۆ جیهان گۆڕاوە، ئەو هەواڵە بڵاوبویەوە بەناو دانیشتوانی شاردا، کاتێ پرسیاریان لێکرد هەواڵی دا بەوان من و هاوڕێکانم بۆ پاراستنی ئایینی خۆمان لە پاشای ستەماکار پەنامان بردە لای ئەو ئەشکەوتە، هەندێ لەو کەسانەی لەوێ بوون ووتیان: بەڵێ بیستومانە تاقمێ لەکاتی کۆنا هەڵهاتوون بۆ پاراستنی ئایینی خۆیان لە ستەمی پاشایە ناوی دەقیانووس بوە کەخاوەنی ئەم وێنەیە لەسەر ئەم دراوە و پەنایان بردوە بۆلای ئەشکەوتێ لەوانەیە ئەمانە ئەو تاقمە بن، دوایی دانیشتوانی شار ڕایان کرد بۆ لای ئەشکەوتەکە، خاوەن دراوەکە لەپێشا چو بۆ لای هاوڕێکانی و ئەو هەواڵەی بۆ گێڕانەوە، دوایی کاتێ بەسەرهاتەکەیان دەرکەوت و بەکارەکەیان زانرا لەخوا پاڕانەوە و داوایان لەخوا کرد ئەوەی چاکە بۆیان بکا، کاتێ پاڕانەوەکانیان کۆتایی پێ هات خوا هەمویانی مراند و گیانی پاکیان چویەوە بۆ لای خوا، دوایی دانیشتوان مزگەوتێکیان بەسەریانەوە دروست کرد. بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو باسانە و هەندێ ئاگاداری لەتوانای خوا، خوا ئەفەرموێ:

﴿ وَكَذَلِكَ أَعْثَرْنَا عَلَيْهِمْ لِيَعْلَمُوا أَنَّ وَعْدَ اللهِ حَقٌّ ﴾ وەهەر وەك بەوجۆرەی ئێمە ڕاغویی ئەو لاوانەمان زۆر کرد بۆیان و دڵمان بەهێز کردن و ئەوانمان خەواندو لەپاشا بێدارمان کردنەوە، هەروایش ئێمە دانیشتوانی ئەو شارەوە دراوسێکانیانمان ئاگادرکرد لەبەسەرهاتی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە، بەڕاستی وبەبێگومان لەبەرئەوەی کەسانێکی ئەوتۆ ئاگاداریان پەیداکرد بزانن کەبەڕاستی بەڵێن دانی خوا بەزیندوو کردنەوەی مردوان ڕاست و بێگومانە .

﴿ وَأَنَّ الْسّاعَةَ لارَيْبَ فِيْها ﴾ وەبزانن بەڕاسـتی ڕۆژی دوایـی گومـان لـەبونیدا نیـە، چونکە هەرکەسێ توانای بەسەر خەواندنی ئەو لاوانە بێ بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ و لەش و گیانیان پارێزراوبێ لەڕزان و بیـان هێڵێتـەوە بـەبێ خـواردن باشـتر ئـەتوانێ مـردووان زیندوو بکاتەوە لەپاشەڕۆژدا .

﴿ إِذْ يَتَنازَعُونَ بَيْنَهُمْ اَمْرَهُمْ ﴾ دانیشتوانمان بێدارکـردەوە لـەکاتێکا دانیشـتوانی شـار ودراوسێی ئەو ئەشکەوتە لەناو خۆیانان بیرو بۆچونیان دژی یەکتری بـو لـەبارەی ئـایینی خۆیانەوە: ئایا دانیشتوانی ئـەو ئەشـکەوتە خـەووتون یـامردوون ئایـا مـردون بەلـەش و گیانەوە زیندوو ئەکرێنەوە یا بـەگیانی تەنـها، بـۆ ئـەوەی ڕوون بێتـەوە بۆیـان بەلـەش و بەگیانە. هەروەها بـیرو بۆچوونـی دانیشـتوان جیـاواز بـو ئایـا خـانوێ دروسـت بکـەن بەسەریانەوەو بیکەن بەگوندێ یا مزگـەوتێ دروسـت بکـەن بەسـەریانەوەو نوێـژی تێـدا بکرێ، بۆ ڕوون کردنەوەی ئەو مەبەستە خوا ئەفەرموێ:

﴿ فَقالُوا ابْنُوا عَلَيْهِمْ بُنْيانـاً رَبُّـهُمْ أَعْلَـمْ بِـهِمْ ﴾ دوایـی کاتـێ خـوا دانیشـتوانی ئـەو ئەشکەوتەی مراند هەندێ لەدانیشتوان ووتیان: ئێوە دروست بکەن خـانوێ بەسـەریانەوە وبیکەن بەگوندێ، پەروەردگاری ئەو ئەو کەسانە بیرو باوەڕیان جیـاوازە زانـاترە لـەوان لەبارەی باو پیری ئەو لاونەوەو زاناتروە لەبەسەرهاتیان. کەواتە واز لە نـاکۆکی خۆیـان بهێنن  وهەمو کارێ هەواڵەی خوای بکەن .

﴿ قـالَ الَّذِيـنَ غَلَبُـوا عَلـى أَمْرِهِـمْ لَنَتخِـذَنَ عَلَيْـهِمْ مَسْجِداً ﴾ وەکەسـانێکی ئـەوتۆ سەرکەوتبون بەسەر کاروباری دانیشتوانی و سەرکەوتن بەسـەریانا لـەگفتوگۆدا ووتیـان :بەڕاستی ئێمە دروست ئەکەین مزگەوتێ بەسەریانەوە بۆ نوێژ کردن لەناویدا، بـیرو ڕای ئەمانەی دوایی سەرکەوت و مزگەوتێکیان بەسەریانەوە دروسنت کرد .

پێشەوا ڕازی و تەبەرسی ئەڵێن: کاتێ نوێنەرانی گاورەکـانی نـەجران هاتنـە خزمـەت پێغەمەر باسی دانیشتوانی ئەشکەوتەکە هاتە باسەوە، یەعقوبیەکان ووتیان: ژمارەیـان سـێ کەسن و چوارەمیان سەگەکەیانە، ئەستوریەکان ووتیان: پێنج کـەس بـوون و شەشـەمیان

سەگەکەیانە، دوایی موسڵمانان ووتیان: حەوت کەسن و هەشتەمیان سەگەکەیانە. دوایی زۆرترینی زانایان ئەڵێن: حەوتن و هەشتەمیان سەگەکەیانە. خوای مەزن بیرو بۆچوونی ئەو کەسانەی ئەڵێن: سیانن یا پێنج ئەفەرموێ: فڕێدانی هەواڵێکە پەنهان و نەزانراوەو کەس ئاگای لێ نیە. کەواتە پێویستە حەوت بن و ڕاستی ئەمەیانە، چونکە خوا نافەرموێ: فڕێدانی کارێکی نهێنیە .

بۆ ڕون کردنەوەی ژمارەی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە خوا ئەفەرموێ:

﴿ سَيَقُولُونَ ثَلاثَةٌ رابِعُهُمْ كَلْبُهُمْ وَيَقُولُـونَ خَمْسَـةٌ سادِسُـهُمْ كَلْبُـهُمْ رَجماً بِـالْغَيْبِ ﴾ هەندێ تاقم ئەڵێن: لاوانی ناو ئەو ئەشکەوتە سێ کەسن و چوارەمیان سەگەکەیانەو، تاقمێ تریان ئەڵێن: دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە پێنج کەسن و شەشەمیان سەگەکەیانە، ئەو دووبیرو بۆچوونانە گفتوگۆیەکە لەنەزانینەوە هاتوە فڕێدانی گومانە بۆ لای بۆشانی.

﴿ وَيَقُولُونَ سَبْعَةٌ وَثامِنُهُمْ كَلْبُهُمْ ﴾ وەتاقمێ تریان بەهۆی فەرمودەی پێغەمەرانەوە ئەڵێن: ئەو لاوانە حەوت کەس بوون و هەشتەمیان سەگەکەیانە. ناوی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە بەم جۆرەیە: یملیفحا، مکشلمینا، مرنوش، دبرنوش، شاذنوش. ناوی شوانەکە کفشططویش، ناوی سەگەکەیان: قمطره .

﴿ قُلْ رَبِّي أَعْلَمُ بِعِدَتِهِمْ ما يَعْلَمُهُمْ إلا قَلِيْلٌ ﴾ تۆ بڵێ پەروەردگاری من زاناترە لەهەمو کەسێ بە ژمارەی دانیشتوانی ئەشکەوتەکە مەگەر کەمێ لەئادەمیزاد بزانێ ژمارەیان چەندە، ئەو کەمانەیش بریتین لەو زانایانە بیرو بۆچونیان وایە حەوت کەسن و هەشتەمیان سەگەکەیانە، لەبەرئەوەی خوای مەزن لەدوایی بیرو بۆ چوونی دووانەکەی تر فەرمویەتی: ﴿ رَجْماً بِالْغَيْبِ ﴾ .

﴿ فَلا تُمار فِيْهِمْ إلا مِراءً ظاهِراً ﴾ دوایی تۆ گفتو گۆ مەکە لەبارەی ژمارەی ئەو لاوانەوە لە گەڵ خاوەن نامەکان مەگەر بەگفتوگۆیە بەئاشکرایی خوێنراوەتەوە بەسەر تۆدا و بەقولی بۆی دامەچوە، هەر ئەوەیە ئێمە باسمان کردوە، نە وەلامیان بدەرەوەو نەبەدرۆیشیان بخەرەوە .

﴿ وَلا تَسْتَفِتْ فِيْهِمْ مِنْهُمْ أحَداً ﴾ وە تۆ پرسیار مەکە لە هیچ کەسیٚ لە ئادەمیزاد و خاوەن نامەکان لەبارەی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە تۆ ئەوەندەت بەسە کە خوا ڕونی کردوەتەوە .

لەکۆتایی ئەو باسانەدا ئەم بیرو بۆ چونە جیاوازانە باس ئەکەین: ئادەمیزاد بیرو بۆچونیان جیاوازە ئایا ئەو ئەشکەوتە لە چ جیٚگەیەکە: هەندیٚ ئەلیٚن: لەفەلەستینە و لەنزیك بەیتولموقەدەسە. هەندیٚ تریان ئەلیٚن: لەموسلە. هەندیٚ تریان ئەلیٚن: لە ئەندەلوسە لەلای غەرناتەوە، چەندین بیرو بۆچوونی تر. ئایا ڕوداوی ئەو لاوانە لەکاتی عیسادا بوە یادوای عیسا؟ ئەو خواردەمەنی‌یە بۆی ڕۆیشتن بیکرن خورما بو یا میٚوژ یا گۆشت بو. ڕەنگی سەگەکەیان چۆن بوە: گەنم ڕەنگ بوە یا بەلە. کاوی یا ڕەش بوو یا سپی. چەندین بیرو بۆچوونی تر، دوایی جیٚگەی سەر سوڕمان نیە بیروباوەڕیان جیاوازبیٚ. هەمووشتیٚ هەوالەی خوایە، پیٚویست نیە ئیٚمە بیانزانین .

دوای ئەوەی خوای مەزن ئەو باسانەی بۆ پیٚغەمەر ﴿ﷺ﴾ ڕون کردووە، ئامۆژگاری ئەکا و ئەفەرمویٚ: مەلیٚ: ئەو کارە ئەکەم هەتا نەلیٚی: ( إنْ شاءَ اللهِ ) وەك ئەفەرمویٚ:

وَلَا تَقُولَنَّ لِشَاْىْءٍ إِنِّي فَاعِلٌ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُ ۚ وَٱذْكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلْ عَسَىٰٓ أَن يَهْدِيَنِ رَبِّى لِأَقْرَبَ مِنْ هَٰذَا رَشَدًا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُوا۟ فِى كَهْفِهِمْ ثَلَٰثَ مِا۟ئَةٍ سِنِينَ وَٱزْدَادُوا۟ تِسْعًا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعْلَمُ بِمَا لَبِثُوا۟ ۖ لَهُۥ غَيْبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ۖ أَبْصِرْ بِهِۦ وَأَسْمِعْ ۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِىٍّ وَلَا يُشْرِكُ

فِي حُكْمِهِۦٓ أَحَدًا ﴿٢٦﴾

﴿ ولا تقولن لشيء إني فاعل غدا إلا أن شاء الله ﴾ وەتۆ بۆ هیچ شتیك و بۆ هیچ کاری نیازت وابی ئەو شتە بکەی مەلی: بەراستی من بەیانی ئەو شتە ئەکەم مەگەر بلی (إن شاء الله ) ئەگەر خوا ئارەزووی هەبی ئەیکەم. ئەەو ئایەتە لەوەوە هاتوەتە خوارەوە کاتی عەرەبەکان پرسیاریان کرد لەپیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾: ئایا دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە بەسەرهاتیان چۆن بوە ؟ ئەو پیاوە زۆربەی زەوی داگیر کرد چ کەسی بوە؟ پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ بەبی ئەوەی بلی: (إن شاء الله ) ووتی: بەیانی وەلامتان ئەدەمەوە، بەو بۆنەوە چەند رۆژ سروشی بۆ نەهاتە خوارەوە. هەمو ئادەمیزادی جیگەیە بۆئەوەی زۆر شتی لەبیر بچیتەوە. بەتایبەتی لەکاتی نەخۆشیدا ولەکاتی خۆشیدا و لەکاتی رووداوی زۆردا و کاری زۆریدا، زۆرجارانیش وائەبی ناوی خوا لەبیر ناکا، خوای مەزن فیرمان ئەکاو ئەفەرموی:

﴿ واذكر ربك إذا نسيت ﴾ وەتۆ باسی ئارەزووی پەروەردگار بکەو بلی: (إن شاء الله) هەرکاتی تۆ لەبیرت چوبو (إن شاء الله ) بکەی و دوایی بیرت کەوتەوە بیلی .

﴿ و قل عسى أن يهدين ربي لأقرب من هذا رشدا ﴾ وەتۆ بلی ئومید وایە کە پەروەردگاری من شارەزایی من بکا بۆ لای شتی چاکتر وبەسود تر بی لەو شتەی من لەبیرم چوەتەوە (إن شاء الله) ی لەسەر بکەم بەشارەزایی کردنیکی گەورە، چونکە لەبیر چونەوەی هەندی کاردا سودی زۆری تیدایە. یانی من ئومیدم وایە بەخوای مەزن بەلگەی زۆر گەورەتر دابنی لەزانینی بەسەرهاتی دانیشتوانی ئەو ئەشکەوتە لەسەر راستی پیغەمەرایەتی من وەك هەوالدان بە بەسەرهاتی پیغەمەران و هەوالدان بەشتی نهینی و نادیار و روداوی پەیدا ببی دوایی .

﴿ و لبثوا في كهفهم ثلاثمئة سنين و ازدادوا تسعا ﴾ وە ئەو لاوانە مابونەوە لەو ئەشکەوتەی خۆیانا سیسەد (٣٠٠) لەلایەن سالەوەو لاوەکان نۆسالی تریان زۆر کرد

لەسەر ئەو ماوە بەیانی سیسەد و نۆسال مابونـەوە لـەو ئەشکەوتەدا بەخـەوتوویی لـەو رۆژەوە چوبونە ناوی هەتا ئەو کاتەی بیدار بوونەوەو دانیشتوان ئاگاداربون .

پرسیار/ لـەبەر چ شتی خوا فەرموی: نۆسالی تریان زۆرتر کرد و یەکسـەر نەیفـەرمو: سی سەد و نۆسال مانەوە ؟

وەلام/ فەرمودەی خوا ( و ازدادوا تسعا ) ئاماژە بۆ ئەوە ئەکا کە ( ٣٠٠ ) سال ئـەکا بەسالی هەتاوی. سیسەد و نۆ سال ئەکا بەسالی مانگی، چونکـە جیـاوازی نیوانیـان نـۆ سالە بۆ هەرسەد سال سی سالە .

﴿ قل الله أعلم بما لبثوا ﴾ تۆ بلی: خوا زاناترە لەو کەسانە بـیرو بۆچونیـان جیـاوازە لەماوەی مانەوەی ئەو لاوانە لەو ئەشکەوتەکەدا، چونکە هەر خوا دروسـتی کـردوون و خەواندونی و بیداری کردونەتەوەو دوایی مراندونی .

﴿ له غيب السـماوات والأرض أبصـر بـه و أسـمع ﴾ بـۆ خوایـە زانینـی نهینیـەکانی ئاسمانـەکان و زەوی لەدانیشـتوانیان و هیـچ بونـەوەری لـەخوا پەنـهان نیـــە، جیگـــەی سەرسورمانە شتی خوا ئەی بینی و شتی ئەی بیسی. خوای مەزن بە رستەی سەرسورینەرە باسی فەرموە لەبەرئـەوەی بزانـری زانسـتی خـوا زۆر دوورە لەزانسـتی گـوی گـران و بینەران چونکە شتی بچووك و گەروەو نهینی و ئاشـکرا ئـەبینی و ئەبیسـی دوور بـن یـا نزیك.

﴿ ما لهم من دونه من ولي و لا يشرك في حكمه أحدا ﴾ بـۆ دانیشـتوانی ئاسمانـەکان وزەوی هیچ کەسی نیە لەجگەی خوا سـەردار و بەریوەبـەری کاریـان بـی و خـوا نـەی کردوە بەهاوبەشی خۆی هیچ یەکی لەفەرمانەکانی خۆیا .

وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾

وَٱصْبِرْ نَفْسَكَ مَعَ ٱلَّذِينَ يَدْعُونَ رَبَّهُم بِٱلْغَدَوٰةِ وَٱلْعَشِيِّ يُرِيدُونَ وَجْهَهُۥ ۖ وَلَا تَعْدُ عَيْنَاكَ عَنْهُمْ تُرِيدُ زِينَةَ ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا ۖ وَلَا تُطِعْ مَنْ أَغْفَلْنَا قَلْبَهُۥ عَن ذِكْرِنَا وَٱتَّبَعَ هَوَىٰهُ وَكَانَ أَمْرُهُۥ فُرُطًا ﴿٢٨﴾ وَقُلِ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ ۖ فَمَن شَآءَ فَلْيُؤْمِن وَمَن شَآءَ فَلْيَكْفُرْ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا لِلظَّٰلِمِينَ نَارًا أَحَاطَ بِهِمْ سُرَادِقُهَا ۚ وَإِن يَسْتَغِيثُوا۟ يُغَاثُوا۟ بِمَآءٍ كَٱلْمُهْلِ يَشْوِى ٱلْوُجُوهَ ۚ بِئْسَ ٱلشَّرَابُ وَسَآءَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٢٩﴾

﴿ و اتل ما أوحي إليك من كتاب ربك لا مبدل لكلماته ﴾ وە تۆ بخوینە شتی بەسروش نیرراوە بۆ لای تۆ لەنامەی پەروەردگاری خۆت، گوی مەگرە بۆ ئەو کەسانەی ئەلین: تۆ جگەی ئەم قورئانە بهینە یا بیگۆرە بەجۆری تر، هیچ کەسی نیە لەفەرمودەکانی پەروەردگاری تۆ بگۆری و لەتوانای کەسیشا نیە ئەو گۆرانە. کەواتە ئەو شتەی خوا ناردویەتی بۆ لای تۆ رایگەیەنە بە ئادەمیزاد لەو شتانەی پەیوەندارن بە وانەوە، وینەی دەنگ و باسی لاوانی ئەو ئەشکەوتە و جگەی ئەوانیش، تۆ هەر لەسەر بروای بیگومانی خۆت بە، بەراستی هاتوچۆی رۆژانی رابووردو روداوەکان سەلماندویانە کە موحەمەد دیاریەکی زۆر گەورەیە بۆ ئادەمیزاد و پەیامەکەی لەئاسمانەوە نیراوە بۆ لای دانیشتوانی سەر زەوی و هەتا رۆژگار بەرەو پیش کەوتن بروا چاکتر ئەو راستیانە دەرئەکەون و ئەسەلمینرین .

﴿ و لن نجد من دونه ملتحدا ﴾ وە تۆ دەستت ناكەوی لەجگەی خوا هیچ پەناگایە ئەگەر تۆ لابدەی بۆ لایی و لەپەناگای خوا دور بكەویتەوە لەكاتی تەنگانەدا .

ئەگیرنەوە ( عویەینە فەزاری ) كە یەكی بوە لەسەرۆكەكانی قورەیش چو بۆ خزمەت پیغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ كۆمەلی لە هاوریكانی پیغەمەری بینی كە لەناویان ( سەلمانی فارسی ) تیدا بو كە سەرپیچیكی بەسەرەوە بو ئارەقی دەردا بو گەلایەكی خورمای بەدەستەوە بو، عویەینە ووتی بەپیغەمەر: ئایا بۆنی ئەم كەسانە ئازارت نادەن. ئیمەی سەرۆكەكانی قورەیش ئەگەر موسلمان ببین زۆر كەس چاومان لی ئەكا و موسلمان ئەبن، هەر ئەم لات و لوتانە نایەلن ئیمە دوای تۆ بكەوین تۆ ئەوان دور بخەرەوە لەخۆت هەتا ئیمە دوات بكەوین، یا هیچ نەبی جیگەی ئەوان لەئیمە جوی بكەرەوە، بەر لەوەی پیغەمەر وەلامیان بداتەوە خوا فەرموی:

﴿ و اصبر نفسك مع الذين يدعون ربهم بالغداة و العشي يريدون وجهه ﴾ وەتۆ دەروونی خۆت رابگرە لەگەل كەسانیكی ئەوتۆ پەروەردگاری خۆیان ئەپەرستن بە بەردەوامی هەمو بەیانی وئیواران رەزامەندی خوایان ئەیەوی و مەبەستیان هەر خوایەو جگەی خوایان مەبەست نیە .

﴿ و لا تعد عيناك عنهم تريد زينة الحياة الدنيا ﴾ وەتۆ چاوەكانی خۆت لەوان لامەدەو تەماشای جگەی ئەوان بكەی و تۆ مەبەستت جوانی زیندەگانی جیهان بی و بتەوی لەگەل پیاوانی جیهانا دانیشی بیر لە پلەوپایە و سامان بكەیتەوە .

﴿ و لاتطع من أغفلنا قلبه عن ذكرنا ﴾ وەتۆ پەیرەوی و فەرمانبەرداری كەسی مەكە ئیمە دلی ئەومان بی بەش وبیهۆش كردوە لەیاد و پەرستنی ئیمە، وەك ئەوكەسانەی تازە موسلمانن وئەلین بەتۆ: لە سەرەوەی جیگەوە دانیشەو ئەو هەژار و پیس و پۆخلانە لەخۆت دور بخەرەوە، هەتا ئیمەی سەرۆكی قورەیش لەگەل تۆ دانیش .

﴿ و اتبع هواه وكان أمره فرطا ﴾ وە ئەو كەسە ئیمە بی ئاگامان كردوە دوای ئارەزووی دەرونی پیسی خۆی كەوتوەو كارەكەی لەسنوور دەرچوەو جگەی خۆی بەبی نرخ دائەنی. ئەبی بزانری ئارەزوی ئەو كەسە ئەبیتە هۆی خەفەتی خۆی و لەناو بردنی خۆی .

﴿ و قل الحق من ربكم ﴾ وەتۆ بلی بەو کەسانە ئیمە دلمان بی ئاگا کردون لەئاستی راستی: راستی ئەوەیە لەلایەن پەروەردگاری ئیوەۆ دیت نەك ئەو کەسە داوای ئەکا، سەرکەوتن و لادان لەریگەی راست بەدەستی خوایە، ئایینی ئیسلام و قورئانی خوا راستن .

﴿ فمن شاء فليؤمن ومن شاء فليكفر ﴾ دوایی هەر کەسی ئارەزۆی هەیە با باوەر بهینی بەو راستیەو هەر کەسی ئارەزۆی هەیە باباوەر نەهینی، ئادەمیزاد خۆی سەربەستە و کەس زۆری لی ناکا، دوا رۆژی بەستراوە بە بەراوردی خۆیەوە و خۆی بەرپرسیارە. بۆ نمونە پیاوی ژنیکی جوان ئەبینی مەیلی بۆ لای پەیدا ئەبی و ئایین پیویستی کردوە لەو کاتانەدا خۆی بپاریزی و دوای ئارەزۆی خۆی نەکەوی و بیگومان ئەوەیش لە توانای خۆیایەتی .

﴿ إنا أعتدنا للظالمين نارا أحاط بهم سرادقها ﴾ بەراستی ئیمە ئامادەمان کردوە بۆ ستەمکاران ئاگری دەوری ئەوانی دا و چادری ئەو ئاگرە و سزاکەی ئەم لاولای گرتوون.

﴿ و إن يستغيثوا يغاثدا بماء كالمهل يشوي الوجوه بئس الشراب و ساءت مرتفقا﴾ وە ئەگەر لەتینویدا داوای ئاو بکەن یاریدەیان ئەدری و وەلامیان ئەدریتەوە بەئاوی بەوینەی رونی گەرمکراوی زەیتون و تواوەی مس و ئاسن رومەتیان ئەبرژینی و ئەیسوینی بەگەرمای زۆری ئەو ئاوە، خراپ خواردنەوەیەکە ئەو ئاوە تۆواوەیەو خراپ پشتیەکە ئەو ئاگرە شانی لەسەر دائەنین بۆ پشودان .

دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ستەمکاران و جۆری سزادانی ئەوانی کرد باسی پیاو چاکان و پاداشت و جۆری پاداشتیان ئەکاو ئەفەرموی :


إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ إِنَّا لَا نُضِيعُ أَجْرَ مَنْ أَحْسَنَ عَمَلًا ﴿٣٠﴾ أُوْلَٰٓئِكَ

لَهُمْ جَنَّٰتُ عَدْنٍ تَجْرِى مِن تَحْتِهِمُ ٱلْأَنْهَٰرُ يُحَلَّوْنَ فِيهَا مِنْ أَسَاوِرَ مِن ذَهَبٍ وَيَلْبَسُونَ ثِيَابًا خُضْرًا مِّن سُندُسٍ وَإِسْتَبْرَقٍ مُّتَّكِـِٔينَ فِيهَا عَلَى ٱلْأَرَآئِكِ ۚ نِعْمَ ٱلثَّوَابُ وَحَسُنَتْ مُرْتَفَقًا ﴿٣١﴾

﴿ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات إنا لا نضيع أجر من أحسن عملا ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ باوەریان هیناوە بەقورئان و پیغەمەر و کردەوە چاکەکانیان کردوە بەراستی ئیمە لەناو نادەین پاداشتی کەسی کردەوەی چاکی کردبی .

﴿ أولئك لهم جنات عدن تجري من تحتها الأنهار يحلون فيها من أساور من ذهب ﴾ ئەو پیاو چاکانە بۆیان هەیە چەندین بەهەشتی بەرین و بەردەوام بۆ دانیشتن ئەچی بە ژیر درەختەکانیانا و بەم لاولای کۆشکەکانیانا چەندین روباری ئاوی شیرین و پوختە ئەرازینرینەوە لەو بەهەشتانەدا بە چەندین بازنەی دروست کراو لەزیر .

﴿ و يلبسون ثيابا خضرا من سندس و إستبرق متكئين فيها على الأرائك ﴾ وە ئەپۆشن و ئەکەنە بەری خۆیان چەندین بەرگیکی سەوز لەئەوریشمی تەنك و چرو پر دائەنیشن لەو بەهەشتانەدا وپال ئەدەنەوە لەسەر کورسیەکان بەگوزەرانیکی خۆشەوە .

﴿ نعم الثواب و حسنت مرتفقا ﴾ چاك پاداشتیکە ئە وبەهەشتانە بۆ رابواردن و چاك جیگەیەکە بۆ دانیشتن و پشودان .

لەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ بت پەرستانی روون بکاتەوە وینەو بەسەرهاتی باوەرداران و بی باوەران و بیان ترسینی لەکاری خراپ و موژدەیان بداتی لەسەر کردەوەی چاك، بۆیان رون بکاتەوە ئیوە چۆن داوا ئەکەن لەمن واز لە هەژاران بهینم و پاشەرۆژی سامان نەمانە و بەردەوام نابی ورووی خۆی ئەکا بۆ لای پیغەمەری خۆیی و ئەفەرموی:

وَٱضْرِبْ لَهُم مَّثَلًا رَّجُلَيْنِ جَعَلْنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيْنِ مِنْ أَعْنَٰبٍ وَحَفَفْنَٰهُمَا بِنَخْلٍ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُمَا زَرْعًا ﴿٣٢﴾ كِلْتَا ٱلْجَنَّتَيْنِ ءَاتَتْ أُكُلَهَا وَلَمْ تَظْلِم مِّنْهُ شَيْـًٔا ۚ وَفَجَّرْنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرًا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٌ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكْثَرُ مِنكَ مَالًا وَأَعَزُّ نَفَرًا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٌ لِّنَفْسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدًا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةً وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّى لَأَجِدَنَّ خَيْرًا مِّنْهَا مُنقَلَبًا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرْتَ بِٱلَّذِى خَلَقَكَ مِن تُرَابٍ ثُمَّ مِن نُّطْفَةٍ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلًا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّى وَلَآ أُشْرِكُ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٣٨﴾ وَلَوْلَآ إِذْ دَخَلْتَ جَنَّتَكَ قُلْتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّىٓ أَن يُؤْتِيَنِ خَيْرًا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرْسِلَ عَلَيْهَا حُسْبَانًا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصْبِحَ صَعِيدًا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوْ يُصْبِحَ مَآؤُهَا غَوْرًا فَلَن تَسْتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبًا ﴿٤١﴾

وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصْبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيْهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِىَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيْتَنِى لَمْ أُشْرِكْ بِرَبِّىٓ أَحَدًا ﴿٤٢﴾ وَلَمْ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٌ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾

لەئایەتی (٢٧) ی ئەم سورەتەدا باسی ئەوەمان کرد کـە بت پەرستان ئـەیان ووت: بەپیغەمەر کاتێ ئیمە باوەرت پی ئەهینین باوەردارانی هەژار دەربکەی یا بـۆ هەریەکـەمان جیگەیە دیاری بکەی، چونکە ئیمە گەورەین و ئەوان بەندەن، لەم ئایەتانەی دواییدا باسی دوو پیاومان بۆ ئەکا یەکیکیان ساماندارێکی تاوانبـار و یـەکی تریـان هـەژاریکی چـاك و باوەردار و ئەفەرموی:

﴿ و اضرب لهم مثلا رجلين جعلنا لأحدهما جنتين من أعناب ﴾ وە تۆ رون بکـەرەوە بۆ دانیشتوانی مەکە بەسـەرهات و وینـەی دوو پیـاوی سـامان دارو هـەژار گفتوگۆیـان لەگـەل یـەکتری ئـەکرد ئیمـە بەخشـیومان بەیـەکیکیان دوو بیسـتان لـەدرەختی تـری جۆراوجۆر .

﴿ و حففناهما بنخل و جعلنا بينهما زرعا ﴾ وە ئیمە بەخورما هەمو لایـەکی ئـەو دوو بیستانەمان پەرژین کردبوو گیرابومان لەنیوانیانا سەوزایی لـەهەمو جۆرو لەهـەمو رەنگـی بۆ خواردەمەنی و میوە لەهەمو کاتیکا زۆر بەجوانی رازاندبومانەوە .

زانایان بیریان جیاوازە ئایا ناوی ئەو دوو پیاوە چ ناوی بوون، لــە چ جیگەیـە بـوون، دیاری کردنیان مەبەسـت نیـە، ئـەوەی گرنگبـی و جیگـەی سـود بـی بەسـەرهاتی ئـەو دووپیاوانە پەیدا بوە .

﴿ كلتا الجنتين آتت أكلها ولم تظلم منه شيئا ﴾ ئەو دوو بیستانە هەریەكەیان ئەیان ڕەخسان خواردەمەنی و میوەی خۆیان و كەم نەبوەتەوە لەخواردەمەنیەكان هیچ شتیو بەگویرەی سورشت هەمو سالی بەرهەمی خۆیانیان ئەرەخسان .

﴿ و فجرنا خلالهما نهرا ﴾ وە ئیمە هەلمان قولاند لە ناوەراستی ئەو دوو بۆستانەدا روباری ئاو بۆ ئاودان و پاراوكردنەوەی ئە وبیستانە هەتا نزیكبی لە درەختەكانیانەو ئاویان بدەن بەبی ماندو بۆن و ئازار بۆ ئەوەی بەرهەمیان باشبی

﴿ و كان له ثمر ﴾ وە ئەو پیاوە ساماندارە بی باوەرە هەبیو دارایی تری جۆراوجۆر و دانەویلەی تر جگەی ئەو دوو بیستانانە و زیرو زیوو گەوهەر .

﴿ فقال لصاحبه و هو يجاوره أنا أكثر منك مالا و أعز نفرا ﴾ دوایی ئەو پیاوە ساماندار و بی باوەرە ووتی بە هاوری باوەردارەكەی خۆی و گفتوگۆی لەگەل ئەكرد: من دارایم لە تۆ زۆرترە و پیاوەكانم گەورەتر و تەواو ترن و كوری زۆرم هەیە .

﴿ و دخل جنته وهو ظالم لنفسه قال ما أظن ان تبيد هذه ابدا ﴾ وە ئەو پیاوە كە چوە ناو بیستانەكەیی و، ستەمی لەخۆی كردو خۆی بەگەورە دائەنا و خۆی هەلئەكیشا بەو سامانە زۆرەیەوە .

ووتی: من گومان نابەم كە ئەو بیستانە دوایی بی هەرگیز، كەچی بەگویرەی هەست جیهان وسامان و دارایی هەموی كۆتایی پی دی، كەواتە ئەو پیاوە یا خۆی گیل ئەكرد یا مەبەستی ئەوە بوو ئەو سامانە بەردەوام ئەبی لەماوەی تەمەنیا. بەگویرەی بیرو بۆچون وبەراوردی خۆی وای ئەزانی دارایی و پلە و پایە و منال و خزمەتكار زۆر جیگەی شانازیە. بەلام ئەو شتانە لای باوەرداران بی نرخە .

﴿ و ما أظن الساعة قائمة و لئن رددت إلى ربي لأجدن خيرا منقلبا ﴾ وە من گومان نابەم كاتی پاشەرۆژ هەبی و بیت بەو شیوەیە تۆ ئەیلی و بەراستی ئەگەر من بگەریمەوە بۆ لای پەروەردگار بەگویرەی گومانی تۆ كە ئەو رۆژە دیت بەراستی من دەستم ئەكەوی چاكتر گەرانەوە، چونكە بۆیە ئەم بیستانەی داومەتی لەپاشەرۆژدا چاكتر لەوەی بدا بە من، هەر من شایستەی ئە وچاكەیەم .

﴿ قال له صاحبه و هو يجاوره أكفرت بالذي خلقك من تراب ثم من نطفة ثم سواك رجلا ﴾ هاوری باوەردارەکە بەبی باوەرەکەی ووت و ئەو گفتوگۆی لەگەل ئەکرد: ئایا بۆ تۆ باوەرت بە کەسیکی ئەوتۆ نەهیناوە تۆی دروست کردوە لەخاك و لەپاشا لە دلۆپی ئاو لەلایەن باوکتەوە رژاوەتەنیو منالدانی دایکتەوە لەپاشا تۆ ریك و پیکی کردوی وتۆی کردووە بە پیاو و ئیستا تۆ باوەری پی ناهینی و سوپاسی خوا ناکەیی و لات وایە رۆژی دوایی نیە و نابی .

﴿ لكنا هو الله ربي و لا أشرك بربي أحدا ﴾ وە بەلام من ئەلیم هەر خوا پەروەردگاری من و دروستکەری منە و من هیچ کەسی ناکەم بە هاوبەش بۆ پەروەردگاری خۆم .

﴿ و لولا إذ دخلت جنتك و قلت ما شاء الله لا قوة إلا بالله ﴾ وە بۆچی کاتی چویتە ناو بیستانی خۆت و نەت ووت: خوا ئارەزۆ بکا هەمو شتی ئەکا و ئەم سامانە خوا داویە بەمن و نەت ووت: هیچ هیز و پشتیوانی نیە مەگەر هەر خوا و هەر خوا پاریزەری هەمو شتیکە و روداوی خراپ لائەبا .

﴿ إن ترن أنا أقل منك مالا و ولدا فعسى ربي أن يؤتيني خيرا من جنتك ﴾ ئەگەر تۆ من وائەبینی کە من دارایی و منالم لە تۆ کەمترە و بۆیە خۆت لەمن بەگەورەتر دائەنیی و خۆت هەلەئکیشی، دوایی ئومیدم وایە کە پەروەردگاری من ببەخشی بەمن چاکتر لەو بیستانەی تۆ بەهۆی نیازی پاکمەوە .

﴿ و يرسل عليها حسبانا من السماء فتصبح صعيدا زلقا ﴾ وە دوایی پەروەردگاری من رەوانە بکا بەسەر ئەو باخ وبیستانەی تۆدا کارەساتیکی دل تەزین بەوینەی هەورەگرمە و بایەکی گەرم و سەخت دوایی ئەو بیستانە بگەرینی بەزەوییەکی رەق ولوس وبی ئاو و ئادەمیزاد پییان هەلخلیسکی لەکاتی رۆیشتن بەسەریا .

﴿ أو يصبح ماؤها غورا فلن تستطيع له طلبا و أحيط بثمره ﴾ یا ئاوی بیستانەکەت بروا بەناو زەویدا و دەست و دۆلچە پیی نەگا، دوایی تۆ توانای ئەوەت نەبی هیچ شتی پەیدا بکەی بۆ گەرانەوەی ئەو ئاوەی چوەتە خوارەوە بەناو زەویدا، لەناوچو بەرو سامان و دارایی ئەو کەسە بی باوەرە .

﴿ فأصبح يقلب كفيه على ما أنفق فيها وهي خاوية على عروشها ﴾ دوایی هاوری بیباوەرەکەی چوە ناوی بیستانەکەی خۆی و دەستی ئەم دیو دیو ئەکرد لەخەفەتا و پەشیمان بویەوە لەسەر شتی سەرفی کردبو بۆ ئاوەدان کردنەوەی ئەو بیستانانەی لەکیسی چوو باخ وبیستانەکەی و درەختی تریکانی وکەپرەکانیان کەوتبونە سەر زەوی‌دا .

﴿ و يقول ياليتني لم أشرك بربي احدا ﴾ وەئەو پیاوە بی باوەرە ووتی: خۆزگایە من هاوبەشم دانەنایە بۆ پەروەردگاری خۆم هیچ کەسی هەتا ئەم باخ وبیستانانەم لەکیس نەچوایە. بەلام پەشیمان بونەوە لە دوای چ شتی و سوودی پی‌نەبەخشی ؟

﴿ و لم تكن له فئة ينصرونه من دون الله و ما كان منتصرا ﴾ وە بۆ ئەو بی باوەرە نەبوە تاقمی یاریدەیان بدا و بەرگری لەکارەساتی باخ و بیستانەکەی بکەن لەجگەی خوا، هەر خوایە خاوەنی توانایە بۆ لابردنی زیان وخراپە و ئە وبی باوەرە سەرناکەوی و ناتوانی بەهیزی خۆی ریگە بگری لەفەرمانی خوا و تۆلەی لە خوا بکاتەوە .

﴿ هنالك الولاية لله الحق هو خير ثوابا و خير عقبا ﴾ رۆژی دوایی یارمەتی وسەرداری بۆ خوای دادپەروەری راستیە خوا چاکترین کەسە لەلایەن پاداشت دانەوەی ئادەمیزاد و خوا چاکترین کەسە دوای هەموو کەسی بکەوی و هەر ئەوە پایەدار بی و بگاتە فریای هەموو کەسی. یانی ئادەمیزاد هەر کاتی کەسیکی دەست بکەوی یاریدەی بدا و سزای لی بگیریتەوە لەجیهاندا یارمەتی بدا لەرۆژی دواییدا هیچ یاریدەیکی بۆ نابی جگەی خوا بی، خوا لەگەل پیاوچاکانە .

لەپاشا خوای مەزن فەرمان ئەدا بە پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ بۆ جیهان پەرستانی رون بکاتەوە هانیان بدا واز لە جیهان پەرستی بهینن و تویشو بۆ رۆژی دوایی هەلگرن و ئەفەرموی:

وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا كَمَآءٍ أَنزَلۡنَٰهُ مِنَ ٱلسَّمَآءِ فَٱخۡتَلَطَ بِهِۦ نَبَاتُ ٱلۡأَرۡضِ

فَأَصْبَحَ هَشِيمًا تَذْرُوهُ الرِّيَاحُ ۗ وَكَانَ اللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ مُّقْتَدِرًا ﴿٤٥﴾ الْمَالُ وَالْبَنُونَ زِينَةُ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا ۖ وَالْبَاقِيَاتُ الصَّالِحَاتُ خَيْرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابًا وَخَيْرٌ أَمَلًا ﴿٤٦﴾

﴿ و اضرب لهم مثل الحياة الدنيا كماء أنزلناه من السماء فاختلط بـه نبـات الأرض ﴾ وە تۆ رونی بکەرەوە بۆ خزمەکانی خۆت وینەی جیهان لـە جوانی و لـەنەمانی بە گورجـی کە بی باوەران خۆیانی پیوە هەلئەکیشن بەوینەی ئاو ی ئیمـە ناردومانەتـە خـوارەوە لـە هەوری ئاسمانەوە، دوایی گیای زەوی تیکەلاو بەو ئاوە بـوەو هـەمو گـول و رەنگـی ئـەو گیایە پەیدا ئەبی و چرو پر ئەبی و ئەچن بە ناو یەکا و گەشە ئەکا و بەهۆی ئاوەکەوە .

﴿ فأصبح هشيما تذوره الرياح وكان الله على كل شيء مقتـدرا ﴾ دوایـی بەنزیکـەوە ئەو گیایەو ئەو رووەك ودانەویلە جوانانە ووشك هەلئەگەری ئەشکین بەسەر یـەکا وای لی دی با هەلی ئەگری و ئەیبا بە ئاسمانا هەریەکەیان بەلایەکەوە ئەرۆن و کەس نـازانی چ شتیکیان بەسەردی و خوا بەسەر هەمو شتیکا خاوەن توانایە پەیدایان ئەکاو لەناویان ئەبا. کەواتە بەندەکانی خوا شایستەی خۆهەلکیشانیان بەسامانەوە نیە .

﴿ المال و البنون زينة الحياة الدنيا ﴾ دارایی و کورەکان ئارایش و جوانی زیندەگانی جیهانن، ئادەمیزاد خۆیانی پی ئەرازیننەوە و خۆیانی پی بەهیز ئەکەن لـەجیهاندا، دارایی بۆ جوانی و سودی جیهانە، کورانیش بۆ هیز وبەرگری‌یە لـەخۆیان. بەلام وەك گیایە ئـەوان نامینن و پرژ و بلاو ئەبن پاش ماوەیە نامینن، مرۆڤی ژیر ئەو کەسەیە بۆ سـودی گشـتی و پاشەرۆژی خۆی بەکاریان بهینی .

بۆ زانین: ئارایش و جوانی جیهان دوو بەشن: یەکەمیان سودەکەیان گشتیە و بۆ هـەمو کەسە لـە دانیشتوان وینەی زانکۆکان. ئاسان کردنی ریگە وبان و دروست کردنی پـرد و

ئاو بەن و دامـەزراندنی باخچـەی منـالان، هـەتادی پیشەسـازی بـۆ رەخسـاندنی ژیـانی دانیشتوان، ئەوانە هەموویان بۆ سودی گشتیە و پیویستی سەرشانی هەمومانە بیانپـاریزین. بەتایبەتی کاربەدەستان سزای ئەو کەسەانە بدەن دەست کاریان ئەکەن بەدزین و زیان پـی گەیاندنیان .

دوو هەمیان: هەیانە سودەکە تایبەتیە: وەك خانو، ئوتومبیل، کوری سەرکەوتویی ژیر و خاوەن سود. پلەو پایەی کۆمەلایەتی، ئەوانە هەرچەندە سودەکانیان تایبەتیە و بـەگویرەی یاسـا قەدەغـە نـین. بـەلام پیویسـتە ئـادەمیزاد شـانازیان پیـوە نـەکا و خۆیـان بەوانـەوە هەلنەکیشن، بەگویرەی توانا لـەسود و بەختیاری پەسەندا بەکاریان بهینی، ئـەبی بزانـری ریز وگەورەیی ئادەمیزاد بەو شـتانە بـەراوەرد نـاکرین، ریـزی مـرۆڤ بەسـودی گشـتی هەموان بەراورد ئەکری، چاکەو سودیان بۆ نەوەی پاشەرۆژ بەردەاومە و جیگـەی ریـزی لای خوایە، وەك ئەفەرموی:

﴿ و الباقيات الصالحات خير عند ربك ثوابا و خـير أمـلا ﴾ وە ئـەو کـارە چاکانـەی بەرهەمەکانیان و پاداشتیان بەردەوام و پایەدارە چاکترە لای پەروەردگاری تۆ لـە دارایی و کور وپلەو پایەی جیهانی ماوەی کورتە لـەلایەن پاداشت و چاکـترە لـە بـارەی ئومیـد و ئاواتەوە، لـەبەرئەوەی خاوەنەکەی لـە رۆژی دواییدا ئەگا بە ئـاواتی خـۆی و لـەجیـهاندا ریزدارە و ناوی بە چاکە ئەبری. ئەو شتە سودی لـەناو نەچی و بەردەوام بی وەك زانیاری خاوەن سود و کـردەوەی چـاکی منـال و دروسـت کردنـی مزگـەوت و نەخۆشـخانە و تەرخان کردنی سودی ئاو بۆ دانیشتوان و بەرهەمی زەوی و زار و دروست کردنی پرد و ریگەو بان .

کاتی خوای مەزن رونی کردەوە بـی نرخـی جیـهان و کـالای جیـهان، باسـی ریـز و گەورەیی چاکە کردن، باسی هەندی لـە کارەساتی رۆژی دواییمان بۆ ئەکاو ئەفەرموی:

وَيَوْمَ نُسَيِّرُ الْجِبَالَ وَتَرَى

ٱلْأَرْضَ بَارِزَةً وَحَشَرْنَٰهُمْ فَلَمْ نُغَادِرْ مِنْهُمْ أَحَدًا ﴿٤٧﴾ وَعُرِضُوا۟ عَلَىٰ رَبِّكَ صَفًّا لَّقَدْ جِئْتُمُونَا كَمَا خَلَقْنَٰكُمْ أَوَّلَ مَرَّةٍۭ ۚ بَلْ زَعَمْتُمْ أَلَّن نَّجْعَلَ لَكُم مَّوْعِدًا ﴿٤٨﴾ وَوُضِعَ ٱلْكِتَٰبُ فَتَرَى ٱلْمُجْرِمِينَ مُشْفِقِينَ مِمَّا فِيهِ وَيَقُولُونَ يَٰوَيْلَتَنَا مَالِ هَٰذَا ٱلْكِتَٰبِ لَا يُغَادِرُ صَغِيرَةً وَلَا كَبِيرَةً إِلَّآ أَحْصَىٰهَا ۚ وَوَجَدُوا۟ مَا عَمِلُوا۟ حَاضِرًا ۗ وَلَا يَظْلِمُ رَبُّكَ أَحَدًا ﴿٤٩﴾

﴿ و يوم تسير الجبال و ترى الأرض بارزة ﴾ وە تـۆ بـيری ئـەو رۆژە بكـەرەوە ئيمـە كيوەكان لـە جيگەی خۆيانان هەلـەئەكە نين و ئەيان ئەكەين بە تۆز و ئەچن بـەئاسمانا وەك هەور و زەوی ئەبينی هەمو كەنار و گۆشەكانی دەرئەكەوی و نەكيوی تيدايە و نە شيو و نەدرەخت. نە بەرزايی و نەنزمايی، ئەو كاتە كاتی زيندو بونەوەی بونەوەرانە .

﴿ و حشرناهم فلم نغـادر منـهم أحـدا ﴾ وە ئيمـە لـەوكاتـەدا هـەمو گيـانداران كـۆ ئەكەينەوە بەئادەميزاد و جنۆكەوە بە باوەردار و بی باوەرانەوە بـۆ پرسـياركردن لـەوان، دوايی ئيمە بەجی نايەلين هيچ كەسی لـەوان .

﴿ و عرضوا على ربك صعفا لقد جئتمونا كما خلقناكم أول مرة ﴾ وە كۆكراوەكـان رائەنويررين بەسەر پەروەردگاری تۆدا بۆ پرسيار بەريزكراوی يـەك لـە داوی يـەك بـەبی وونبونی يەكيكيان. لـەو كاتەدا بەوان ئەبيژری: بەراسـتی ئيمـە ئيوەمـان هينـاوە بـۆ لای خۆمان بە تەنهايی و بەروت و قوتی وبی خاوسی و بی دارايی بەوينەی ئـەو كاتـەی ئيمـە يەكەمين جار ئيوەمان دروست كردبو هيچ شتيكتان لـەوانـەی پيشـوو نـەبو، ئيسـتا هيـچ كەسی نيە يارمەتيتان بدا و بۆتان بپاريتەوە بە گومانی خۆتان.

﴿ بل زعمتم أن لن نجعل لكم موعدا ﴾ بەلام ئیوە گومانتان ئەبرد کە ئیمــە بەراستی ناگیرین بۆ ئیوە کاتی زیندوو کردنەوەتان و کۆکردنەوەتان، ئەوا ئیسـتا توشتان بـو ئـەو بەلینانەی خوا دابوی بەئیوە .

﴿ و وضع الكتاب فترى المجرمين مشفقين مما فيه ﴾ وە لـەو کاتەدا نامەی کرداریان دانراوە، ئەو نامەیە ئەدری بەدەســتی راسـتی پیـاو چاکانـەوەو ئـەدری بەدەسـتی چـەپی تاوانبارانەوە، دوایی تۆ تاوانبـاران ئـەبینی ئەترسـن لـەو کـارە خراپانـەی لــە نـاویدان و نیشانەی ترس بەدەم وچباویانەوە دیارە و هــەمو کردەوەکانیـان لــەو نامەیـەدا نوسـراوەو تۆلـەی گوناهەکانیان دیاری کراوە .

﴿ و يقولون يا ويلتنا ما لهذا الكتاب لا يغـادر صغـيرة و لا كـبيرة إلا أ حصاهـا ﴾ وە تاوانباران ئەلین: ئەی لـەناوچوون ئامادەبی لای ئیمەیە: چ شتیکە بۆ ئـــەم نامەیـە بـەجیی نەهیشتوە هیچ کاریکی بچووك و گەورە مەگەر ژماردویەتی و نوسراون بەتەواوی .

﴿ و وجدوا ماعملوا حاضرا و لا يظلم ربك أحدا﴾ وە تاوانبــاران دەسـتیان ئەکـەوی شتی کردویانە لـە چاك ولـــە خـراپ بـەئامادەکراوی و لــەو نامەیەدایـە، بەهـەر جـۆری کردویانە ولـەچ لایە کردویانە و پەروەردگاری تۆ ستەم لـە هیــچ کەسـی ناکـا بـەجۆری شتی نوسراو بی نەی کردبی یا بـەتاوانی یـەکی تـر سـزای بـدری یـا لـە پاداشـتی کـەم بکریتەوە .

کاتی خوای مەز نباسی خراپەی ئەو کەسانەی کرد خۆیــان هەلئەکیشـا بەسـامانەوەو بیریان لـــە هـەژارە خـوا پەرسـتەکان ئـەکردەوە، ئـەیان ووت بەپیغەمـەر ﴿ ﷺ﴾: ئیمـە ساماندار و بنەمالـەی بەریزین چۆن کۆ ئەبینەوە لـەگەل ئەم هەژار و بنەمالە پەستانە، لـــەم ئایەتانەی دواییدا خوا ئەفەرموی: وینەی ئەو کەســانە وەك شـەیتان وان خـۆی بەگـەورە دائەنا و کورنوشی بۆ ئادەم نەبرد و ئەیووت: من لـەرەگەزی پاك و نورانیـــم و ئـادەم لــە خاکی تاریك و پیسە، بەو بۆنەوە خوا فەرموی:

وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ كَانَ مِنَ ٱلْجِنِّ فَفَسَقَ عَنْ أَمْرِ رَبِّهِۦٓ ۗ أَفَتَتَّخِذُونَهُۥ وَذُرِّيَّتَهُۥٓ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِى وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّۢ ۚ بِئْسَ لِلظَّٰلِمِينَ بَدَلًا ﴿٥٠﴾ ۞ مَّآ أَشْهَدتُّهُمْ خَلْقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلَا خَلْقَ أَنفُسِهِمْ وَمَا كُنتُ مُتَّخِذَ ٱلْمُضِلِّينَ عَضُدًا ﴿٥١﴾ وَيَوْمَ يَقُولُ نَادُوا۟ شُرَكَآءِىَ ٱلَّذِينَ زَعَمْتُمْ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ يَسْتَجِيبُوا۟ لَهُمْ وَجَعَلْنَا بَيْنَهُم مَّوْبِقًا ﴿٥٢﴾ وَرَءَا ٱلْمُجْرِمُونَ ٱلنَّارَ فَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُم مُّوَاقِعُوهَا وَلَمْ يَجِدُوا۟ عَنْهَا مَصْرِفًا ﴿٥٣﴾

﴿ و إذا قلنا للملائكة اسجدوا لأدم فسجدوا إلا إبليس كان من الجن ففسق عن أمر ربه ﴾ وە تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە ئیمە ووتمان بە فریشتەکان: ئیوە سوژدە بەن بۆ ئادەم بەریزەوە، دوایی فریشتەکان هەمویان سوژدەیان برد مەگەر ئیبلیس لە جنۆکەکان بۆ سوژدەی بۆ ئادەم نەبرد، دوایی لە فەرمانی پەروەردگاری خۆی دەرچوبو. خوا جنۆکەی لە ئاگر دروست کردوە. بەراستی ئیمە بروامان بە بونی جنۆکەکان هەیە و ئەقلیش لای گونجاوە، دریژەی چۆنایەتیان خوا ئەیزانی.

﴿ افتتخذونه و ذريته أولياء من دوني ﴾ ئایا دوایی ئیوە بۆ ئیبلیس و منالەکانی وەربگرن بە دۆستی خۆتان لەجگەی من و بچوکی ئەوان بکەن و من نەپەرستن، هەندی لە زانایان ئەلین: مەبەست لە ( ذرية ) ئەو کەسانەن دوای شەیتان بکەون ئیتر منالی ئەو بن یا ئادەمیزاد بن .

﴿ وَهُمْ لَكُمْ عَدُوٌّ وَ بِئْسَ لِلظَّـالِمِيْنَ بَـدلاً ﴾ وە شـەیتان ومناڵـەکانی دوژمنـی ئێـوەن خراپە گۆڕینەوەی پەرستنی خـوا بەپەرسـتنی ئیبلیـس و مناڵـەکانی بـۆ سـتەمکاران، لـە ستەمکارانە پیاو خراپان هەڵبژێرن بۆ پلەیە لە پلەکانی جیهان و ڕێزیان بدەن بەسەر پیـاو چاکانا، دوژمنی خۆتان چۆن ئەکەن بە پەرستراوی خۆتان؟.

﴿ مـا أشْـهَدْتُمْ خَلْـقَ السّـماواتِ وَ الأَرْضِ وَ لا خَلْـقَ أنْفُسِـهِمْ ﴾ وە مـــن شـــەیتان ومناڵەکانی شەیتانم ئامادە نەکردوە و لـەوێ نەبوون ئاسمانەکان و زەوی و خۆیانم دروست کردوون و پرسم پێ نەکردوون و داوای یارمـــەتیم لێ نـەکردوون، هیـچ کەسـێ ئاگـای لەدروست کردنی خۆی نەبوە. کەواتە چۆن پەرستنیان بۆ ئـەکرێ کـە خـاوەنی سـود و زیان نەبن نە بۆ خۆیان ونە بۆ جگەی خۆیان، جێگەی سەرسوڕمانە واز لەپەرســتنی خـوا بهێنرێ ؟.

﴿ وَ ماکُنْتُ مُتَخِذاً الْمُضِلِیْنَ عَضُداً ﴾ وەمن ئەو کەسانەی ئـادەمیزاد وەرئـەگێڕن لـە خوا پەرستی وەرم نەگرتوون بە یاریدەرو پشتیوان بۆ خۆم لە دروستکردن و پەیدا کردنی هیچ شتێ لە بونەوەران هەتا گومان ببرێ هاوبەشی خوان لە پەرستندا.

﴿ وَیَوْمَ یَقُولُ نادُوا شُرَکائي الذیْـنَ زَعَمْتُـمْ ﴾ وەتـۆ بـیری ئـەو کاتـە بکـەرەوە خـوا ئەفەرموێ بە بێ باوەڕان. ئێوە بانگی هاوبەشەکانی ئـەوتۆی مـن بکـەن گومانتـان ئـەبرد هاوبەشی منن و بۆتان ئەپارێتەوە و لە ڕۆژی داوییدا و ڕزگارتان ئەکەن لە سزا .

﴿ فَدَعَوْهُمْ فَلَمْ یَسْـتَجِیْبُوا لَـهُمْ وَ جَعَلْنـا بَیْنَـهُمْ مُّوْبِـاً ﴾ دوایـی بـێ بـاوەڕان بـانگی بتەکانیان ئەکەن بێن بە فریایانەوە، دوایی ئەوان وەڵامیان نادەنەوە وناگەنە فریایان و ئێمـە گێڕاومانە لەنێوان بێ باوەڕان و بتەکانیان جێگەیە بۆ لەناوبردن و سـزادانیان بەهاوبەشـی لە ئاگری دۆزەخدا و هەریەکەیان بەخۆیانەوە خەریکن و ئاگایان لەیەك نیە.

﴿ وَ رَأی الْمُجْرِمُونَ الْنّارَ فَظَنُّوا أنّهُمْ مُّواقِعُوهـا وَلَـمْ یَجِـدُوا عَنْـها مَصْرِفـاً﴾ وە بـت پەرستانی تاوانباران لە پاشەڕۆژدا تەماشای ئاگری دۆزەخ ئەکەن، دوایی بەڕاستی ئـەوان ئەزانن کە ئەکەونە ناو ئەو ئـاگرەوە، چونکـە تاوانـە زۆر گـەورەکانی خۆیـان ئـەبینن و دەستیان نەکەوتوە جێگەیە لایان بدا لەو ئاگرە هەروەك نەیان توانیوە خۆیان ڕزگار بکـەن لە مردن .

وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا ٱلْقُرْءَانِ لِلنَّاسِ مِن كُلِّ مَثَلٍ وَكَانَ ٱلْإِنسَٰنُ أَكْثَرَ شَيْءٍ جَدَلًا ﴿٥٤﴾ وَمَا مَنَعَ ٱلنَّاسَ أَن يُؤْمِنُوٓا۟ إِذْ جَآءَهُمُ ٱلْهُدَىٰ وَيَسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّهُمْ إِلَّآ أَن تَأْتِيَهُمْ سُنَّةُ ٱلْأَوَّلِينَ أَوْ يَأْتِيَهُمُ ٱلْعَذَابُ قُبُلًا ﴿٥٥﴾ وَمَا نُرْسِلُ ٱلْمُرْسَلِينَ إِلَّا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ وَيُجَٰدِلُ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِٱلْبَٰطِلِ لِيُدْحِضُوا۟ بِهِ ٱلْحَقَّ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَمَآ أُنذِرُوا۟ هُزُوًا ﴿٥٦﴾

﴿ وَ لَقَدْ صَرَّفْنا فِي هـذا الْقُـرآنِ لِلْنـاسِ مِـنْ كُـلِّ مَثَـلٍ ﴾ وه بەڕاستی ئێمـه ڕونمـان كردوەتەوه چەند جارێ بۆ ئادەمیزاد لـەم قورئانەدا هەموو وێنەو هەمو شتێ پێویستیان پێی هەبێ لـه دەستور و یاسای ئایین و هەواڵ و بەسەرهاتی گەلانی ڕابوردو، بۆ نمونـــه وێنـەی ئەو دوو پیاوه لـه ئایەتی ( ٢٣٢ ) دا باسی كرا لـەم سورەتەدا، بۆ ئەوەی ئادەمیزاد تـــەمێ خوار بن و مێشكی خۆیان بخەنه كار .

﴿ وَ كانَ الإِنْسـانُ اَكْـثَرُ شَـيءٍ جَـدلاً ﴾ وه ئـادەمیزاد زۆرترین شـتێكه دوژمنایـەتی پڕوپوچ بكا به درۆو بەجۆرێ ناپەسەند. بەتایەبتی لـەبارەی زیندوو بونەوەی مردووان .

﴿ وَ مامَنَعَ الْنّاسَ أنْ یُؤمِنُوا إذْ جاءَهُمْ الْهُدی وَ یَسْتَغْفِرُوا رَبَّهُمْ ﴾ وه ڕێگه نـاگرێ لــه ئادەمیزاد كه باوەڕ بهێنن كاتێ چوبو بۆلایان شارەزایی كەرێ لـەو ێنەی قورئـان و داوای لێ خۆشبوون بكەن لـەپەروەردگاری خۆیان و كاتێ پەشیمان ئەبنەوه لـه گوناهەكانیان .

﴿ إلا أنَّ تَأتِیَهُمْ سُنَّةُ الأَوَّلِینَ أوْ یَأتِیَهُمْ الْعَذابُ قُبُلاً ﴾ مەگەر كەبێت بۆلای ئادەمیزاد دەستوری لـەناوبردنی گەلانی پێشوو بەوێنەی گەلی نوح ولوت وعاد و سەمود یابێت بـۆ

لایان سزای روبەرو بەوینەی فیرعەون و تاقمەکەی، دوایی ئەوکاتە باوەربهینن و سودی ناگەیەنی بەوان. یانی بی‌باوەران بیر لە باوەرهینان ناکەنەوە مەگەر یەکی لەو دووسزایانە تووشیان ببی ئەوکاتە بیر ئەکەنەوە .

﴿ و مانرسل المرسلین إلا مبشرین و منذرین ﴾ وە ئیمە رەوانە ناکەین پیغەمەران مەگەر بۆئەوەی موژدە بدەن بە باوەرداران بە بەهەشت و بی باوەران بترسینن بەئاگری دۆزەخ، ئیتر هیچ شتی تر بەدەست پیغەمەران نیە جگە لەو راگەیاندنە .

﴿ و یجادل الذین کفروا بالباطل لیدحضوا به الحق ﴾ وە کەسانیکی ئەوتۆ باوەریان نەهیناوە دوژمنایەتی فەرمودەی خوا ئەکەن لەبارەی زیندوو بونەوەی مردووان بەبرو بیانوی پوچ دوای ئەوەی خوا بە بەلگەی رون وئاشکرا باسی کردووە بۆ ئەوەی پوچ بکەنەوە ئە کارە پوچە بەراستی فەرمودەی خوا لەقورئانی پیرۆزدا .

﴿ و أتخذوا آیاتي و ماأنذروا هزوا ﴾ وە بی باوەران ئایەتەکانی من وشتی ئەوانی پی ئەترسینری لە سزای خوا بە گالتە کردن وەریان گرتوە هەرکەسی قورئانی خویندەوەو کاری پی نەکرد ئەچیتە نیو ئاگری دۆزەخ .

وَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّن ذُكِّرَ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ فَأَعْرَضَ عَنْهَا وَنَسِىَ مَا قَدَّمَتْ يَدَاهُ ۚ إِنَّا جَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۖ وَإِن تَدْعُهُمْ إِلَى ٱلْهُدَىٰ فَلَن يَهْتَدُوٓا۟ إِذًا أَبَدًا ﴿٥٧﴾ وَرَبُّكَ ٱلْغَفُورُ ذُو ٱلرَّحْمَةِ ۖ لَوْ يُؤَاخِذُهُم بِمَا كَسَبُوا۟ لَعَجَّلَ لَهُمُ ٱلْعَذَابَ ۚ بَل لَّهُم مَّوْعِدٌ لَّن يَجِدُوا۟ مِن دُونِهِۦ مَوْئِلًا ﴿٥٨﴾

وَتِلْكَ ٱلْقُرَىٰٓ أَهْلَكْنَٰهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا۟ وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِم مَّوْعِدًا ﴿٥٩﴾

﴿ و من أظلم ممن ذكر بآيات ربه فأعرض عنها ﴾ وە چ کەسیکە ستەمکارترە لە کەسی ئامۆژگاری بکری بە ئایەتەکانی قورئانی پەروەردگاری خۆیی بەو هەموە تەمی کردنانەوە، دوایی ئەو کەسە روو وەرگیری لەو ئایەتانە، بیر لەکارە پەك خەرەکانی نەکاتەوەو گالتەیان پی بکا .

﴿ و نسي ما قدمت يداه ﴾ وە لە بیری چوبیتەوە شتی بەدەستی خۆی کردویەتی، لەئەوپەری دوژمنایەتی و هەولدانا بی بۆ شتی پرو پوچ وگالتە بکا بەو شتەی پیی ترسینراوە لە سزای رۆژی دواییی و بیر لە خۆی نەکاتەوە .

﴿ إنا جعلنا على قلوبهم أكنة و في آذانهم وقرا ﴾ بەراستی ئیمە گیراومانە بەسەر دلیانا پەردەیە کە سود لە قورئان وەرنەگرن، چونکە خاوەنی ئەقل نین و نایخەنە کارو گیراومانە لە گویکەیان قورسایی و کەری راستی نابیسن .

﴿ و إن تدعهم إلى الهدى فلن يهتدوا أبدا ﴾ وە ئەگەر تۆ بانگی ئەو بی باوەرانە بکەی بۆ لای شارەزایی ئایینی خوا و باوەرهینان بە قورئان، دوایی راغومایی وەرناگرن هەرگیز، ئەبی بزانری هەر کەسی ئامۆژگاری وەرنەگری وەك کەسی وایە گویچکەی کەر بی .

﴿ و ربك الغفور ذوا الرحمة لو يؤاخذهم لعجل لهم العذاب ﴾ وە پەروەردگاری تۆ لی بوردنی زۆرە خاوەنی بەزەیی و میهرەبانیە ئەگەر ویستی وابی سزای بی باوەران بدا بە هۆی شتیکەوە کردویانە ولەناویان ببا بەراستی بە گورجی سزای ئەوانی ئەدا، بەتایبەتی بەردۆخستنەوەی پیغەمەر و باوەر نەکردن بە قورئانی پیرۆز .

﴿ بل لهم موعد لن يجدوا من دونه موئلا ﴾ بەلکو خوا پەلەناکا و بۆ سزادانی ئەوان ماوەیە لە جیهان و لە رۆژی دواییدا دەستی ئەوان ناکەوی لەو رۆژە دا پەناگایە بۆ رزگار بونی خۆیان .

﴿ و تلك القرى أهلكناهم لما ظلموا و جعلنا لمهلكـهم موعـدا ﴾ وە ئـەو گوندانـە باسیان کراوە ئیمە لـە ناومان بردون کە باسیان بۆ تۆ کۆاوە کاتی ستەمیان لـە خۆیان کرد و باوەریان بە پیغەمەرەکانی خۆیان نەهیناو دەستیان دابوە گونـاە کـردن و ئیمـە دیاریمـان کردبو بۆ لەناوبردنیان کاتیکی دیاری کراو، بـۆ بـت پەرسـتانی مەکـەیش کـاتی دیـاری کراوە بۆ سزادنیان .

ئەگیرنەوە موسا پیغەمەر ووتاری ئەدا لــەناو بـەنو ئیسـرائیلیدا زۆر کاریگـەر ئـەبی، دوای لی بونەوەی لـەو ووتارە پیاوی لەوانە بە موسا ئەلی: ئایا تۆ ئـەزانی بـە کەسـی لـە خۆت زاناتر بی، موسا ئەلی نیە .بەو بۆنەوە بۆ سەرزەنشتی کردنی موسـا خـوا سروشـی نارد بۆ لای موسا: بەراستی من بەندەیەکم هەیە لـە ( مجمع البحرين ) لــەو جیگـەدا دوو روبار کۆئەبنەوە لـەسەر کەناری ئەو روبارە بەردیك لەویدایە، ئـەو بـەندەی منـە لـە تـۆ زاناترە. موسا فەرموی: ئەی پەروەردگار: من بـەچ جـۆری ئـەو بـەندەی تۆیـەم دەسـت ئەکەوی ؟ خوا فەرموی: ماسیە لـەگەل خۆت هەلگرە و بیخەرە نـاو زەمیلەکەتـەوە، لـە هەر جیگەیە ئەو ماسـییە زینـدو بویـەوەو تـۆ لــەبیرت چـو بـو ئـەو بـەندەی منـە لــەو جیگەیەدایە، دوایی موسا ماسییەکی نایـە نـاو زەمیلـەکـەی و بـەرەو ( مجمـع البحريـن ) کەوتنە ری بە هاورییەتی یوشەعی کوری نون و خوشکەزا و قوتابی جیگەداری موسا بـو لـە پاش خۆی، بە یوشەعی ووت: هەرکاتی ئەم ماسیە خۆی فرەدایە ناو روبارەوە ئاگادرم بکە لـە پاشا خۆی و هاوریکەی رۆیشتن هەتا گەیشتنە لای ئـەو بـەردە موسـا و یوشـەع وەنەوزی گرتنی و خەویان پیدا کەوت، بەویستی خوا هەندی ئاو کەوتە سەر لـەشی ئـەو ماسیە و کەوتە جولـە و بازی دایە ناو ئاو وریگەی خۆی گرتە بەر و رۆیشت بە ناو ئاودا و چوە ناو روباری کە لـەویدا بو .

یوشەع لـەنیوان خەو و بیداریدا بوو ئەو ماسیەی بینی بەو جۆرە، کاتی بیـدار بویـەوە لـە بیری چوبوەوە موسا ئاگادر بکاو موسایش لـەبیری نەبوو پرسیاری لی بکا، هــەر لــەو رۆژەدا کەوتنە ریگە هەتا رۆژی دوایی سەرلـەبەیانی بەو رۆیشتنە زۆر ماندو بـون. موسـا

بە هاوریکەی خۆی ووت: خوادرەمەنی بەیانی بهینە ئەوەی راستی بیت لەم رۆیشتنەدا زۆر ماندوو بوین بەجۆری ماندویەتی وامان بە خۆمانەوە نەدیوە، کاتی یوشەع نیازی کرد خواردەمەنی ئامادە بکا بیری کەوتەوە ماسیەکە چوە نیو روبارەوە. بە موسای ووت: تۆ ئەزانی کاتی لای بەردەکە بوین و پشومان دابو من لە بیرم چویەوە هەوالی ئەو ماسیە بە تۆ بدەم و شەیتان لە بیری بردمەوە. بەراستی ئەو ماسیە بە جۆریکی سەرسورینەر خۆی فرەدایە نیو روبارەوەو ریگەی خۆی گرت بە نیویدا. موسا ووتی: ئاواتی ئیمە چونی ئەو ماسیەیە بۆ نیو ئاو، هەلسە با بگەریینەوە بە شوینی خۆماناو ریگەمان لی تیك نەچی هەتا ئەچینەوە بۆ لای ئەو بەردەو ئەو جیگەیە، بۆ روون کردنەوەی ئەو رووداوە خوای مەزن ئەفەرموی:

وَإِذْ قَالَ مُوسَىٰ لِفَتَىٰهُ لَآ أَبْرَحُ حَتَّىٰٓ أَبْلُغَ مَجْمَعَ ٱلْبَحْرَيْنِ أَوْ أَمْضِىَ حُقُبًا ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا بَلَغَا مَجْمَعَ بَيْنِهِمَا نَسِيَا حُوتَهُمَا فَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ سَرَبًا ﴿٦١﴾ فَلَمَّا جَاوَزَا قَالَ لِفَتَىٰهُ ءَاتِنَا غَدَآءَنَا لَقَدْ لَقِينَا مِن سَفَرِنَا هَٰذَا نَصَبًا ﴿٦٢﴾ قَالَ أَرَءَيْتَ إِذْ أَوَيْنَآ إِلَى ٱلصَّخْرَةِ فَإِنِّى نَسِيتُ ٱلْحُوتَ وَمَآ أَنسَىٰنِيهُ إِلَّا ٱلشَّيْطَٰنُ أَنْ أَذْكُرَهُۥ ۚ وَٱتَّخَذَ سَبِيلَهُۥ فِى ٱلْبَحْرِ عَجَبًا ﴿٦٣﴾ قَالَ ذَٰلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِ ۚ فَٱرْتَدَّا عَلَىٰٓ ءَاثَارِهِمَا قَصَصًا ﴿٦٤﴾

﴿ إذ قال موسى لفتاه لا ابرح حتى أبلغ مجمع البحرين أو أمضي حقبا ﴾ تۆ بیری ئەو کاتە بکەرەوە موسا ووتی بە هاوریکەی خۆی و قوتابیەکەی کە ناوی یوشەعی کوری نونە و جیگەنشینی موسایە دوای خۆی بۆ بەنو ئیسرائیلیەکان و خوشکەزای موسا بو زانیاری لە موسا وەرگرتبو: واز نایەرم و ئەرۆم بە بەردەوامی هەتا ئەگەمە (مجمەعولبەحرەین) و ئەو جیگەیە خوا بۆی دیاری کردووم و بەلینی پیداوم بگەمە لای پیاویکی زانای خوا پەرست لەسەر کەناری روباریکەلای بەردیکا، هەندی پرسیاری لی کەم و زانیاری لی وەرگرم، یا ئەرۆم بە ریگەیەدا ماوەیەکی زۆر هەتا شوینی ئەو پیاوە چاکەی تیدابی، ئیتر با ئەوپەری توشی ئازار ببم .

زانایان بیر و بۆچونیان لە دیاری کردنی ئەو موسایەدا و ئەو هاوریی موسایەدا جیاوازە: هەندیکیان لایان وایە ئەو موسایە کوری میشای کوری یوسوفی کوری یەعقوبە و کۆن ترە لە موسای کوری عیمرانی خاوەنی تەورات و ئەو روداوەی بەسەر هاتوە. بەلام ئەوەی جیگەی بروای بیگومانی زۆربەی زانایان بی ئەو مەسایە کوری عیمرانی خاوەنی تەوراتە و هاوریکەی بریتیە لە یوشەعی باسکراو .

﴿ فلما بلغا مجمع بينهما نسيا حوتهما ﴾ دوایی کاتی گەیشتنە جیگەی کۆبونەوەی ئەو دوو دەریایە خوا بۆی دیاری کردوون کە لەلای ئەو بەردە بو موسا و یوشەع ماسیەکەیان لە بیرچوبوەوە و فەرامۆشیان کرد. با ئەوەیش بزانین لەو شوینەدا دوو دەریا ئەگەنە یەکتری و دەریایەك پیك دینن، وەك لەمەوپاش باسی ئەکەین .

﴿ فاتخذ في البحر سربا ﴾ دوایی ئەو ماسیە لە نیو روبارەکەدا ریگەیەکی بۆ خۆی وەرگرت و رۆیشت بەرەو دەریا بە گویرەی سروشتی خۆی .

زۆربەی زانایان لایان وایە: ئەو دوو دەریایە بریتین لە (دەریای سپی ناوەند و دەریای کەنداوی فارس) هەندی تر ئەلین: (دەریای سپی ناوەند و دریای سورە) ئەو دوو بیر و بۆچونە زۆر دوورن لە راستی هەرچەندە زۆربەی زانایان فەرمویانە، چونکە هیچ یەکی لەو دوو دەریایانە ناگەن بەیەکتری و کۆ ببنەوە لەیەك جیگەدا. هەندی تر لەزانایان

ئەلین: ئومید و بۆچونمان وایە ئەو دوو دەریایە بریتی بن لە دەریای ئوردون و دریای مەیت کە تیکەلاوی یەك ئەبن و یەك دەریا پیك دینن، ئەو بیرو بۆچوونە لای هەندی لە زانایان پەسەندە. ئەوەی شایانی باس بی وا چاکە هەوالەی زانیاری لای خوا بکری، ئەوە گرنگیی ئەو دوو دەریایە هەن، پەیوەندی بە بنچینەی باوەڕەوە نیە با خۆمانی بۆ ماندوو نەکەین .

﴿ فلما جاوزا قال لفتاه آتينا غداءنا لقد لقينا من سفرنا هذا نصبا ﴾ دوایی کاتی موسا و یوشەع لەو جیگەیە تیپەرین دوو دەریاکەی تیدا کۆ ئەبوەوە موسا بە یوشەعی ووت: خواردەمەنی بەیانیەکەمان بهینە بیخۆین بەراستی ئیمە لەم رۆیشتنەمانا تووشی ئازار و ماندو بون بووین لەو کاتەدا هەلساین لای بەردەکە و پشوماندابو هەرگیز ماندوبونی وامان بەخۆمانەوە نەدیوە، لەو کاتەدا یوشەع بیری کەوتەوە کە ماسیەکەی خۆی فریدا بوە ناو دەریاکەوە .

﴿ قال أرأيت إذ أوينا إلى الصخرة فأني نسيت الحوت و ما أنسانيه إلا الشيطان أن أذكره ﴾ یوشەعدەستی کرد بە بیانو هینانەوە ووتی بە موسا: ئایا تۆ ئەزانی و ئاگاداری کاتی ئیمە گەیشتینە لای بەردەکەی سەرچاوەی ئاوەکان و پشوماندا، دوایی من لە بیرم چویەوە کە بە تۆ بلیم: ئەو ماسیە خۆی فرەدایە نیو دەریاکەوەو لە بیری نەبردمەوە ئەو روداوەت بۆ بگیرمەوە مەگەر شەیتان لە بیری بردمەوە داوای لی بوردن ئەکەم .

﴿ و اتخذ سبيله في البحر عجبا ﴾ وە ماسیەکە ریگەی خۆی گرت لە نیو روبارەکەدا و رۆیشت بە جیگەیەکی سەرسورینەر چونکە بەزەوی ووشکا رۆیشت هەتا گەیشتە ناو روبارەکە .

﴿ قال ذلك ماكنا نبغ فارتدا على آثارهما قصصا ﴾ مو سا ووتی: کارو کردەوەی ئەو ماسیە شتیکە ئیمە داوای ئەکەین و بە شوینیا ئەگەرین و ئەو روداوە نیشانەی سەرکەوتنمانە دوایی بەرەو دواوە گەرانەوە بەو ریگەیەدا هاتبون گفتوگۆی ئەو شتانەیان ئەکرد بۆی هاتوون و بە شوینیا ئەگەرین . رۆیشتن و ئاگادری خۆیانیان ئەکرد نەوەك ریگەیان لی تیك بچیت هەتا گەیشتنەوە لای بەردەکە .

فَوَجَدَا عَبْدًا مِّنْ عِبَادِنَا ءَاتَيْنَٰهُ رَحْمَةً مِّنْ عِندِنَا وَعَلَّمْنَٰهُ مِن لَّدُنَّا عِلْمًا ﴿٦٥﴾ قَالَ لَهُۥ مُوسَىٰ هَلْ أَتَّبِعُكَ عَلَىٰٓ أَن تُعَلِّمَنِ مِمَّا عُلِّمْتَ رُشْدًا ﴿٦٦﴾ قَالَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِىَ صَبْرًا ﴿٦٧﴾ وَكَيْفَ تَصْبِرُ عَلَىٰ مَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ خُبْرًا ﴿٦٨﴾ قَالَ سَتَجِدُنِىٓ إِن شَآءَ ٱللَّهُ صَابِرًا وَلَآ أَعْصِى لَكَ أَمْرًا ﴿٦٩﴾ قَالَ فَإِنِ ٱتَّبَعْتَنِى فَلَا تَسْـَٔلْنِى عَن شَىْءٍ حَتَّىٰٓ أُحْدِثَ لَكَ مِنْهُ ذِكْرًا ﴿٧٠﴾

﴿ فوجد عبدا من عبادنا و آتيناه رحمة من عندنا ﴾ دوایی موسا و یوشەع بەندەیە لــە بەندەکانی ئیمەیان دەست کەوت و توشیان بو بە توشیەوە و ئیمە بەو بەندەیەی خۆمانمان بەخشیبوو میهرەبانی و زانیاری ئیتر بەهەر جۆری بوبی ئــەو زانیاریــە بــە ســروش بــی یــا بەجگەی سروش مەبەستەکە ناگۆرری .

زانایان بیر و بۆچونیان لەبارەی ئەو بەندەیەوە جیاوازە: ئایا ئەو بەندەیە ئیستا زیندوە و نامری هەتا رۆژی دوایی. خاوەنی نامەی بوخاری و موسلیم و جگەی ئــەوانیش بلاویــان کردوەتەوەو ئەلین: زیندوو نیە و مردووە، هەندی لە زانایان لایان وایە بــلاو کردنــەوەی زیندویەتی خزر لە شەیتانەوەیە بە نیو مرۆڤدا، تاقمی تر ئەلین: زینــدوەو نــەمردوە. بــەلام واچاکە ئیمە لەو کارە بی دەنگبین، چونکە نە لە قورئاندا ونــە لــە فــەرمودەی پیغەمــەر بەلگەی بیگومان دەست ناکەوی بۆ هیچ یەکیکیان و پەیوەندی بە بنچینەی باوەرەوە نیە. ئەوەی مەبەستبی بۆ ئیمە پیویســتە بروامــان بــەو رووداوە هــەبی. بــەگویرەی بیســتن لــە

زۆربەی کەسەوە زۆر جاران لە کاتی تەنگ و چەلەمەدا توشیان بوە بە تووشی کەسیکەوە لەو تەنگانەیە رزگاری کردوون یا شارەزایی ریگەی راستی کردوون بەبی ئەوەی بزانن چ کەسیکە؟ لەوانەیە ئەو کەسە فریشتەیە بی خوای مەزن یارمەتی بەندەکانی خۆی ئەدا بەهەر جۆری بی و هەموو شتی هەر خوا ئەیانزانی .

هەروەها زانایان بیر وبۆچوونیان جیاوازە بۆ ناوی ئەو بەندەیە ئایا ناوی خۆی وباوکی چیە؟ ئادەمیزادە یا فریشتەیە؟ پیغەمەرە یا دۆستیکی خوایە؟ ئەوەی جیگەی بروای هەندی لە زانیان بی: ناوی بلیای کوری مەلکانە و نازناوی خزرە و ئادەمیزادە و دۆستی خوایە و پیغەمەر نیە، لە بارەی نازناوی ئەو بەندەیە بە خزر یانی بە زمانی عەرەبی سەوز، بیرو بۆچونی زۆر دریژیان هەیە، تەماشای تەفسیری خازین بکەن بۆ زانینیان .

﴿ و علمناه من لدنا علما ﴾ وە ئیمە لەلایەن خۆمانەوە هەندی زانیاری نهینی خۆمانمان فیری ئەو بەندەیەی خۆمانە کردبوو لە نادیاری لای ئادەمیزاد. موسا کەبۆی دەرکەوت ئە وپیاوە ئەو بەندەیەیە خوا باسی فەرموە ئەو کەسە زۆر زاناترە لەو چوە لای و سلاوی کرد، ئەو پیاوە ووتی: لای ئیوە سلاو باوە؟ تۆ چ کەسیکی؟ موسا ووتی: من موسام. پیاوەکە فەرموی موسای بەنو ئیسرائیل؟ موسا فەرموی بەلی، چ کەسی هەوالی منی داوە بەتۆ کە من موسام؟ پیاوەکە ووتی: ئەو کەسەیە هەوالی منیشی بە تۆ داوە خوای گەورەیە. موساووتی: ئەوەی راستی بی پەروەردگاری من منی رەاونەی لای تۆ کردوە، بۆ ئەوەی فیری منی بکەی هەندی لە نادیاری و ئەو زانیاریانەی خوا فیری تۆی کردوە، هەتا بیکەم بە شارەزایی خۆم لە ژیانی رۆژانەما. خوا فەرموی :

﴿ قال له موسی هل أتبعك علی ان تعلمني مما علمت رشدا ﴾ موسا ووتی بەو پیاوە: ئایا من دوای تۆ بکەوم لەبەرئەوەی تۆ فیری من بکەی هەندی لەو زانیاریە شارەزانهینیانە فیری تۆ کراوەو یاریدەی من بدەی بۆ پیکانی شتی راست.

﴿ قال إنك لن تستطیع معي صبرا ﴾ پیاوەکە ووتی: بەراستی تۆ توانای ئەوەت نابی ئارام بگری لەگەل من، موسا ووتی: بۆچی؟ بەندەکەی خوا ووتی: تۆفروستادەی خوای

بۆ فەرماندان بەو شتانەی ئەبینرین و دیارین و من شتی وا فیرکراوم بە گویرەی رووالەت خراپن لای تۆ و شایانی ئەوە نین تۆ بی دەنگ بی لەوان .

﴿ و کیف تصبر علی مالم تحط به خبرا ﴾ وە تۆ چۆن توانای ئەوەت هەیە ئارام بگری لەسەر شتی تۆ ئاگات لە ئەجامی ئەو شتە نەبی بە ئاگاداربونیکی تەواو، چونکە تۆ شتی وا ئەبینی لە منەوە بە رووالەت نارەوایە وجیگەی سەرسورمانە، تۆ بە گویرەی پیویستی خۆت رەخنە لە من ئەگری لەسەر ئەوشتانە لای تۆ قەدەغەن. بەلام پاشەرۆژ ئەنجامیکی رەوا و چاکی هەیە .

﴿ قال ستجدوني إن شاء الله صابرا ولا أعصی لك أمرا ﴾ موسا ووتی: تۆ لەمەودوا منت دەست ئەکەوی بە ئارام گر ئەگەر خوا ئارەزووی هەبی من بی فەرمانی تۆ ناکەم لە هیچ کاریکا .

﴿ قال فأن أتبعتني فلا تسألني عن شيء حتی أحدث لك منه ذکرا ﴾ پیاوەکەی بەندەی خوا ووتی: دوایی ئەگەر تۆدووای من ئەکەوی دوایی تۆ پرسیاری هیچ شتی لەمن مەکە لای تۆ ئەبینری لە منەوە چاکبی یا خراپ هەتا من باسی ئەو شتە بۆ تۆ روون ئەکەمەوە .

فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا رَكِبَا فِي ٱلسَّفِينَةِ خَرَقَهَا قَالَ أَخَرَقْتَهَا لِتُغْرِقَ أَهْلَهَا لَقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا إِمْرًا ﴿٧١﴾ قَالَ أَلَمْ أَقُلْ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٢﴾ قَالَ لَا تُؤَاخِذْنِي بِمَا نَسِيتُ وَلَا تُرْهِقْنِي مِنْ أَمْرِي عُسْرًا ﴿٧٣﴾ فَٱنطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَا لَقِيَا غُلَٰمًا فَقَتَلَهُۥ قَالَ أَقَتَلْتَ نَفْسًا زَكِيَّةًۢ بِغَيْرِ نَفْسٍ لَّقَدْ جِئْتَ شَيْـًٔا نُّكْرًا ﴿٧٤﴾

۞ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكَ إِنَّكَ لَن تَسْتَطِيعَ مَعِيَ صَبْرًا ﴿٧٥﴾ قَالَ إِن سَأَلْتُكَ عَن شَيْءٍ بَعْدَهَا فَلَا تُصَٰحِبْنِي ۖ قَدْ بَلَغْتَ مِن لَّدُنِّي عُذْرًا ﴿٧٦﴾ فَانطَلَقَا حَتَّىٰٓ إِذَآ أَتَيَآ أَهْلَ قَرْيَةٍ ٱسْتَطْعَمَآ أَهْلَهَا فَأَبَوْا۟ أَن يُضَيِّفُوهُمَا فَوَجَدَا فِيهَا جِدَارًا يُرِيدُ أَن يَنقَضَّ فَأَقَامَهُۥ ۖ قَالَ لَوْ شِئْتَ لَتَّخَذْتَ عَلَيْهِ أَجْرًا ﴿٧٧﴾ قَالَ هَٰذَا فِرَاقُ بَيْنِي وَبَيْنِكَ ۚ سَأُنَبِّئُكَ بِتَأْوِيلِ مَا لَمْ تَسْتَطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٧٨﴾ أَمَّا ٱلسَّفِينَةُ فَكَانَتْ لِمَسَٰكِينَ يَعْمَلُونَ فِى ٱلْبَحْرِ فَأَرَدتُّ أَنْ أَعِيبَهَا وَكَانَ وَرَآءَهُم مَّلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا ﴿٧٩﴾ وَأَمَّا ٱلْغُلَٰمُ فَكَانَ أَبَوَاهُ مُؤْمِنَيْنِ فَخَشِينَآ أَن يُرْهِقَهُمَا طُغْيَٰنًا وَكُفْرًا ﴿٨٠﴾ فَأَرَدْنَآ أَن يُبْدِلَهُمَا رَبُّهُمَا خَيْرًا مِّنْهُ زَكَوٰةً وَأَقْرَبَ رُحْمًا ﴿٨١﴾ وَأَمَّا ٱلْجِدَارُ فَكَانَ لِغُلَٰمَيْنِ يَتِيمَيْنِ فِى ٱلْمَدِينَةِ وَكَانَ تَحْتَهُۥ كَنزٌ لَّهُمَا وَكَانَ أَبُوهُمَا صَٰلِحًا فَأَرَادَ رَبُّكَ أَن يَبْلُغَآ أَشُدَّهُمَا وَيَسْتَخْرِجَا كَنزَهُمَا رَحْمَةً مِّن رَّبِّكَ ۚ وَمَا فَعَلْتُهُۥ عَنْ أَمْرِى ۚ ذَٰلِكَ تَأْوِيلُ مَا لَمْ تَسْطِع عَّلَيْهِ صَبْرًا ﴿٨٢﴾

﴿ فأنطلقا حتى إذ ركبا في السفينة خرقها ﴾ دوایی موسا و ئەو بەندەی خوایە رۆیشتن بەرەو کەناری دەریایەکا بۆ ئەوەی کەشتیەکیان دەست بکەوی سواری بن، دوای ماوەیە کەشتیەکە دەرکوت و داوای سواربونیان لە کەشتیەوانەکە کرد وئەویش لەبەرئەوەی بە پیاو چاك هاتنە بەر چاوی بەخۆرایی سواری کردن بە تایبەتی خزریان ئەناسی .

لیرەدا باسی یوشەع نەکراوە ئایا گەرایەوە یا لەگەلیان رۆیشت؟ ئەوەی لە دارژاندنی ئەو باسەوە دەرئەکەوی یوشەع لەگەل موسا و خزردا نەرۆیشتوە. بەلام بۆ چ جیگەیە رۆیشت باسی نەکراوە. هەندی لە زانایان ئەلین: لەگەلیانا رۆیشتوە.

هەروەها رۆیشتن کاتی سواری کەشتیەکە بوون و شەپۆلی ئاو پەرەی سەند خزر بەبی ئاگای دانیشتوانی کەشتیەکە تەوریکی هەلگرت وتەختەیەکی کەشتیەکەی کون کرد بە جۆری ئاو بیتە ناو دانیشتوانی ناو کەشتیەکە بخنکینن، دوایی موسا لەو کارە بەگویرەی رووالەت ترسا و بە کاریکی نار ەوای دانا .

﴿ قال أخرقتها لتفرق اهلها لقد جئت شيئا إمرا ﴾ موسا ووتی: ئایا تۆ بۆ ئەو کەشتیەت کون کرد، بۆئەوەی دانیشتوانی ئەو کەشتیە بخنکین بە هۆی ئەو کارەی تۆو بە ئاوی ئەم دەریایە بەراستی تۆ شتیکی زۆر خراپت کردوە و زۆر دل تەزینە، موسا بە بەرگی بەری خۆی کونەکەی گرت .

﴿ قال ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبرا ﴾ خزر فەرموی: ئایا من بە تۆم نەووت: بەراستی تۆ توانای ئەوەت نیە لەگەل مندا برۆی و ئارام بگری، موسا داوای لی بودرنی لی کرد .

﴿ قال لاتؤاخذني بما نسيت و لاترهقني من أمري عسرا ﴾ موسا فەرموی: تۆ لۆمەی من مەکە بەهۆی شتی من لەبیرم چویەوە و سزای من مەدەو مەیخەرە سەر من سەختی و ئازار لەبەر ئەم کارەی من کردم .

﴿ فانطلقا حتى إذ لقيا غلاما فقتله ﴾ دوایی موسا و ئەو زانایە رۆیشتن هەتا گەیشتن بەکوری دوایی ئەو زانایە کورەکەمەی کوشت. خاوەنی تەفسیری حوسەینی لە تەفسیرەکەی خۆیا بەزمانی فارسی ئەلی: ئەو کورە ناوی (خوش) بو، رومەت جوان و بالا بەرز و شۆخ وشەنگ و پی کەوتو، ناوی باوکی کورەکە (کماردويی) دایکی ناوی (شاهویە)، ئیتر ئەو زانایە بەهەر شیوەیە ئەو کورەی کوشت و بە چ شتی کوشتی و ئەو کورە خەریکی چ شتی بو، یاری ئەکرد یا نە؟ لەو کاتەدا بی باوەر بوە یا نە؟ گرنگ نیە. ئەوەی شایستەیە ئیمە باوەرمان بەو رووداوە هەیە، خوای مەزن باسی نەفەرموە ، واچاکە ئیمە هەوالەی زانیاری خوای بکەین .

﴿ قال أقتلت نفسا زكية بغير نفس لقد جئت شيئا نكرا ﴾ موسا فەرموی: ئایا تۆ بۆ ئەو کەسە پاك و بی تاوانەت کوشت بەبی ئەوەی کەسیکی کوشتبی. بەراستی تۆ بەکاریکی ناپەسەند و خراپەوە هاتووی .

﴿ قال ألم أقل لك إنك لن تستطيع معي صبرا ﴾ زاناکە ووتی: ئایا من بە تۆم نەووت بەراستی تۆ توانای ئەوەت نیە لەگەل من برۆی و ئارام بگری وهیچ شتی نەلیی .

﴿ قال إن سألتك عن شيء بعدها فلا تصاحبني لقد بلغت مني عذرا ﴾ موسا ووتی: ئەگەر من لە دوای ئەم جارە پرسیاری هەر شتیکم لی کردی، دوایی هاوریتی من مەکە. بەراستی تۆ گەیشتوی بەبیانوی خۆت بۆ جوی بونەوەی تۆ لە منو بۆ لەمەوپاش بەلگەم بە دەست نامینی .

﴿ فانطلقا حتى أتيا أهل قرية إستطعما أهلها فأبوا أن يضيغوهما ﴾ دوایی موسا وخزر رۆیشتن هەتا چونە لای دانیشتوانی گوندی داوای خواردەمەنیان کرد لە دانیشتوانی ئەو گوندە زۆریان برسیبو، دوایی دانیشتوانی ئەو گوندە وازیان لە میوانداری ئەوان هینا چونکە زۆر رژد و بەرچاو برسیبوون .

زانایان لە دیاری کردنی ئەو شارە بیر وبۆچونیان جیاوازە ، ئەوەی شایستەی ئەو رووداوە بیت ئەو گوندە (فاسرییەیە) پیشەوا جەعفەری‌سادیق لایەنی ئەو بۆچونە ئەگری.

﴿ فوجدا جدارا يريد أ ن ينقض فأقامه ﴾ دوایی موسا و خزر چونە دەرەوەی گوندەکە سەر لەبەیانی ئەو رۆژە دیواریکیان دەست کەوت و تەماشایان کرد ئەیەویست بروخی، دوایی خزر دیوارکەی چاك کردەوەو هەلی ساندەوە.

﴿ قال لو شئت لأتخذت عليه أجرا ﴾ موسا فەرموی بەخزر: دانیشتوانی ئەو گوندە تاقمی بوون ئیمە داوای خواردەمەنیمان لی کردن میوانداریان لی نەکردین تۆ چۆن ئەو دیوارەیان بۆ چاك ئەکەیتەوە، ئەگەر تۆ ئارەزۆت بکردایە تۆ کریت لەسەر چاك کردنەوەی ئەو دیوارە وەردەگرت، خواردەمەنیمان بەو کرییە ئەکری و پیویستی ترمان پی جی بەجی ئەکرد .

﴿ قالَ هَذا فِراقُ بَيْنِى وَ بَيْنِكَ ﴾ خزر فەرموی: ئەم کاتە کاتی جویٚ بونەوەی من و تۆیە لە نێوان یەکا. دوایی هەر لەئێستەوە تۆ بەرِێگەدا ئەرۆیت و منیش بە رِێگەیە تردا ئەرِۆم، دوای هەوڵدان بەسوودی ئەو کارانە منکردم و تۆ پرسیارت لەمن کردنیان کرد.

﴿ سأنبك بِتأويلِ مَالَمْ تَسْتَطِيْعْ عَلَيْهِ صَبْراً ﴾ لە مەوداو من هەواڵ ئەدەم بە تۆ بە مانای شتیٚ تۆ توانای ئارام گرتنت نەبوە لەسەری و ئاگاداری ئەنجامەکانت بۆ ئەکەم .

﴿ أمّا السَفِيْنَةَ فَكانَتْ لِمَساكِيْنَ يَعْمَلُونَ فِي الْبَحْرِ ﴾ بەڵام کەشتیەکە کەشتی چەند هەژارێکی باوەڕدار بون کاریان ئەکرد بەو کەشتیە بۆ بەخێوکردنی خۆیان و خێزانیان لەو ڕوبارەدا بەنرخێکی کەم .

﴿ فَأَرَدْتَ أنْ أعَيْبُها وَ كانَ وَرؤاعَهُمْ مَلِكٌ يَأخذُ كُلَّ سَفِيْنَةٍ غَصْباً ﴾ دوایی من ویستم کە ئەو کەشتیە عەیب دار بکەم بە هۆی ئەو کونەوەو لە پێشیانەوە پاشایە هەیە هەمو کەشتێکی چاك و بیٚ عەیب داگیر ئەکا بەزۆر و ناڕەوا، من ئەو کارەم کرد هەتا ئەو کەشتیە داگیر نەکەن .

﴿ وَ أمّا الْغُلامُ فَكانَ أبَواهُ مُؤمِنِيْنَ فَخَشَيْنا أنْ يُرْهِقُها طفياناً وَ كُفْراً ﴾ وە ئەو کوڕەی من کوشتم باوك ودایکی باوەڕدارن و ئێمە ترساین کە ئەو کوڕە دایك و باوکی خۆی ناچار بکاو دایان بپۆشیٚ بە لادان لە خوا پەرستی و بیٚ باوەڕیان بکا و سوپاسی چاکەی خوا نەکەن و ڕێگەی خراپی ئەو بگرن بە هۆی خۆشەویستی ئەو کوڕەوە. بەگوێرەی فەرمانی خوا ئەو کارەم کرد و کوشتم .

﴿ فَأَرَدْنا أنْ يَبْدِلَهما ربّهما خَيْراً مِنْهُ وَ أقْرَبُ رُحْماً ﴾ دوایی ویستمان پەروەردگاری باوك و دایکی ئەو کوڕە ببەخشیٚ بەوان کوڕێکی لەو چاکتر لەو کوڕە پاکتر بیٚ لەو نزیکتربیٚ لەو کوڕە خۆشەویستر و خاوەن بەزەیی تر بیٚ بۆ ئەوان .

﴿ أمّا الْجِدارُ فَكانَ لِغُلامَيْنِ يَتِمَيْنِ فِي الْمَدِيْنَةِ وَكانَ تَحْتَهُ كَنْزٌ لَهُما وَكانَ أبُوهُما صالِحاً ﴾ وە بەڵام ئەو دیوارە دیواری دوو کوڕی بیٚ باوك و دایك بوو لەو شارەدا لە ژێر دیوارەکەوە گەنجینەیەکی زێریان هەیە ئەگەر ئەودیوارە بڕوخایە دانیشتوان پارەکانیان ئەبرد و لە کیسیان ئەچوو ئەو دوو کوڕە باوکیان پیاوچاك و باوەڕدار بوە .

﴿ فأراد ربك أن يبلغا أشدهما و يستخرجا كنزهما رحمة من ربك ﴾ دوایی پەروەردگاری تۆ ویستی ئەو دوو کورە بگەنە کاتی بالغبون و ئەقل و شارەزایی پەیدا بکەن و گەنجینەکەی خۆیان دەربهینن لەبەر ئەوەبو خوا بە میهرەبانی و بەزەیی پەروەردگاری خۆیان ئەو کارەیان لەگەل بکا .

﴿ و ما فعلت عن امري ذلك تأويل مالم تستطيع عليه صبرا ﴾ وە من ئەو کارانەم نەکردوە بە بیرو بۆچوونی خۆمەوەو بە فەرمانی خوا من ئەو کارانەم کردوە، ئەو سی وەلامانەی من وەلامی تۆم پی دایەوە ماناو ئەنجامی شتی بون تۆ توانای ئارام گرتنت لەسەریان نەبوە .

ئاگاداریيە لەبارەی زیندوویی خزر یا مردنی: زانای بەرز شیخ موحەمەدی کوری سەیدە دەرویش مەشهور بە حوتی ئەلبیراتی لە نامەی خۆیا (أستی مطالب) لاپەرە (٢٢٩ – ٢٣٠) ئەفەرموی: { دۆستانی خواو پیاو چاکان زیندوویتی خزر بە شتیکی بروا پیکراوی نازانن و بەلگەی راستی لەسەر نیە، ئەو فەرمودەیە ئەدریتە پال پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ زەعیفە، ئیبنوحەبەر و سەخاوی ئەلین: ئەو فەرمودەیە مونکەرە، هەروەها ویندوو بونەوەی ئیلیاسیش راست نیە و پوچە گوایا هەمو سالی لەکاتی حەجدا لەگەل خزر کۆ ئەبیتەوە. بەکورتی هەمو ئەو هەوالانە دەربارەی زیندوییەتی خزرەوە هاتوون راست نین}

ئەو ئایەتە ئەمانەمان فیر ئەکەن: چەند کاری هەن بە رووالەت چاکن و لەژیرەوە سزادراو وسەختن و هۆی دەرچونن لە دەستوری خوا، وایش ئەبی بە گویرەی رووالەت هەندی کار خراپن. بەلام لە نهینیدا چاکن و ئەنجامەکانیان سود بەخشن، ئەوەی جیگەی شایستە بی ئیمە لەهەمو کاتیکدا خۆراگر بین وبیرو بۆچوونی خۆمانی تیدا یەکار نەیەرین هەتا پاشەرۆژی ئەو کارەمان بۆ دەرئەکەوی. پیاوی خاوەن ئەقل بەگویرەی دەستوری ئیسلام کاریکی خراپ ئەکا بۆ ئەوەی کاریکی زۆرتر خراپتر رونەداو بە رەوایش ئەژمیری، زۆر جاران دیومانە ئەبی مرۆڤی ئەندامیکی خۆی ببری بۆ مانەوەی

ئەنادمەکانی تری، زۆرجاران دیومانە بنەماڵەیەکی خوا پەرست وخاوەن سوود بـە هـۆی منالیکیانەوە بی ئابرو ئەبن و ناموسیان ئەرووشی. کەواتە پیویستە لەسەر باوك ودایـك و کاربەدەستان واز لـە منالو خـیزانی خۆیـان نـەهینن لەبـەر پاراسـتنی ریـز پـاکی خۆیـان وچاکەی بنەمالـەکەیان .

بەیاریدەی خوا کۆتایی بە ماناکردنی جزمی پازدەهەم هات

رۆژی سی‌شەممە ( ١٤٢٠ هـ ) ( ٢٤) ی مانگی زیلقەعدە ریکەوتی ٢٩ / ٢ / ٢٠٠٠

خوا یاریدەرمان بی بۆ هەمو کاری

بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان. درودی بێ پایان لەسەر پێشەوای بونەوەران و یارو یاوەران و خێزان و پەیرەوانی. لەجزمی پازدە ئایەتی (٨٥) سورەتی ئەلئیسرا دا ڕون کرایەوە کە عەرەبەکان بە هاندانی جوەکان پرسیاریان لە پێغەمەر کرد لە بارەی گیانەوە (الروّح) لەم سورەتەدا و لەئایەتی (١٣) هەتا ئایەتی (٢٢) پرسیاریان لێ کرد دەربارەی دانیشتوانی ئەشکەوت، خوا فەرمانی دا بە پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ وەلأمەکانیان دایەوە .لەم ئایەتانەی دوایشدا پرسیاری لێ ئەکەن لە بارەی (ذولقەرنەینەوە ) وەك خوا ئەفەرموێ :

وَيَسْـَٔلُونَكَ عَن ذِي ٱلْقَرْنَيْنِ ۖ قُلْ سَأَتْلُوا۟ عَلَيْكُم مِّنْهُ ذِكْرًا ﴿٨٣﴾ إِنَّا مَكَّنَّا لَهُۥ فِى ٱلْأَرْضِ وَءَاتَيْنَٰهُ مِن كُلِّ شَىْءٍ سَبَبًا ﴿٨٤﴾ فَأَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٥﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَغْرِبَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَغْرُبُ فِى عَيْنٍ حَمِئَةٍ وَوَجَدَ عِندَهَا قَوْمًا ۗ قُلْنَا يَٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِمَّآ أَن تُعَذِّبَ وَإِمَّآ أَن تَتَّخِذَ فِيهِمْ حُسْنًا ﴿٨٦﴾ قَالَ أَمَّا مَن ظَلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبُهُۥ ثُمَّ يُرَدُّ إِلَىٰ رَبِّهِۦ فَيُعَذِّبُهُۥ عَذَابًا نُّكْرًا ﴿٨٧﴾ وَأَمَّا مَنْ ءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَلَهُۥ جَزَآءً ٱلْحُسْنَىٰ ۖ وَسَنَقُولُ لَهُۥ مِنْ أَمْرِنَا يُسْرًا ﴿٨٨﴾ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٨٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ مَطْلِعَ ٱلشَّمْسِ وَجَدَهَا تَطْلُعُ عَلَىٰ قَوْمٍ لَّمْ نَجْعَل لَّهُم مِّن دُونِهَا سِتْرًا ﴿٩٠﴾ كَذَٰلِكَ وَقَدْ أَحَطْنَا بِمَا لَدَيْهِ خُبْرًا ﴿٩١﴾

﴿ وَ يَسْأَلُونَكَ عَنْ ذِي الْقَرْنَيْنِ قُلْ سَأَتْلُوا عَلَيْكُمْ مِنْهُ ذِكْراً ﴾ وە بێ باوەڕانی قورەیش پرسیار ئەكەن لە تۆ بە هاندانی جوەكان لە ذولقەرنەین كە ئەو كەسە زۆربەی ئـاوەدانی سەردەمی خۆی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی. تۆ بڵێ: من ئەخوێنمـەوە بەسـەر ئێـوەدا لـە بارەی ئەو مرۆڤەوە باس كردنی هەندێ لەكارەكانی .

زانایان و مێژوو نوسان بیرو بۆچونیان جیاوازە لە بارەی ذولقەرنەین: چ كەسێكە، ئایا فریشتەیە یا ئادەمیزادە پێغەمەرە یا بەندەیەكی چـاكی خـوا پەرستە؟ بۆچـی نـاوبراوە بـە ذولقەرنەین؟ ذولقەرنەین ناوی ئەسـكەندەرە، ئـادەمیزادە وە فریشـتە نیـە. هـەندێ لـە زانایان ئەڵێن: پێغەمەرە، هەندێ تریان لایان وایە پێغەمەر نیــە و گومـان لـە پیـاو چـاكی ئـەودا نیـە و ئـەو بۆچونـە فـەرمودەی زۆری زانایانـە، نـاوی بـراوە بـە ذولقەرنـــەین لەبەرئەوەی باوك و دایكی بەڕێز بـــوون، هـەندێ لایـان وایـە لەبەرئەوەیـە خۆرنشـین و خۆرهەڵاتی داگیركردوە، چەندین بیرو بۆچونی زۆرتر هەن. خوای مەزن و پێغەمـەر لـەو بارەیەوە هیچ شتێكی لە بارەی ذولقەرنەینەوە ڕون نەكردوەتەوە .

ئیبنو قوتەیبەی دینەوەری لە نامەی (ئەلمەعاریف لاپـەڕە ٢٥) ئەفـەرموێ ذولقەرنـەین ناوی ئەو (ئەسكەندەروسە) دانیشتوی ئەسكەندەریە بوە، خەوێكی بینی وای زانـی نزیـك بوەتەوە لە خۆرەوە و بەجۆرێ دەستی گرتبوو بە دووشاخەی خۆردا، بۆیــە نـاوبراوە بـە ذولقەرنەین) بەڵام قورئـانی پـیرۆز نرخـی نـەداوە بـەباس كـردن و ناونیشـانی كەسـانی ڕابوردوو، واچاكە ئێمە خۆمان خەریك نەكەین بە شتێكەوە سودی هەردوو جیهانی تێـدا نەبێ. ئەوەی شایانی باسبێ چەند كەسێ پرسیاریان لــە پێغەمـەر كـردوە لـەو پیـاوە پێـی ووتراوە ذولقەرنەین، دوایی خوای مەزن وەڵامەكەی فێری پێغەمەر كردوە، بەم جـۆرەی كە خوا ئەفەرموێ:

﴿ إِنَّا مَكَّنَّا لَـهُ فِي الأَرْضِ وَ آتَيْنَاهُ مِنْ كُلِّ شَيْءٍ سَبَباً ﴾ وە ئێمـە گێڕابومـان بـۆ ذولـقەرنەین هێز و فەرمانڕەوایی لـە زەویدا هێزێكی وامان پێ بەخشیبو بتوانێ هاتوچۆ بكـا بەناو شارەكانی زەویدا بەهەر جۆرێ ئـارەزۆی بكردایـە و سـەرئەكەوت لـە جـەنگدا و

پیلانی لێ نەئەکراو ڕێگەی لێ نەئەگیراو، ئێمە بەئەومان بەخشیبوو بۆمان ئامادەکردبو شتێکی ئەوتۆ بیگەیەنێ بەجێگەیە بیەوێ بۆی بڕوا، لەش ساغی وشارەزایی ودارایی و چەکی جەنگ و سەربازی زۆر و پسپۆری بۆ سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی خۆیا دابومانێ. ناوەڕۆکی ئەو ئایەتە بۆمان ڕون ئەکاتەوە هەر چەندە خوا یاریدەی بەندەی خۆیەتی. بەلاّم پێویستیە بۆ هەموو کارێ پێشەکی هۆیەکانی سەرکەوتن ئامادەبکرێ هەتا دوژمن بترسێ و هەرگیز خوای مەزن بەڕەوای دانانێ بەبێ هۆی سەرکەوتن لە کارو کردەوەدا پەلاماری دوژمن بدرێ لە جیهاندا .

﴿ فَاتْبَعَ سَبَباً حَتَى إذا بَلَغَ مَغْرِبَ الْشَمْسِ ﴾ دوایی ذولقەرنەین دوای ئەو هۆو ڕێگەیە کەوت خوا بۆی ئامادە کردبوو خستیە کار بۆ جێ بەجێ کردنی هەمو کارە چاکەکان کەوتە بیرکردنەوە بۆ دۆزینەوەی ڕێگەی سەرکەوتن هەتا گەیشتە جێگەیە بە چاو ئەبینرا خۆرئاوا ئەبێ و چوە ناو شارەکانی خۆرئاوا کە ئەوپەڕی ئاوەدانی زەویە لای خۆرئاوا .

﴿ وَجَدَها تَغْرُبُ فِي عَيْنٍ حَمِئَةٍ ﴾ ذولقەرنەین بینی ودەستی کەوت خۆرئاوا ئەبێ لەنێوان قوڕێکی ڕەش و گەرم و لە نێو دەریایە لە دەریاکانا، زانای بەرز مەراغی ئەڵێ: دەریای ئەتڵەنتیە. بەلاّم خوا ئەیزانێ چ دەریایەکە .

﴿ وَ وَجَدَ عِنْدَها قَوْماً ﴾ وە ذولقەرنەین لای ئەو سەرچاوەیە تاقمێ ئادەمیزادی دەست کەوت. زانایان ئەڵێن تاقمێ بوون بت پەرست کەل و پەل و بەرگیان پێستی گیانداران بو، خواردەمەنیان لەو شتانە پەیدا ئەکرد ڕاویان ئەکردن لەناو ئاو وشکانیدا وێنەی ماسی وجگەی ماسی .

﴿ قُلْنا يا ذا الْقَرْنَيْنِ إمّا أنْ تعذب ﴾ ئێمە ووتمان ئەی ذولقەرنەین: تۆ یا سزای ئەو تاقمە بدەی بە کوشتن ئەگەر باوەڕیان نەهێناو دەستیان دایە جەنگ کردن و ستەمیان لە خۆیان کرد بەبۆنەی مانەوەیان لەسەر بت پەرستی .

﴿ وَ إمّا أنْ تَتَّخِذَ فِيْهِمْ حُسْناً ﴾ یا تۆ لەوان ببورە و شارەزای یاسای خوا پەرستیان بکە و چاکەیان لەگەڵ بکە و مەیان کوژە ئەگەر جەنگیان لەگەڵ نەکردی، ئەتوانی

بەندیان بکەی هەتا باوەڕ بهێنن. ئەبێ بزانرێ چاکە کردن لەگەڵ بێ باوەڕانا دروستە ئەگەر جەنگیان نەکرد و کەسیان ئاوارە نەکرد، ئەگەر ئاوارە کرابن پێویستە بەرگری لە خۆمان بکەین .

﴿ قَالَ أَمّا مَنْ أَظْلَمَ فَسَوْفَ نُعَذِّبَهُ ﴾ ذولقەرنەین ووتی: بەلاّم کەسێ لەو تاقمە ستەمی لەخۆی کرد و بێ باوەڕبو، دوایی سزای ئەو کەسە ئەدەین بە کوشتن ئەگەر باوەڕی نەهێنا و بەردەوام بوو لەسەر بت پەرستی. فەرمان ئەدەین بەو سزایە لە جیهاندا .

﴿ ثُمَّ يَرُدُّ إلى رَبِّهِ فَيُعَذِّبَهُ عَذاباً نُكراً ﴾ لە پاشا ئەگێڕرێتەوە بۆ لای پەروەردگاری خۆی لەپاشەڕۆژدا، دوایی پەروەردگار سزای ئەدا بەسزایەکی سەخت وناهەموار و گران .

﴿ وَ أمّا مَنْ آمَنَ وَ عَمِلَ صالِحاً فَلَهُ جَزاءُ الْحُسْنى وَ سَنَقُولُ لَهُ مِنْ أمْرِنا يُسْراً ﴾ وە بەلاّم کەسێ باوەڕی هێنابوو کردەوەی چاکی کردبوو، دوایی بۆ ئەو کەسە هەیە پاداشتێکی چاك لە جیهاندا و لەپاشەڕۆژدا و ئێمە بەو کەسە ئەڵێین: لەو شتەدا ئێمە فەرمانی پێ ئەدەین بە ئاسان و بەشتێ گران نەبێ لەسەری ئەو شتە. ئەوانەی باسکران یاسای ئێمەیە و خوا خستویەتیە دڵمەوە .

﴿ ثُمَّ أتْبَعَ سَبَباً حَتى إذا بَلَغَ مَطْلَعَ الْشَمْسِ ﴾ لە پاشا ذولقەرنەین جارێ تری دووهەم دووای هۆیەکی تر کەوت و کەوتە ڕێگە بۆ جێ بەجێ کردنی کارێکی تری چاك بەرەو خۆرهەلاّت هەتا کاتێ گەیشتە جێگەیە خۆری لێ هەڵئەهات لە لای ژووروی ئاوەدانی لە زەویدا .

﴿ وَجَدَها تَطْلَعُ عَلى قَوْمٍ لَمْ تجعَلُ لَهُمْ مِنْ دُونِها سِتْراً ﴾ ذولقەرنەین بینی و دەستی کەوت خۆر هەڵدێ لەسەر تاقمێ لە ئادەمیزاد ئێمە نەمان گێڕابو بۆ ئەو تاقمە شتێ بکەوێتە نێوان ئەوان وخۆر و بیانپارێزێ لەگەرما و خۆر لەبەرگ و لە خانو وشتی تر، پەنایان ئەبرد دوای هەڵهاتنی خۆر بۆ لای ئەشکەوتەکان وچاڵ و چۆڵی دۆڵ و شیوەکانی زەوی، شەوێ ئەهاتە دەرەوە بۆ کارکردن و پەیداکردنی هۆی ژیانی خۆیان بە پێچەوانەی کاری ئادەمیزادی ترە .

خوای مەزن ڕونی نەکردوەتەوە کە ذولقەرنەین چ شتێکی لەگەڵ ئەو تاقمە کرد: ئایا چاکەی لەگەڵ کرد نبەگوێرەی باوەڕهێنان بە خوا و بەگوێرەی بێ باوەڕیان، یـا وازی لێ هێنان کە بەردەوامبن لەسەر ئـەو ژیانـەی لەسـەری بـوون، بـە تایبـەتی لەسـەر ئـەوبێ شارستانیەتەی خۆیان، بۆیە هەواڵەی زانیاری خـوای ئەکـەین. بـەڵام خـاوەنی تەفسـیری بەیزاوی لە تەفسیرەکەی خۆیا ئەفەرموێ: ئەوکارەی لـەگەڵ دانیشتوانی خۆرئـاوای کـرد هـەر بـەو جـۆرەی لـەگـەڵ ئـەم تاقمـەی خۆرهـەڵاتی کـرد، خۆیـانی سەربەسـت کـرد لەباوەڕهێنان و باوەڕنەهێناندا .

﴿ كَذَلِكَ وَقَدْ أَحَطْنا بِما لَدَيْهِ خبراً ﴾ هـەر بـەو جـۆرەی باسـکرا لـە بـەرزی پلـەی ذولقەرنەین و فراوانی دەستەڵاتی لە خۆرئاوادا و ئەو کارەی کردی لەگەڵ دانیشـتوانیدا هەمان کاریشی کرد لەگەڵ دانیشتوانی خۆرهەڵاتا و بەڕاستی ئێمە بەخشیومان زانیاریـە کەشیاوی ئەو کارانە بێ بەهۆی شتێ درابو بەو لەسەرباز و کەرەسە و تفـاقی جـەنگ و هۆیەکانی پاشایەتی .

بۆ زانین: دانیشتوانی خۆرهەڵات بە وێنەی زینـەوەرانی کێوانـدا ئـەژیان، هـەندێ لـە زانایان ئەڵێن: شارەکانیان کەوتوەتە سەر کەناری خۆرهەڵاتی ئەفەریقا .

ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَبًا ﴿٩٢﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغَ بَيْنَ ٱلسَّدَّيْنِ وَجَدَ مِن دُونِهِمَا قَوْمًا لَّا يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلًا ﴿٩٣﴾ قَالُوا۟ يَـٰذَا ٱلْقَرْنَيْنِ إِنَّ يَأْجُوجَ وَمَأْجُوجَ مُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجًا عَلَىٰٓ أَن تَجْعَلَ بَيْنَنَا وَبَيْنَهُمْ سَدًّا ﴿٩٤﴾ قَالَ مَا مَكَّنِّى فِيهِ رَبِّى خَيْرٌ فَأَعِينُونِى بِقُوَّةٍ أَجْعَلْ بَيْنَكُمْ وَبَيْنَهُمْ رَدْمًا ﴿٩٥﴾ ءَاتُونِى زُبَرَ ٱلْحَدِيدِ ۖ حَتَّىٰٓ إِذَا سَاوَىٰ بَيْنَ ٱلصَّدَفَيْنِ

قَالَ انفُخُوا حَتَّىٰ إِذَا جَعَلَهُ نَارًا قَالَ آتُونِي أُفْرِغْ عَلَيْهِ قِطْرًا ﴿٩٦﴾ فَمَا اسْطَاعُوا أَن يَظْهَرُوهُ وَمَا اسْتَطَاعُوا لَهُ نَقْبًا ﴿٩٧﴾ قَالَ هَٰذَا رَحْمَةٌ مِّن رَّبِّي فَإِذَا جَاءَ وَعْدُ رَبِّي جَعَلَهُ دَكَّاءَ وَكَانَ وَعْدُ رَبِّي حَقًّا ﴿٩٨﴾ وَتَرَكْنَا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يَمُوجُ فِي بَعْضٍ وَنُفِخَ فِي الصُّورِ فَجَمَعْنَاهُمْ جَمْعًا ﴿٩٩﴾

﴿ ثُمَّ أَتْبَعَ سَبَباً حَتَّى إذا بَلَغَ بَيْنَ السَّدَّيْنِ ﴾ لە پاشا ذولقەرنەین دوای هۆیەك و ڕێگەی سێهەم کەوت بۆ لای شوێنێکی تر جگەی خۆرئاوا وخۆرهەلأت لە باشوورەوە بەرەو باکوور هەتا گەیشتە نێوان دوو کێو کەلەپشتی ئەو دووکێوانەوە هۆزەکانی یاجوج و ماجوج کردبویان بە نیشتمان بۆ خۆیان .

بە جۆرێکی دیاری‌کراو ئەو دووو هۆزە چ کەسێکن و لەشیان چۆنە و نیشتمانیان چ جێگەیەکە؟ زانایان بیر و بۆ چونیان جیاوازە، هەندێکیان ئەڵێن: زر کورتە بالاّ و هەندێ تریان لایان وایە زۆر بالأیان بەرزەو زۆر شتی تریش لە بارەی شێوازیانەوە. زۆر لەو شێوازانە لەگەڵ ئەقڵدا گونجاو نیە .بەلأم ئەوەی جێگەی بڕوا بێ ئەمەیە: ئەوانە دوو هۆزن لە ئادەمیزاد، ئەقڵ لاوازو هەرچی و پەرچین و ستەمکارن. یاجوج بریتین لە تەتەرەکان، ماجوج بریتین لە مەغۆلیەکان، لە بنچینەدا کوڕی یەك باوکن ناوی (تورك) بوە. هەندێ زانایان لایان وایە دانیشتوی ڕۆژئاوای سنووری ( چینن ) هەندێ تریان ئەڵێن: دانیشتوی باکوری ڕۆژهەلأتی دانیشتوی کۆنی سەردەمی ذولقەرنەینن. زۆر جاران پەلاماری دراوسێکانی خۆیان ئەدەن و تالأنیان ئەکردن. جێنگیز خان و هۆلاکۆ و تەیمور لەنگ لەوانن و لەو دوو هۆزەن. بە بیری من واچاکە هەواڵەی زانیاری خوایان بکەین.

﴿ وَجَدَ مِنْ دُونِهِما قَوْماً لاَ يَكادُونَ يَفْقَهُونَ قَوْلاً ﴾ ذولقەرنەین بینی و دەستی کەوت لەبەردەم ئەو دوو کێوەدا تاقمێ هەن نزیك نەبوو لە هیچ گفتوگۆیە بگەن و جگەی زمانی خۆیان هیچ زمانێ تریان نەئەزانی. بە ماندو بونێکی زۆر جگەی خۆیان لە زمانی ئەوان بگەن .

﴿ قالُوا يا ذا الْقَرْنَيْنِ إنَّ يأجُوجَ و مَأجُوجَ مُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ ﴾ بەهۆی کەسێکەوە زمانی ئەوان وزمانی ئەمانی ئەزانی ئەو تاقمە ووتیان: ئەی زولقەرنەین: بەڕاستی هۆزەکانی یاجوج وماجوج خراپەی زۆر بڵاو ئەکەنەوە لە زەوی و نیشتمانی ئێمەدا تالاَن وجەردەیی و کوشتن بەبێ ئەندازە، ئەوەندە زۆرن وەك کولە بڵاو ئەبنەوە، تەڕ و ووشك نایەڵن و ئەیخۆن و ئەیبەن لەگەڵ خۆیان .

﴿ فَهَلْ نَجْعَلُ لَكَ خَرْجاً عَلى أنْ تَجْعَلَ بَيْنَنا وَ بَيْنَهُمْ سَداً ﴾ دوایی ئەو تاقمە بە زولقەرنەینیان ووت: ئایا ئێمە کۆ بکەینەوەو بیگێڕن بۆ تۆ کرێ لە دارایی خۆمان لەسەر ئەوەی کە تۆ دروست بکەی ڕێگرێ و بیگێڕێ لە نێوان ئەو دوو هۆزە ڕەوشتیان جا نەوەرانەیە ببێتە هۆی پەلامارنەدانیان بۆ سەر ئێمە. زانایان بۆ دیاری کردنی شوێنی ئەو ڕێگرە و ئەو سەدە بیر و بۆچونیان جیاوازە. زانای بەناوبانگی میسری مامۆستا (مەراغی) ئەی گێڕێتەوە لە گۆڤاری (المقتطف) لە ساڵی (١٩٨٨) زاینی ئەو ڕێگرەی زولقەرنەین کەوتوەتە پشت دەریای (جەیحون) لە پارێزگاری (بەلْخدا) و ئێستا ناو ئەبرێ بە (باب الحدید) = دەرگای پۆلایین، لە نزیك شاری (تورموزەوە). زانای ئەڵمانی (سیلد برجر) و مێژوو زانی ئەسپانی (کلا فیحو) لە گەشتەکەیدا ساڵی (١٤٠٣) زایینی، هەردوو زاناکان پشت گیری ئەو بیر وبۆچونەی مەراغیان کردوە.. لە مێژووی زۆر کۆنەوە هەندێ لە زانایان ووتویانە: ئەو ڕێگرە ئەکەوێتە ئەرمینیا و ئازەر بایجانەوە، مێژوونوسی بەڕێز مامۆستا (تەبەری) ئەڵێ: پیاوێ ڕۆیشتوە بۆ لای ئەو ڕێگرە کە لەلای دەریای ( خەزەرە ) و وای باس کردوە کە جێگەیەکی بەرزە لە پشتیەوە چاڵ و چۆڵ و دۆڵێك و شوێنێکی قوڵ هەیە .

لەو بیر وبۆچونە جیاوازانەوە بۆمان دەرکەوت بە جۆرێکی ڕون جێگەی ئەو ڕێگرە بەجۆرێ دیاری نەکراوە جێگەی متمانە بێت.کەواتە ئەوەی پێویستە بۆ ئێمە ئەمەیە: بڕوامان بە دروستکردنی ئەو سەدە هەبێ، جێگەی دیاری بۆ کراوی هەواڵەی زانیاری خوای بکەین .

﴿ قَالَ ما مكّني فِيْهِ رَبّي خَيْرٌ فَأعِينُوني بَقُوَةٍ ﴾ زولقەرنەین وتی: شتێکی ئەوتۆ پەروەردگاری من دەستەلاتی منی بەسەردا پەیدا کردوە و بەخشیوە بە من چاکترە لەو شتەی خوا بەخشیویە بە ئێوە و ئێوە خۆتان زۆرتر پێویستیتان بە دارایی خۆتان هەیە و بۆ خۆتانی سەرف بکەن، دوایی ئێوە یارمەتی من بدەن بە کرێکار و بە کەرەسەی خانوو دروست کردنن، من بە خۆڕایی ئەو ڕێگرەتان بۆ دروست ئەکەم.کەواتە ئەندازیارەکان ئامادە بکەن بۆ من بۆ دروست کردنی ئەو سەدە .

﴿ أجْعَلَ بَيْنَكُمْ وَ بَيْنَهُمْ رُدْماً ﴾ من دروست ئەکەم و ئەگێرم لە نێوان ئێوەو ئەو دوو هۆزە دڕوندانەدا ڕێگرێکی زۆر سەخت سەدێ ڕێگە بگرێ لەوان و نەتوانن بێنە ئەم دیوی لای ئێوە .

﴿ آتُوني زبر الْحَدِيْدَ حَتّى إذا ساوى بَيْنَ الصَّدَفَيْنِ ﴾ ئێوە ببەخشن بە من پارچەی زۆر ئاسن و بیان خەنە سەر یەك بەیەکسانی هەتا کاتێ ڕێك ئەبن لە نێوان هەردوو لای کێوەکان و لە خوارەوە بۆ سەر پڕ ئەبن لە پارچەی ئاسن، دوایی سوتەمەنی بهێنن و ئاگری تێ بەربدەن و فودانیان بۆ دابنێن، دوایی ئەو کارەتان بۆ ساز ئەکەم، ئەوانیش داواکانی زولقەرنەینیان جێ بەجێ کرد .

﴿ قَالَ انْفَخُوا حَتّى إذا جَعَلَهُ ناراً قَالَ آتُونِيَ أفْرِغُ عَلَيْهِ قِطراً ﴾ زولقەرنەین بە ئەندازیارو کرێکارەکانی ووت: ئێوە فو بکەن بە کورەکان و بە ئاگرەکەدا هەتا کاتێ ئەو ئاشتانەو ئە وچاڵە وەك ئاگریان لێدێ و ئەتوێنەوە، لەو کاتە وەك ئاگری لێ هات زولقەرنەین ووتی: ئێوە بۆ منی بهێنن مس و ئاسن و پۆڵای تواوە من ئەیڕێژم بەسەر ئەم لاو لای دیوارەکانیا، بۆ ئەوەی بڕۆن بە ناو بۆشایی پارچە ئاسنەکاندا و ئەلکێن بەیەکدا وبۆشایی تێدا نامێنێ، بەوینەی کێوێکی لێ دێ .

﴿ فَما اسْتَطاعُوا أنْ يُظْهِرُوهُ وَما اسْتَطاعُوا لَـهُ نقيا ﴾ دوایـی ئـەو دوو هـۆز ەتوانـای ئەوەیان نامێنیّ کە سەری ئـەو ڕێگـر و سـەدە بکـەون لەبـەرزی و لوّسـی ئـەو دیـوارە وتوانای کون کردنی دیوارەکەیان نابیّ لەبەر ڕەقی ئەو دیوارە .

﴿ قَالَ هَذا رَحْمَةٌ مِنْ رَبِّي ﴾ زولقەرنەین ووتی: دوای دروست کردنـی ئـەو ڕێگـرە: دروستکردنەکەی چاکەیەکە لەلایەن پەروەردگاری منەوە بەتەنها کە قەدەغەی هاتنی ئەو دوو هۆزە خوێن مژە وکاول کەرانە ئەکا لە هاتنیان بۆ ئەو دیـوی ئـەم ڕێگـرە و نـاتوانن تالاّن و خراپە بکەن .

﴿ فَأذا جاءَ وَعْدُ رَبّي جَعَلَهُ دَكاءَ وَكانَ وعد رَبّي حقاً ﴾ دوایی هەرکاتیّ نزیك بویـەوە ئەو کاتەی ئەوتۆ یاجوج وماجوج بێنە دەرەوە لە پشتی ئەو ڕێگرەوە بـۆ ئـەم دیـو خـوا ئامادەی ئەکا هۆی ڕوخانی و نەمانی و بەڵێنی خوا ڕاستە و گومانی تێدا نیە، کاتی ڕوخان ونەمانی ئەو ڕێگرە خوا ڕونی نەکردوەتەوە .

زانایان بیریان جیاوازە بۆ کاتی هاتنی ئـەو بەڵێنـەی خـوای مـەزن: زانـاو مامۆسـتای مەراغی لە تەفسیرەکانی خۆیانـا ئـەڵێن: ئـەو کاتـە ڕوی داوە بـەهاتنی جێنگـیز خـان و نـەوەکانی، ئـەوەبو ئـاوەدانی و شـارەکانی ئـەو سـەردەمەیان ڕوخـان وزۆربـەی زۆری دانیشتوانی ئەو شارانەیان کوشت هەر لە چینەوە هەتا شام، بـە جـۆریّ مێـژو شـتی وای بەخۆیەوە نەدیوە .

خاوەنی تەفسیری (مجمـع البیـان) تەبەرسـی لای وایـە کـاتی هـاتنی ئەوبەڵێنـە دوای کوشتنی دەجال ئەبیّ، پێشەوا ڕازی ئەڵیّ لە ڕۆژی دواییدا ئەبیّ، ئەو بۆ چونـەی پێشـەوا ڕازی ئەچێتە دڵەوە بە گوێرەی ئەوەی خوای مەزن ئەفەرمویّ:

﴿ وَتَرَكْنا بَعْضَهُمْ يَوْمَئِذٍ يموج فِي بَعْضٍ ﴾ وە ئێمە ئە گێڕین هەندیّ لە یاجوج مـاجوج بڕۆن بەناو یەکا بەوێنەی شەپۆلی ئاو لە زۆریـدا لـەو ڕۆژەدا ڕێگرەکـە ئەشـکیّ و دێنـە دەرەوە لـە پشتی سەدەکەوە. بەڕاستی ئێمە ئەزانین کـە یـاجوج و مـاجوج بـلاّو، ئەبنـەوە بەزەویدا دوای ڕوخانی ڕێگرەکە و خراپـە بەکارئـەهێنن لەگـەڵ ئـادەمیزاد. هـەندیّ لـە

زانایان ئەڵێن ئەو ڕۆژی دوایی بونەوەران هەندێکیان ئەچن بەناو هەندێ تریانا بە ئادەمیزاد و بە جنۆکەیانەوە بەسەر گەردانی دێن وئەڕۆن .

﴿ وَ نُفِخَ فِي الصّور فَجَمَعْناهُمْ جَمْعاً ﴾ وە لەو ڕۆژەدا فو ئەکرێ بە سوردا بۆ جێگەی ڕاوەستان زیندوو ئەکرێنەوە، دوایی ئێمە بونەوەران کۆ ئەکەینەوە بۆ پرسیارو وەلاّم بە کۆکردنەوەیەکی وا هیچ کەسێ بەجێ نامێنێ، هەمویان پاداشت و تۆڵەی خۆیان وەرئەگرن .

بۆ زانین: سور بە گوێرەی فەرمودەی پێغەمەر ﴿ ﷺ ﴾ بریتیە لە کەڵەشاخێ بەوێنەی سەرباز بانگیان ئەکرێ بۆ کۆبونەوەی دەشتی مەشق کردن. وەك چەند جارێ باسکرا: مەرج نیە دیاری کردنی جێگەی ئەو ڕێگرە و سەرچاوەیە نیە بۆ دیاری کردنی و ئێمە بڕوامان بەبونی هەیە هەمو شتێ هەر خوا ئەیزانێ .

وَعَرَضْنَا جَهَنَّمَ يَوْمَئِذٍ لِّلْكَٰفِرِينَ عَرْضًا ﴿١٠٠﴾ ٱلَّذِينَ كَانَتْ أَعْيُنُهُمْ فِى غِطَآءٍ عَن ذِكْرِى وَكَانُوا۟ لَا يَسْتَطِيعُونَ سَمْعًا ﴿١٠١﴾ أَفَحَسِبَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوٓا۟ أَن يَتَّخِذُوا۟ عِبَادِى مِن دُونِىٓ أَوْلِيَآءَ ۚ إِنَّآ أَعْتَدْنَا جَهَنَّمَ لِلْكَٰفِرِينَ نُزُلًا ﴿١٠٢﴾ قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُم بِٱلْأَخْسَرِينَ أَعْمَٰلًا ﴿١٠٣﴾ ٱلَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعًا ﴿١٠٤﴾ أُو۟لَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَلِقَآئِهِۦ فَحَبِطَتْ أَعْمَٰلُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وَزْنًا ﴿١٠٥﴾ ذَٰلِكَ جَزَآؤُهُمْ جَهَنَّمُ بِمَا كَفَرُوا۟ وَٱتَّخَذُوٓا۟ ءَايَٰتِى وَرُسُلِى هُزُوًا ﴿١٠٦﴾

﴿ وَ عَرَضْنا جَهَنَمَ يَوْمَئِذٍ لِلْكافِرِيْنَ عَرضاً ﴾ وە ئێمە دۆزەخ دەرئەخەین و ڕای ئەنوێنین لە ڕۆژی دواییدا بە دەرخستنێکی وا چاویان پێی بکەوێ بەرلەوەی بخرێنە ناو دۆزەخ بۆ ئەوەی باشتر بترسێنرێن .

﴿ الَّذِيْنَ كانَتْ أعْيُنِهِمْ فِي غِطاءٍ عَنْ ذِكْرِى وَكانُوا لايَسْتَطِيْعُونَ سَمْعاً ﴾ بێ باوەڕێکی ئەوتۆن چاویان لە ژێر پەردەدایە لە یادی من ولەقورئانی ئێمە هەتا تەماشای بکەن وخۆیان بەوێنە کوێر ئەگرن و توانای بیستنی فەرمودەی منیان نیە و خۆیان کەڕ ئەکەن لەئاستی ئەوشتانەی پێغەمەر ئەیخوێندەوە بەسەریانا هەر لەبەرئەوەی پێغەمەریان خۆش نەئەویست .

﴿ افَحَسِبَ الَّذِيْنَ كَفَرُوا انْ يَتّخِذُوا عِبادِي مِنْ دُونِي أوْلِياءَ ﴾ ئایا دوایی کەسانێکی ئەوتۆ باوەڕیان نەهێناوە گومانیان بردوە کە بەندەکانی من وەربگرن بە دۆست و پەرستراوی خۆیان لە جگەی ئێمە بەوێنەی عیسا وعوزەیر و فریشتەکان ئەگەنە فریایان وائەزانن ئێمە سزایان نادەین ؟.

﴿ إنّا أعْتَدنا جِهَنّمَ لِلْكافِرِيْنَ نُزُلاً ﴾ بەڕاستی ئێمە ئامادەمان کردوە دۆزەخ بۆ بێ باوەڕان بەشتێ ئامادە ئەکرێ بۆ میوان، دۆزەخ شایستەی کاری بێ باوەڕانە و میواندراری ئەوانی پێ بکرێ، بێگومان ئەو شتەی پێش کەشیان ئەکرێ ئاوی گەرم و خوادرەمەنی تاڵ و بۆنی زۆر ناخۆشە .

﴿ قُلْ هَلْ انَبِئُكُمْ بِالأخسرين أعمالاً الَّذِيْنَ ضَلَّ سَعْيِهُمْ فِي الْحَياةِ الّدنيا ﴾ تۆ بلێ: ئایا من هەواڵ بە ئێوە بدەم ئەو کەسانەی زیانۆ مەنترینی هەموو کەسن لەبارەی کردەوەکانیانەوە، کەسانێکی ئەوتۆن ونبون لەوان ئەو کۆشش و ماندوبونەیان کردویانن لە ژیانی جیهانیانا، لەبەر بێ ئەقڵی خۆیان هیچ شوێنەوارێکی کردەوەی چاکیان نەماوەو لەکیسی خۆیانیان داوە .

﴿ وَ هُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً ﴾ وە ئەو کەسانە ئەوەندە بێ ئەقڵن گومان ئەبەن کە ئەوان بەڕاستی کردەوەی چاك ئەکەن و وائەزانن پاداشت وەرئەگرن لەسەر کردەوەکانیان. نەزانین و کردەوەی خراپی خۆیانیان بەچاك دائەنا، خوای مەزن بەم جۆرەی خوارەوە باسیان ئەکاو ئەفەرموێ:

﴿ أُولَئِكَ الَّذِيْنَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَ لِقَائِهِ ﴾ ئەو تاقمانە کەسانێکی ئەوتۆن باوەڕیان بەئایەتە ڕونەکانی قورئانی پەروردگاری خۆیان و بەخزمەت گەیشتنی پەروەردەکەری خۆیان نەبوە لە ڕۆژی دواییدا کە زیندوو ئەکرێنەوە و لەبەردەم خوادا پرسیاری کردەوەکانیان لێ ئەکرێ .

﴿ فَحَبِطَتْ أَعْمالُهُمْ فَلا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيامَةِ وَزْناً ﴾ دوایی پوچ بوەتەوە و پاداشتی کردوەکانیان بە هۆی بێ باوەڕی خۆیانەوە، داویی هیچ نرخ و کێشانەیە بۆ ئەو کەسانە بەرپاناکەین لە ڕۆژی دواییدا ونرخ بۆ هیچ کارێ دانانرێ لەگەڵ بێ باوەڕیدا، ئێمە ڕسوا و بێ نرخیان ئەکەین لەو ڕۆژەدا .

﴿ ذلِكَ جَزاؤُهُمْ بِما كَفَرُوا ﴾ ئەو پوچ بونەوەی پاداشتی کردوەکانیان و پەستی و خواری ڕێزیان بەهۆی شتێکەوەبو باوەڕیان پێی نەهێنابو لە زیندو بونەوەو بە خزمەتگەیشتنی خوا .

﴿ وَ اتَّخَذُوا آياتِي وَ رُسُلِي هزوا ﴾ وە بەهۆی ئەوەیشەوە بووە ئایەتەکانی نامەی من و گفتوگۆی پێغەمەرەکانی منیان بەگاڵتە وەرئەگرت سەرباری ئەوەیش باوەڕیان پێ نەئەکردن .

ئەو ئایەتانەی پێشوو وامان پیشان ئەدەن: کە بەڕاستی نرخی مرۆڤ بە بیرو بۆچونی خۆی وبەبیر و بۆچونی دانیشتوان بەراورد ناکرێ. بەڵکو نرخی مرۆڤ بە پەیڕەوی کردنی قورئان و پێغەمەران و بەڕاستی و بەدادپەروەری و خۆبەخت کردنی گیان و بەبەخشینی دارایی بەراورد ئەکرێ .

تەفسیری زمناکۆیی

إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّٰتُ ٱلْفِرْدَوْسِ نُزُلًا ﴿١٠٧﴾ خَٰلِدِينَ فِيهَا لَا يَبْغُونَ عَنْهَا حِوَلًا ﴿١٠٨﴾ قُل لَّوْ كَانَ ٱلْبَحْرُ مِدَادًا لِّكَلِمَٰتِ رَبِّى لَنَفِدَ ٱلْبَحْرُ قَبْلَ أَن تَنفَدَ كَلِمَٰتُ رَبِّى وَلَوْ جِئْنَا بِمِثْلِهِۦ مَدَدًا ﴿١٠٩﴾ قُلْ إِنَّمَآ أَنَا۠ بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُوحَىٰٓ إِلَىَّ أَنَّمَآ إِلَٰهُكُمْ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ فَمَن كَانَ يَرْجُوا۟ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴿١١٠﴾

﴿ إن الذين آمنوا وعملوا الصلحات كانت لهم جنات الفردوس نزلا ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ باوەریان هیناوە بە نامەکانی خوا وپیغەمەرەکانی و کردەوە چاکەکانیان کردوە بۆ ئەو کەسانە هەیە چەندین میوەی باخ و بیستانەکانی بەهەشتی بالا و بەرزی بەرین جیگەیە بۆ میوانداری ئەوان، میوەی ئەو بەهەشتانە کەس نەی دیوەو، بەدلی هیچ کەسیکا نەهاتوە، فیردەوس جیگەیەکی بەرز وپر لەدار ودرەختە وهەمو جۆرە میوەەیکی تیدایە، ئامادەکراوە بۆ میوانداری باوەرداران .

﴿ خالدین فیها لایبغون عنها حولا ﴾ ئەو کەسانە بەردەوامن لەو بەهەشتانەدا، داوای دەرچوون لەو بەهەشتانەدا ناکن، چونکە چاکتریان لەو جیگە دەست ناکەوی وبەتەمای شتی تر نین.

﴿ قل لو کان البحر مدادا لکلمات ربي لنفذ البحر قبل أن تنفذ کلمات ربي ﴾ تۆ بلی: ئەگەر ئاوی هەموو دەریا وزەریای سەر زەوی مورکە ببی بۆ نوسینی فەرمودەکانی خوای پەروەردگاری من. بەراستی کۆتایی بە ئاوی زەریاکان دی و هەموویان نامینن بەر لەوەی فەرمودەکانی پەرورەدگاری من کۆتایی پی بی ،زۆر ئاشکرایە فەرمودەکانی خوا ناژمیررین .

﴿ و لو جئنا بمثله مددا ﴾ وە باوەکو ئیمە وینەی ئاوی ئەو زەریایانە بهینین وبیخەینە سەر هەمو زەریاکانی سەر زەوی بۆ یارمەتی دانی نوسینی فەرمودەکانی خوا. بەراستی زانیاری پەروەردگاری من ئەوەندە زۆرن ئاوی زەریاکانی زەوی ئەوەندەی تریش بخەینە سەریان کۆتایی پی‌دی و فەرمودەکانی خوا هەر ماون و بی کۆتایین .

﴿ قل إنما أنا بشر مثلكم يوحي إلي إنما إلهكم إله واحد ﴾ تۆ بلی: بەراستی من ئادەمیزادیکم وینەی ئیوە، دوای ئەوەی رون بویەوە فەرمودەکانی خوای مەزن زۆرن و زانیاری خوا بی کۆتاییە. ئەبی بزانری زانیاری من زۆر کەمە و جیاوازیم نیە لەگەل ئیوەدا جگەی ئەمە نەبی بەراستی خوا سروش ئەنیری بۆ لای من کە خوای ئیوەیە و، هاوبەشی نیە لە پەرستندا، ئەو شتانەی نابینرین من نایانزانم و لە خۆمەوە هیچ شتی نالیم، ئەوەی بیزانم خوا پیم ئەفەرموی. کەواتە منیش یەکیکم بە وینەی ئیوە .

﴿ فمن كان يرجو لقاو ربه فليعمل عملا صالحا ولا يشرك بعباده ربه أحدا ﴾ دوایی هەرکەسی بە ئومیدی ئەوەیە بەخزمەتی پەروەردگاری خۆی بگا لە رۆژی دواییدا و پاداشتی بداتەوە، دوایی با ئەو کەسە کردەوەی چاك بکا و هیچ کەسی نەکا بەهاوبەشی پەروەردگاری خۆی بۆ پەرستن .

# ﴿ سورەتی مەریەم ﴾

لە مەککە هاتوەتە خوارەوە، هەندێ لە زانایان ئەڵێن: جگە لە ئایەتەکانی (٥٨-٧١) کە لە مەدینە هاتوەتە خوارەوە. ژمارەی ئایەتەکانی (٩٨) ئایەتن.

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

( بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان )

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

كٓهيعٓصٓ ﴿١﴾ ذِكْرُ رَحْمَتِ رَبِّكَ عَبْدَهُۥ زَكَرِيَّآ ﴿٢﴾ إِذْ نَادَىٰ رَبَّهُۥ نِدَآءً خَفِيًّا ﴿٣﴾ قَالَ رَبِّ إِنِّى وَهَنَ ٱلْعَظْمُ مِنِّى وَٱشْتَعَلَ ٱلرَّأْسُ شَيْبًا وَلَمْ أَكُنۢ بِدُعَآئِكَ رَبِّ شَقِيًّا ﴿٤﴾ وَإِنِّى خِفْتُ ٱلْمَوَٰلِىَ مِن وَرَآءِى وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا فَهَبْ لِى مِن لَّدُنكَ وَلِيًّا ﴿٥﴾ يَرِثُنِى وَيَرِثُ مِنْ ءَالِ يَعْقُوبَ ۖ وَٱجْعَلْهُ رَبِّ رَضِيًّا ﴿٦﴾

﴿ كٓهيعٓصٓ ﴾ ئەو پێنج پیتانە لەو پیتانەن کە قورئانیان لێ پێك هاتووە، هەر بەو پیتانە عەرەبەکان هۆنراوەو پەخشانی خۆیانیان پێ ئارایش ئەدا، بێ باوەڕان و زۆربەی کەسانی تری زمان پاراو خاوەنی توانا بوون نامەی خۆیانیان بەو پیتانە دائەڕێژن. بەڵام نەیانتوانیو پەکیان کەوت لە داڕژاندنی وێنەی سێ ئایەتی کورت لەم قورئانە هاتوەتە خوارەوە

بۆسەر موحەمەد (د.خ) ئەگەر ئەو قورئانە دانراوی مرۆڤ بوایە ئەیان توانی وێنە دابنێن، خوای مەزنئەو پیتانەی باس کردووە بۆ ئـەوەی پـەکیان بخا بـەو پیتانـەی سـەرەوە، لـە سورەتی ئەلبەقەرەوسورەتەکانی تردا باسیان کراوە. هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەو پیتانـەی ناوی خوای گەورەن، هەندێ تریان لایان وایە ناوی قورئانن، چەندین مانای تریان بۆمانای ئەو پیتانە باسکردووە .

﴿ ذِكْرُ رَبِّكَ عَبْدَهُ ذَكَرِيَّا ﴾ ئـەو شـتەی ئـەوتۆ ئەخوێنرێتـەوە بەسـەر تـۆدا باسـی میهرەبانیو چاکەی پەروەردگاری تۆیە لەگەڵ بەندەی خۆی کە زەکەریایە، زەکـەریا لـە بنەماڵەی هارونی برای موسایە کە هەردووکیان کـوڕی عیمرانـن و ئەچنـە سـەر (لاوی) کوڕی یەعقوب کوڕیئیسحاق کوڕی ئیبراهیم، ژنی زەکەریا خوشـکی مەریـەمی دایکـی عیسایە، چاودێری کەرو پێ سپێراوی پەروەردەکەری مەریەم بووە. بەکورتی:

تۆ یادی بەسەرهاتی زەکەریا بکەرەوە وبزانە بە چ جۆرێ خوا رێزی گرتووە. بێـژراوە زەکەریا دارتاش بووە .

﴿ إذ نادى رَبَّهُ نداء خفيّا ﴾ چاکەی لەگەڵ کرد کاتێك پاڕایـەوە لـە پـەروەردگاری خۆی بە پاڕانەوەیەکی سوك و نهێنی لەنێوان خوای مەزن و خۆیا بێ ئەوەی کـەس گـوێ لێبێ. پاڕانەوە لە خوای مەزن بە نهێنی و بە ئاشکرا یەکسانە لای خـوای گـەورە. بـەڵام بەنهێنی کزۆڵیو خۆشکاندنی زۆرتری تێدایە، شەرمیشی ئەکرد کە خۆی تەمەنی زۆر بـێ و ژنەکەشی نەزۆکبێ کەسێ تر پێ بزانێ .

﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي وَهَنَ الْعَظْمُ مِنِّي ﴾ زەکـەریا ووتـی لـە پاڕانەوەکـەیدا: ئـەی پـەروەردگاری مـن: بەڕاسـتیمن ئێسـك و لەشـی مـن لاواز بـووە، بۆیـە فـەرموی: (ئێسکی من)، چونکە لەکاتی پیر نەبونا ئێسـکی ئـادەمیزاد لەهـەموو ئەندامـەکانی تـری بەهێز ترەکە پیریشبو لەهەموی لاواز ترە .

﴿ وَاشْتَعَلَ الرَّأْسُ شَيْباً ﴾ وەموی سەری من لەبـەر پـیری شـەوقی داوەتـەوەو سـپی هەڵگەڕاوە بەوێنەی ڕوناکی ئاگر. زەکەریا تەمـەنی زۆر بوبـو خـوای مـەزن منـاڵی پێ نەبەخشیبو، پاڕایەوەو هاواری خۆی برد بۆلای خوا کە لاوازو پـیرەو پێـی خۆشـبو خـوا مناڵێکی بداتێ :

﴿ وَلَمْ أَكُنْ بِدُعائِكَ رَبِّ شَقِياً ﴾ وەمن لەمەوبەر نا ئومێـد نـەبووم بـەهۆی پارانـەوە لەتۆ، ئەی پەروەردگاری من، داوای هەر شتێکم لەتۆ کردبێ پێت بەخشیوم داوا لـەتۆ ئەکەم ئێستایش نا ئومێدم مەکە لەم کاتی پیریمەدا ونزاکەم وەربگرە. بۆیە ووتی: ﴿ وانـی خفت الموالی من وَرائـی وَكـانَتِ امرأتِـی عـاقِراً ﴾ وەمـن بەڕاستی ترساوم لـە ئـامۆزاو خزمەکانی ترم کەلەمەو دوا لـەدوای مـن ئەبنـە کاربەدەستی دانیشتوان و کاروبـاری یاسایی‌و ئاینی ئەبەن بەڕێوە لەدژی فەرمانی تۆ هەڵسن و خراپە بڵاوبکەنەوە لە زەویـداو ژنەکەیشم نەزۆکەو منالی نابێ‌و تەمەنی زۆرە بەگوێرەی سروشت ناگونجێ منالی ببی.

﴿ فَهَبْ لِي مِنْ لَدُنْكَ وَلِياً يَرِثُنِي و يَرِثُ مِنْ آلِ يَعْقُوب ﴾ دوایـی تـۆ ببەخشە بـەمن لەلایەن خۆتەوە کوڕێ فەرمانی تۆ ببابەڕێوە لە دوای مـن و زانیـاری لـەمن وەربگـرێ‌و پێغەمبەرایەتیش لە خێزانی یەعقوب وەربگرێ‌و شایستەی ئـەوەبێ سروشـی بـۆ بـەنێرێ. میراتی پێغەمبەران جگەی سامان و داراییە، زانیاری میراتی ئەوانە .

﴿ وَاجْعَلْهُ رَبِّ رَضِياً ﴾ وە تۆ ئەی پەروەردگاری من: ئەو کورەی ئەیبەخشـی بـەمن بیگۆرە بەکەسێ تۆ لـە کردارو گفتوگۆی رازیبی. خوای مەزن پارانەوەکەی لێ وەرگرتـو کوڕێکی دایەو کردی بە جێگەی ڕەزامەندی خۆی. هەندێ لە زانایان لایـان وایـە: ئـەو یەعقوبە یەعقوبی کوری ئیسحاق نیە. بـەڵکو مەبەسـت یـەعقوبی‌برای عیمرانـی بـاوکی مەریەمە کە ئەبێتە برای زەکەریاو بەبرای عیمرانی باوکی مەریەم .

يَٰزَكَرِيَّآ إِنَّا نُبَشِّرُكَ بِغُلَٰمٍ ٱسْمُهُۥ يَحْيَىٰ لَمْ نَجْعَل لَّهُۥ مِن قَبْلُ سَمِيًّا ﴿٧﴾ قَالَ رَبِّ أَنَّىٰ يَكُونُ لِى غُلَٰمٌ وَكَانَتِ ٱمْرَأَتِى عَاقِرًا وَقَدْ بَلَغْتُ مِنَ ٱلْكِبَرِ عِتِيًّا ﴿٨﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ قَالَ رَبُّكَ هُوَ عَلَىَّ هَيِّنٌ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِن قَبْلُ وَلَمْ تَكُ

شَيْـًٔا ﴿٩﴾ قَالَ رَبِّ ٱجْعَل لِّيٓ ءَايَةٗۖ قَالَ ءَايَتُكَ أَلَّا تُكَلِّمَ ٱلنَّاسَ ثَلَٰثَ لَيَالٖ سَوِيّٗا ﴿١٠﴾ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ﴿١١﴾

﴿ يازَكَرِيّا إنّا نُبَشِرُكَ بِغُلامٍ إسْمُهُ يَحيٰى لَمْ نَجْعَـلْ لَـهُ مِـنْ قَبْلُ سَمِياً ﴾ ئـەی زەکـەریا بەراستی ئێمە موژدە ئەدەین بەتۆ بەکوڕێ ناوی یەحیایە، ئێمە نەمانگێڕاوە بۆ ئـەو کـوڕە لـەمەوبەر هیچ کەسێ هاوناوی ئەو بێ وێنەی ئەوبێ. ئەبێ بزانین ڕێزدانان بۆ یەحیا لـەبـەر ئەوە نیە هاوناوی نیە. بەڵکو لـەبەر ئەوەیە کە خوا سەرپەرشتی ناوەکەی کردووەو نـاوی ناوە یەحیا. ئەبێ بزانرێ ئەو موژدە دانە بەزەکەریا بەهۆی فریشتەکانەوە بووە .

﴿ قالَ رَبِي أنى يَكُونُ لِي غُلامٌ وَّكانَتِ امرَأتِـي عـاقِراً وَقَـد بَلَغْـتُ مِـنَ الكِبَرِ عِتِياً ﴾ زەکەریا ووتی: ئەی پەروەردگاری من: چۆن من کورم ئەبێ و ژنەکەشم نەزۆکەو منـاڵی نابێ و پیرەو چۆن جوانی بۆ ئەگەڕێتەوەو من گەیشتوم بەکاتێ جگەو ئێسکەکانم ووشـک بونەتەوە بەوێنە درەختی ڕەق لـەبەر پیریو تەمەنی زۆرم .

﴿ قالَ كَذلِكَ قالَ رَبُكَ هُوَ عَلي هَيّنٌ ﴾ خوا فەرموی: هەر بەو جۆرەیە خۆت ئـەیڵێ: پیرو لاوازی، پەروەردگاری تۆ ئەفەرموێ: دروستکردنی کوڕێ لـەتۆی پیرو ژنێکی نەزۆك ئاسانە لـەسەر من و گران نیە .

﴿ وَقَدْ خَلَقْتُكَ مِنْ قَبْلُ وَلَم تَكُ شَيْئاً ﴾ وە بەراستی من تۆم دروست کردووە لــەپێش ئەم کاتەی کە کوڕێ بۆتۆ دروست بکەم و تۆ هیچ نەبوی بەبێ کەرەستە من تۆم هێناوەتە بوونەوە .

﴿ قالَ رَبِّ اجْعَلْ لِيَ آيَةً ﴾ زەکەریا ووتی: ئەی پەروەردگاری من: تـۆ دابنـێ بۆمـن نیشانەیەکی ئاشکرا بەڵگە بێ لـەسەر پاڕانەوەکەی منت وەرگرتـوەو بزانـرێ لـەمـەو دوا ئەو کارە دێتە دی .

﴿ قالَ آيتك ألاّ تُكَلِمُ الناسَ ثَلاثُ لَيالٍ سَوِياً ﴾ پەروەردگار فەرموی: نیشانەی تۆ ئەوەیە کەتۆ توانای ئەوەت نابێ گفتوگۆ بکەی لەگەڵ ئادەمیزاد سێ شەو بەبێ ئەوەی تۆ لاڵی و کەریت توشبێ و تەندروستیت تەواوەو شتێکی وا رووت تێ ناکا ببێتە هۆی نزمی ئەقڵی تۆ .

﴿ فَخَرَجَ على قَومِهِ مِنَ المِحرابِ ﴾ دوای روون بونەوەی توانــای خــوا بــە بەخشینی کورێو نەیتوانی گفتوگۆبکا، هاتە دەرەوە بــۆلای خــزم و تاقمەکــەی خــۆی لەجێگــەی نوێژو پەرستنەوە، بەوێنەی جاران هات و دەرگای مزگەوتی کردوە بــۆ نوێژکــەران، لای نوێژکەرەکان شێوازی زەکەریا گۆرابو، ووتیان بۆتۆ گفتوگۆیان لەگەڵا ناکەی؟ .

﴿ فأوحى إلَيهم أنَ سجول بكرة وعشِياً ﴾ دوایی بەدەستی خۆی ئاماژەی کرد بۆلایــان یا بەنوسین پێی راگەیاندن کە ئێوە نوێژەکانتان بکەن بۆ خوا بەیانیان و ئێواران و گفتوگــۆ لــەمن قەدەغە کراوە، پاکی خوا دەربــرن لــەلایــەن خۆتانــەوەو بــێ فــەرمانی پــەروەردگار مەکەن .

يَٰيَحۡيَىٰ خُذِ ٱلۡكِتَٰبَ بِقُوَّةٖۖ وَءَاتَيۡنَٰهُ ٱلۡحُكۡمَ صَبِيّٗا ﴿١٢﴾ وَحَنَانٗا مِّن لَّدُنَّا وَزَكَوٰةٗۖ وَكَانَ تَقِيّٗا ﴿١٣﴾ وَبَرَّۢا بِوَٰلِدَيۡهِ وَلَمۡ يَكُن جَبَّارًا عَصِيّٗا ﴿١٤﴾ وَسَلَٰمٌ عَلَيۡهِ يَوۡمَ وُلِدَ وَيَوۡمَ يَمُوتُ وَيَوۡمَ يُبۡعَثُ حَيّٗا ﴿١٥﴾

کاتێ ماوەی لەدایکبونی یەحیا کۆتایی پێ هات و لە دایك بوو خوای مەزنە زیرەکیو وورياییو تێگەیشتنی پێ بەخشی، هێزو توانای خستە ناو مێشکی و پێی فەرمو:

﴿ يا يَحيى خُذ الكِتابَ بِقُوَةٍ وَآتيناهُ الحُكْمُ صبياً ﴾ ئــەی یــەحیا: تــۆ ئــەو نامەیــە کــە تەوراتە وەری بگــرە و کــاری پــێ بکــە بەهــەمو توانــای خۆتــەوە بــەنیازی پاکــەوە، بــە

دانیشتوانی ڕابگەیەنە بەهۆی بیری تیژی خۆتەوەو بەبیر کردنەوە لە دەسەلاتی خوا فەرمانی پێداوی‌و ئێمە بە خشیومانە فەرمان و پێغەمبەرایەتی‌و زانینی تەورات و ئەقلی تەواو لەسالانی منالیداو کردمان بە پێغەمبەر هەر بە منالی، هەر بەو جۆرەی یەحیامان بەخشی بە باوك و دایکی بە پیری. ئەگێڕنەوە منالان بە یەحیایان ووت وەرە بڕۆین بۆ یاری کردن، دوایی یەحیا ووتی: ئێمە بۆیاری کردن دروست نەکراوین، ئێوە بێن با بڕۆین بۆ نوێژکردن .

﴿ وَحنانًا مِنَ لَّدُنا وَزَكاةً وَكانَ تَقِيا ﴾ وە ئێمە بەخشیومانە بە یەحیا لەلایەن خۆمانەوە میهرەبانی‌و بەزەیی هاتنەوەی بە بەندەکانی خواو پاکی لە گوناهو ڕێزی تایبەتیمان دابویەو یەحیا فەرمان بەرداری ئێمە بوو خۆی دور ئەگرت لە گوناە کردن و لەبێ فەرمانی خوا .

﴿ وَبَرًّا بِوالِدَيهِ وَلَمْ يَكُنْ جَباراً عَصِياً ﴾ وە بە یەحیامان بەخشیبو چاکە کردن لەگەل باوك و دایکی خۆی و گوێ ڕایەل بێ بۆ فەرمانیان و خۆی بەگەورە دانەئەناو ئازاری دایك و باوکی نەئەداو بێ فەرمانی خوای نەئەکرد .

﴿ وَسَلامٌ عَلَيهِ يَوْمَ وُلِدَ وَيَوْمَ يَمُوتُ وَيَومَ يُبعَثُ حَياً ﴾ وە پاراستن و یاریدانی خوا لەسەر یەحیا بێ لە ڕۆژێکا لە دایکبووەو پاراستویەتی لە شەیتان و ئاگاداری خوای لەسەر بێ کاتێ ئەمرێ و سزای نەدرێ‌و بیپارێزێ لە سزای ئاگر لەو ڕۆژەدا هەلئەسێتەوە لە گۆڕەکەیدا بەزیندویی .

ئەگێڕنەوە ( هێردوس ) فەرمان ڕوایی فەلەستین بوو لەسەردەمی یەحیادا دلی چوبوە سەر ( هیرودیا )ی برازای خۆی‌و زۆری بۆ پەرێشانبو، ئەو کچە زۆر جوان و پێ کەوت و بوئەیویست بیخوازێ و کچەکەو دایکی زۆریان پێخۆشبو. بەلام یەحیا لەدژی ئەو کارە ڕا وەستابو، چونکە لەئاینی ئەواندا بەفەرمودەی تەورات خواستنی برازا قەدەغەبو، ئەو کچە بەمامەکەی خۆی ووت: پێویستە سەری یەحیام بۆبکەی بەمارەیی، ئەویش فەرمانی دا یەحیایان سەربڕی‌و سەرەکەیان بەدیاری هێنا بۆ ئەو کچە .

بۆ زانین: لەم ئایەتانەی دواییدا خوای مەزن باسی مەریەم و لە دایکبونی عیسای کوری مەریەم دەکا. ئێمە بەر لەوەی بچینە سەر مانا کردنی ئایەتەکان بەم جۆرەی خوارەوە باسی مەریەم و داوێن پاکی مەریەم و لەدایکبونی عیسای کوڕی مەریەم ئەکەین بەم جۆرەی خوارەوە:

جارێك مەریەم چوو بۆ جێگەیە لە ڕۆژهەڵاتی (بەیتولموقەدەسا) بۆ جێ بەجێ کردنی هەندێ کاری تایبەتی خۆی، پەردەیەکی گێڕایەوە بۆئەوەی کەس نەیبینێ، لەو کاتەداو لەو جێگە چۆڵەدا خوای مەزن جوبرەئیلی نارد بۆلای لە شێوەی ئادەمیزادێکی پێ کەتوو دەم و چاوو رومەت جوان، کاتێ مەریەم ئەو کەسەی بینی وای زانی ئادەمیزادەو ئەیەوێ پەلاماری بدا. مەریەم ووتی: من پەنا ئەگرم بەهۆی خواوە لە خراپەی تۆو داواکارم خوا بمپارێزێ ئەگەرنیازت خراپە، جبرەئیل ووتی: من ئادەمیزاد نیم. بەڵام فریشتەیەکم خوا ناردومی فوبکەم بەناو کراسەکەی تۆدا هەتا خوا منالێکت بداتێ، مەریەم ووتی: من کچم و شووم نەکردوە منالم چۆن ئەبێ؟ جبرەئیل ووتی: بڕیارێکە لەلایەن خواوە دەرچووە، دوایی جبرەئیل فویەکی کرد بەناو کراسەکەی مەریەمدا، دوای جبرەئیل رۆیشت لای مەریەم، دوای ماوەیە سکی پڕبوو کاتی منالبونی نزیك بویەوەو ژانی منالبون گرتی و پەرەی سەند و لە ئاوەدانی دورکەوتەوە بۆ پشتی کێوێ لە شەرمەزاری خۆیداو هەستی بە منالبون کردو ژانی منالبون زۆری لێ سەند، لە دڵی خۆیا بەخۆی ووت: بەچ شتێ روبەروی دانیشتوان ئەبیتەوەو بەچ شتێ گفتوگۆیان لەگەڵ ئەکەی و چۆنت بروا پێ ئەکەن کە پاکی؟ بەڵگەیەکت بەدەستەوە نیە کە پاك و داوێن خاوێنی. بێگومان تاوان و خراپەت ئەخەنەپاڵ، لەو کاتەدا ئاواتی مردنی خواست بەرلەوەی منالی ببێت و بەسەرهاتی بلاوببێتەوە. بەناچاریو ژانەوە خۆی دایە پاڵ دارخورمایە، بۆئەوەی دەست بگرێ بەدارخورماکە هەتا زاڵ بێ بەسەر ژانەکەیداو لەسێبەرەکەشیدا پشوێ بدا. لەو کاتەدا نیشانەی گەورەی خوا روی داو عیسای لێ کەوتە خوارەوەو لە دایك بوو، دوای عیسای نایە سەر دەستی و داپۆشت، لەو کاتە ناسکەدا جبرەئیل بانگی کردە مەریەم و

ووتی: ئەی مەریەم کە لە جێگەیە کەلە خواریەوەبوو هەتا ئەو ترس و خەفەتەی نەمێنێ و کەم ببێتەوەو ووتی: ئەی مەریەم: تۆ مەترسەو خەفەت مەخۆ، خوا یاریدەرتەو چاوی لێتە. بەهۆی توانای خۆیەوە داوێنی پاکی تۆ ئەسەلمێنێ بە دانیشتوان، لقی خورماکە راکێشە بۆلای خۆت و رای وەشێنەو لە خورما تەڕەکەی بخۆ، بڕۆرەوە خوارەوە بۆلای ئەو ئاوەیش لە ئاوەکەی بخۆرەوە. کەواتە دڵت بێتەوە بۆ جێگەی خۆی و چاویشت فێنك بکەرەوە، لە دانیشتوان مەترسە ئەگەر ویستیان گفتوگۆت لەگەڵ بکەن پەنجەی خۆت راکێشە بۆلایان و ئاماژەیان بۆبکەو بڵێ: من پێویستم کردووە لەسەرخۆم گفتوگۆ نەکەم و گفتوگۆ لەگەڵ ئەم منالە بکەن ئەگەر ئەتانەوێ لەم کارەساتە بگەن، مەریەم ئارامی گرت و رۆیشتەوە بەمنالەکەیەوە بۆلای خزمەکانی، کاتێ مەریەمیان بەو کارەوە بینی زۆریان لا گران بوو ناخۆش بولایان، زۆر سەریان سوڕما ئەو منالە چۆن گفتوگۆ ئەکا؟. عیسا دانەماو کتوپڕووتی: من بەندەی خوام و لەمەو پاش ئەکرێم بە پێغەمبەر، فەرمانی خوای مەزنە ڕائەگەیەنم. کورتە باسی لەدایك بونی عیسا بەو جۆرە بوو باس کرا لەمەوبەر .

ئەبێ بزانرێ: پەیوەندی لەنێوان لەدایك بونی عیساو لەدایك بونی یەحیادا چ شتێکە کە دوابەدوای یەکتری باسیان کردوە ؟ لە وەڵامدا ئەبێژرێ پەیوەندی پتەویان بەیەکەوە هەیە، وەك چۆن عیسا بەبێ باوك خوا دروستی کردوە، یەحیایشی لە باوك و دایکێکی پیر دروست کردوە کە لەئەقڵەوە دوربووە منالیان ببێ و کەچی دروستی کردووە، بەشێوەی ئاسای هەردولایان لەئەقڵەوە دورن منالیان ببێ. بۆ ڕون کردنەوەی باسی لەدایکبونی عیسا خوای مەزن ئەفەرموێ :

وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مَرۡيَمَ إِذِ ٱنتَبَذَتۡ مِنۡ أَهۡلِهَا مَكَانٗا شَرۡقِيّٗا ﴿١٦﴾ فَٱتَّخَذَتۡ مِن دُونِهِمۡ حِجَابٗا

فَأَرْسَلْنَآ إِلَيْهَا رُوحَنَا فَتَمَثَّلَ لَهَا بَشَرًا سَوِيًّا ﴿١٧﴾ قَالَتْ إِنِّيٓ أَعُوذُ بِٱلرَّحْمَٰنِ مِنكَ إِن كُنتَ تَقِيًّا ﴿١٨﴾ قَالَ إِنَّمَآ أَنَا۠ رَسُولُ رَبِّكِ لِأَهَبَ لَكِ غُلَٰمًا زَكِيًّا ﴿١٩﴾ قَالَتْ أَنَّىٰ يَكُونُ لِي غُلَٰمٌ وَلَمْ يَمْسَسْنِي بَشَرٌ وَلَمْ أَكُ بَغِيًّا ﴿٢٠﴾ قَالَ كَذَٰلِكِ قَالَ رَبُّكِ هُوَ عَلَيَّ هَيِّنٌ وَلِنَجْعَلَهُۥٓ ءَايَةً لِّلنَّاسِ وَرَحْمَةً مِّنَّا وَكَانَ أَمْرًا مَّقْضِيًّا ﴿٢١﴾

﴿ وَاذْكُر فِي الكِتابِ مَرْيَمَ إِذْ إنْتَبَذَتْ مِنْ أهْلِها مَكاناً شَرْقِياً ﴾ وە تۆ لە قورئاندا و لەم سورەتەدا باسی هەواڵ و بەسەر هاتی مەریەم بکە کاتێ جوێ بویەوەو دورکەوتەوە لەخزمەکانی بۆجێگەیە لای خۆرهەڵاتی ( بەیتولموقەدەس ) بۆ جێبەجێ کردنی کارێکی پێویستیو تایبەتی خۆیو بۆ پەرستن و خۆ شۆردن. هەر لەبەر ئەوەیشە گاورەکان رۆژهەڵاتیان کردووە بەرِوانگە بۆخۆیان لەکاتی نوێژکردندا، هەندێ لەزانایان لایان وایە ئەو کاتە وەرزی زستان بووە زۆر ساردبووە .

بۆ زانین: جوێ بوونەوەی مەریەم و کەنارگیری لەخزمەکانی ئایا لەبەر ئەوەبو شتێکی بینی لای ناخۆش بو، یا بۆپەرستن بو یابۆ جگەی ئەوانە بو؟ ئەو جێگەیە شوێنێ بو خۆر بەسەریا هەڵئەهات یاخۆرهەڵاتی بەیتولموقەدەس بو؟ ئەو پەردەیە چ شتێ بو دیوارێ بو یا خانو یاشتێ تر؟ ئەوانە هەمویان لەو ئایەتانەدا باسیان نەکراوە، چونکە رون کردنەوەیان پەیوەندی بەبیرو باوەرِی سەرەکیمانەوە نیە، واشایستە بێ دەنگبن و هەواڵەی زانیاری خوای بکەین.

﴿فَاتَّخَذَتْ مِنْ دُنِهِمْ حِجاباً فَأَرْسَلْنا إِلَيْها رُوحَنا فَتمثّل لَها بَشَراً سَوِيا﴾دوایی مەریەم پەردەیەکی گێڕا بەنێوان خۆی و خزمەکانیا بۆئەوەی خۆی بشۆرێ‌و کەسێ نەیبینێ، دوای ئەوە ئێمە ڕەوانەمان کرد بۆلای مەریەم لەو شوێنە چۆڵەدا گیان لەبەرێکی زیندوی ئێمە کە جبرەئیل بو دوایی جبرەئیل خۆی بردە وێنەی ئادەمیزادێکی ڕێك و پێك لەشێوەی لاوێکی جوانداو خۆی نیشانی مەریەم داکەچاوی بەو وێنە شیرینە کەوت وای زانی ئادەمیزادەو ئەیەوێ پەلاماری بدا، زۆر ترساو لای بێگانە بو لەو جێگە چۆڵەدا ئەو کەسە بەبێ پرس هاتوەتەلای، بۆیە ؟ .

﴿ قالَتْ إِنِی أعوز بِالرَّحْمنِ مِنْكَ إِنْ كُنْتَ تقیا ﴾ مەریەم وتی: بەڕاستی من پەنا ئەگرم لە تۆ بەهۆی خوای بەخشندەوە لە خراپەی تۆ ئەگەر تۆ باوەڕت بەخواو سزای خواو پرسیاری خوات هەیە، ئەو کەسەی لەخوا ئەترسێ چونکە لەو کاتەدا هیچ دەسەڵاتێکی بۆنەمایەوە جگەی لەوەی بیترسێنێ لەخوا، ئەگینا مەریەم پشتی بەخوا ئەستوربو کەخوا ئەیپارێزێ ئیتر ئەو کەسە لەخوا بترسێ یانەترسێ ؟. بەڵام کەجبرەئیل ترسی مەریەمی بۆدەرکەوت .

﴿ قالَ إِنَّما أنا رَسول ربّك لأهب لك غلاماً زكیاً ﴾ جبرەئیل بەمەریەمی ووت: تۆ مەترسە بەڕاستی من نێراوێکی پەروەردگاری تۆم بۆلای تۆ، من ئادەمیزاد نیم و فریشتەی ئەو خوایەم تۆپەنای بۆ ئەبەی، خوامنی ناردوە بۆلای تۆ لەبەر ئەوەی من ببەخشم بەتۆ بەهۆی دەستوری خواوە کوڕێکی لەخوا ترس و پاك لەگوناه، گەشەبکا لەسەر پیرۆزی‌و فەرو چاکەدا. مەریەمی داوێن پاك سەری سوڕما لەوشتەی جبرەئیل فەرموی .

﴿ قالَتْ أني يَكُونُ لِي غُلامٌ وَلَمْ يَمْسَسنِي بَشَرٌ وَلَمْ أكُ بَغِياً ﴾ مەریەم ووتی: چۆن ئەبێ من کوڕێکم لێ پەیدا ببێ و من کچ بم و هیچ ئادەمیزادێ دەستی لە من نەکەوتووە و مێردم نەکردبێ و من داوێن پیس و خراپەکار نەبوم، نە بەداوێن پاکی و نە بە داوێنپیسی هیچ پیاوێ نزیکی من نەکەوتوەتەوە .

﴿ قالَ كَذٰلِكِ قالَ رَبُّكِ هُوَ عَلي هَيِّنٌ ﴾ جبرەئیل ووتی: هەر بەو جۆرەیە تۆ ئەیڵێ تۆ کچی و هیچ کەسێ دەستێ نەکەوتوە لە تۆ، پەروەردگاری تۆ فەرموی: بەڕاستی بەخشینی کوڕێ بەتۆ بەبێ مێرد لەسەر من ئاسانەو کارێکی گران نیە، هەرچەندە بەگوێرەی سروشت کارێکی نەگونجاو بێ .

﴿ وَلِنَجْعَلَهُ آيَةً لِلّناسَ وَرَحْمَةً مِّنّا ﴾ وە لەبەر ئەوەی ئێمە ئەو کارە سەرسوڕێنەرە بگێڕین بەنیشانە بۆ ئادەمیزادو بیکەینە بەڵگە لەسەر توانای بێ وێنەی خۆمان و بیگێڕین بەچاکە بۆبەندەکانی ئێمە لەلایەن خۆمانەوەو ڕانموییی وەرگرن بۆ باوەڕهێنان بەئێمە .

﴿ وكان أمراً مُقضِياً ﴾ وە دروست کردنی ئەو کوڕە بەبێ باوك کارێکە بڕیاری پێ دراوەو ئێمە ئەو کوڕە بدەین بەتۆ بەبێ ئەوەی کەس بەخراپی دەستی دابێ لەتۆ. جبرەئیل بەدەستوری خوا بەمەریەمی ووت: بەڕاستی هۆی منداڵ بون هەر بەتەبها بریتی نیە لەوەی پیاوێ بچێتە لای ژنێ، ئێمە هەمو شتێ دروست ئەکەین بە وشەی توبە، دوایی ئەو شتە کتوپڕ پەیدا ئەبێ. هەر بەو جۆرەی ئادەممان بەبێ باوك و دایك دروست کرد. بەڕاستی خوای مەزن ئەو کوڕە ئەگێڕێ بە بەڵگەیەکی ئاشکرا لەسەر گەورەیی خۆی و کردنی ئەو منداڵە بەپێغەمەرو بەچاکەو خۆشی بۆ مرۆڤایەتیو بەڵگەبێ لەسەر ئەو جولەکانەی ویستیان ئەو کوڕە بکوژن .

فَحَمَلَتْهُ فَٱنتَبَذَتْ بِهِۦ مَكَانًا قَصِيًّا ﴿٢٢﴾ فَأَجَآءَهَا ٱلْمَخَاضُ إِلَىٰ جِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ قَالَتْ يَٰلَيْتَنِى مِتُّ قَبْلَ هَٰذَا وَكُنتُ نَسْيًا مَّنسِيًّا ﴿٢٣﴾ فَنَادَىٰهَا مِن تَحْتِهَآ أَلَّا تَحْزَنِى قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِيًّا ﴿٢٤﴾ وَهُزِّىٓ إِلَيْكِ بِجِذْعِ ٱلنَّخْلَةِ تُسَٰقِطْ عَلَيْكِ رُطَبًا جَنِيًّا ﴿٢٥﴾

فَكُلِي وَٱشْرَبِي وَقَرِّي عَيْنًا فَإِمَّا تَرَيِنَّ مِنَ ٱلْبَشَرِ أَحَدًا فَقُولِيٓ إِنِّي نَذَرْتُ لِلرَّحْمَٰنِ صَوْمًا فَلَنْ أُكَلِّمَ ٱلْيَوْمَ إِنسِيًّا ﴿٢٦﴾

﴿ فَحَمَلَتهُ فَانْتَبَذَتْ بِهِ مَكاناً قَصِياً ﴾ دوای ئەوەی جبرەئیل فوی کرد بەناو کراسەکەی مەریەمدا ئەو کورە بەخشراوەی هەڵگرت لەناو منداڵدانیداو نیشانەی منداڵ بونــی ڕویـدا، دوای مەریەم دورکەوتەوە لەئاوەدانی و کەناری گرت بۆلای جێگەیەکی زۆر دور بەوەی هەڵی گرتبو لە منداڵدانیدا .

﴿ فَأَجاءَ هَا المخاضُ الى جِذعِ النَخلِة ﴾ دوایی ژانی منداڵ بون مەریـەمی بـردو ناچـاری کرد بۆلای بنکی درەختی خورمایــەکی ووشـك و بێ لـق و پـۆپ لـەبەرئـەوەی خـۆی بشارێتەوە و دەستی پێ بگرێ لەکاتی منداڵ بونیدا، ئەو کاتـە کـاتی زسـتان بـوو. زانایـان بیریان جیاوازە. ئایا لـەو کاتەدا تەمەنی مەریەم چەندە بوە؟ وچەند ماوەیە لە منداڵدانیا ئـەو کورە مایەوە، ئەوانە هەمویان باس ناکەین و گرنگ ئەوەیە ئەو ڕوداوە هـەبوە و پێویسـتە ئێمە بڕوامان پێ هەبێ .

﴿ قالَت يا لَيْتَنِي مُتُّ مِنْ قَبْل هذا وَكُنْتُ نَسْياً مَنْسِياً ﴾ مەریەم ووتی: ئــەی کاشـکایە من بمردمایە بەر لـەوەی من ئەم کارەم بەخۆمەوە ببینیایە لەبەر ئەوەی شەرمەزاری خزمانی خۆم نەبومایەو من ئادەمیزادێ بومایە واز لێ هێـنراو بومایـەو نەناسـرامایەو کـەس باسـی نەکردمایە؟ چونکە من هەمو زاناو خوا پەرستان ئەزانن من کچی مامۆستای ئەوانم، لـەژێر چاودێری زەکەریادابووم، کچم و مێردم نەکردوە کەچی من منداڵێکم بوە، من شەرمەزارم و نازانم چ شتێ بکەم، دوایی عیسا لەدایك بـوو، مەریـەم بەخەفـەت بـاری بـەلای ئـەو کورەوە بو، کوتو پڕموژدەی بۆهات لـەلایەن خواوە .

﴿ فَناداها مِنْ تَحِها ألآ تَحْزَنِي ﴾ لەدوای ئەوەی عیسا لەدایك بو جبرەئیل لەخوار ئەو جێگەیەوە مەریەمی تێدابو بانگی مەریەمی کـردو ووتـی: تـۆ خەفـەت مـەخۆو مەترسـە. هەندێ لەزانایان ئەڵێن: ئەو کەسەی بانگی مەریەمی کرد عیسا بـو، وەك کـارێکی پـەك خەری عیسا .

﴿ قَدْ جَعَلَ رَبُّكِ تَحْتَكِ سَرِياً ﴾ بەڕاستی پەروەردەکەری تۆ دروستی کردوە لەخوارتەوە گۆلاوێ، برۆ لەئاوەکەی بخۆرەوەو خۆیشتی لێ بشۆرە، مەترسە خوا هەمو شتێکی بۆسازاندوی .

﴿ و هَزّي إِلَيْكِ بِجِذعِ النَخْلَةِ تُساقِطُ عَلَيكِ رطباً جنيا ﴾ وەتۆ ڕابکێشە بۆلای خۆت بنکی درەختی خورماکەو ڕای وەشێنە تۆ بخەرە خوار بەسەر خۆتا خورمای تازەو تەڕو تازە ئەگەر برسیت بو، خەفت مەخۆو منداڵەکەت بەرگریت لێ ئەکاو ڕزگارت ئەکا لەگومانی خراپ بردن بەتۆ .

﴿ فَكُلِي وَاشرَبِي وَقَرِي عَيْناً ﴾ دوایی تۆ بخۆ لەو خورما تازەو تەڕەو بخۆرەوە لەو ئاوەو چاوی خۆت فێنك بکەرەوەو خۆت دڵخۆش بکە بەبونی ئەو کوڕەی خۆتەوە .

﴿ فَإما تَرَيْنَ مِنَ الْبَشَرِ أحَداً فَقُولِي إِنِي نَذَرْتُ لِلرَحمنِ صَوماً ﴾ دوایی ئەگەر تۆ هەر کەسێکت لە ئادەمیزاد بینیو پرسیاری ئەو منداڵەی لەتۆ کرد ئەو منداڵەت لەچ جێگەیەکەوە هێناوە، تۆ بێ دەنگ بەو گفتوگۆ مەکە، دوایی تۆ بڵێ بە پرسیارکەران بە ئاڕاستەو لەسەرخۆو دەست ڕاکێشە بۆلایان، دوایی بڵێ: بەڕاستی من پێویستم کردوە بەڕۆژوبم، لەبەر ڕەزامەندی خوای بەخشندە، پێویستە گفتوگۆ نەکەم، ڕۆژوی باوەڕدارانی ئەو کاتە وەك پێویستبو خواردەمەنی نەخۆن پێویستیشبو گفتوگۆ لەگەڵ ئادەمیزاد نەکەن، وەك خودا ئەفەرموێ:

﴿ فَلَنْ أكَلِمَ اليَومَ إنسِياً ﴾ دوایی من گفتوگۆ ناکەم لەگەڵ هیچ ئادەمیزادێ ئەمڕۆ جگە لەوەی لەخوا بپاڕێمەوە یا گفتوگۆ بکەم لەگەڵ فریشتەیە .

فَأَتَتْ بِهِۦ قَوْمَهَا تَحْمِلُهُۥ قَالُوا۟ يَٰمَرْيَمُ لَقَدْ جِئْتِ شَيْـًٔا فَرِيًّا ﴿٢٧﴾ يَٰٓأُخْتَ هَٰرُونَ مَا كَانَ أَبُوكِ ٱمْرَأَ سَوْءٍ وَمَا كَانَتْ أُمُّكِ بَغِيًّا ﴿٢٨﴾ فَأَشَارَتْ إِلَيْهِ قَالُوا۟ كَيْفَ نُكَلِّمُ مَن كَانَ فِى

ٱلْمَهْدِ صَبِيًّا ﴿٢٩﴾ قَالَ إِنِّى عَبْدُ ٱللَّهِ ءَاتَىٰنِىَ ٱلْكِتَٰبَ وَجَعَلَنِى نَبِيًّا ﴿٣٠﴾ وَجَعَلَنِى مُبَارَكًا أَيْنَ مَا كُنتُ وَأَوْصَٰنِى بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ مَا دُمْتُ حَيًّا ﴿٣١﴾ وَبَرًّۢا بِوَٰلِدَتِى وَلَمْ يَجْعَلْنِى جَبَّارًا شَقِيًّا ﴿٣٢﴾ وَٱلسَّلَٰمُ عَلَىَّ يَوْمَ وُلِدتُّ وَيَوْمَ أَمُوتُ وَيَوْمَ أُبْعَثُ حَيًّا ﴿٣٣﴾ ذَٰلِكَ عِيسَى ٱبْنُ مَرْيَمَ قَوْلَ ٱلْحَقِّ ٱلَّذِى فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٣٤﴾ مَا كَانَ لِلَّهِ أَن يَتَّخِذَ مِن وَلَدٍ سُبْحَٰنَهُۥٓ إِذَا قَضَىٰٓ أَمْرًا فَإِنَّمَا يَقُولُ لَهُۥ كُن فَيَكُونُ ﴿٣٥﴾

**﴿ فأتت به قومها تحمله ﴾** دوایی دانانی کورەکـەی مەریـەم منالەکـەی هـەلگرت و چویەوە بە منالەکەیەوە بۆلای خزمەکانی، دوای پاك بونەوەی لە خوینی پاش منـال بـەبێ باکیو بەبێ ترس، چونکە منالەکەی ئەبێ بپاریزێ لەهۆی گومانی خراپە بردن بۆی، هەر ئەو منالە ئەبێ بەشایەت بۆ پاکیو بۆداویـن پـاکی، دانیشـتوان کەمەریـەمیان بینـی بـەو منالەوە بەبێ میرد سەرسامبون .

**﴿ قالوا یامریم لقد جئت شیئا فریا ﴾** خزمەکانی وتیان: ئـەی مەریـەم: بەراسـتی تـۆ بەشتیکی درۆو بوختانەوە هاتوی بۆلای ئیمە کەتۆ ئەلیی من منالیکم بـووە بـەبێ میـردو بەبێ داوین پیسی، بەراستی ئەوەی تۆ ئەیلیی بوختانیکی روتە.

**﴿ یا أخت هارون ماکان أبوك امرأ سوء وماکانت أمك بغیا ﴾** ئـەی خوشـکی هـارون باوکی تۆ پیاویکی خراپ نەبو کە عیمرانـی باوکتـە زۆر لـەخوا تـرس و داویـن پـاکبو، هەرگیز کاری خراپی نەکردبو، ئیمە تۆمان وەك هارونی بـرات دانـابو لـەخوا پەرستیو

داوین پاکیدا، ئەو کارەت چۆن کردوە، هارون وینـەی نـەبو لـەپیاو چـاکیداو ناوبـانگی دەرکردبو لەخوا ترسیدا، مەریەم تۆ لـەرەگـەزی هـارونی بـرای موسـایو دایکـی تـۆش خراپەکارو داوین پیس نەبوە، ئەم جۆرە کردەوەیە لـە کەسێ ئەوەشیتەوە بـاوك و دایکـی خراپە کردەوەبن .

زانایان بیرو بۆچونیان جیاوازە لەبارەی هارونەوە ئایا چ کەسیکە ؟ هەندیکیان ئـەلین: مەبەست هارون برای موسا پیغەمبەرە کە مەریەم لـەنەوەی ئـەوە، هـەندێ تریـان ئـەلین: مەبەست لـەهارون یا پیاویکی چاکی ئەو کاتە بـوە یـا پیـاویکی خـراپ بـوە. مەریـەمیان وینەی ئەوانیان داناوە لـەچاکی و لـەخراپیدا، هەندێ تریان لایان وایە ئـەو هارونـە بـرای راستی مەریەمە .

﴿ فأشارت إليه قالوا كيف نكلم من كان في المهد صبيا ﴾ دوایی مەریەم بەبێ دەنگـی وەستاو ئیشارەی کرد بۆلای منالەکەی کە گفتوگۆیان لـەگـەڵ بکـاو وولامیـان بداتـەوە ئەگەر بیانەوێ راستیان بۆ دەرکەوێ ئەوانیش تورە بون و سەریان سورما، ووتیـان: ئیمـە چۆن گفتوگۆ بکەین لـەگەڵ کەسیکا منالی ناو بیشکە بێ و شیاوی ئەوە نیـە گفتوگـۆی لـەگەڵ بکرێ بەگویرەی سروشت هەتا وەلامی ئیمە بداتەوە .

گفتوگۆی خزمەکانی مەریـەم کۆتـای پـێ هـات. دوای نـۆرەی وولامدانـەوەی ئـەو منالـەیە.

﴿ قال إني عبدالله آتاني الكتاب وجعلني نبيا ﴾ عیسا ووتی: بەراستی من بەندەی خوام بەخشیویەتی بەمن نامەیە کەئینجیلـەو منی گیراوە بە پیغەمەر لـەم کاتە بـەدواوە ووشـەی (عبدالله ) بیروبۆچونی گاورەکان پوچ ئەکاتەوە کە عیسـا کـوری خوایـە یـا هـەر خـۆی خوایە یا سییەمی سێ خوایە .

﴿ وجعلني مباركا أين ماكنت وأوصاني بالصلاة والزكاة مـاومت حيـا ﴾ وەخـوا منـی گیراوە بە مرۆڤیکی زۆر خاوەن سودو فیرکەری یاسای خوا بەئادەمیزاد بۆهەر لایە برۆم .

بیگومان مرۆڤێ بەو جۆرە بێ پیرۆزو خاوەن فەرە، خوا فەرمانی داوە بەمن و رای سپاردوە کەمن نویژەکانم بکەم کاتێ گەورەبوم و زەکاتیش بدەم بە هەژاران بەماوەی زیندویم لەجیهاندا، فەرمانیش ئەدەم بە ئادەمیزاد ئەوانیش نویژ بکەن و زەکات بدەن، لیرەدا دەری خستوە کەپیویستە پەرستن هەر بۆخوا ئەکرێ، بیرو باوەری گاورەکان بەدرۆ ئەخاتەوە کەعیسا کوری خوایە یاهاوبەشی خوایە .

﴿ و برا بوالدی ولم یجعلنی جبارا شقیبا ﴾ وەخوا فەرمانی داوە بەمن چاکە لەگەڵ دایکماو ریزی لی بگرم و گوێ رایەڵی بم وەخوا منی نەگیراوە بەمرۆڤێ بێ فەرمانی خوا بکەم و خۆم بەگەورە دابنیم بەرانبەر بەخواو چاکە نەکەم لەگەڵ دایکماو بێ فەرمانی ئەو بکەم .

﴿ والسلام علی یوم ولدت ویوم أموت و یوم أبعث حیا ﴾ وە خۆشی و بێ ترسی لەسەر من لەرۆژیکا من لەدایك بووم لەخراپەی شەیتان دوربوم و رۆژیك ئەمرم لەبت پەرستی دورم وەرۆژێ زیندو ئەکریمەوە لەترسی رۆژی دوای پاریزراوبم و خوا پاداشتی چاکەم بداتەوە .

﴿ ذلك عیسی إبن مریم قول الحق الذي فیه یمترون ﴾ ئەو شتانەی ئەوتۆ باسی کرا لەمەوبەر لەبارەی عیساوە ئەو گفتوگۆیانەی ئەوتۆ راستیکی ئەوتۆن گومانیان هەیە لەراستی ئەوانداو جوەکان ئەڵین: عیسا جادوگەرو پیاو خراپە،گاورەکان ئەڵین: عیسا خوا یاکوری خوایە یا هاوبەشی خوایە. ووشەی راست ئەوەیە عیسا بەندەی خواو پیغەمبەری خوایە. نویژ کەرو زەکات دەرو پیرۆزو دادپەروەرو چاکەکەرە لەگەڵ دایکیو جگەی دایکی خۆی .

﴿ ماکان الله أن تخذ ولدا سبحانه ﴾ شایستە نیە خوای مەزن کەوەربگرێ منال بۆخۆیو ناگونجێ خوامنالی هەبێ، پاك و خاوینی بۆخوایەو دورە لەوەی منالی هەبێ، ئەگەر خوا منالی هەبوایە هەمو سامانی جیهانیان بۆخۆیان دائەناو نەیان ئەدا بەجگەی خۆیان، وینەی کورانی فەرمانرەوای ئەم سەردەمەی ئیمە ، جیهانیان پرئەکرد لەئاشوبو جەنگ و ستەم کردن و خوین ریژی ، تاقی کردنەوە لەجیهاندا ئەوانەی سەلماندوە .

﴿ إذا قضى أمرا فإنما يقول كن فيكون ﴾ هەر كاتێ خـوا فـەرمانی دابـێ بەدروست کردنی شتێ، دوایی بەراستی بەو شتە ئەڵێ: تۆ ( ببە ) ئەو شتە کتوپر ئەبێ بـەو جـۆرەی خوای مەزن بیەوێ .

وَإِنَّ ٱللَّهَ رَبِّي وَرَبُّكُمْ فَٱعْبُدُوهُ هَٰذَا صِرَٰطٌ مُّسْتَقِيمٌ ﴿٣٦﴾ فَٱخْتَلَفَ ٱلْأَحْزَابُ مِنۢ بَيْنِهِمْ فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن مَّشْهَدِ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٣٧﴾ أَسْمِعْ بِهِمْ وَأَبْصِرْ يَوْمَ يَأْتُونَنَا لَٰكِنِ ٱلظَّٰلِمُونَ ٱلْيَوْمَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٣٨﴾ وَأَنذِرْهُمْ يَوْمَ ٱلْحَسْرَةِ إِذْ قُضِيَ ٱلْأَمْرُ وَهُمْ فِي غَفْلَةٍ وَهُمْ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٩﴾ إِنَّا نَحْنُ نَرِثُ ٱلْأَرْضَ وَمَنْ عَلَيْهَا وَإِلَيْنَا يُرْجَعُونَ ﴿٤٠﴾

﴿ وإن الله ربى وربكم فأعبدوه وهذا سراط مستقم ﴾ وەبەراستی خـوا پـەروەردگاری من و پەروەردگاری ئیوەشە کەواتـە مـن و ئیوەیـش پـەروەردگاری خۆمـان بپەرستین و جگەی ئەو نەپەرستین. ئەوانەی باسکران ریگەی راستە ئەگەر ئیوە پـەیرەوی ئـەو بکـەن رزگارتان ئەبی لـەسزای خوا، چونکە هەر ئەوەیە ئەو ئاینەی پیغەمبەران فەرمانیان پیداوە، من بروای راستی بەئیوە ئەلیم: کەمن ئادەمیزادم وەك ئیوە، ئەو شتانە شایستەی خوایـەتی نین، خوا پەروەردگارو پەرستراو دروست کەری من و ئیوە، بۆیە پیویستە هـەمومان ئـەو بپەرستین بەتاقی تەنها .

﴿ فأختلف الأحزاب من بينم ﴾ دوایی هەمو تاقمەکانی خاوەن نامەکان بیرو بۆچونیـان جیاوازە لـەنیوان خۆیانا دەربارەی عیسـا: جوەکـان ئـەلین: عیسـا جادوگـەرو درۆزنـە، گاورەکان لـەنیوان خۆیانا بیریان جیاوازە: یەعقوبیەکان ئەلین: عیسا خوایـەو لـەئاسمانـەوە

هاتوەتە خوارەوە بۆسەر زەوی لەپاشا بەرز بۆتەوە بۆلای ئاسمان. نەستوریەکان گومانیان وایە: عیسا کوری خوایە، تاقمێ تر لە گاورەکان لایان وایە: خواو عیساو مەریەم سێ خوان. ئەو بیرو باوەرە جیاوازە بیرو باوەری کوییانە. بەلام گاورەکان لەم سەردەمەی ئیمەدا هەمویان پیك هاتون لەسەر ئەوەی کەهەر عیسا خوایە بەتەنها .

﴿ فويل للذين كفروا من مشهد يوم عظيم ﴾ دوایی سزای زۆر سەختی دۆزەخ بۆکەسانیکی ئەوتۆیە باوەریان بەخوا نەهیناوە لەو کەسانەی ئەووتۆ ئەلین: هەر عیسا خوایەو ئەوانەیش ئەلین: عیسا کوری خوایە لەئامادەبونیان لەرۆژیکی گەورە لەبارەی سەختیو سزای گرانی ئەو رۆژەوە توشیان ئەبێ .

﴿ أسمع بهم وأبصر يوم يأتوننا ﴾ شتیکی زۆر سەرسورینەرە ئەو بێ باوەرانە ئەیبیسن و ئەیبینن لەو رۆژەدا دین بۆلای ئیمەو سزای ئیمە ئەبینن لەرۆژی دواییدا. یانێ بێ باوەران لەئاستی راستیدا کەرو کویرن و باوەریان بەیەکیتی خوا نەهیناوە، هاوبەشیان بۆخوا داناوە لەجیهاندا. ئەگەر ئەوان بیریان بکردایەوە سودیان لەبیستراوو بینراو وەرئەگرت. بەلام لەرۆژی دواییدا کەدین بۆلای ئیمە بەو بێ باوەرییەوە بویانە هەتا پرسیار تەواو ئەبێ گوێ ئەگرن و چاوو ورد ئەکەنەوە زۆر شتی دژوار ئەبیسن و ئەبینن ،؟ ئەو کاتە ئاوات ئەخوازن بگەرینەوە بۆ جیهان هەتا باوەر بهینن .

﴿ لكن الظالمون اليوم في ضلال مبين ﴾ بەلام ستەمکاران کەخۆیانیان کەرو کویر ئەکرد لەجیهانداو راستیان نەئەبیست ونەیان ئەبینی لەگومراییەکی ئاشکرادان لەپاشە رۆژدا .

﴿ وأنذرهم يوم الحسره إذ قضى الأمر ﴾ وەتۆ ستەمکاران بترسینە لەرۆژی خەفەت و سەرگەردانی کەرۆژی دواییەو تاوانباران خەفت ئەخۆن لەسەر کردنی کارە خراپەکانیان کاتێ هەمو شتێ کۆتای پێ دێ و پرسیارو وولامیان لێ ئەکرێ، ئیتر ئەو کاتە ریگەی هەلهاتن ئەبەسترێ بێ باوەران ئەچنە ناو دۆزەخ و باوەرداران ئەچنە بەهەشت، ئەو کاتە بێباوەران دلیان پرئەبێ لەخەفەت .

﴿ وهم فی غفلة لایؤمنون ﴾ وەتۆ بێباوەران بترسینە لـەکاتیکا ئـەوان لـەگیلیو بـێ ئاگایدان باوەرنابەرن لـەجیهانداو ئەیان توانی باوەر بهینن بەیەکیتی خـواو پیغەمبـەرو لـەم رۆژە بترسانایە. بەلاّم بەردەوام بون لـەسەر بێ فەرمانی خوا هەتا توشیان بووە بەتوشی ئەم رۆژەوە خەفەتباریان ئەکاو سزایان ئەدرێ .

﴿ إنا نحن نرث الأرض ومن علیـها وإلینـا یرجعـون ﴾ بەراستـیی ئیمـە دانیشـتوانی سەرزەوی لـەناو ئەبەین و هەر ئیمە ئەمینینــەوەو خـاوەنی زەویو هـەمو ئـەو کەسـانەین لـەسەر زەویدان و ئەوان ئەگەرینەوە بۆلای ئیمە لـەرۆژی دوایدا بۆ وەرگرتنــی پاداشـتی کردەوەی چاك و خراپی خۆیان .

وَٱذْكُرْ فِي ٱلْكِتَٰبِ إِبْرَٰهِيمَ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقًا نَّبِيًّا ﴿٤١﴾ إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَٰٓأَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْـًٔا ﴿٤٢﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّي قَدْ جَآءَنِي مِنَ ٱلْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَٱتَّبِعْنِيٓ أَهْدِكَ صِرَٰطًا سَوِيًّا ﴿٤٣﴾ يَٰٓأَبَتِ لَا تَعْبُدِ ٱلشَّيْطَٰنَ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ كَانَ لِلرَّحْمَٰنِ عَصِيًّا ﴿٤٤﴾ يَٰٓأَبَتِ إِنِّيٓ أَخَافُ أَن يَمَسَّكَ عَذَابٌ مِّنَ ٱلرَّحْمَٰنِ فَتَكُونَ لِلشَّيْطَٰنِ وَلِيًّا ﴿٤٥﴾ قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ ءَالِهَتِي يَٰٓإِبْرَٰهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَٱهْجُرْنِي مَلِيًّا ﴿٤٦﴾ قَالَ سَلَٰمٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّيٓ إِنَّهُۥ كَانَ بِي حَفِيًّا ﴿٤٧﴾

وَأَعْتَزِلُكُمْ وَمَا تَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَأَدْعُواْ رَبِّي عَسَىٰٓ أَلَّآ أَكُونَ بِدُعَآءِ رَبِّي شَقِيًّا ﴿٤٨﴾ فَلَمَّا ٱعْتَزَلَهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَهَبْنَا لَهُۥٓ إِسْحَٰقَ وَيَعْقُوبَ ۖ وَكُلًّا جَعَلْنَا نَبِيًّا ﴿٤٩﴾ وَوَهَبْنَا لَهُم مِّن رَّحْمَتِنَا وَجَعَلْنَا لَهُمْ لِسَانَ صِدْقٍ عَلِيًّا ﴿٥٠﴾

﴿ واذكر في الكتاب إبراهيم إنه كان صديقا نبيا ﴾ وەتۆ باسی ئیبراهیم بکە لەقورئاندا بۆگەلەکەت کەئەوان و جگەی ئەوانیش بروایان بەگەورەیی‌و ریزی ئیبراهیم هەیە. بەتایبەتی ئەو عەرەبە بت پەرستانە خۆیان بەنەوەی ئیبراهیم ئەزانن و خۆیانی پیوە هەلئەکیشن. بەراستی ئیبراهیم مرۆڤیکی راستگۆبوە لەهەمو گفتوگۆکانیاو لەو بەلینانەی داویەتی، پیغەمبەریکە لە پیغەمەرانی خواو هەلبژیراوە بۆ پیغەمبەرایەتی‌و سروشی بۆنیراوە، گفتوگۆی خراپی نەکردوەو خوا پەرستبوە .

﴿ إذ قال لأبيه يا أبت لم تعبد ما لا يسمع ولا يبصر ولا يغني عنك شيئا ﴾ ئیبراهیم راستی‌کردکاتی ووتی بەباوکی خۆی کەئازەرە: ئەی باوکی من، ئومیدەواربو باوەربهینێ بەخوا: تۆبۆچی شتێ ئەپەرستی هیچ شتێ نابیسێ‌و هیچ نابینێ‌و هیچ سودێ بەتۆ نابەخشێ، بگرە ئەگەر ببیسن و ببینن خاوەنی زیان لابردن نین و خاوەنی سود بەخشین نین نە بەخۆیان و نەبەجگەی خۆیان، چونکە ئەوان وینەی تۆن. ئیبراهیم یەکەم جار دانەبەزیە سەرباوکی‌و بلێ: تۆگیل و بێ ئاگای، زۆر بەژیرانە گفتوگۆی لەگەڵ‌کرد .
زانایان لەبارەی باوکی ئیبراهیمەوە بیرو چونیان جیاوازە: هەندیکیان ئەلین: ئازەر باوکی راستی ئیبراهیمە بەگویرەی دەرکەوتوی فەرمودەی خوا کەوای دەرئەخا. هەندێ تریان لایان وایە ئەوکەسەی ئیبراهیم پیی ئەوت: باوکی‌خۆم مامی بوە، چونکە بەمام و بەخیوکەریان ئەووت: باوك. دووبارە ئایا باوکی ئیبراهعیم باوەردار بوە یان نە ؟

لەوولاّمدا ئەو گیرەو گیشەیە سودیکی تیدانیە، ئەوەی پیویست بێ لەسەر ئیمە ئەمەیە ئیمە باوەرمان بە پیغەمبەرایەتی ئیبراهیم هەبێ. بەلاّم بروابون بەباوەرداری باوکی ئیبراهیم نرخی بۆ دانانرێ لەلایەن ئاینەوە. بەتایبەتی دەرکەوتی قورئان وادەرئەخا باوکی ئیبراهیم باوەری بەخوا نەبوە. بەهەر جۆرێ بوبێ ئیبراهیم باوکی راستەقینەی خۆی یا باوکی ناراستەقینەی خۆی بانگ کردوە بۆلای باوەرهینان بەخوا. هەرچەخدە زۆربەی زۆری زانایان لایان وایە مامی بوە، لەبەرئەوەی باپیرەکانی پیغەمبەری ئیسلام ئەبی هەمویان باوەرداربن بەخوا .

﴿ یاأبت إني قد جاءنی من العلم مالم یأتك ﴾ ئەی باوکی من: بەراستی هاتعوە بۆلای من لەزانین و ناسینی خوا شتێ نەهاتوە بۆلای تۆ، وەك ئەوەی هەر کەسێ دوای راستی نەکەوێ سزای ئەدری بەئاگری دۆزەخ، ئەی باوکی بەریزم: کاتێ من داوا ئەکەم لەتۆ واز بهینی لەبت پەرستی جگەی راستی بەتۆ نالیم و هیچ مەبەستیکم نیە مەگەر هەر چاکەی تۆ مەبەستیمنە .

﴿ فأتبعني أهدك سراطا سویا ﴾ دوایی تۆ پەیرەویمن بکە ریگەی راست و خوا پەرستی شارەزای تۆ ئەکەم و پیتی نیشان ئەدەم کەتۆ بەئاواتی خۆت بگەیو رزگارت بکا لەسەرگەردانی، بەختیاری هەردو جیهانت دەست گیربێ .

﴿ یاأبت لاتعبد الشیطان إن الشیطان کان للرحمن عصیا ﴾ ئەی باوکی بەریزی من: تۆ شەیتان مەپەرستە بەراستی شەیتان بێ فەرمانی خوای بەخشندە ئەکاو باوەری بەخوا نیەو پەیرەوی مەکە تۆ سەرگەردان و بەدبەخت ئەکاو بەرەو ئاگری دۆزەخ رائەکیشێ .

﴿ یاأبت إنی أخاف أن یمسك عذاب من الرحمن فتکون للشیطان ولیا ﴾ ئەی باوکی بەریزی من: بەراستی من ئەترسم و چاوەروانی ئەوە ئەکەم کەتوشی تۆبێ سزایەکی سەخت لەلایەن خوای خاوەن بەخشندە ئەگەر تۆ بەردەوامبی لەسەر پەیرەویو پەرستنی شەیتان، دوایی ببی بە هاورێ و دۆستی شەیتان لەنیو ئاگری دۆزەخداو دوربکەویتەوە لەبەزەیی خوای بەخشندە بەوینەی شەیتان .

﴿ قال أراغب أ نت عن آلهتي يا إبراهيم ﴾ ئازەری باوكی ئیبراهیم بە ئیبراهیمی ووت بەهەرەشەوە دوای ئەوهەمو ئامۆژگاریە ژیرانەی ئیبراهیم بەكاری هینا لـەگەڵ باوكیا: ئایـا تۆ ئارەزوت لـەوەیە واز لـەپەرستنی خواكانی من بهینی ئەی ئیبراهیم، سویند ئەخۆم

﴿ لئن لم ت ننته لأرجمتك واهجرني مليا ﴾ بەراستی ئەگەر تۆ كۆتای نەهینی بەدژایەتی من و خواكانی من و پەشیمان نەبیتەوە لـەو شتانەی وتووتە بەراستـی مـن تـۆ بـەردەباران ئەكەم و خۆت لـەمن بپاریزەو خۆت لـەمن دوربخەرەوە كاتیكی دورو دریژ هـەتامن مـاوم و زیندوم و یەك نەبینین لـەم كاتە بەدواوە .

﴿ قال سلام عليك سأستغفر لك ربي إنه كان بي حفيا ﴾ ئیـبراهیم دوای بـێ ئومیـدی لـەباوەرهینانی باوكیو خۆراگرتنی لـەسەر بێ باوەری بەباوكی ووت: بێوەی بـیو توشـی خراپەنەبیو من لای تۆ ئەرۆم و لـەبەر ریزی باوكی داوای لیبوردنت لی ئەكەم لـەمـەودوا لـەپەروەردگاری خۆم داوا ئەكەم بۆتۆ كەلـە تۆ خۆش ببێ و ئومیـدەوارم تـۆش پەشـیمان ببیتەوەو پارانەوەی من وەربگیرێ لای خـوا. بەراسـتی پـەروەردگاری مـن زۆر بەلوتفـە لـەگەڵ من و وەڵامی پارانەوەی من ئەداتەوە .

﴿ وأعتز لكم وما تدعون من دون الله ﴾ وەمن كەنار لـەئیوەو ئـەو شـتە ئـەگرم ئیـوە ئەیپەرستن لـەجگەی خوا هەركاتێ ئامۆژگاری من كارتان تێ نەكا منیـش بـەجیتان دیلـم لـەگەڵ خواكانتانا .

﴿ وأدعو ربي عسى ألا أكون بدعاء ر بي شقيا ﴾ وەمن پەروەردگاری خۆم ئەپەرسـتم و لــەو ئەپاریمـەوەو پـەنا بـۆلای ئـەو ئەبـەم ئومیـد ئەوەیـە كـەمن بــەهۆی پەرسـتنی پەروەردگاری خۆمەوە كۆشش و پارانەوەم لـەكیس نەچێ و بێ ئومید نەبم بەوینەی ئیوەی بت پەرست كەسود لـەماندوبون و پەرستنی بتەكان وەرناگرن مرۆڤ هەر پلەیەكی هـەبێ پیویستە داوای ریگە نومایی لــەخوا بكـا، چونكـە هـەر خوایـە دەسـەڵاتی هـەمو ەشـتی بەدەستەو رینومایی ئادەمیزاد ئەكا.

﴿ فلما أعتز لهم وما يعبدون من دون الله ﴾ دوایی کاتێ ئیبراهیم جـوێ بویـەوە لـەو بت پەرستانەو لەوشتەی ئەوان ئەیان پەرست لەجگـەی خـوا، خـوا پاداشـتی ئیـبراهیمی دایەوەو جیگەی ئەوانی پرکردەوە بەچاکتر لەوان، وەك خوا ئەفەرموێ:

﴿ و وهبنا له إسحاق ويعقوب وكـلا جعلنـا نبيـا ﴾ وەئیمـە بەخشـیمان بـە ئیبرباهیم ئیسحاقی کوریو یەعقوبی کورەزاێو منالی زۆریش، وەئیمە هەمو یەکێ لــەوانمان گـیرا بەپیغەمبەرو ئیبراهیممان کرد بەباوکی پیغەمەران .

﴿ و وهبنا لهم من رحمتينا وجعلنا لهم لسان صدق عليا ﴾ وەئیمە بەخشـیمان بـەوان لەگەڵ پیغەمبەرایەتیدا دارایيو کورو نەوەی زۆرو خواردەمەنی فراوان و شــتی تریـش و ئیمە گیرابومان بۆئەوان زمانی راستی بەرزو بەناوبانگی چــاك، بـەجۆرێ ئـادەمیزاد نـەوە لەدوای نەوە شانازی بە ئیبراهیم و یسحاق و یەعقوبەوە ئەکــەن و سـوپاس و ستایشـیان بۆئەنیرن و ئەوانەیش بەردەوامن هەتا هەتایە .

وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ مُوسَىٰٓۚ إِنَّهُۥ كَانَ مُخۡلَصٗا وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥١﴾ وَنَٰدَيۡنَٰهُ مِن جَانِبِ ٱلطُّورِ ٱلۡأَيۡمَنِ وَقَرَّبۡنَٰهُ نَجِيّٗا ﴿٥٢﴾ وَوَهَبۡنَا لَهُۥ مِن رَّحۡمَتِنَآ أَخَاهُ هَٰرُونَ نَبِيّٗا ﴿٥٣﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِسۡمَٰعِيلَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صَادِقَ ٱلۡوَعۡدِ وَكَانَ رَسُولٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٤﴾ وَكَانَ يَأۡمُرُ أَهۡلَهُۥ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱلزَّكَوٰةِ وَكَانَ عِندَ رَبِّهِۦ مَرۡضِيّٗا ﴿٥٥﴾ وَٱذۡكُرۡ فِي ٱلۡكِتَٰبِ إِدۡرِيسَۚ إِنَّهُۥ كَانَ صِدِّيقٗا نَّبِيّٗا ﴿٥٦﴾ وَرَفَعۡنَٰهُ مَكَانًا عَلِيًّا ﴿٥٧﴾ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ أَنۡعَمَ ٱللَّهُ عَلَيۡهِم مِّنَ ٱلنَّبِيِّـۧنَ مِن ذُرِّيَّةِ ءَادَمَ وَمِمَّنۡ حَمَلۡنَا مَعَ نُوحٖ

وَمِن ذُرِّيَّةِ إِبْرَٰهِيمَ وَإِسْرَٰٓءِيلَ وَمِمَّنْ هَدَيْنَا وَٱجْتَبَيْنَآ ۚ إِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُ ٱلرَّحْمَٰنِ خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَبُكِيًّا ۩ ﴿٥٨﴾

﴿ وأذكر في الكتاب موسى إنه كان مخلصا وكان رسولا نبيا ﴾ وەتۆ باسی موسا بکە لەقورئاندا بۆئادەمیزاد بەراستی موسا مرۆڤیکی هەلبژیراوە لەلایەن خواوە نیرراو پیغەمبەری خوابوو، موسا بەنیازی پاکەوە خوا پەرستی ئەکرد، (رسول) بەمرۆڤێ ئەلین:: نامەی بۆ نیرابێ و فەرمانی پێ درابێ ناوەرۆکی ئەو نامەیە رابگەیەنێ بەئادامیزاد. (نەبی) کەسیکە کرابێ بەپیغەمبەرو خاوەنی ئۆمەت نەبێ و نامەی بۆ نەنیررابێ .

﴿ وناديناه من جانب الطور الأيمن و قربناه نجيا ﴾ وەئیمەی پەروەردگاری موسا بانگی موسامان کرد لەلای راستی موساوە لەکیوی (تور) وئیمە موسامان لەخۆمان نزیك کردەوە بۆ گفتوگۆکردن لەگەلیا ریزمان لێ گرت بەبێ هۆی فریشتەوە. ئەو گفتوگۆیەی ئەبیست لەهەمو لایەکەوە. (تور) کیویکە لەنیوان مەدیەنا کاتێ لەمەیەنەو موسا ئەچوەوە بۆ میسر ئاگریکی بینیو بانگی کرا من خواو پەروەردگاری هەمو بونەوەرانم .

﴿ ووهبنا لهم من رحمتنا أخاه هارون نبيا ﴾ وەئیمە بەخشیبومان بەموسا لەبەر بەخشندەییو چاکەی ئیمە برای موسا کەهارونە پیغەمەرایەتیو یاریدەرایەتی موسا، چونکە بەر لەئیستا موسا داوای لەئیمە کردبو هارون بکەین بەیاریدەری = (وزیر) بۆی.

﴿ وأذكر في الكتاب إسماعيل إنه كان صادق الوعد ﴾ وەتۆ باسی ئیسماعیل بکە لە قورئانا. بەراستی ئیسماعیل مرۆڤێ بو راستی ئەکرد لەبەلینانداو هەر بەلینیکی بدایە جێبەجێی ئەکرد، بەتایبەتی ئەو بەلینەی دایبویە ئیبراهیمی باوکی کەئارام بگرێ لەسەر سەربرینی خۆی کەباەکی فەرموی: لەخەوما من فەرمانم پێدرابو کەتۆ سەربرم .

﴿ وكان رسولا نبيا وكان يأمر أهله بالصلاة والزكاة ﴾ وە ئیسماعیل نیراوی ئیمەبو بۆ راگەیاندنی فەرمانی خوا بەئادەمیزاد، پیغەمبەری ئیمەبو هەوال بدا بەمرۆڤ فەرمانەکانی ئیمە بەوان و فەرمانی ئەدا بەخیزانەکانی خۆی بەکردنی نویژو بەخشینی زەکات بەهەژاران .

﴿ وكان عند ربه مرضيا ﴾ وە ئیسماعیل مرۆڤیكی خۆشەویست بۆ لای پەروەردگاری خۆی، خوای مەزن باسی ئیسماعیلی كردووە لە بەلیندانا بۆئەوەی هەمو كەسێ وەكو ئەو بێ لەبەلین دان و فەرماندانی خیزانەكانی بە نویژكردن و زەكات دان، بۆیە بو بەجیگەی رەزامەندی خوا. كەواتە هەركەسێ پەیرەوی ئەو بكا خۆشەویستی خوایە .

﴿ واذكر فی الكتاب إدریس إنە كان صدیقا نبیا ﴾ وەتۆ باسی ئیدریس بكە لەقورئاندا. بەراستی ئیدریس مرۆڤیكی راست گۆو پیغەمبەربو هەوالی ئەدا بەئادەمیزاد فەرمانبەرداری خوابن .

﴿ ورفعناه مكانا علیا ﴾ وە ئیمە ئیدریسمان بەرزكردبوەوە بەپلەو پایەی بەرزە لای ئیمە لەجیهاندا بە پیغەمبەرایەتیو بەزانیاری .

بۆزانین: ئیدریس كوری یارد كوری مەهلائیل كوری قەینان كوری ئەنوش كوری شیس كوری ئادەمە. لەتەوراتا ناوی براوە بە (خەنوفە) لەگۆرانی زمانی عەرەبیدا ناوی بوبە ( ئوخنوخ ) .

خوای مەزن لە قورئاندا ناوی بردوە بە ئیدریس. زانایان بیریان جیاوازە لەبارەی ئیدریسەوە، ئایا لەمیسردا لەدایك بوە یا لە بابولدا، چەند زمانی زانیوەو چەند شاری دروست كردوە؟ بیژراوە: حەفتا زمانی زانیوە، سەدو هەشتا شاری دروست كردوە . یەكەم كەس بوە بۆزانینی تاقیكردنەوەی هاتوچۆی خۆرو مانگ و ئەستیرەكان ، بەو بۆنەوە دانیشتوانی فیری ژمارەی سال و مانگی كردوون، فەرمانی داوە بە ئادەمیزاد بەكردنی نویژو بەخشینی زەكات، فیری خوا پەرستیو یەكیتی خوای كردوون و فەرمانی داوە بەپاك كردنەوەی لەشیان و دەوركردنی لەش پیسی، فەرمانی داوە بەقەدەغەكردنی خواردنی گۆشتی سەگ و بەراز، چەندین كاتی بۆدیاری كردوون بكرین بەرۆژی جەژن و خۆشیو سەیران، موژدەی داوە بەهاتنی پیغەمبەرانی دوای خۆی بەتایبەتی باسی پیغەمبەری ئیسلامی كردووەو بۆ دانیشتوانی روون كردوەتەوە، هەرشتیكی لی پرسیاربكرایە وولامی ئەدانەوە لەبارەی روداوەكانی ئاسمان و زەوی، پارانەوەی لای خوا

گیرابوە، ئەیفەرمو: ئایینی پیغەمبەری ئیسلام شایستەیە بۆهەمو کات و هەمو جیگەیەو رەوشتە بەرزەکانی پیغەمبەری باسکردوە. یەکەمین کەس بوە بەپینوس شتیکی ویستبێ بینوسێ. جگە لە پیستی ئاژەڵو گەڵای درەخت فیری لەبەرکردنیی پۆشاکی تری بۆکردن. ئیدریس یەکەمین کەس بووە کیشانەو پیوانەو چەکی بەکارهینابێ .

هەندێ لەزانایان ئەلین: خوا ئیدریسی بەرز کردوەتەوە بۆبەهەشت، هەندێ تریان ئەلین: بەرزی کردوەتەوە بۆئاسمانی شەشەم یا ئاسمانی چوارەم .

﴿ ألئك الذين أنعم الله من النبيين من ذرية آدم وممن حملنا مع النوح ﴾ ئەو تاقمە پیغەمبەرانەی باسکران کەسانیکی ئەوتۆن خوا چاکەی خۆی بەسەر داریژان بەپیغەمبەرایەتی لەهەندێ لەمنالەکانی ئادەم وینەی ئیدریس و لەهەندێ لەو کەسانەی ئیمە هەلمان گرتبون لەگەڵ نوحدا لەناو کەشتیدا لەجگەی ئیدریس وەك ئیبراهیم کەلە منالەکانی سامی کوری نوحە .

﴿ ومن ذرية إبراهيم وإسرائيل وممن هدينا وأجتينا ﴾ وەلەمنالەکانی ئیبراهیم وەك ئیسماعیل و ئیسحاق و لەمنالەکانی ئیسرائیل کەنازناوی یەعقوبە زەکەریاو یەحیاو موساو هارون و عیساو کەکۆمەلە کەسیکن ئیمە رانموییمان کردوون بۆریگەی راستی خوا پەرستیو ئیمە هەلمان بژاردون لەنیو هەمو ئادەمیزاددا بۆ پیغەمبەرایەتیو ریگە پیشاندەری مرۆڤ و بۆبلاو کردنەوەی چاکەی هەمو جیهان .

﴿ إذا تتلى عليهم آيات الرحمن خروا سجدا وبكيا ﴾ هەرکاتێ بخوینریتەوە بەسەریانا ئایاتەکانی قورئانی خوای مەزنی خاوەن بەخشندە لەگەڵ ئەو هەمو پلەو پایە بەرزەی خوا بەوانی بەخشیون ئەکەون بەسەردەما بەسوژدە بردن بۆخواو بەگریان و ترسەوەو باوەری زۆر بۆخوای مەزن .

فَخَلَفَ مِنۢ بَعۡدِهِمۡ خَلۡفٌ أَضَاعُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَٱتَّبَعُواْ ٱلشَّهَوَٰتِۖ فَسَوۡفَ يَلۡقَوۡنَ غَيًّا

إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴿٥٩﴾ جَنَّٰتِ عَدْنٍ ٱلَّتِى وَعَدَ ٱلرَّحْمَٰنُ عِبَادَهُۥ بِٱلْغَيْبِ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ وَعْدُهُۥ مَأْتِيًّا ﴿٦٠﴾ لَّا يَسْمَعُونَ فِيهَا لَغْوًا إِلَّا سَلَٰمًا ۖ وَلَهُمْ رِزْقُهُمْ فِيهَا بُكْرَةً وَعَشِيًّا ﴿٦١﴾ تِلْكَ ٱلْجَنَّةُ ٱلَّتِى نُورِثُ مِنْ عِبَادِنَا مَن كَانَ تَقِيًّا ﴿٦٢﴾ وَمَا نَتَنَزَّلُ إِلَّا بِأَمْرِ رَبِّكَ ۖ لَهُۥ مَا بَيْنَ أَيْدِينَا وَمَا خَلْفَنَا وَمَا بَيْنَ ذَٰلِكَ ۚ وَمَا كَانَ رَبُّكَ نَسِيًّا ﴿٦٣﴾ رَّبُّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا فَٱعْبُدْهُ وَٱصْطَبِرْ لِعِبَٰدَتِهِۦ ۚ هَلْ تَعْلَمُ لَهُۥ سَمِيًّا ﴿٦٤﴾ ﴿٦٥﴾

﴿ فخلف من بعدهم خلف أضاعوا الصلاة وأتبعوا الشهوات فسوف يلقون غيا ﴾ دوای ئەوەی خوای مەزن باسی ئەو پیغەمبەرانەی کرد ئاماژە ئەکات بۆ تاقمیکی خراپی دوای ئەوان ئەفەرموێ: لەدوای ئەو پیغەمبەرانە تاقمیکی خراپ دین و جیگەی ئەوان ئەگرنەوەو واز لەنویژکردن ئەهینن لەکاتی دیاری کراوی خۆیانا نایکەن بەو مەرجانەوە بۆیان دیاری کراوەو دوای ئارەزۆ هەوەسی خراپی خۆیان ئەکەون و دژی یاسای خوا ئەوەستن و گوناهی جۆراوجۆر ئەکەن، دوایی ئەو منالآنەیان توشی زیانۆمەندی ئەبن لەرۆژی دواییدا بەهۆی بێفەرمانی خواو نیازی خراپیانەوە .

﴿ إلا من تاب وآمن وعمل صالحا فألئك يدخلون الجنة ولايظلمون شيئا ﴾ مەگەر کەسێ لەو منالەی ئەوان پەشیمان بوبونەوە لەکردەوە خراپەکانیان و داوای لیبوردن

لەخوای مەزن بکەن بەنیازی پاکەوەو باوەریان هینابیّ و کردەوەی چاکیان کردبیّ، دوایی ئەو کەسانە خوای مەزن لەکردەوە خراپەکانیان خۆش ئەبیّ و ئەچنە بەهەشتەوەو ئەو کەسانە ستەمی هیچ شتیکیان لیّناکریّ و بەتەواوی پاداشتی خۆیان وەرئەگرن، ئەو مرۆڤانەی پەشیمان بنەوە لەگوناهی خۆیان وەك گوناهیان نەکردبیّ وان .

﴿ جنات عدن التي وعد الرحمن عباده بالغيب إنه كان وعده مأتيا ﴾ ئەو بەهەشتە بریتیە لەچەندین بەهەشتیکی بەرین و پایەداری ئەوتۆو چاکەی کۆتای پیّنایە خوای خاوەن بەخشندە بەلینی داوە بە بەندەکانی خۆی باوەریان هیناوە بەبونی بەهەشت و ئەوان بەهەشتیان نەدیوە.

بەنادیاری باوەریان پیّ هیناوە کە هەیە. بەراستی بەلینی خوادیت و پیچەوانە لەبەلینی خوادا نیەلەبارەی ئەو بەهەشتانەوەو بەخشینی بەوکەسانە پەشیمان بونەتەوەو باوەریان هیناوەو کردەوەی چاکیان کردوە.

﴿ لايسمعون فيها لغوا إلا سلاما ولهم فيها رزقهم بكرة وغشيا ﴾ ئەوکەسە باوەردارانە گفتوگۆی بیجیگە نابیسن لەو بەهەشتانەدا مەگەر ئەو شتەی ئەیبیسن سلاوکردن و دەربینی خۆشیە بۆیەکتری و بۆ ئەو کەسانە هەیە لەو بەهەشتانەدا خواردەمەنی زۆر خۆش و رابواردنی چاك بەجۆریّ دلیان بچیتە سەری لەبەیانیان و ئیواران و هەمو کاتیکی تردا .

﴿ تلك الجنة التى نورث من عبادنا من كان نبيا ﴾ ئەو بەهەشتەی ئەوتۆ کەهەمو خواردەمەنی تیدایە لەوانەی چاکنو دەروون ئارەزۆی بکاو چاو پیّی گەش ببیتەوە ئیمە ئەیکەین بەمیراتی بەروبومی کەسیّ لەخوا ترساوە خۆپاریزبوە لەگوناه لەبەندەکانی ئیمە، پاداشتی کردەوەکانیانەوە بەتازەیی بۆیان دانراوە .

بت پەرستان و جوەکان پرسیاریان لە پیغەمبەر کرد لەبارەی چۆنیەتی گیانی زیندەوەران و دانیشتوانی ناو ئەشکەوت و زولقەرنین. پیغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ فەرموی: بەیانی وولامتان ئەدەمەوەو نەیفەرمو: خوا ئارەزۆ بکا .

بەو بۆنەیەوە بۆماوەیە سروشــی بـۆ نەهاتـە خـوارەوە پیغەمبـەر زۆری لاگرانبـو. بـێ باوەران تانەیان دا لـەوکارەو ئــەیان ووت: موحومـەد خواکـەی وازی لیـهیناوە. لـەپاشـا خوایمەزن بـە جـبرەئیلدا سروشــی بۆنـارد لــەبارەی وولآمدانـەوەی پرسـیارەکانیانەوە، پیغەمبەر فەرموی بە جبرەئیل: بۆچی درەنگ هاتی بـۆلای مـن. جـبرەئیل فـەرموی: ئیمـە بەندەیەکین بێفەرمانی خواناکەین لـەلایەن خــوای گـەورەوە فـەرمانمان پێئـەدرێو بـەبێ فەرمانی خوا هیچ شتێ ناکەین وبەدەســتوری خوانایـەین بـۆلای تـۆ. وەك خـوای مـەزن ئەفەرموێ:

﴿ وما ننزل إلابأمر ربك له مابين أيدينا وما خلفنا وما بين ذلـك ﴾ وەجـبرەئیل ووتـی: ئیمەی فریشتە نایەینە خوارەوە بەسروش هینان مەگەر بەهۆی فەرمانی پەروەردگاری تۆوە بیینە خوارەوە، هاتنە خوارەوەمان بەویسـتی خوایـە بۆپـەروەردگارە تۆیـە شتێ لـەدوای ئیمەوە دیت و شتێ لەمەوبەری ئیمـەوە رۆیشـتوەو شـتێ لـەنیوان داهـاتوو رۆیشـتودایە لەکارەکانی ئیستا. کەواتە هەمو شـتێ لـەکاتی دروسـتبونی بونەوەرانـەوە هـەتا کۆتـایی جیهان هەمویان فەرمانی خوان.

﴿ وما کــان ربـك نسـیا ﴾ وەپـەروەردگاریتۆ تـۆی لـەبیر نەچۆتـەوەو وازی لـەتۆ نەهیناوەو نەهاتنە خوارەوەی سروش لـەبەر ئەوەیە خوا فەرمانی پێنـەداوە بـەگومانی بـت پەرستان نابـێ. کەواتـە بۆماوەیـە سـروش نـەهات بـۆلای تـۆ خەفـەت مـەخۆ، سـروش بەگویرەی دانانی هەمو شـتیکە لەشـوینی شیاوی خۆیـاو گویـت مـەدەرە گومـانی بـت پەرستان کەگوایا خوا تۆی لـەبیر چۆتەوە .

﴿ رب السماوات والأرض وما بینهما ﴾ پەروەردگاری تۆ پەروەردگاری ئاسمانـەکان و زەویو شـتیکە لـەنیوان ئاسمـان و زەویـدان. چـۆن ئەچیتـــە میشــکەوە بێئاگــاییو لـەبیرچوونەوە روی تــێ بکـا، چـۆن ئـەگونجێ واز لـەتۆ بـهینێ کەهـەلبژاردەی خـوای بۆپیغەمبەرایەتی هەموو بونەوەران .

﴿ فاعبده وأصطبر لعبادته ﴾ دوایی تۆ لەپەروەردگاری خۆت ببرستەو ئارام بگرە بۆپەرستنی پەروەردگاری خۆت و خۆراگربە لەسەر ئازارو ئیش و لەسەر ئەو شتانەی دیتە ریگەی تۆو لەسەر تاوانجی بت پەرستان وگالتەپێ کردنی تۆ، خوای مەزن ئاگای لەتۆیە لەهەردو جیهاندا .

﴿ هل تعلم له سمیا ﴾ ئایا تۆئەزانی بەوینەی خوا کەسێ شایستەبێ ناوی ببرێ بەخواو شایان بێ بۆپەرستن و بەکەسێ ناوی ببرێ بەخوا بیگومان هیچ کەسێ نیە، چونکە بت پەرستان ناوی بتەکانیان ئەبەن بەجگەی (الله) وئەلین (الـه) .

هەندێ لەبێباوەران بێشەرمانە ئەیان ووت: ئیمە چۆن زیندو ئەکرینەوە دوای مردن و رزاندنی ئیسك و پیسمان و گیان ئەکریتەوە بەبەرمانا ؟ خوافەرموی :

وَيَقُولُ ٱلْإِنسَٰنُ أَءِذَا مَا مِتُّ لَسَوْفَ أُخْرَجُ حَيًّا ﴿٦٦﴾ أَوَلَا يَذْكُرُ ٱلْإِنسَٰنُ أَنَّا خَلَقْنَٰهُ مِن قَبْلُ وَلَمْ يَكُ شَيْـًٔا ﴿٦٧﴾ فَوَرَبِّكَ لَنَحْشُرَنَّهُمْ وَٱلشَّيَٰطِينَ ثُمَّ لَنُحْضِرَنَّهُمْ حَوْلَ جَهَنَّمَ جِثِيًّا ﴿٦٨﴾ ثُمَّ لَنَنزِعَنَّ مِن كُلِّ شِيعَةٍ أَيُّهُمْ أَشَدُّ عَلَى ٱلرَّحْمَٰنِ عِتِيًّا ﴿٦٩﴾ ثُمَّ لَنَحْنُ أَعْلَمُ بِٱلَّذِينَ هُمْ أَوْلَىٰ بِهَا صِلِيًّا ﴿٧٠﴾ وَإِن مِّنكُمْ إِلَّا وَارِدُهَا ۚ كَانَ عَلَىٰ رَبِّكَ حَتْمًا مَّقْضِيًّا ﴿٧١﴾ ثُمَّ نُنَجِّى ٱلَّذِينَ ٱتَّقَوا۟ وَّنَذَرُ ٱلظَّٰلِمِينَ فِيهَا جِثِيًّا ﴿٧٢﴾

﴿ ويقول الأنسان أ إذا مامت لسوف أخرج حيا ﴾ وەرەگەزی ئادەمیزاد ئەوانەیان بێباوەڕن ئەڵین: ئایا کاتێ من مردم وئیسك و پیسم نەما بەراستی من دەرئەهێنریمەوە لەگۆڕدا بەزیندویی وەك موحەمەد ئەیلێ. خوای مەزن وولاّمی ئەداتەوەو ئەفەرموێ:

﴿ أ و لايذكر الأنسان أنا خلقناه من قبل ولم يك شيئا ﴾ ئایا ئەو ئادەمیزادە بۆبیر ناکاتەوە کەبەراستی ئیمە ئەومان دروست کردوە لەپیش ئیستاوەو ئەو هیچ شتێ نەبوە. کەواتە ئیمە توانای ئەوەمان بوبێ بەبێ کەرەستەیەکی پیشو ئەومان دروست کردبێ و لەنەبونەوە هاتوەتە بون لەسەر ئیمە گران نیە ئیمە ئەو ئیسك و پروسکانە کۆبکەینەوە بەمرۆڤیکی وەك جاران و گیان بکەینەوە بەبەریا .

﴿ فوربك لتحشرنهم والشياطين ﴾ دوایی بەپەروەردگاری تۆ سویندبێ: بەراستی ئیمە ئەو بێباوەڕانەو ئەو شەیتانانە هاوڕیی ئەوان بوون و سەری لی تیکداون و بروایان بەزیندو بونەوە نەبوە کۆیان ئەکەینەوەو زیندویان ئەکەینەوە لەگۆڕەکانیاناو دەریان ئەهینین .

﴿ ثم لنحضرنهم حول جهنم جثيا ﴾ لەپاشا بەراستی ئیمە هەمویان ئامادەئەکەین بەم لاولای دۆزەخدا لەسەر ئەژنۆ دائەنیشن لەبەر تەسك و تروسکی جیگەکانیان و ناتوانن بەئارامی دانیشن هەتا زۆرتر خەفەت بخۆن و چاوەڕوانی پرسیار ئەکەن .

﴿ ثم لننزعن من كل أيهم أشد على الرحمن عتيا ﴾ لەپاش ئەوەی ریزکران لەم لاولای دۆزەخەوەو لەسەر ئەژنۆیان ئیمە دەرئەهینین لەهەمو تاقم و هۆزێ کەسێ لەوان زۆرتر تاوانبارو بێفەرمانی خوای بەخشندەی کردوە فرێ ئەدریتە دۆزەخ یەك لەدوای یەك بەگویرەی خراپەیان ئەخرینە جیگەیە لەدۆزەخ شایانی تاوانەکەیان بێ. هەروەها تاقم لەدوای تاقم. خراپتر لەدوای خراپتر فرێ ئەدرینە ناو دۆزەخ .

﴿ ثم لنحن أعلم بالذين هم أولى بها صليا ﴾ لەپاشا بەراستی ئیمە زاناترین بەکەسانیکی ئەوتۆ شایستەتر بن بخریتە دۆزەخەوە، ئەوکەسانەیان گوناهی گەورەتربێ سزاکەیشی گەورەترە، لەپاشا گەورەتر لەدوای گەورەتر لەگوناە کردنداو دەستیان ئەکەوێ بەئامادەکراوی ئەو شتانەی کردویانە لەجیهانداو ستەمیان لی ناکرێ .

﴿ وإن منكم إلاواردها كـان علـى ربـك حتمـا مقضيـا ﴾ وە هيـچ کەسـێ لـەئيوەی ئـادەميزاد نيـە مەگـەر ئەچێتـە نـاو دۆزەخ، ئەوچونـەيان بۆنـاو دۆزەخ پيويسـتيكە پەروەردگاری تۆ پيويستی کردوە لـەسەر خۆی زانايان بيرو بۆچونيان جياوازە لـەمەبەسـت لـەمانای (وارد ) هـەنديکيان ئـەلين: بـەمانا بينينـە، چونكـە بـاوەرداران، دورئەخرينـەوە لـەدۆزەخ، هەندێ تريان لايان وايە بەمانا چونە ناو دۆزەخـەو چـاك و خراپـان ئەخرينـە دۆزەخ، پياو خراپان لـەسەر ئەژنۆ، پياو چاکان بەبی ئازار ئەچنەژورەوە .

﴿ ثم ننجـي الذيـن اتقـوا و نـذر الظـالمين فـها جثيـا ﴾ لەپاشـا ئيمـە رزگارئەکـەين کەسانيکی ئەوتۆ لـەخوا ترسـاون و خۆيانيـان پاراسـتوە لـەبێفـەرمانی خـوا وە ئيمـە واز ئەهينين لـە ستەمكاران لـە نيو دۆزەخدا و لـەسەر ئەژنۆ دائەنيشن لـەبەر تـەنگی جيگـەيان هەر لـەبەر ئازاردانيان .

هاوريكانی پيغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ ژيانيـان ئـەبردە سـەر بەناخۆشـیو لـەبرگيكی چلكـن و شردابون، بێباوەرانيش لـەنيو ژيانی خۆش و بەرگی نايـاب و جيگـەی جـوان و رازاوەدا ئەژيان، بێباوەران بەهاوريكانی پيغەمبەريان ئەووت: بيگومان خوا ئيمەی لـەئيوە خۆشـتر ئەوێو ريزی پيداوين و سامانی زۆری داوە پيمان لـەجيهاندا، ئيـوە هـەژارو بـێ داريـن. کەواتە لـەپاشە رۆژدا ئيمە چاکتر ئەبين، خوای مەزن رسوايان ئەکاو ئەفەرموێ:

وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتُنَا بَيِّنَٰتٍ قَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ لِلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَىُّ ٱلْفَرِيقَيْنِ خَيْرٌ مَّقَامًا وَأَحْسَنُ نَدِيًّا ﴿٧٣﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هُمْ أَحْسَنُ أَثَٰثًا وَرِءْيًا ﴿٧٤﴾ قُلْ مَن كَانَ فِى ٱلضَّلَٰلَةِ فَلْيَمْدُدْ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ مَدًّا ۚ حَتَّىٰٓ إِذَا رَأَوْا۟ مَا يُوعَدُونَ إِمَّا ٱلْعَذَابَ وَإِمَّا ٱلسَّاعَةَ فَسَيَعْلَمُونَ مَنْ هُوَ شَرٌّ مَّكَانًا

وَأَضۡعَفُ جُندٗا ﴿٧٥﴾ وَيَزِيدُ ٱللَّهُ ٱلَّذِينَ ٱهۡتَدَوۡاْ هُدٗىۗ وَٱلۡبَٰقِيَٰتُ ٱلصَّٰلِحَٰتُ خَيۡرٌ عِندَ رَبِّكَ ثَوَابٗا وَخَيۡرٞ مَّرَدًّا ﴿٧٦﴾

﴿ وإذا تعلى عليهم آياتنا بينات قال الذين كفروا للذين آمنوا أى الفريقين خير مقاما وأحسن نديا ﴾ وە هەر کاتێ بخوێنریتەوە بەسەر بت پەرستانا ئایەتەکانی نامەی ئێمە بەرونیو بەئاشکرایی ماناکانیان. بێباوەران چەندین پروپاگەندەیان ساختە ئەهینا لەبارەی زیندوبونەوەو سزای رۆژی دوایی ئەیان ووت کەسانێکی ئەوتۆ باوەریان نەهینابوو: چ تاقمێ لەو دووتاقمەی ئیمەی بێباوەروو ساماندارو لەئیوەی باوەردارو هەژار چاکترن لەلایەن جیگەو پلەو پایەو خۆشتر ئەژین و کام لایان چاکترن لای دانیشتوان ئاشکرایە ئیمەی بێباوەر خۆش گوزەرانین، ئەگەر خوا ئیوەی باوەرداری خۆش بویستایە وەك ئیمە سامانی ئەرژان بەسەرتانا. کەواتە ئیمە لای‌خوا چاکترین. نەك ئیوەی هەژار، لەپاشە رۆژیشا ئەگەر هەبێ وەك ئیوە ئەیلین لەئیوە چاکترئەبین .

بۆزانین: (ئەبیقور) کەیەکیکە لەزاناکانی (یۆنان) هاوکات و هاو شاگردەکانی (ئەرەستۆ) بوە بیرو بۆچونی وایە هەمو چاکەیە بریتیە لەتام و خۆشیو رابواردنی جیهان، ئیتر بۆگەدە پرکردن بێ یابۆشتی تربێ، هەرکەسێ خۆش رابویرێ چاکترە لەو کەسەی رابواردنی کەم بێ.. فیرعەون و دارو دەستەکەی و بت پەرستانی کاتی پیغەمبەریش هەر ئەو بیرو بۆچونەیان هەبو، ئەوەبو فیرعەونە ئەیووت: من پاشای میسرم و ئەم روبارەی ژیرم پەیوەندی بەمنەوە هەیە، ئیتر چۆن ئەبێ من خوا نەبم. بت پەرستانی قورەیش ئەیان ووت: ئیمە دارایی و سامانمان لە ئیوەی باوەردار زۆرترەو خۆشتر ئەژین .

بەداخەوە لەم سەردەمەی ئیمەیشدا زۆر خوینەواری بیر تەسك هەن هەر ئەو بیرو بۆچونەیان هەیە بەرانبەر بەرژیمە ساماندارەکان پەیرەویان ئەکەن و لایەنیان ئەگرن. هەر ساماندارییە پالی بەپارتی بەعسی عەفلەقیەوە ناوە کەستەمکردن و رەگەز پەرستی لای‌ئەوان رەوایە، بۆنمونە (٧٠٠) کەسی لەتاقمەکەی (قالە تەگەرانی) پیاوی خۆشیان بوو لەگەڵ .

(٨٠) هەزار بارزانی بی تاوانیان کوشت هەرلەبەر ئەوەی کورد بوون، نزیکەی (١٨٠) هەزار کوردیان بەناوی ئەنفالەوە کەس نازانێ ئەوانە چ شتیکیان بەسەرهاتووە، زۆرتر لە شەش هەزار کەسیان لەدانیشتوانی هەلەبجە بەگازی کیمیاوی لەناو برد، نزیکەی پینج هەزار شارو گوندی کوردستانیانبەمزگەوتوکانیان رووخاند، ئەوانە جگەی هەزاران کوردو بێتاوانی تر کەکوشتنیان بەسێدارەو تیرەباران کردنیان، ئەوانە هەمویان هەر لەبەر ئەوەبو کەکوردن، ئەو شتانە هەمویان لەبەر سامانداری زۆر بو کەئەو کارە خراپانەیان بەکوردی موسولمان ئەکرد. بەلاّم خەیالیان خاوە پاشەرۆژیان بەم جۆرە ئەبێ کەخوا ئەفەرموێ:

﴿ وكم أهلكنا قبلهم من قرن هم أحسن أثاثا ورئيا ﴾ وەئیمە زۆر تاقمی بێ باوەرمان لەناو بردووە لەدانیشتوانی هەموسەردەمێ لەپیش ئەوانە بون ئەوان رابواردن و دارایی و بەرگ و روالەتیان لەوان چاکترو شیرینتربوە لەو بت پەرستانە. وینەی گەلانی سەمودعارو جگەی ئەوانیش. هەریەکەیان بەجۆرە سزایە بنەبرکران. بۆیە ئەبێ بت پەرستانی قورەیش چاوەروانی ئەو جۆرە سزایانە بکەن .

﴿ قل من كان في الضلالة فليمدد له الرحمان مدا ﴾ تۆبلێ بەو کەسانە شانازی ئەکەن بەبەشی پوچی جیهانەوە: هەرکەسێ لە گومراییدا بێ و دوربێ لەراستی، دوایی خوای خاوەن بەخشندە دریژە ئەدا بەتەمەنی ئەوکەسەو مۆلەتی ئەداو سامانی زۆری ئەداتێ و وازی لی دینێ و بێ باوەری و گوناهی زۆر ئەکا بەدریژدانیکی زۆر .

﴿ حتى إذا رأوا مايوعدون إما العذاب وإما الساعة ﴾ هەتا کاتێ ئەوکەسانە ئەلین: کام لایەکمان چاکین ئەبینن یاسزایان ئەدرێ بەکوشتن و دیل کردن و سەرکەوتنی موسولمانان یا ئەبینن رۆژی دوایی ئەخرینە نیو ئاگری دۆزەخ .

﴿ فسيعلمون من هو شرمكانا وأضعف جندا ﴾ دوایی ئەو کەسانەی لەگومرایدان ئەزانن چ کەسێ جیگەی خراپەو چ کەسێ یاریدەری لاوازترە، لەرۆژی دواییدا ئەو کەسانەخوای مەزن رسوایان ئەکا باوەرداران سەربەرزو رزگارن.

﴿ ویزید الله الذین أهتدوا هدی ﴾ وەخوا شارەزایی بەدەستوری خـواو ریگـەی چـاك زۆر ئـەكا بۆكەسـانیكی ئـەوتۆ رانمویـان وەرگرتـوەو باوەریـان هینـاوەو بـەردەوام بـون لـەسەری، هەروەك دریژە ئەدا بەگومرایی بێ باوەران .

﴿ والباقیات الصالحات خیر عند ربك ثوابـا و خـیر مـردا﴾ وەئـەو كـردەوە چاكانـە سودیان بەردەوامە وەك زانیاری خواناسین و كاری سود بەخش ئەوانە چاكترن لـەدارایی‌و پلەو پایە لـەلایەن پاداشتەوە لـەخزمەت پەروەردگاردا پاشە رۆژیان چاكترە. چونكـە ئـەو كارە چاكانە پاداشتیان بەردەوامەو كاری خراپ سودی ئەبریتەوە، ئەو كارە چاكانـە وەك نویژو منالی خواناس و زۆر شتی تریش .

أَفَرَءَيْتَ ٱلَّذِى كَفَرَ بِـَٔايَـٰتِنَا وَقَالَ لَأُوتَيَنَّ مَالًا وَوَلَدًا ﴿٧٧﴾ أَطَّلَعَ ٱلْغَيْبَ أَمِ ٱتَّخَذَ عِندَ ٱلرَّحْمَـٰنِ عَهْدًا ﴿٧٨﴾ كَلَّا ۚ سَنَكْتُبُ مَا يَقُولُ وَنَمُدُّ لَهُۥ مِنَ ٱلْعَذَابِ مَدًّا ﴿٧٩﴾ وَنَرِثُهُۥ مَا يَقُولُ وَيَأْتِينَا فَرْدًا ﴿٨٠﴾ وَٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ ءَالِهَةً لِّيَكُونُوا۟ لَهُمْ عِزًّا ﴿٨١﴾ كَلَّا ۚ سَيَكْفُرُونَ بِعِبَادَتِهِمْ وَيَكُونُونَ عَلَيْهِمْ ضِدًّا ﴿٨٢﴾ أَلَمْ تَرَ أَنَّآ أَرْسَلْنَا ٱلشَّيَـٰطِينَ عَلَى ٱلْكَـٰفِرِينَ تَؤُزُّهُمْ أَزًّا ﴿٨٣﴾ فَلَا تَعْجَلْ عَلَيْهِمْ ۖ إِنَّمَا نَعُدُّ لَهُمْ عَدًّا ﴿٨٤﴾ يَوْمَ نَحْشُرُ ٱلْمُتَّقِينَ إِلَى ٱلرَّحْمَـٰنِ وَفْدًا ﴿٨٥﴾ وَنَسُوقُ ٱلْمُجْرِمِينَ إِلَىٰ جَهَنَّمَ وِرْدًا ﴿٨٦﴾ لَّا يَمْلِكُونَ ٱلشَّفَـٰعَةَ إِلَّا مَنِ ٱتَّخَذَ عِندَ

أَلرَّحْمَٰنِ عَهْدًا ﴿٨٧﴾

﴿ أفرأيت الذى كفر بآياتنا وقال لأوتين مالا وولدا ﴾ ئایا تۆ زانیوتە هەواڵت داوە بەکەسێکی ئەوتۆ باوەری نەهیناوەوبروای بەزیندو بونەوە نەبوەو ئەیوت: بەراستی ئەبەخشرێ بەمن دارایی‌و منالْ لەمەودوا ئەوکاتە ئەوقەرزەی تۆداوای ئەکەی ئەتدەمێ.

زانایان ئەلین: هۆی هاتنە خوارەوەی ئەو ئایەتانە ئەمەیە: خەبابی کوری ئەلئەرت قەرزیکی بەسەر عاسی کوری وائیلەوە بوو کاتێ داوای قەرزەکەی لیکردەوە عاس بەخەبابی ووت: ئەو قەرزەت نادەمەوە هەتا بێباوەرنەبی بەموحەمەد، خەباب ووتی: سویندم بەخوا: نەبەزیندویو نەبەمردویو نەکاتێ زیندو ئەکریمەوە بێباوەرنابم بەموحەمەد ﴿ ﷺ﴾، عاس ووتی: کاتێ تۆ زیندو کرایتەوە ئەوکاتە من کورو دارایم ئەدریتێ و قەرزەکەت ئەدەمەوەو گالتەی پێ‌ئەکرد .

﴿ أطلع الغيب أم اتخذ عندالرحمن عهدا ﴾ ئایا ئەو پیاوە بێباوەرە ئاگاداری لەسەر ئەوشتە نهینیە چۆن بۆیەیدا بوەو چ کەسێ بەوی ووتوە ئەچیتە بەهەشت و ئەوشتانەی ئەدریتێ؟ باوەری گرتوە لەخزمەت خوای خاوەن بەخشندەوە پەیمانێ ئەو شتەی ئەدریتێ؟ ئەبێ بزانێ ئەو بێباوەرە نەئەوەیان بوەو نەئەمەیان .

﴿ كلا سنكتب مايقول ونمد له من العذاب مدا ﴾ ئەو کەسە هەلەیە لەو شتەدا بیری لی کردوەتەوە بۆخۆیو نەمنالی ئەدریتێ نەدارایی. لەدوایدا ئیمە ئەوشتەی ئەوبێ باوەر ە ئەیلێ ئەینوسین دوایی سزای ئەدەین لەرۆژی دوایدا لەسەر ئەو شتەی ئەیلێ دریژە ئەدەین بەسزادان بۆی بەدریژدانیکی زۆر لەسەر ئەو بوختانە کردویەتی کەدارایی‌و منالی ئەدریتێ .

﴿ ونرثه مايقول ويأتينا فردا ﴾ وە ئیمە ئەو شتە ئەوکەسە ئەیلێ لیی ئەسینینەوە لە دارایی و لە منالْ بەهۆی مردنی و لەناو بردنیەوە و ئەوکەسە دیت بۆلای ئیمە لەپاشە رۆژدا بە تەنهایی و بەبێ دارایی و بەبێ منالْ، جگە لەخوا کەسێ تری نیەو کەس ناگاتە فریای .

﴿ وأتخذوا من دون الله آلهة ليكون لهم عـزا ﴾ وەبـت پەرسـتانی قورەیـش چـەندین خوایان وەرگرتوە بۆخۆیان لـەجگەی خوا بۆ پەرستن لـەبتـەکان و فریشـتەکان هـەتا ئـەو پەرستراوە پوچانە بن بەهۆی ئەرجومەندی و ریز بۆئـەوانو بۆیـان بپارینـەوە، هەرکەسـێ خۆی بەگەورە دابنێ بەجگەی خواو خوا بەرگی رسوایی ئەکاتە بەری .

﴿ كلا سيكفرون بعبادتهم ويكونون عليهم ضدا ﴾ ئەو کـارە بـەو جـۆرە نیـە ئـەوان گومانی بۆئەبەن، لـەمەودوا ئەو پەرستراوانە ئەوان بەدرۆ ئەخەنەوەو بیزاری خۆیان لـەوان دەرئەبرن و ئەبن بە دژی ئەوەی ئەوان لـەسەری بوون و ئەبن بە دوژمنیان. نەك بەدۆست و یاریدەریان لای‌خوا .

﴿ ألم ترأنا أرسلنا الشياطين على الكافرين تؤزهم أذا ﴾ ئایا تۆ نەتزانیوە بەراستی ئیمـە ناردومانە بۆسەر بێباوەران شەیتانەکان و دەسەڵاتیان پەیدا کـردوە بەسـەریاناو هانیـان ئەدەن بۆبێ فەرمانی خواو ناچاریان ئەکەن لـەسەرکردنی گوناە بەهاندانیکی زۆر سـەخت و گومان ئەخەنە دلیان. بەلاّم ئیمە ریگەی چاك و خراپمان بۆ ر ون کردونەتەوەو ئەقلمان داونەتێ بۆکردنی هەمو شتێو سەربەستن .

﴿ فلا تعجل عليهم إنما نعد لهم عدا ﴾ دوایی تۆ پەلـە مەکە لـەسەر نـاوبردنی ئـەوان هەتا خۆت و باوەرداران رزگارتان ئەبێ لـەئازار و خراپەی ئەوان. بەراستی ئیمە ئەژمیرین و دیاریمان کردوە بۆئەوان تەمەنیکی کورت و دوایی پـێ دیـت و چـەن رۆژیکیـان مـاوە لـەژیانیانا یابەدیاری کردنیکی زۆرکەم، بەلاّم ئیمە دوایی ئەخەین بۆلای ماوەیەکی دیـاری کراو، تەمەنی دریژ چاکەی تیدا نیە مەگەر بۆئەو کەسـانە بـاوەر ئـەهینن و کـاری چـاك ئەکەن. بەلاّم بۆبێ باوەران و گوناە کاران ژیانیان نەگبەتیە بۆیان .

﴿ يـوم نحشـر المتقيـن إلى الرحمـن وفـدا ﴾ وەتـۆ بـیری ئـەو رۆژە بکـەرەوە ئیمـە کۆئەکەینەوە کەسانیکی ئەوتۆ لـەخوا ترساون و خۆیانیان پاراسـتوە لـەبێ فـەرمانی خـوا بۆلای خوای خاوەن بەخشندە بەچەندین کۆمەڵو بەچەند شیواز بۆئەوەی بچنە بەهەشـت و بحەسینەوە لـەژیر میهرەبانی خوادا بەرابواردن و خواردەمەنی خۆش و بەتام .

﴿ و نسوق المجرمين إلى جهنم وردا ﴾ وەئیمە لەو رۆژەدا تاوانباران ئەنیرین بۆلای دۆزەخ بەوینەی ئاژەڵ بەپیادەیی و بەتینویتی لییان ئەخورن بەوینەی ئاژەڵ بۆلای ئاو خواردنەوە .

﴿ لايملكون الشفاعة إلا من اتخذ عند الرحمان عهدا ﴾ بەندەكان هیچ كەسیكیان خاوەنی ئەوە نین بۆ هیچ كەسێ بپارینەوە لەلای خوا مەگەر پارانەوەی كەسێ لای خوای خاوەن بەخشندە پەیمانی پیدرابێ بۆپارانەوە بۆ كەسێ وەیا بۆئەو كەسەی پارانەوەی بۆئەكرێ لای خوا دەستوری بۆدرابێ، هەركەسێ فەرمانی خوای جێبەجێ كردبێ و گوناهی گەورەو بچوكی نەكردبێ خوا پەیمانی پیداوە رزگاری بكاو پارانەوە بكا بۆكەسی شایستەبێ بۆئەوەی پارانەوەی بۆبكرێ .

وَقَالُوا۟ ٱتَّخَذَ ٱلرَّحْمَٰنُ وَلَدًا ﴿٨٨﴾ لَّقَدْ جِئْتُمْ شَيْـًٔا إِدًّا ﴿٨٩﴾ تَكَادُ ٱلسَّمَٰوَٰتُ يَتَفَطَّرْنَ مِنْهُ وَتَنشَقُّ ٱلْأَرْضُ وَتَخِرُّ ٱلْجِبَالُ هَدًّا ﴿٩٠﴾ أَن دَعَوْا۟ لِلرَّحْمَٰنِ وَلَدًا ﴿٩١﴾ وَمَا يَنۢبَغِى لِلرَّحْمَٰنِ أَن يَتَّخِذَ وَلَدًا ﴿٩٢﴾ إِن كُلُّ مَن فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ إِلَّآ ءَاتِى ٱلرَّحْمَٰنِ عَبْدًا ﴿٩٣﴾ لَّقَدْ أَحْصَىٰهُمْ وَعَدَّهُمْ عَدًّا ﴿٩٤﴾ وَكُلُّهُمْ ءَاتِيهِ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ فَرْدًا ﴿٩٥﴾ إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحْمَٰنُ وُدًّا ﴿٩٦﴾ فَإِنَّمَا يَسَّرْنَٰهُ بِلِسَانِكَ لِتُبَشِّرَ بِهِ

ٱلْمُتَّقِينَ وَتُنذِرَ بِهِۦ قَوْمًا لُّدًّا ﴿٩٧﴾ وَكَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّن قَرْنٍ هَلْ تُحِسُّ مِنْهُم مِّنْ أَحَدٍ أَوْ تَسْمَعُ لَهُمْ رِكْزًۢا ﴿٩٨﴾

﴿ وقالوا أتخذالله الرحمن ولدا ﴾ بێباوەران گەیشتونەتەە رادەیـە لـەبێباوەریو لـەبێ شەرمیدا. ئـەیان ووت: خـوای خـاوەن بەخشـندە منـالی دانـاوە بۆخـۆی لـەئادەمیزادو لەفریشتە، جولـەکەکان ئەیان ووت: عوزەیر کوری خوایە. گاورەکان ئەیان ووت: عیسـا کوری خوایە. هەندێ لـەبت پەرستانی عەرەب لایان وابو: فریشتەکان کچی خـوان. ئـەو بۆچون و بروایانە هەمویان پروپوچن. گفتوگۆی نارەواو بیزلی کراوەن .

﴿ لقد جئتم شيئا إذا ﴾ بەراستی ئیـوەی بـێ بـاوەر هـاتوون بەشـیکی زۆر خـراپ و بیزلیکراوەو گفتوگۆیەکی زۆر گەورەی نارەواو خراپتان کـردوە، چونکـە خـوای مـەزن بێباوك و بێمناڵو بێوینەیە .

﴿ تكاد السماوات يتفطرن منـه وتنشـق الأرض وتخـر الجبـال هـدا أن دعـو للرحمـن ولـدا﴾ زۆرنزیکـە ئاسمانـەکان پارچەپارچـەبن و ئەسـتیرەکان بـدەن لـەیـەك و ژیـان بـۆ گیانداران نـەمینێ لـەبـەر خراپـی ئـەو گفتوگۆیـە و زەوی رۆبچـێ و کیوەکـان بکـەون بەپارچەپارچەیی لـەبەر ئەوەی ئەو بێباوەرانە بانگیان کردوە بۆخوای خـاوەن بەخشـندەو داویانەتە پاڵ خوا مناڵو ئەو گفتوگۆ نارەوایانە .

﴿ وما ينبغـي للرحمـن أن يتخـذ ولـدا ﴾ وەشایسـتەنیە کـەوەربگیرێ خـوای خـاوەن بەخشندە مناڵ بۆخۆی، ئەبێ مناڵ لـەباوکی خۆی بچێ و خوا بێ وینەیە، وەرگرتنی منـاڵ لـەبەر پیویستیەو خوا پیویستی بەبونەوەران نیە .

﴿ إن كل من في السـماوات والأرض إلآ آتـي الرحمـان عبـدا ﴾ هیـچ کەسـێ لـەنیو ئاسمانەکان و زەویدا نیە مەگەر دین بۆلای خوای خاوەن بەخشندە بەبەندایەتی بۆخوا، ئیتر ئەو کەسانە ئادەمیزاد بن یا فریشتەو جنۆکـە، ئـەبێ بریـار بـدەن خوایەکـەو سەرشـۆری دەربرن بۆخوا، بەندە ئەبێ جگەی گەورەی خۆی بێ .

﴿ لقد أحصاهم وعدهم عد أوكلهم آتيه يوم القيامة فردا ﴾ بەراستی خوای خاوەن بەخشندە ئەوانەی لەئاسمان و زەویدان هەمویان ئەزانیو ئەوانی ژماردوەو تۆماری کردون لایخۆی بەتۆمارکردنی خۆیان و هەناسەیان و کردەوەو گوفتاریان بەدانیشتوانی سەرەو خوارەوەو هەمویان دین بۆلای خوای خاوەن بەخشندە بەتەنهاییو بێیاریدەرو خاوەنی خۆیشیان نین چەجای جگەی خۆیان، کەسانێ بین بۆلای خوا بەو جۆرە چۆن ئەبێ کوری خوابن؟ .

﴿ إن الذين آمنوا وعملوا الصالحات سيجعل لهم الرحمان ودا ﴾ بەراستی کەسانیکی ئەوتۆ باوەریان هیناوە بەخواو کردەوە چاکەکانیان کردبێ خوای خاوەن بەخشندە ئەگیرێ بۆیان خۆشەویستی بەندەکانی بۆئەوانە کەخاوەنی باوەرو نیازی پاکن و بەچاکە باسیان ئەکەن. پیغەمبەر ئەفەرموێ بەجبرەئیل : من ئەو بەندەی خۆمم خۆش ئەوێ پیویستە تۆیش خۆشت بوێ، دوایی جارئەدا بەنیو ئاسمانەکاندا خوا فلان کەسی خۆش ئەوێ، ئیوەش خۆشتان بوێ. دوایی بەوبۆنەوە خۆشەویستی ئەوکەسە دیتە خوارەوە بۆسەر زەویو دانیشتوانی سەرزەویش باسی بەچاکە ئەکەن .

﴿ فإنما يسرناه بلسانك لتبشر به وتنذر به قوما لدا ﴾ دوایی بەراستی ئیمە قورئانمان ئاسان کردوە بەهۆی زمانی تۆو بەزاراوی عەرەبی ناردومانەتە خوارەوە هەتا لەقورئان بەباشی تیبگەی، لەبەر ئەوەی تۆ موژدە بدەی بەهۆی قورئانەوە بەو کەسانەی لەخوا ئەترسن و خۆیان لەگوناه ئەپاریزن و بەو قورئانەیش بترسینی تاقمێ دوژمنی سەرسەختی تۆن و زمانیان پیسە هەتا خوا بنەبریان بکا وەك گەلانی رابوردو ئەگەر باوەرنەهینن .

﴿ وكم أهلكنا قبلهم من قرن هل تحس منهم من أحدا وتسمع لهم ذكرا ﴾ وەئیمە زۆرکەسمان لەدانیشتوانی کاتەکانی پیش ئەوان لەناو بردوەو وینەی ئەوبت پەرستانە دوژمنی پیغەمبەرەکانیان بون، ئایا تۆهەست ئەکەی بەهیچ یەکێ لەوان و ئەیان بینی یائەبیسی دەنگیکی نزم لەوانەوەو هەمویان بنەبربوون ، بت پەرستانی ئەم کاتەش وەك ئەوانی لیدێ .

بەیاریدەی خوا کۆتایی هات رۆژی شەممە (٥)ی مانگی زیل حیجە ریکەوتی ١١|٣|٢٠٠٠ خوای خاوەن بەخشندە ئەوەی چاکە بۆخۆم و خیزانمی بکەو لەخۆم و باوك و دایکم خۆش بە

# ﴿ سورەتی تـەهـا ﴾

لەمەکە هاتوەتە خوارەوە. هەندێ لـەزانایان ئـەڵێن: جگـە لەئایەتـەکانی (٣٠-٣١) لەمەدینە هاتونەتە خوارەوە، ژمارەی ئایەتەکانی ( ١٣٥ ) ئایەتن .

﴿ بسم الله الرحمن الرحيم ﴾

**( بەناوی خوای بەخشندەی میهرەبان )**

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

طه ﴿١﴾ مَا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْقُرْآنَ لِتَشْقَىٰ ﴿٢﴾ إِلَّا تَذْكِرَةً لِّمَن يَخْشَىٰ ﴿٣﴾ تَنزِيلًا مِّمَّنْ خَلَقَ الْأَرْضَ وَالسَّمَاوَاتِ الْعُلَى ﴿٤﴾ الرَّحْمَٰنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوَىٰ ﴿٥﴾ لَهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ وَمَا بَيْنَهُمَا وَمَا تَحْتَ الثَّرَىٰ ﴿٦﴾ وَإِن تَجْهَرْ بِالْقَوْلِ فَإِنَّهُ يَعْلَمُ السِّرَّ وَأَخْفَى ﴿٧﴾ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ لَهُ الْأَسْمَاءُ الْحُسْنَىٰ ﴿٨﴾

﴿ طَهَ ﴾ زانایان بیروبۆچونیان جیاوازە لـەماناکردنی ئـەودوو پیتانـە، بۆئـەوەی چاکـتر مانای ئەوجۆرە پیتانە بزانرێن تەماشای سـەرەتای سـورەتی ئەلبەقـەرەو سـورەتەکانی تـر بکەن. بەڵام زۆربەی زانایان لایان وایە: ئەودوو پیتانەی ئێرە نـاون بـۆ پێغەمبـەر ﴿ ﷺ﴾، چونکە کاتێ ئازاری زۆری خـۆی ئـەداو خەفـەتی ئـەخوارد لـەسـەر ئـەوەی دانیشـتوان باوەڕیان پێ‌نەئەهێنا. خوای مەزن فەرموی: ئەی تاهـا: تـۆ ئـازاری خـۆت مـەدە لـەسـەر

ئەوەی قورەیشەکان باوەڕت پێ‌ناهێنن، ئێمە پێویستمان نەکردوە لەسەر تۆ ئەوان باوەڕت پێ‌بهێنن، ئەوەتە خوای مەزن ئەفەرموێ :

﴿ وَما أَنْزَلْنا عَلَيْكَ القُرآنَ لِيَتَشقى ﴾ وە ئێمە قورئانمــان ڕەوانــە نەکردوەتــە خــوارەوە بەسەر تۆدای ئازار بچێژی لەسەر ئەو شتانە تــۆ ئــەبینی لــەبێ باوەڕانــەوەو بــەردەوامیان لەسەر بێ‌باوەڕی .

﴿ أَلاّتَذْكِرَةً لِمَــنْ تَخْشــى ﴾ بــەڵام ئێمــە قورئانمــان ناردوەتــە خــوارەوە لەبەرئــەوەی تۆبیکەی بەئامۆژگاری کردن بۆکەسێ لەخوا بترسێ‌و خوا دڵی کردبێتەوە بۆباوەڕ هێنان. نەك بۆکەسێ خوای مــەزن مــۆری دابــێ بەســەر دڵیــا بــەهۆی گونــاه کردنــەوە، بۆئــەو کەسانەیش پەیڕەوی تۆئەکەن بەهۆی ئەو قورئانەوە ڕێگەی ڕاست وەرئەگرن، بۆئــەوەیش ناوەڕۆکی قورئان ببێت بەبەڵگە لەسەر بێ‌باوەڕان و بیانویان نەمێنێ .

﴿ تَنْزِيلاً مِمَنْ خَلَقَ الأَرضَ وَالسَماواتِ العُلِــى ﴾ ئێمــە قورئانمــان ناردوەتــە خــوارەوە بەناردن لەکەسێکەوە زەوی دروست کــردوە بــەو شــتانەوە لەســەریەتی لــەگیانداران و جگەی گیانداران بەجۆرێ ئەتوانرێ پشــووی تێدا بــبرێ‌و ئاسمانــە بــەرزەکانی دروســت کردوە بەجۆرێ کەس ناتوانێ دروستیان بکاو ئەستێرەکان هاتوچۆە تێدا ئەکەن بەو شــێوە سروشتیەو ئەوان بەزمانی تایبەتی خۆیان و قورئانیش بــەزمانی گفتوگــۆ بەڵگــەن لەســەر بونی توانای خوای مەزن و بەختیاری ئادەمیزاد، دوایی تۆ بۆئەو قورئانە ئەکــەی بــەئازارو ماندوبونی خۆت. پێغەمبــەر ﴿ ﷺ﴾ هەرچــەندە گــەورەترینی دروســت کراوانــی خوایــەو زانیاری لەزانیاری بێ‌وێنەی خواوە وەرگرتوە، لەبەر ئەوە خۆی بەوە ئەژمێرێ کەســـتی لەفەرمانی خوادا ئەکا، بەتایبەتی ئەگەر بانگەوازە ڕاستیەکەی بەرهــەمی نــەبێ لــەڕانموبی وەرگرتنی قورەیشەکان .

﴿ الرَّحمن عَلَى العَرْشِ اسْــتَوى ﴾ خــوای خــاوەن بەخشــندە دەســەڵاتی هەیــە بەســەر بونەوەراندا، ئەو ڕستەیە هێمایــە لەســەر توانــای خــواو بــەڕێوە بردنــی بونــەوەران، وەك ئەبێژرێ پاشا توانای بەسەر تەختی خۆیا هەیە، بۆباشتر ڕون بونــەوەی مانــای ئــەو ڕســتە

یەتەماشای مانای ئایەتی (٤٥)ی ئەلتەعراف بکەن. بۆوەرگرتنی توانــای. خـوای مـەزن، خوا ئەفەرموێ:

﴿ لَهُ مافي السَماواتِ وَماْ فِي الأَرْضِ وَما بَيْنَهُما وَما تَحْتَ الثَرى ﴾ هەر بۆخوا یەشـتێ لەناو ئاسمانەکاندایە لەفریشتەکان و ئەستێرەکان و ئەو شـتە لـەناو زەویـداو لەسـەریەتی لەگیانداران و کێوو ڕوبارو درخت و ئەو شتانەی تریش لەئاسمان و زەویـدان نـابینرێن و شتێکیش ئەبینرێ. بۆ خوایشــە شـتێ لەزەویدایـە لـەکانگاکانیی زێـڕو زیـوو نـەوت و ئەڵماس و یۆرانیۆم و گازو خواردەمەنیو ئـاوو ئـاگرو شـتی تریـش. کەواتـە هـەر خـوا شایستەی پەرستنەو ئاگای لەهەمو شتێ هەیە .

﴿ وَإِنْ تَجْهَرَ بِالقَوْلِ فَإِنَهُ يَعْلَمُ السِرَّ وَاخْفــى ﴾ وەئەگـەر تـۆ دەنـگ بـەرز بکەیتــەوە لەگفتوگۆدا، دوایی بەڕاستی خوا ئـەزانێ بـەگفتوگۆی نـهێنی و بەشـتی نـهێنی تـر لــەو شتانەی بەدڵدا تێپەڕ ئەکەن. کەواتە خوا ئـەزانێ بـەگفتوگۆی نـهێنیو ئاگـاداری هـەمو شتێکە، پێویستی بەدەنگی بەرز نیە لەپاڕانەوەدا، چونکە دەنگ بەرز کردنەوە بەڕواڵــەت لەڕیاوە نزیکە هەتا دانیشتوان باستان بکەن .

﴿ اللهُ لاإِلَهَ إِلاّ هُوَ لَهُ الأَسْماءَ الحُسْنى ﴾ خوا ئەو خوایەیــە هیــچ خوایــە نیــە شـایانی پەرستن بێ مەگەر هەر خوایە تاك و تەنهایـە، بۆخـوا هەیـە چـەندین نـاوی گـەورەو زۆر شیرینتر لەهەمو ناوێ هەریەکە لەو ناوانە ماناکانیان جۆرە تواناو زانیاری خوا دەرئەخـەن کەلەهیچ کەسێکی تر وەدەر ناچن و بۆهیچ کەسێ تر ناگونجێن، مەگـەر بۆکەسـێ زانـاو خاوەنی هەمو بونەوەران بێ .

سەرەتای ئەم سورەتە هاتوەتە خوارەوە بۆسـەر پێغەمبـەر ﴿ ﷺ﴾ بۆئـەوەی دڵنـەوایی بداتەوە لەســەر ئـەو ئـازارەی تووشـی ئـەو ئـەبێ لـەوبێ باوەڕانـەوەو دژی ئەوەسـتن، بۆئەوەیش پێغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ بـەزەیی بـەخۆیا بێتـەوەو ئـەوەندە ئـازاری دڵـی خـۆی نـەدا بەخەفەت خواردن لەسەر ئەوشتەی ڕوی تێکردوە لەبەردەوامبونی قوڕەیشیەکان لەسەر بێ باوەڕی .

لەدوای ئەو باسانە خوای گـەورە ڕەوانـەی کـردوە بۆسـەر پێغەمبـەر ﴿ ﷺ ﴾ باسـی بەسەرھاتی موسا ئەکا ھەتا پێغەمبەر ﴿ ﷺ ﴾ موسا بکا بەچاو لێکـراوی خـۆیو پـەیڕەوی موسا بکا لـەسەر ھەڵگرتنی باری گرانی پێغەمبەرایەتیو ئارام گرتنی لەسەر ئازارو ئێشـی بانگی ئادەمیزاد بۆلای خوا پەرستی .

خوای مەزن باسی بەسەرھاتی موسـا ئەگێڕێتـەوە بـۆ پێغەمبـەر ﴿ ﷺ ﴾ لـەو کاتـەوە کەموسا داوای لـەشوعەیبی خەزوری کرد ڕێگەی پێ بـدا لـەگـەڵ ژنەکـەی لـەمەدینـەوە بگەڕێتەوە بۆمیسر بۆچاو پێکەوتن و دیدەنی دایکـی و خوشـکی کـەماوەی (١٠) سـاڵـە بەجێی ھێشتوون لــە میسـردا، لـەدەسـتی فیرعـەون و سـەربازەکانی ھەڵـھاتبو بەبۆنـەی کوشتنی پیاوێکی بێ باوەڕ، وای ئەزانی لـەو ماوە زۆرەدا لەوانەیە ئــەو کردەوەیـە لـەبیر چوبێتەوە، کوشتنی ئەو پیاوە لـەسەر ئەوەبو سەربازێکی فیرعەون لـەخزمێکی موسای ئـەدا ئەویش چوو بەھاواریەوەو ئەو پیاوەی کوشت. شوعەیب فەرمووی: بڕۆ بۆلای دایکت و ئەو سەردانەت زۆر ڕاستە، موسا بەرەو میسر کەوتە ڕێگە، ڕێگەیەکی گرتـە بـەر کـەس ھاتوچۆی پێدا نەئەکرد لـەترسی ئەوە بەو ڕێگەیەدا ئەڕۆیشت نـەوەك لەلایـەن پاشـاکانی شامەوە تووشی خراپە ببێ. کاتێ گەیشتە شیوی (تووا) کەئەکەوێتە لای ڕۆژئاوای کێـوی (تـور) لـەشـەوێکی تـاریکی زسـتانا لـەوکاتـەداو لـەو شـەوەدا خـوای مـەزن کوڕێکـی پێبەخشی، موسا جگە لەژنەکەیو دوومناڵو خزمەت کـارێکی کەسـی تـری لـەگـەڵدا نەبوو، زۆریان پێویستی بەئاگر ھـەبوو. بـەردە ئەسـتێکەی دالـەیـەك ئـاگری نـەکردەوەو ڕێگەکەی ونکردبوو. ئاژەڵەکەیشی پـرش و بـلاو بوبـوەوە، ئـاوی پـێ نـەمابو ئـەھاتو ئەڕۆیشت بەھەر چوارلای خۆیـاووێڵو سـەرگەردان، بۆئـەووەی لـەلایەکـەوە ئـاگرێکی دەست بکەوێ لـەو کاتەداو لـەو تاریکیەدا لـەدورەوە ئاگرێکی بینـی لای کێـوی (تـوور) بڕوای وابو ئەو ڕوناکیە ئاگرە. بەخێزانەکـەی خـۆی ووت: ئێـوە لـێرە دانیشـن و مەجوڵێن و مەچن بۆھیچ جێگەیە ھەتا منە ئـەڕۆم بـۆلای ئـەو ئـاگرە، ھیـوام وایـە بێمـەوە بۆلاتـان و دەسـتەوارە ئـاگرێ بـھێنم و خۆمـانی پێ گـەرم بکەینـەوەو ڕێگـەی

پێبدۆزینەوە، یا بەڵکو لەلای ئەو ئاگرە کەسێکمان دەست بکەوێ و ڕێگەمان نیشان بدا، کاتێ لەو ئاگرە نزیك بویەوە دەنگێکــی خـوای بیسـت لەهـەمو لایەکـەوە، موسـا ئـەو دەنگەی وەرگرت بە وەرگرتنێکی گیانی و ڕۆحی لەهەمو لەشیەوەو چـوە نێـو سـەرجەم ئەندامەکانی لـەشیەوە . نەك ئەو دەنگە بەشێوەیێ بێ کەتاییەتی بێ بۆلایە یا بـۆلای تاکـە ئەندامێ بێ. بێژرا بەموسا لەو کاتەدا: ئەی موسا: من پەروەردگاری تۆم، تۆم هەڵبژاردوە ڕاستەوخۆ بەبێ هیچ کەسێ من گفتوگۆت لـەگەڵ بکــەم. کەواتـە پێڵاوەکـانت داکەنـە بۆئەوەی هەردو پێت بەڕوتی بکەوێ لەخاکی پاکی (توور) لەم شێوە پیرۆزەدا، هەتا پێت و فەڕی من وەربگری. من تۆم کرد بەپێغەمبەر، کەواتە بەچاکی گوێبگرەو ئەندامەکانت هێدی بکەرەوەو چاوت بنوقێنەو دڵت لە من بترسـێ، ئـەو سروشـەی دێت بـۆلای تـۆ ببیسە، بڕوات وابێ هەرمن شایستەی پەرستنم بەتەنها. خوای مەزن بەدرێژی باسـی ئـەو بەسەر هاتەی موساو پاشەڕۆژی موسا ئەکاو ئەفەرموێ:

وَهَلْ أَتَىٰكَ حَدِيثُ مُوسَىٰٓ ﴿٩﴾ إِذْ رَءَا نَارًا فَقَالَ لِأَهْلِهِ ٱمْكُثُوٓا۟ إِنِّىٓ ءَانَسْتُ نَارًا لَّعَلِّىٓ ءَاتِيكُم مِّنْهَا بِقَبَسٍ أَوْ أَجِدُ عَلَى ٱلنَّارِ هُدًى ﴿١٠﴾ فَلَمَّآ أَتَىٰهَا نُودِىَ يَـٰمُوسَىٰٓ ﴿١١﴾ إِنِّىٓ أَنَا۠ رَبُّكَ فَٱخْلَعْ نَعْلَيْكَ ۖ إِنَّكَ بِٱلْوَادِ ٱلْمُقَدَّسِ طُوًى ﴿١٢﴾ وَأَنَا ٱخْتَرْتُكَ فَٱسْتَمِعْ لِمَا يُوحَىٰٓ ﴿١٣﴾ إِنَّنِىٓ أَنَا ٱللَّهُ لَآ إِلَـٰهَ إِلَّآ أَنَا۠ فَٱعْبُدْنِى وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِذِكْرِىٓ ﴿١٤﴾ إِنَّ ٱلسَّاعَةَ ءَاتِيَةٌ أَكَادُ أُخْفِيهَا لِتُجْزَىٰ كُلُّ نَفْسٍۭ بِمَا تَسْعَىٰ ﴿١٥﴾ فَلَا يَصُدَّنَّكَ

عَنْهَا مَن لَّا يُؤْمِنُ بِهَا وَاتَّبَعَ هَوَىٰهُ فَتَرْدَىٰ ﴿١٦﴾

﴿ وَهَلْ أَتاكَ حَدِيْثُ مُوسى ﴾ ئایا هاتوه بۆلای تۆ هەواڵو بەسەرهاتی موسـا کـەکاتێ دووپیاو بوبەجەنگیان یەکێکیان سەربە فیرعـەون بـو، ئـەویتریان لـە عیبریـەکانی خزمـی موسابو، ئەو عیبریـە هـاواری کـردە موسـا کەیارمـەتی بـدا، موسـا چـوو بەهاواریـەوە، لـەئەنجامی ئەو ناو بژیەدا موسا بۆکزێکی دا لـەو پیاوە سەربە فیرعەون بو موسـا کوشتی. موسا لـەترسی کوشتنی خۆی لـەمیسـر هەڵهاتوبـەرەو مەدیـەن کەوتـە ڕێگـە. شـوعەیب کچێکـی خـۆی لێ مـارەکرد بـەو مەرجـەی (٨) سـاڵ یـا (١٠) سـاڵ ببێ بەشـوانیو ئاژەڵەکـەی بۆبلـەوەڕێنێ. موسـا مـاوەی دیـاریکراوی بۆبـەجێ هێنـا، لـەپاشـا داوای لـەشوعەیب کرد بگەڕێتەوە بۆمیسر لـەگەڵ ژن و خێزانەکەیدا، موسـا لـەو چۆڵـەوانیـەدا ڕێگەی لێ وونبو لـەشەوێکی تاریکی ساردی زستاندا، لـەو کاتەداو لـەو سـەرە ڕێگەیـەدا ژنەکەی ژانی منداڵبوون گرتی، لـەبەر تاریکی شەوو ساردی و ژانی منـاڵبونی ژنەکـەییو ئاگرنەگرتنی پوشوی ئەستێکەی ئەوانە هەمویان بوون بەهۆی ئەوەی موسا بترسـێ لـەناو چونی خۆیو خێزانەکەی .

﴿ إذ رَای ناراً فَقالَ لأَهْلِهِ امكثُوا إنِی آنَست ناراً ﴾ ئەو هەواڵەی لەکاتێکا بوو موسـا ئاگرێکی لـەدوورەوەچاو پێ‌کەوت، بەو بۆنەوە خۆشـی کەوتـە دڵـیو بەژنەکـەی ووت: زۆر هیوادارم خوا دەروی خۆشیمان لێ بکاتەوە، دوایی موسا بەخێزانەکەی خـۆی ووت: ئێوە لێرە دانیشن و مەجوڵێن لـەجێی خۆتانا بەڕاستی من ئاگرێ ئەبینم وئەچم بۆلای .

﴿ لَعَلّی آتیْكُمْ مِنْها بِقَبِسٍ أَوْ أجد عَلی النّار هُدی ﴾ هیوام وایە من لـەو ئاگرە بیـهێنم بۆئێوە پشکۆیە ئاگری پێ‌بکەنەوەو خۆتانی پێ‌گەرم بکەنـەوەو بـەرچاومان ڕون ببێتـەوەو ڕێگەی پێبدۆزینەوە یامن دەستم بکەوێ لـەسەر ئەو ئاگرە پیاوێکی ڕێگە ناس و شـارەزای ڕێگەمان بکا، ئەوەتە ڕێگەمان لێ وونبوە .

﴿ فَلَما أتا هانُودی یامُوسی ﴾ دوایی کاتێ چوه لایئاگرەکه بەگوێرەی زانیاری خۆی، زۆر سەری سوڕما لەڕوناکیەکی زۆرگەورە زۆرتر لــەڕوناکی خـۆر هاتـە پێش چاووی کەئەو ڕوناکیە دەرئەچوو لەدرەختێکی سەوزەوە هەر لەبنیەوە هەتا سـەرپۆپەی لقـەکانی لەکاتی ئەو سەرسوڕمانەدا بانگی موسا کرا بەدەنگێکی زۆرسامناك بێژرا: ئەی موسا:

﴿ إِني أنا رَّبُك فأخْلَع نَعلَيْكَ ﴾ بەڕاستی من پــەروەردگاری تـۆم، دوایـی تـۆ هــەردو پێلاّوەکانت داکەنە لەبەر گەورەیی‌و ڕێزی ئـەم جێگەیـە، ئـەو درەختـەی موسـا چـاوی پێکەوت عەناناب بێ یا ئاس یا درەختێ تر، پێلاّوەکانی لەهەر چـەرمێ دروسـت کرابـێ گرنگ نیە. خوای مەزن بەموسای فەرمو لەو کاتەدا:

﴿ إنَكَّ بِالْوادِی الْمُقَدَسِ طُویً ﴾ بەڕاستی تـۆ لەشـیوێکی پـاك و پـیرۆزو ڕێـزداردای کەناوی ئەو شیوە (تووایا) چونکە دەنگی زۆر گەورەو بەنرخ لەئاسمانی ئەم شیوەوە بـەرز ئەبێتەوە. ڕونـاکی بێوێنـەی خوایمـەزن بۆتـۆ دەرکـەوتوە، ئـەبێ بزانـرێ ئـەو دەنگـە بەراوردی لـەگەڵ هیچ دەنگێ پێناکرێ، چونکە لەهەر شەش لاوە موسـا ئـەو دەنگـەی ئەبیست بەهەمو ئەندامێ نەك بەتەنها بەگوێچکە بیبیسێ .

﴿ وَأنا أخْتَرْتُكَ فَأسْتَمِع لِما یُوحـی إنَّنـی أنـا الله لاإلـهَ إلاّ أنـا فَـأَعْبُدْنِی ﴾ وەمـن تـۆم هەڵبژاردوە بۆ پێغەمبەرایەتی، دوایی تۆ گوێ بگرە بۆشتێ بەسـروش ئـەنێرێ بـۆلای تـۆ. بەڕاستی هەر من خوای هەمو بونەوەرانم هیچ پەرستراوێ نیە شایانی پەرستن بێ مەگەر من نەبێ بەتەنها، دوایی تۆ هەر من بپەرسـتە ،ئـەبێ بزانـرێ مەبەسـت لـەو سروشـە زانینـی تەنهایی خوایە کەئەو پەڕی زانیاریەو فەرمان دانیشـە بەپەرسـتن بۆخـوای مـەزن. زانایـان ئەڵێن: ئەو گفتوگۆیەی خوای مەزن لەشیوی ( تووادا ) یەکەمین سروشە خـوا ڕەوانـەی کردوە بۆلای موسا بەجۆرێکی ڕاستەوخۆ بەبێ فریشتە .

﴿ وَأَقِمَ الصَلاةَ لِذِكْرِی ﴾ وەتۆ نوێژ ڕاوەستێنەو بەجێی بهێنە لەبەر یـادی مـن هـەر بەتەنها، بەردەوام بــە لەســەر نوێژکـردن و پەرسـتنی مـن بـەنیازی پاکـەوە، هیـچ شـتێ خەریکت نەکاو بێئاگات نەکا لەیادی من .

﴿ إِنَّ الساعَةَ آتِيَةٌ أَكادُ أُخفِيها ﴾ بـــەڕاستی کـاتی ڕۆژیدوایـیو ڕاکردنـی ئـادەمیزاد بۆدەشتی پرسیار دووای هەڵسانیان لـەگۆڕەکانیان و زیندو بونـەوەیان دێـت بـەبێ‌گومان، من ئەمەوێ کاتەکەی بشارمەوە لـەبەرئەوەی بەندەکانی من بترسن و لـەبەر زۆرشـتی تـر. خۆم ئەزانم چ کاتێ دێـت و لایئێمـە دیـاری کـراوە، لـەو ڕۆژەدا هـەمو کردەوەکـانی ئادەمیزاد نیشانی خاوەنەکانیان ئەدرێ و نهێنی دڵیان دەرئەکەوێو چاوەڕوانی ئـەو ڕۆژە بکەن، چونکە بەکتوپڕی پەیدا ئەبێ .

﴿ لِتُجْزِىَ كُلُّ نَفْسٍ بِما تُسْعى ﴾ لەبەر ئەوەی هەمو کەسـێ پاداشـتی بدرێتـەوە بـەو شتەی خۆی ئەیکاو خۆی کۆششی بۆئەکا لـەکردەوەی چاك و خـراپ و سـتەم لـەکـەس ناکرێ .

﴿ فَـلاَ يُصِدَّنَّـكَ عَنْـها مَـنْ لايُؤمِـنُ بِـها وَاتَّبِـعَ هَـواهُ فَتَردى ﴾ دوایـی تـــۆ لانـــەدا لـەباوەڕبەهاتنی ئەو ڕۆژە کەسی باوەڕ نەهێنێ بەهاتنی ئەو ڕۆژەو دوای ئـارەزوی خراپـی خۆی کەوتبێ، دوایی تۆ لـەناو بچێ وێنەی ئەو کەسانەی باوەڕیان بەهاتنی ئەو ڕۆژە نیە .

خوای مەزنە پرسیاری کرد لـەموسـا ئـەو شـتەی بەدەسـتی تۆیـە هـەواڵم بـدەرێ چ شتێکە، بێگومان ئاشکرایە خوای مەزن زاناترە لـە موسا بەوشتەی وا بەدەستیەوە. کەواتـە شتێکی زۆرگرنگی نهێنی خوا لـــەو داردەستەی موسـادا دروسـتی کـردوەو موسـا بـەر بەنهێنیە نازانێ ئەویش ئەوەیە ئەو داردەستە زۆرشتی پـەك خـەری بێباوەڕانی بێئـەنجام ئەدرێ، وەك ئـــەوەی ئـەبێ بـەمارێك و دوژمنـانی خـۆی پـێ ئەترسێنێ و زۆرشـتی تـر کەلـەوێنەی ئەو داردەسـتەوە زۆر دوورن، بەوێنـەی ئـەوەی خـوا دڵۆپـە ئـاوێ بـەهۆی پیاوەوە ئەڕژێنێتە ناو مناڵدانی ژنەوە ئەبێ بە مرۆڤێ. هێلکەیە ئەبێ بەمریشك. دانەوێڵەی ووشك ئەبێ بەڕوەکێکی زۆر تەڕو ئـاودار ئەوانـە هـەمویان جێگـەی سەرسـوڕمان نـین، چونکە خوای مەزن بەگوێرەی سروشت هێزی گەشـە پێدانـی تێـدا دروسـت کـردوون. بەڵام دارێکی ووشك خوای گەورە ئەوهێزەی تێدا دانابێ بـەگوێرەی سروشـت جێگـەی سەرسوڕمانە، بۆیە خوای مەزن پرسیار لـەموسا ئەکا هەتا نیشانی بدا ئەوکارە پـەك خـەرە بەوداردەستەی موسا دەرئەکەوێ. وەك خوای مەزن ئەفەرموێ :

وَمَا تِلْكَ

بِيَمِينِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿١٧﴾ قَالَ هِيَ عَصَايَ أَتَوَكَّؤُا عَلَيْهَا

وَأَهُشُّ بِهَا عَلَىٰ غَنَمِي وَلِيَ فِيهَا مَـَٔارِبُ أُخْرَىٰ ﴿١٨﴾ قَالَ أَلْقِهَا

يَٰمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ فَأَلْقَىٰهَا فَإِذَا هِيَ حَيَّةٌ تَسْعَىٰ ﴿٢٠﴾ قَالَ خُذْهَا

وَلَا تَخَفْ سَنُعِيدُهَا سِيرَتَهَا ٱلْأُولَىٰ ﴿٢١﴾ وَٱضْمُمْ يَدَكَ

إِلَىٰ جَنَاحِكَ تَخْرُجْ بَيْضَآءَ مِنْ غَيْرِ سُوٓءٍ ءَايَةً أُخْرَىٰ ﴿٢٢﴾ لِنُرِيَكَ

مِنْ ءَايَٰتِنَا ٱلْكُبْرَى ﴿٢٣﴾ ٱذْهَبْ إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُۥ طَغَىٰ ﴿٢٤﴾ قَالَ

رَبِّ ٱشْرَحْ لِي صَدْرِي ﴿٢٥﴾ وَيَسِّرْ لِيٓ أَمْرِي ﴿٢٦﴾ وَٱحْلُلْ عُقْدَةً مِّن

لِّسَانِي ﴿٢٧﴾ يَفْقَهُوا۟ قَوْلِي ﴿٢٨﴾ وَٱجْعَل لِّي وَزِيرًا مِّنْ أَهْلِي ﴿٢٩﴾ هَٰرُونَ

أَخِي ﴿٣٠﴾ ٱشْدُدْ بِهِۦٓ أَزْرِي ﴿٣١﴾ وَأَشْرِكْهُ فِيٓ أَمْرِي ﴿٣٢﴾ كَيْ نُسَبِّحَكَ

كَثِيرًا ﴿٣٣﴾ وَنَذْكُرَكَ كَثِيرًا ﴿٣٤﴾ إِنَّكَ كُنتَ بِنَا بَصِيرًا ﴿٣٥﴾

﴿ وَما تِلْكَ بِيَمِنِكَ يا مُوسى ﴾ خوا فەرموی: ئەوە چ شتێکە بەدەستی ڕاستی تۆوەوە ئـەی موسـا، ئاشـکرایە خـوا ئـەزانێ چ شـتێکە بەدەسـتی موسـاوە. بـەڵام ئەوپرسـیارە بۆئاگادارکردنەوەی موسایە هـەتا خـۆی ئامادەبکـا بۆشـتێکی سەرسـوڕێنەر، بۆئـەوەیش کەدەربکەوێ شتێکی بێنرخی وەك داردەستەکەی موسا ئەگۆڕرێ بەمارێکی زۆر گـەورەو

بەهەڵمـەت و بـۆزۆر شـتی تریـش وەك جویّ‌کردنـەوەی ئـاوی دەریـا بەدووبەشـــی وا تیکەڵاوی یەك نەبن بەبیّ پـەردە، دەرهینـانی ئـاو لـەبـەردیکی رەق بـەهۆی لیدانـی ئـەو داردەستەوە لـەدەریاو لـەبەردی ووشك و رەق .

﴿ قال هی عصای أتوكؤ علیها وأهش بها علی غنمی ﴾ موســا فـەرموی: ئـەم شـتەی بەدەستمەوەیە داردەستی منە خۆم ئەدەم بەسەریا لــەکاتی رۆیشـتن و ماندوبونـا، لـەکاتی هەڵخلیسکاندا خۆمی پیّ ئەگرمەوە، ئەیدەم لـەدرەخت بۆئەوەی گەڵای بوەریّ‌ومەرەکانم بیخـۆن، ئـەیدەم بەسەرپشـتی مـەرەکانما لـــەکاتی لیخورینیانــا بۆلــەوەر خــواردن و هاوردنەوەیان، وەك باسمان کرد ئەو داردەستە لـەهەر درەختیّ‌بیّ گرنگ نیە .

﴿ ولی فها مآرب أخری ﴾ وەبۆمن هەیە لـەو داردەستەمدا چەندین پیویستی تــر، وەك لقی درەختی پیّ‌دائەنەوینم مەرەکانم گەڵاکەی بخـۆن، کاتـیّ بچـم بەریگـەدا شـتومەك و خواردەمەنی پیدا هەڵئەواسم و ئەیدەم بەسەرشانما، دای ئــەکوتم بـەزەویداو شـتیّ ئـەدەم بەسەریاو لـەسیبەرەکەیدا دائەنیشم .

کاتیّ گوریسی دۆڵچەی ئاو کورتبیّ ئەیبەسـتم بەداردەسـتەکەمەوە هــەتا بگاتــە ئـاو. بەرگری دورندەی پیّ‌ئەکەم لـەخۆم و لـەمەرەکانم و زۆر شتی تریشی پیّ‌ئەکەم .

کاتیّ موسا باسی سودی داردەستەکەی خـۆی بــەو شـیوەیەی شایسـتەبیّ بۆدرەختـی ووشك کردی، خوای مەزن ویستی شتیکی وا لـەو داردەستەوە پەیدا بکا دژی سروشـتی ئەو دارە ووشکەبیّ، وەك بوونی بەماریکی زیندو وبکەویتە پـەلاماردان هــەتا هــەواڵ بـدا بەموساو بەدانیشتوان توانای خوا لـەوە زۆرترە ئەوان ئەیبینن .

﴿ قال ألقها یا موسی فألقاها فإذا هی حیة تسعی ﴾ خوا فەرموی: تۆ ئــەو داردەسـتەی خۆت فریّ بدە، ئەی موسا، دوایی موسا دادرەستەکەی خۆی فریدا، کتوپر ئەو داردەستە بوبەماریکی وا رایئەکرد بەم لاولادا زۆر بــەتیژی ، موســا زۆرترســاو رای‌کــردو پشـتی تیّ‌کرد، خوای مەزن ئارامی خستە دڵی و ترسی نەما .

﴿ قال خذها ولاتخف سنعيدها سرتها الألى ﴾ خوا فەرموی: موسا تـۆ داردەسـتەکەی خۆت هـەلگرە بەدەسـتی راسـتی خـۆت کـەتۆ بـەماری ئـەزانیو تـۆ مەترسـە ئـازارت پیناگەیەنی، ئیمـە ئـەو داردەسـتە ئەگیرینـەوە بـۆلای دیمەنـە پیشـوەکەی خـۆی بەرلـە فریدانیو ئەیکەینەوە بە داردەستە پیشـوەکە، ئـەو سـودانەی لـەمەوبـەر پیـت وەرگرتـوە وەریان بگرەوە بەو دار دەستەی خۆت، من کاریکی یەك خەری ترت پینیشـان ئـەدەم و ئەفەرموێ:

﴿ وأضمم يدك إلى جناحك نخرج بيضاء من غير سوء آية اخرى ﴾ وەتۆ دەستی خۆت بکە بەبنبالی خۆتا ئەو دەستەی تۆ دیتە دەرەوە بەسـپیەکی زۆر رونـاك و بریقـەدار بـەبێ ئەوەی نەخۆشی روی تێکردبێ بەوینەی بەلـەکیو شتی تر، ئەوەش نیشانەیەکی ئاشـکراو روونی تری پەك خەرە بۆتۆ، موسا رەنگی سپیو قاوەیی بوو، زۆری لاسەیر بو کەسپی بوە بەو جۆرەو بەو روناکیە هەیەتی .

﴿ لنريك من آياتنا الكبرى ﴾ داردەستەکەت هەلگرە لەبەرئـەوە ئیمـە نیشـانی تـۆی بدەین هەندێ لـەنیشانە روون و ئاشکرا گـەورەکانی ئیمـە و ئـەو کـارە پـەك خـەرەکان کەئەو داردەستەو ئەو دەستە روناك و سپیەی تۆ بەبێ ئەوەی نەخۆشی تیدابێ .

﴿ إذهب إلى فرعون إنه طغى ﴾ تۆ برۆ بۆلای فیرعەون بەوکارە پەك خەرانەوە بـانگی بکە بۆلای پەرستن و باوەرهینان بەئیمە. بەراستی فیرعەون لـەگوناهو بی فـەرمانی ئیمـەدا لـەسنور دەرچوە، ئەوپەری بێشەرمی دەست داوەتـێ، بـەجۆرێ داوا لـەدانیشـتوان ئـەکا بیپەرستن و بەخوای دابنین .

کاتێ خوای مەزن فەرمانی دا بەموسا بروا بۆلای فیرعەون زانی ئەوکارە زۆر گـەورەو گرانە کەبەو سپیراوە، بۆیە داوای خۆراگری و ئارامی دلیخۆی لـەخوای مەزن کرد:

﴿ قال رب اشرح لي صدري ويسر لي أمري ﴾ موسا فەرموی: ئـەی پـەروەردگاری من: تۆ دلی من فراوان بکە هەتا توانای هەلگرتنی ئەو کارە گرانەی هەبێ لـەو سروشەی تۆ دیت بۆلای من و تۆ ئاسان بکە بۆمن ئەوکارەی تۆ ئەیسپیری بەمن هەتا بتوانم ئەوکارە رابگەیەنم بەفیرعەون .

﴿ واحلل عقدة من لساني يفقهوا قولي ﴾ وەتۆ ئەو گرێو قورسیە بکـەرەوە لـەزمانی مندا هەتا دانیشتوان بەئاسانی لـەگفتوگۆی من بگەن. ئەو زمان گرتنـەی موسـا سروشـتی بێ یابەهۆی تاقیکردنەوەی موسا بێ لـەلایەن فیرعەونەوە بۆئەوەی بزانـێ موسـا پشـکۆی ئاگرو خورما لـەیەك جویێ ئەکاتەوە زانینی ئەوانە لای‌خوای مەزنە، بەلام ئەوەی جیگـەی شایانبێ ئەو ئایەتە ئەوە ئەگەیەنێ زمان پاراوی بەخششی خوای مەزنە بـۆ گفتوگۆکـردن لـەگەڵ دانیشتوانا .

﴿ واجعل لي وزيرا من أهلي هارون أخي أشدد بـه أزري ﴾ وەتـۆ بیگـیرە بۆمـن لـەم کارە گرنگەدا کەبەمنت سـپاردوە یـاریدەدەرێ بۆمـن لـەخیزانی خـۆم ئـەویش هـارونی برامبێ، هەتا تۆبەهیز بکەی پشتی من بەهۆی هارونەوە .

﴿ وأشر كه أمري كي نسبحك كثرا ونذكرك إنك كنت بنا بصرا ﴾ وەتۆ هارون بکـە بەهاوبەشی من لـەم کارەی مندا کە گەیاندنی فەرمانی تۆیەو بیکە بەپیغەمبەر هەتا یاریدەی یەکتری بدەین بۆجێبەجێ کردنی پەیامی تۆ بەجۆرێ پیویستبێ، لـەبەر ئەوەی ئیمە تۆ پاك بکەینەوە لـەکاری بێ‌شەرمی بێ‌باوەران لـەبارەی گـەورەییو پەرسـتنی تـۆو بـەردەوامبین. لـەسەر پەرستنی تۆ بەزۆریو بۆئەوەیش یادی تۆبکەین بەزۆریو بەهۆی سـوپاس کردنـی تۆو نویژکردن بۆتـۆ. بەراسـتی تـۆ ئـەزانیو ئاگـاداری کـارو کـردەوە ئیمـەی لـەهـەمو رویەکەوەو هیچ شتێ لـەتۆ پەنهان نیە .

بۆزانین: لـەجیگەیە پیغەمبەران پیویستیان بەیاریدەر هـەبێ بۆگـەیاندنی پـەیامی خـوای مەزن لـەخزمی ئازاو نیاز پاکی خۆیان هەتا بن بەفیداکار بۆمەبەستی پەیامی خوای گەورە، ئیمە موسولـمان پیویستمان بەیاریدانی جگەی خۆمان هەیـە، کەواتـە پیشـەی پیغەمبـەران گەیاندنی فەرمانی خوایە بەهۆی یاریدەی باوەردارانـەوە، هـەر خوایـە بەتەنـها هەموشـتێ بەفەرمودەی: (تۆبە) ئەویش ببێ بەبێ دواکەوتن. پیغەمبەران مرۆڤن توانای هینانی چاکـە بۆخۆیان و لابردنی خراپە لـەسەر خۆیان نین، بەوینەی مرۆڤانی تر کەپیویستیان بـەیاریدانی جگەی خۆیان هەیە، پیغەمبەران لـەکاتی جەنگدا بۆگەیاندنی داواکاری خۆیان پیویسـتیان

بەسەربازو چەك هەیە بۆ پتەوكردنی یاسای خواناسی، پیغەمبــەران هــەمویان بەپیغەمبــەری ئیسلامەوە ئازاری زۆریان چەشتوە، هەندیكیان لـەو ریگەدا كوژراون یاهەولی كوشـتنیان دراوە، هەركەسێ بلێ: موحەمــەد سـەرچاوەیە بۆدروسـتكردنی بونـەوەران ئەگـەر ئـەو نەبوایە خوای مەزن بونەوەرانی دروست ئەكرد ئەوكەسە لەسنوری خوای مەزن دەرچوە، لـەبەر ئەوانەی رابوردون و موسا پارایــە بـەهیزی بكـا بـە هـۆی هارونـەوە، پیغەمبـەری ئیسلامیش پارایەوە خوای گــەورە هاوریكـانی بپـاریزێ لــە دەسـت دریـژی بێبـاوەران، فەرموی: ئەی خوایە: ئەگەر ئەوانە نەمینن لـەمەوپاش پەرستن بۆتۆ ناكرێ .

میژو نووسان ئەلین: ژیانی پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ زۆر سادە بـووە: خانوەكـەی لـەدوازدەپێ دووجار بەرزایی هەشت پێ زۆرتر نەبوە، سەربانی خانوەكەی لق و گەلای خورمــا بـوە، قاپی هۆدەكەی موی بزن و كورگـی هوشـتربوە، ژیرخـەرو سـەرخەری زۆر سـادەتربوە، بەرگی خۆی پینەكردوە. فوی لـەئاگر كـردوە بۆسـاخنە هینـانی خواردەمـەنی. بەدەسـت خواردنی خواردوە. مـالی خـۆی پـاك كردۆتـەوە. خـۆی بزنـی خـۆی دۆشـیوە، خـۆی خواردەمەنی لـەبازاردا كریوە، خواردەمەنی سەرەكی پیغەمبەر ﴿ ﷺ﴾ نـانی جـۆو خورمـا بوە، شیرو هەنگوین خۆشترین خواردەمەنی و رابواردنی ئەوبوە، ئەوەی لـەمیژو نوسـانەوە باسی كرا (و.ل.دیورانت) كەزانایەكی جگەی ئیسلامە تۆماریكردوە .

ئەبێ بزانین لـەهەمان كاتا پیغەمبەر ﴿ﷺ﴾ پیویستی بەپزیشك هەبوە هەركاتێ نەخۆشـی تـووش ببوایـە بەوینـەی ئەوكەسـانە باوەریـان بـەخواو رۆژی دوایـی نـەبوەو، بەوینـەی باوەردارانیش .

دوای پارانەوەی موسا لـەخوای مەزن بۆبەخشینی ئەو شتانەی پیشـو بۆخـۆی. خـوای مەزن فەرموی:

قَالَ قَدْ أُوتِيتَ سُؤْلَكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٣٦﴾ وَلَقَدْ مَنَنَّا عَلَيْكَ مَرَّةً أُخْرَىٰٓ ﴿٣٧﴾ إِذْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّكَ مَا يُوحَىٰٓ ﴿٣٨﴾ أَنِ ٱقْذِفِيهِ فِى ٱلتَّابُوتِ فَٱقْذِفِيهِ

فِي ٱلْيَمِّ فَلْيُلْقِهِ ٱلْيَمُّ بِٱلسَّاحِلِ يَأْخُذْهُ عَدُوٌّ لِّي وَعَدُوٌّ لَّهُۥ وَأَلْقَيْتُ عَلَيْكَ مَحَبَّةً مِّنِّي وَلِتُصْنَعَ عَلَىٰ عَيْنِيٓ ﴿٣٩﴾ إِذْ تَمْشِيٓ أُخْتُكَ فَتَقُولُ هَلْ أَدُلُّكُمْ عَلَىٰ مَن يَكْفُلُهُۥ فَرَجَعْنَٰكَ إِلَىٰٓ أُمِّكَ كَيْ تَقَرَّ عَيْنُهَا وَلَا تَحْزَنَ وَقَتَلْتَ نَفْسًا فَنَجَّيْنَٰكَ مِنَ ٱلْغَمِّ وَفَتَنَّٰكَ فُتُونًا فَلَبِثْتَ سِنِينَ فِيٓ أَهْلِ مَدْيَنَ ثُمَّ جِئْتَ عَلَىٰ قَدَرٍ يَٰمُوسَىٰ ﴿٤٠﴾ وَٱصْطَنَعْتُكَ لِنَفْسِي ﴿٤١﴾

﴿ قال قد أوتيت سؤلك يا موسى ﴾ خوای مەزن فەرموی: ئەی موسا: بەراستی ئیمە ئەو شتانەی تۆ داوات کردبوهەمویان بەخشران بەتۆ، لەفراوانی دلـت و ئاسان کردنی کارەکەت و لەپاراوی زمـانت و تونـدو تـۆل کردنی پشتت بەهۆی هارونی براتـەوە هاوبەشی ئەوبۆتۆ لـەکردنی بە پیغەمبەر .

﴿ ولقد مننا عليك مرة أخرى إذ أوحينا إلى أمك ما يوحى ﴾ وەبەراستی ئیمە رژاندبومان بەسەر تۆدا چاکەی خۆمـان جاریّتر لـەمەوبـەر کاتیّ ئیمە خستمانە دلـی دایکت شتیّ خرایە دلی، یا ئیمە لەخەودا سروشی خۆمانمان بـەدایکت راگـەیاند یا پیغەمبەری ئەوکاتە یا فریشتەیە سروشی ئیمەی راگەیاند بـەدایکت. دایکی موسا نـاوی (بوکابیدە) .

﴿ أن أقذفيه في التابوت فأقذفه في اليم ﴾ بـەوە کـەتۆ موسا بخەرە نیو سندوقیکی قیرتاوکراو، دوایی تۆئەو سندوقە بخەرە ناو روباری نیلەوە. دوایی دایکی بەبروای تـەواوە سندوقەکەی خستە ناو ئاوی روباری نیلەوە کە ئەو روبارە ئەرۆشت بەبـەردەم کۆشکی فیرعەوندا .

﴿ فليلقه اليم بالساحل يأخذه عدولي وعدوله ﴾ دوایی باروبارەکە ئــەو ســندوقە بخاتــە کەناری خۆیەوە دوژمنی من دوژمنــی موسا ئــەو ســندوقە وەرئــەگرن و ئەیبــەن بـۆلای فیرعەون و ئاسیەی ژنی .

بۆزانین: ئەستیرەناسان و پۆشە ویژان بە فیرعەونیان ووت: لـەمەودوا کوریــك لـەبـەنو ئیسرائیلی لـەدایك ئەبێ ئەبیتە هۆی نەمانی خۆت و پاشایەتی خۆت، بەو بۆنەوە فیرعــەون فەرمانی دابو کەهەرژنێ لـەوان منــالی نیرینــەی بــو ئــەو منالــە ســەربرن و کچــەکانیان بهیلـنەوە بۆکارەکەری، کاتێ موسا لـەدایك بو دایکی ترسا موسا ســەربرن و ســەرگردان بو نەیزانی چ شتێ بکا خوا خستیە دلیــەوە موسا بخاتــە نــاو ســندوقیکەوەو بیخاتــە نــاو روباری نیلـەوە. ئەگیرنەوە لـەزانایانــەوە: کارەکــەرەکانی ئاسیەی ژنــی فیرعــەون چونــە دەرەوە بۆئەوەی خۆیان بشۆرن لـەئاوی روباری نیل کەبەنیو حەوشــی کۆشــکی فیرعــەونا ئەرۆیشت، سندوقیکیان دۆزیەوە لـەکەناری دەریای نیلدا بەقیرتاوکراوی بردیانەوە بۆلای ئاسیەی ژنی فیرعەون، فیرعەون فــەرمانی دا بەشــکاندنی ئــەو ســندوقە تەماشــایان کــرد کۆرپەیەکی تیدایە، فیرعەون دەری هینــا، تەماشــایان کــرد کوریکــی قەشــەنگی رومــەت جوانی تیدایە، ئاسییەی ژنی زۆر دلی بەو کورە گەشایەوە بەفیرعەونی ووت: تۆئەم کــورە مەکوژە ئەویش بەدلی کردو نەیکوشت .

﴿ والقيت عليك محبة م ـ ي ولتصنع على عيني ﴾ وەمن خۆشەویستی خۆمم رژاندبــو بەسەر تۆداو هەر کەسێ تۆی ببینیایە تۆی خۆش ئەویست، یەکێ لـەو کەسانە فیرعەون و ئاســییەی ژنــی فیرعــەون بــوو، بۆئــەوە بــەخیوبکریی لـەســەرچاودیری کردنــــی مـــن و خۆشەویستی لای‌دانیشتوان و لای فیرعەون بەگشتی .

﴿ إذ تمشي أختك ﴾ موسا تۆبیری ئەوکاتە بکەرەوە خوشکی تۆ ئەرۆریشت و ئەگەرا بۆهەواڵ زانینی تۆو بزانــێ چ شــتیکت بەســەرهاتوە ؟ ئــەوەبو دایکــی موســا کەموســای خستەنیو ئاوی روبارەکەوە دلی کەوتە خورپەو ترسی لـەموسا پەیدا کرد نــەی ئــەزانی چ شتیکی بەسەر هاتوە، بۆ دەنگ و باسی موسا دایکــی موســا خوشــکەکەی موســای نــارد

کەبــەکۆڵان و کوچــەدا بگــەڕێو ســۆراخیکی موســا بکــا، خوشــکەکەی چــوە دەرێوبەریکەوت و بەمیهرەبانی خوا سـەری هەڵتـەقا بەکۆمـەڵێ لـەخزمـەت کارەکـانی فیرعەون بۆئەوەی ژنیکیان دەست بکەوێ شیربدا بەکوری فیرعەون، ئەو کورە مەمکـەی هیچ ژنێ ناگرێ مەریەمی خوشکی موسا بـۆی دەرکـەوت کەئـەو کـورە موسـایە، بۆیـە مەمکەی هیچ ژنێ ناگرێ .

﴿ فتقول هل أدلكم علي من يكفله ﴾ دوایی خوشکەکەی موسا بەپیاوەکانی فیرعەونی ووت: ئایا ئەتانەوەێ من شارەزایی ئیوە بکەم لـەسەر کەسێ ئەومناڵـە بـەخیوبکاو شـیری بداتێ ؟ پیاوەکانی فیرعەون ووتیان بەخوشکی موسا: تۆئەو مناڵە ئەناسی ئـەویش ووتـی: من ئەو مناڵە ناناسم. بەڵام ئەو خیزانە خۆیان بەبەختیار ئـەزانن نزیکـی شـاژن بکەونـەوە بەهۆی بەخیوکردنی کورەکەیانەوەو بەنیازی پاکەوە خزمەتیان بکا، لـەپاشا داروودەسـتەی فیرعـەون دایکـی موسـایان بـرد بـۆلای ئاسیای شـاژن و ژنـی فیرعـەون، موسـای نـا بەباوەشیەوەو مەمکەی نایە دەمی، موسایش زۆر بەپەرۆشەوە مەمکـەی گـرت و دەسـتی کرد بەمژینیو بەشیرخواردن، ژنەکـەی فیرعـەون زۆرزۆر خۆشـحاڵبوو داوای لـەدایکی موسا کرد لـەکۆشکی پاشادا بمینیتەوە بۆ بـەخیوکردن و شـیردان بەموسـا، دایکـی موسـا ووتی: بۆم ناکرێ لـیرە بمینمـەوەو پیویسـتە کاروبـاری خیزانـەکانم هەڵسـورینم، ئاسـیە موسای دایە دەستی و بردیەوە بۆ خانەی خۆی، شاژن چاکــەو خزمـەتی دایکـی موسـای کردو لـەگەڵ کورەکەی چوەوەو بردیــەوە بـۆلای خـۆیو پیـی شـادبویەوە ، وەك خـوا ئەفەرموێ :

﴿ فرجعناك إلى أمك كي تقرعينها ولا تحزن ﴾ دوایی ئیمە تۆمـان گـەڕاندەوە بـۆلای دایکت لـەبەرئەوەی چاوی دایکت روناك و فینك ببیتەوە بەهۆی چونـەوەی تـۆ بـۆلایو خەفەت نەخوا بۆجیابونەوەی تۆ .

کاتێ ماوەی شیرپیدانی موسا کۆتایی پێ هات، ئاسیەی ژنی فیرعـەون داوای موسـای کردەوە بۆلای خۆی، موسایان بردەوە بۆلای ئاسیە بەتەندروسـتی تـەواوەوە، ئاسـیە زۆر بەبەختیاریەوە موسای برد بۆلای فیرعەون، ئەویش خۆشەویستی خـۆی بۆموسـا دەربـری کەهاتەوە بۆلای خۆی .

لەپاشا خوای مەزن چاکەیەکی تری خۆی لەسەر موساو بیری ئەخاتـەوە کـەرزگاری کردوە لەکوشتن، ئەفەرموێ :

﴿ وقتلت نفسا فنجيناك من الغـم ﴾ وەبـیری ئەوکاتـەیش بکـەرەوە کـەتۆ پیـاویکی قیبتیت کوشت و ویستیان لەتۆلەی ئەوپیاوەدا بت کوژن، دوایی ئیمە تۆمان رزگـارکرد لەخەفەتی کوشتن، فەرمانم پێدای کەبچی بۆمەدیەن. کوشتنی ئەو پیاوە لەلایەن موسـاوە بـەو جۆرەبـو: رۆژێ موسـا بـەکۆلانێ لەکۆلانـەکانی میسـردا ئەگـەرا بۆپیاسـەکردن، دووپیاوی بینی دەمەقالەو جەنگیانە، یەکیکیان عیبریو ئەوی تریان قیبتی، پیاوە عیبریەکـە هاواری لەموسا کرد کۆمەکی پێبکا، ئەویش لەمیانەی ناوبژیدا مستە کۆلیکی ئاراستەی قیبتیەکەکردو کوشتی، هەرچەندە بەنیازی کوشتنیش نەبو. بەلام کارلەکار تـرازاو موسا ئەترسا تۆلەی لیبکەنەوەو بیکوژن. بەو بۆنەوە رایکردو چوو بۆ مەدن .

﴿ وفتناك فتونا ﴾ وەئیمە تۆمان تاقی کردەوە بەچـەندین تاقیکردنەوەیـەو توشـی زۆر روداومان کردی، لـەو تاقیکردنەوانـەدا دەرچـوی و ناسوپاسـی ئیمـەت نـەکردوە، وەك رزگـارکردنت لـەکاتی منـالیدا، لەسـەردەمیکا هـەمو منـالی نیرینـەی عیبریـەکانیان سەرئەبری، پیاویکی قیبتیت کوشـت و رزگـارم کـردی، چـەند سـالێ بـووی بەشـوانی شوعەیب و مەرەکانی ئەوت ئەلەوەران. لەکاتی گەرانەوەتا بۆمیسـر ریگـەت لی وونبـو. مەرەکانت پرژوبلاو بوونەوە. لەشەویکی تاریکی زستاندا ژنەکەت بەبێ مامان ژانی منـال بوون گرتی و سەرگەردان بویت و لەسەر ئەوهەمو ناخۆشیانەدا تۆخاوەنی ئارام بوویـت، ئیمەش پاداشتی تۆمان دایەوەو تۆمان کرد بەپیغەمبـەرو هـەمو داواکاریـەکانتم جێبـەجێ کرد .

﴿ فلبثت سنين في أهل مدين ثم جئت علـى قـدر ياموسـى ﴾ دوایـی تۆچـەند سـالێ مایتەوە لەنیوان دانیشتواتی شاری (مەدینەدا لەبەر جێبەجێ کردنی یەکێ لەو دوو ماویـە بۆت دانرابـو لەلایـەن شـوعەیبەوە کـە مـەرەکانی بلـەوەرینی دوایـی کچیکـی خۆیـت لیمارەبکا. مەدیەن شاری شوعەیبە لەباشوری شامدایەو هەشت قۆناغ لەمیسرەوە دوورە. لەپاشا تۆ هاتیت بۆلای ئەو جیگە بەریزە بۆئەوەی بکرییت بەپیغەمبەر لـەو کاتـەدا بـۆت دیاری کرا لەلایەن خواوە بۆ روانە کردنت ئەی موسا بۆلای فیرعەون .

﴿ وأسطنعتك لنفسي ﴾ وەمن تۆم هەلبژارد بو بۆپیغەمبەرایەتی و وەرگرتنــی سروشـی من، تۆم کرد بەنیرراوی خۆم بۆ راگەیاندنی فەرمانی من بەفیرعــەون و دارو دەستەکەی، دوایی ئەوهەمو شتانەی موسا بەخۆیەوە بینی، خوا فەرموی:

اذْهَبْ أَنتَ وَأَخُوكَ بِآيَاتِي وَلَا تَنِيَا فِي ذِكْرِي ﴿٤٢﴾ اذْهَبَا إِلَىٰ فِرْعَوْنَ إِنَّهُ طَغَىٰ ﴿٤٣﴾ فَقُولَا لَهُ قَوْلًا لَّيِّنًا لَّعَلَّهُ يَتَذَكَّرُ أَوْ يَخْشَىٰ ﴿٤٤﴾ قَالَا رَبَّنَا إِنَّنَا نَخَافُ أَن يَفْرُطَ عَلَيْنَا أَوْ أَن يَطْغَىٰ ﴿٤٥﴾ قَالَ لَا تَخَافَا ۖ إِنَّنِي مَعَكُمَا أَسْمَعُ وَأَرَىٰ ﴿٤٦﴾ فَأْتِيَاهُ فَقُولَا إِنَّا رَسُولَا رَبِّكَ فَأَرْسِلْ مَعَنَا بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلَا تُعَذِّبْهُمْ ۖ قَدْ جِئْنَاكَ بِآيَةٍ مِّن رَّبِّكَ ۖ وَالسَّلَامُ عَلَىٰ مَنِ اتَّبَعَ الْهُدَىٰ ﴿٤٧﴾ إِنَّا قَدْ أُوحِيَ إِلَيْنَا أَنَّ الْعَذَابَ عَلَىٰ مَن كَذَّبَ وَتَوَلَّىٰ ﴿٤٨﴾

﴿ أذهب أنت وأخوك بآياتي ولا تنيا في ذكري ﴾ موسا تۆو براکەی خۆت کەهارونـە بەم نیشانە رونانەوە کارە پەك خەرەکانی من کەئەو دارەی دەســتەو ئـەو دەستە سپیەی تۆیەو چەند کاری پەك خەری تـرە وەبـۆ راگـەیاندنی فـەرمانم بـرۆن بـۆلای فیرعـەون و کەمتەرخەمی نەکەن لـەگەیاندنی پەیامی منداو یادی مندا بەشتێ شایستەی گەورەیی منبێ.

﴿ إذهبا إلى فـيرعون إنـه طغـى ﴾ ئیـوە بـرۆن بـۆلای فیرعـەون. بەراسـتی فیرعـەون لـەسنوری من دەرچوەو یاخی بوە لـەبەندایەتی مندا. بەجۆرێ بـێ شـەرمانە بەمیسـریەکان ئەلێ: من خوای گەورەی ئیوەم و بم پەرستن .

﴿ فقولا له قولا لـ نا لعله يتذكر أو يخشى ﴾ دوایی ئیوە بەگفتوگۆی نەرم بەفیرعـەون بلین و توندو تیژی لـەگەلیا بەکار مەهینن و وینـەی کاریگـەری بـۆ بهیننـەوە. یەکسـەر فەرمانی پێ مەدەن و بلین: پیویستە هەر شـتێ ئیمـە بـەتۆ ئـەیلین بیکـەی، لـەبەرئـەوەی ئامۆژگاری وەرگریێو بیربکاتەوە یا بترسێ لـەسزای خواولـەکەلـە رەقی خۆی وازبهینێ .

ئەو ئایەتە بەنرخانە ئیمە فیرئەکا :پیویستە ئیمە کاتێ کەوتینـە گفتوگـۆ لـەگـەلٚ هـەر کەسیکا بێ کەبمانەوێ بیروباوەری ئیسلامی بۆدەربخـەین و بـەوی بسـەلمینین بیروبـاوەری ئیسلام راستە، بەلـەسەرخۆو بەنەرمی بەبێ تورەکردنی گفتوگۆی لـەگەلٚ بکـەین، وینـەی بۆبینینەوە بۆراستی بیروباوەری خۆمان بەشەرمەوە لـەگەلی بدویـین و دانەبەزینـە سـەری هەتا ئەویش شەرمەزاربێ. زۆر جیگەی سەرسورمانە کاتی هەلبژاردنی ئەندامانی پەرلـەمان و ئەنجومەنی شارەوانیەکان هەندێ کەس لــەکاتی بلاوکردنـەوەی پروپاگـەندەدا ئـەلین: هەرکەسێ دەنگ بۆئیمە نەدا بێباوەرو خوانەناسە، یابە دانیشتوان ئەلین: تۆلـەنیو چادری بێباوەریدا یالـە خانوی ئیسلامدای، ئەگەر دەنگ بەئیمە نەدەی بێباوەرئەبی بـەخوا. زۆر شتی ئالـۆزاوی ترئەلین و دانیشتوان دلیان لـەوان ئەتۆرێ .

﴿ قالا ربنا إننا نخاف أن يفـرط علينـا أو أن يطغـى ﴾ موسـاو هـارون ووتیـان: ئـەی پەروەردگاری ئیمـە: بەراسـتی ئیمـە ئەترسـین کەفیرعـەون پیـش دەسـتی بکـاو کوتوپـر پەلاماری ئیمە بداو فەرمان بدا بەلیدان وکوشتنی ئیمەو گوێ لـەئیمە نەگرێ یائەو زۆرتـر لـەسنور دەربچێو خراپە بەکار بهینێ بەرامبەر بەگـەورەیی تـۆو کـاری ناشایسـتە بـەکار بهینێ، خۆت ئەزانی فیرعەون پیاویکی زۆر کـە لـە رەق و نالـەبارە، داوا لـەتۆ ئەکـەین کەشتێ بەئیمە بفەرموی لـەخراپەی ئەو نەترسین .

﴿ قال لاتخافا إنني معكمـا أسـمع وأرى ﴾ خـوا فـەرموی بەموسـاو بـەهارون: ئیـوە مەترسن لـەو شتانەی ئیوە گومانی بۆئەبەن، بەراسـتی مـن لـەگـەلٚ ئیـوەم ئـەتانپاریزم مـن ئەبیسم و ئەبینم شتێ لـەنیوان ئیوەو ئەودا ئەروا لـەگفتوگۆو هەمو کارێ، من ئیوە لائەدەم لـەخراپەی فیرعەون و لـەهەمو کات و لـەهەمو روداویکا شتی واتان بۆئەسـازینم خراپـەی ئەوتان لێ دووربخاتەوە .

﴿ فآتعا فقولا إنا رسولا ربك ﴾ دوایی ئیوە بچن بۆلای فیرعەون، دوای چونتان بۆلای فیرعەونە ئیوە بەفیرعەون بلین: بەراستی ئیمە روانـەكراوی پـەروەردگاری تۆیـن، تۆیـش بەندەی خوایو تۆخوانیت بۆتۆ دروست نیە دیل كـردن و ئـازاردانی بـەنو ئیسـرائیلی بۆت نیە سەربەستی ئەوان زەوت بكەیو كاری گرانیان پێ بكەی، بەتایبەتی كورەكانیـان سەربریو ژنەكانیان بۆكاری كەری خۆتان بەكاریان بینن .

﴿ فأرسـل معنـا بنـی إسـرائیل ولاتعذبـهم ﴾ دوایـی روانـە بكـە لەگــەلمان بـەنو ئیسرائیلیەكان و بەرەلایان بكەو تۆسزایان مەدەو وازیان لیبهینە بـابرۆن بۆهـەر جیگەیـە خۆیان ئەیانەوێ، ئازاریان مـەدە بـەكردنیان بەخزمـەكارو كارەكـەر، بـەردو چـەوو لم و داریان پێمەكیشە بۆدروستكردنی ئەهرام و كۆشك .

بۆزانین: داواكردنی خوای مەزن لەموسـاو هـارون كەپیشـەكی داوای رزگـاركردنی بەنو ئیسرائیلیەكان بكەن لەفیرعەون و سزایان نەدا، بەرلـەوەی داوای باوەرهینـان بكـەن لەفیرعەون: ئەم ئامۆژگاریەمان فیرئەكا. خوای مەزن پیویستی كردوە لەسـەر پیاوچاكـان ئاشتی خوازبـن هـەولو تەقـەلایان رزگـاركردن ئادەمیزادبـێ لـەكۆت و پیـوەن و چەوسانەوە، یەكـەم جـار نیـازی جـەنگ كردنیـان نـەبێ، دوایـی داوای چەسپاندن و رونكردنەوەی باوەرهینانیان بەخوای لیبكەن .

موساو هارون رویان كردە فیرعەون و ووتیان: ئیمە لەمەوبەر پیمان راگـەیاندی ئیمـە نیرراویخوای گەورەین و ئەو داوایانەی پیشومان لی كردی. ئیستایش بۆراستی گفتوگۆی راستی خۆمان ئەلیین:

﴿ قد جئناك بآیة من ربك والسلام علی من إتبع الهدی ﴾ بەراستی ئیمە هاتوین بۆلای تۆ بەنیشانەیەكی ئاشكراو كاریكی پـەك خـەر لەلایـەن پـەروەردگاری نـۆو كەبەلگەیـە لەسەر راستی ئیمە. موسا لەوكاتەدا دەستی خۆی لەباخەلی خۆی دەرهینا زۆر بـەجوانی روناكی زۆری بلاوكردەوە بەجۆرێ بوبەهۆی سەرسورمان و سـەرگەردانی دانیشـتوان و ئاشتی لەسـەر كەسـێ بـێ. دوای شـارەزایی و ئـایینی خـوا كـەوتوە، هەركەسـێ دوای هەركەسێ بكەوێ داوای ئایینی خوا بكا توشی ئازار نابێ لەپاشەرۆژدا .

﴿ إنا قد أحي إلينا أن العذاب على من كذب وتولى ﴾ بەراستی سروش نـیراوە بـۆلای ئیمە کەبەراستی سزای پاشەرۆژو جیـهان لـەسـەر کەسیکە بـاوەری نـەهیناوە بـەخواو، پیغەمبەرانی بەدرۆبخەنەوەو واز لـەباوەرهینان هینابیَ. ئەو ئایەتە هەرشـەکردنە لـەفیرعـەون بەلـەناو چوون کەکاری موساو هارون بەسوك بزانیَ و باوەر بەپیغەمبەرایەتی ئەوان نەهینیَ و بەردەوام بیَ لـەسەر یاخی بوون و خراپەکاری .

قَالَ فَمَن رَّبُّكُمَا يَـٰمُوسَىٰ ﴿٤٩﴾ قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِىٓ أَعْطَىٰ كُلَّ شَىْءٍ خَلْقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ﴿٥٠﴾ قَالَ فَمَا بَالُ ٱلْقُرُونِ ٱلْأُولَىٰ ﴿٥١﴾ قَالَ عِلْمُهَا عِندَ رَبِّى فِى كِتَـٰبٍ ۖ لَّا يَضِلُّ رَبِّى وَلَا يَنسَى ﴿٥٢﴾ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلْأَرْضَ مَهْدًا وَسَلَكَ لَكُمْ فِيهَا سُبُلًا وَأَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦٓ أَزْوَٰجًا مِّن نَّبَاتٍ شَتَّىٰ ﴿٥٣﴾ كُلُوا۟ وَٱرْعَوْا۟ أَنْعَـٰمَكُمْ ۗ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَـٰتٍ لِّأُو۟لِى ٱلنُّهَىٰ ﴿٥٤﴾ ۞ مِنْهَا خَلَقْنَـٰكُمْ وَفِيهَا نُعِيدُكُمْ وَمِنْهَا نُخْرِجُكُمْ تَارَةً أُخْرَىٰ ﴿٥٥﴾ وَلَقَدْ أَرَيْنَـٰهُ ءَايَـٰتِنَا كُلَّهَا فَكَذَّبَ وَأَبَىٰ ﴿٥٦﴾

﴿ قال فمن ربكما ياموسی قال ربنا الذی أعطی كل شئی ثم هدی ﴾ فیرعــەون ووتـی بەموساو هارون دروستکەری ئیوە چ کەسیکە ئەی موسا. موسا وولامی دایـەوەو ووتـی: پەروەردەکەری ئیمە کەسیکی ئەوتۆیـە بەخشـیویە بەهـەمو شـتیَ لـەبونـەوەران دیمـەن و شیوەیە شایانی ئەو شتەبیَو پەیوەندی بەسودو تایبەتی ئەوشتەوە بیَ. بەتایبەتی ئـادەمیزادی

دروست کردوە بەشیرینترین شیوە، لەپاشا شارەزایی ریگەی راستی کردوون، بــەگویرەی سروشت فیری کردون بەچ جۆرێ سوود وەرگرن لەوشتەی خوا پییانی بەخشیوە، چــۆن چاودیری خۆیان بکــەن بۆمانــەوەی ســەربەخۆیی‌خۆیان و خۆیــان بپــاریزن لەکارەســات. فیرعەون کەموسای بینــی بــەو بەلگــە رونانــەوە ترســا کەموســا ریگــەی راســت نیشــان دانیشتوان بداو ئاگاداریان بکا لەسەر ئەو کارە پروپوچانەی فیرعەون کەدوای کەوتوون. ئەوانیش پشت بکەنە فیرعەون و روبەر وی راوەستن، بۆیە فیرعەون ویستی لابدا لەباســی پەروەردگارو باسەکە بگۆرێ بۆلای شتێ پەیوەندی بەپیغەمبەرایەتی و کارەکەی موســاوە نەبێ کەموسا بۆی رەوانە کراوە، بۆیە .

﴿ قال فما بال قرن ألألی ﴾ فیرعەون ووتــی: دوایــی بەســەرهاتی دانیشــتوانی کاتــانی رابوردو چۆنە بۆمان باس بکە، دوای مردنیان رزگاریان بوەو بەختیارن یا ســزایان دراوە؟ وەك گــەلانی نــوح و عادوســەمود کەئــەوانیش بــت پەرســت بــوون و جگــەی خوایــان پەرستوە، فیرعەون مەبەستی لەو پرسیارە ئەوەبو، ئەگەر ئەوخوایــەە بەوجۆرەیــە تۆباســی ئەکەی ئەبوایە ئەوان باوەریان بهینایە .

﴿ قال علمها عـند ربی فی کتاب لایضل ربی ولا ینسی ﴾ موسا لەوەلامی فیرعــەوندا ووتــی: زانینــی بەســــەرهاتەکانی دانیشــــتوانی کاتــەکانی رابــوردوی ئەوگەلانــە لای پەروەردەکەری منە تۆمارکراوە لەنامەیەکدا پەروەردگاری مــن هەلــەناکا لــەتۆمارکردنی کارەکانیان و هیچ شتیك لەوانە لەبیری ناچێو هەمویان ئەزانێ. من ئەو شتانەی دیــارنین نایانزانم، خوا زیندویان ئەکاتەوە بۆپرسیار .

دوای ئەوەی موسا بەلگەی لەسەر تەنهایی خوای مەزن هینایەوە، خوای مــەزن باســی ئەوکارە ئەکا بەجۆریکی رون ترو بەپیزتر، ئەفەرموێ:

﴿ الذی جعل لکم الأرض مهدا وسلك لکم فیها شیلا ﴾ پەروەردگاری من کەســیکی ئەوتۆیە زەوی بۆسودی ئیوە دروست کردوەو گیراویەتی بەوینەی بیشکە بۆتان بــەجۆرێ ئیوە پشوی تیدا بدەن و بتوانن هاتوچۆبکەن بەسەریاو گیراویــە بۆســودی ئیــوە لــەزەویدا چەندین ریگەیە برۆن بەسەریاناو بەئاسانی ئاوات و ئامانجی خۆتان جێبەجێ بکــەن ژیــانی رۆژانەی خۆتان فەراهەم بهینن و زەوی ئاوەدان بکەنەوە بەدروستکردنی شارو گوندو باخ و بیستان و شتی تریش .

پرسیار: موسا ئەیزانی بەبیگومان کەگومرایان و خوا سزای داون، بۆچـی بەفیرعـەونی ووت: خوا ئەزانێ و ئەیوت: گومران و سزایان ئەدرێ ؟

وەلام: ئەگەر موسا بیفەرموایە لـەگومریدان فیرعەون داوای بەلگەی برندەوایئـەکرد دانیشتوان ئەتوانن لەدژی راوەستن و موسایش ئەو بەلگەیەی دەسـت نەئەکـەوت، بۆیـە بەجۆرێ وولامی فیرعەونی دایەوە داوای بەلگەی لیٚنەکا .

﴿ وأنزل من السماء ماء فأخرجنابه أزواجا من نبات شتی ﴾ وەپـەروەردگار ناردویەتـە خوارەوە لـەهەوری ئاسمانەوە ئاوێ لـەو ئـاوە چـەندین روبـارو دەریـاو زەریـاو جۆگـەی لیٚپەیدا ئەبێ، دوایی بـەهۆی ئـەوئاوەوە ئیمـە دەرئـەهینین و ئـەروینین چـەندین بـەش و هاوجوتی جۆراوجۆر لـەروەك و درەخت، بەرهەمیان جیـاوازن لـەتام و رەنـگ و بـۆن و گەورەیی‌و بچوکیدا، هەر لـەو روەکانەیش دەرمان و پەیینی کیمیـاوی دروسـت ئـەکرێ بۆرزگاربوون لـەنەخۆشی‌و پیزپەیدا کردنی زەویەکانیان .

﴿ کلوا وارعوا أنعامکم إن فی ذلك لآیات لألی ألنهی ﴾ ئیوە بخۆن لـەمیوەو دانەویلـەو شینایی زەوی‌و چوارپێ‌و ئاژەڵ‌و گیاندارانی خۆتانیـان پـێ بـەخیو بکـەن و دەرخواردیـان بدەن. بەراسـتی چـەندین بەلگـەی ئاشـکراو رون هـەن لـەو شـتانەدا باسـکران بۆئـەو کەسانەی خاوەنی ئەقلن، چونکە هەر بەئەقڵ راستی ئەدۆزریتـەوەو پـاڵ بـەبیرو بـاوەری پروپوچەوە ئەنیررێ‌و بەرگری ئەکرین، هەر بەئەقڵ راستی پیغەمبەران ئەزانرێ. بەتایبـەتی پیغەمبەرایەتی موساو هارون .

﴿ منها خلقناکم ومنها نعیدکم ومنها نخرجکم تـارة أخـری ﴾ هـەر لـەهـەندێ زەوی ئیمە ئیوەمان دروست کردوە یەکەم جار لـەدلۆپە ئاوێ لـەخواردەمەنی زەوی پـەیدا ئـەبێ ئەچیتە پشتی باوك و ئەریژیتـە نـاو منـالدانی دایکـەوەو هـەر لـەنیو زەویـدا ئیمـە ئیـوە ئەگیرینەوە دوای مردنتان و هەر لـەزەویدا ئیمـە بۆجـارێ تـر ئیمـە ئیـوە دەرئـەهینین و زیندوتان ئەکەینەوە وەك جاری یەکەم .

﴿ ولقد أريناه آياتنا كلها فكذب وألى ﴾ وەبەراستی ئیمە نیشــانی فیرعــەونماندا هــەمو نیشانەی ئاشکراو کارە پەك خەرەکانی خۆمان لەداردەستی موسا کەئەبوە ماریو دەســتی زۆر روناك دەری موساو شتی تری زۆرتر کەبەلگــە بــون لەســەر راستی موســا، دوایــی فیرعەون ئەو بەلگانەی بەدرۆ ئەخستەوەو بــەگومانی خــۆی بــەجادوی ئــەزانین و لــەبــەر گوناھباری خۆی وازی لەباوەرکردن بەخوا ھینا .

قَالَ أَجِئْتَنَا لِتُخْرِجَنَا مِنْ أَرْضِنَا بِسِحْرِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٥٧﴾ فَلَنَأْتِيَنَّكَ بِسِحْرٍ مِّثْلِهِۦ فَٱجْعَلْ بَيْنَنَا وَبَيْنَكَ مَوْعِدًا لَّا نُخْلِفُهُۥ نَحْنُ وَلَآ أَنتَ مَكَانًا سُوًى ﴿٥٨﴾ قَالَ مَوْعِدُكُمْ يَوْمُ ٱلزِّينَةِ وَأَن يُحْشَرَ ٱلنَّاسُ ضُحًى ﴿٥٩﴾ فَتَوَلَّىٰ فِرْعَوْنُ فَجَمَعَ كَيْدَهُۥ ثُمَّ أَتَىٰ ﴿٦٠﴾ قَالَ لَهُم مُّوسَىٰ وَيْلَكُمْ لَا تَفْتَرُوا۟ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا فَيُسْحِتَكُم بِعَذَابٍ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنِ ٱفْتَرَىٰ ﴿٦١﴾ فَتَنَٰزَعُوٓا۟ أَمْرَهُم بَيْنَهُمْ وَأَسَرُّوا۟ ٱلنَّجْوَىٰ ﴿٦٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنْ هَٰذَٰنِ لَسَٰحِرَٰنِ يُرِيدَانِ أَن يُخْرِجَاكُم مِّنْ أَرْضِكُم بِسِحْرِهِمَا وَيَذْهَبَا بِطَرِيقَتِكُمُ ٱلْمُثْلَىٰ ﴿٦٣﴾ فَأَجْمِعُوا۟ كَيْدَكُمْ ثُمَّ ٱئْتُوا۟ صَفًّا ۚ وَقَدْ أَفْلَحَ ٱلْيَوْمَ مَنِ ٱسْتَعْلَىٰ ﴿٦٤﴾

﴿ قال أجئتنا لتخرجنا من أرضنا بســحرك ياموسـى ﴾ فیرعــەون ووتـی: ئایـا وادیـارە تۆهاتوی بۆلای ئیمە لـەبەرئەوەی کەتۆ ئیمە دەربکەی لـەزەوی و نیشتمانی ئیمە کەمیسرە بەهۆی جادوی خۆتەوە ئەی موسا .

فیرعەون جموجۆلی پیٚ‌کەوت: ئەگەر کار بەو جۆرە بروا پاشایەتی لـەدەست دەرئەچیٚ‌و هیچ شتیکی بەدەستەوە نەماوە بەرانبەری موسای پیٚ‌بکا. بۆیــە کەوتـە دروسـت کردنـی فروفیـڵ‌و درۆو بوختـان، داوای لـەموسـا کـرد بـەلینی پیـدا جیگەیـە دیـاری بکــەن و کۆریٚ‌بگرن بۆنیوان موساو نیوان جادوگەرانی فیرعــەون کەجیگەیـەکی پـان و تـەختبیٚ‌و کەندو کۆسپی تیدانەبیٚ بەرچاوی دانیشتوان بگریٚ. بۆئەوەی بەگشتی کردەوەی موســاو جادوگەران ببینریٚ .

﴿ فلنأتنك بسحر مثله فأجعل بيننا وبينك موعدا ﴾ دوایی من سویند ئەخۆم بۆتۆ: ئیمە بۆتۆی ئەهینین جادویە وینەی ئەو جادویــەی تـۆو بەرانبــەری تـۆی پیٚ‌ئەکـەین و بـۆرت ئەدەین، دوایی تۆ بگـیرەو ماوەیـە دانـیٚ لــەنیوان ئیمــەو لــەنیوان تـۆدا هــەتا کۆببینــەوە لـەوکاتەداو پەکت بخەین .

﴿ لاتخلفه نحن ولا أنت مكانا سوى ﴾ ئیمەو تۆ هیچ لایەکمان پیچەوانەی ئەوکاتــەو ئەو بەلینە نەرۆین لـەجیگەیەکی تەخت و پان و ریك و پیکی بەزرو بیٚ‌چاڵ‌و چۆلیدابـــیٚ. هەتا دانیشتوان جادوی ئیمەو تۆ لـە دەشتەدا ببینن، ئەو کاتە بەچاوی خۆت ئەبینی چـۆن ئیمە سەرئەکەوین بەسەر تۆدا، موسا چونکە باوەری تەواوی بەخۆی هەبو نەترسا .

﴿ قال موعدكم يوم الزينة وأن يحشر الناس ضحى ﴾ موسا فەرموی: کـاتی بـەلینـدان بەئیوە رۆژی جەژن و کاتی ئارایشتدان و رابواردن و سەیرانی دانیشتوانبیٚ‌و کۆبکرینــەوە لـەکاتی چیشتەنگادا کە ئەو کاتە روناکی خۆر پەرەئەسینیٚ و دانیشتوان هەمویان لـەخــەو رائەپەرن و ئەتوانن خۆیان بگەیەننە ئەوجیگەیە بەخۆشیٚ‌و بەبیٚ ماندوبون، موسا ئەیویست کەراستی دەرکەویٚ‌و کاری پوچ پوچ ببیتەوە، زانایان ووتویانە ئەورۆژە رۆژی نـەورۆزبو کەجەژنی هاتنی بەهارو نەمانی سەرمایە .

﴿ فتولى فيرعون فجمع كيده ثم أتى ﴾ دوایــی فیرعــەون پشــتی کــردە موســاو وازی لیهیناو چوو بــۆلای داردەســتەی خــۆی. دوایــی فیرعــەون ئەوشــتانەی پیویســت بــون بۆجادوگەران دانیشــتوانی پــێ بخلــەتینن کــۆیکــردەوە بۆیــان هەموشتی بۆئامــادەکردن، لەگەڵ پیاوەکانی کەوتنە راویژکردن بۆکیشانی نەخشــەی ســەرکەوتن بەســەر موســادا، پیاوەکــانی خــۆی نــارد بۆهــەمو شــارەکانی میســر هــەتا جادوگــەری کارامــەو پســپۆر لەجادوگەریدا کۆبکەنەوە، لــەپاشا فیرعەون فەخفەی پاشــایەتیەوە هــات بــۆلای جیگــەو کاتی دیاریکراوی پالەوانبازی بۆپیکادانی هەردولای موساو جادوگەران. موســا کــەوتــە ئامۆژگاری کردنی جادوگەران .

﴿ قال لهم موسى ويلكم لاتفتروا على الله كذبا ﴾ فەرموی بــەوان کەروبــەروی یــەك وەستابون: هاوارو لەناوچون بۆئیوەی جادوگــەرانی فیرعــەون ئیــوە درۆ هەلمەبەســتن و مەیدەن بەسەر خوادا بەبوختان کردن، ئەگەر لاتان وابێ جادوی ئیوە پەکی من ئەخا ئەوە کاریکە ئیوە ئەیدەنە پاڵ خوای مەزن و بۆتان نارواتە سەرو ئەبیتە هۆی نەمانتان .

﴿ فيسحتكم بعذاب وقد خاب من إفترى ﴾ دوایــی خــوا ئیــوە لــەناو ئــەباو بنــەبرتان ئەکاو ریشەتان دەرئەهینێ. بەهۆی سزایەکی سەختەوە کەلەئاسمانەوە ئــەرژێ بەســەرتاناو بەراستی رسواو بێهودەیە کەسێ بوختان بکاو درۆ هەلبەسێ، فیرعــەون چــەندە خــاوەنی دەسەلاتبێ ناتوانێ زیان لــەخۆیو لــەئیوە لاداو ناشتوانێ هیــچ ســودێ بــەهیچ کەســێ بگەیەنێ، کاتێ جادوگــەرانی فیرعــەون فــەرمودەی موســایان بیســت و زۆر سەربەســتانە بەئامادەبونی فیرعەون و دانیشتوانەوە ئەو فەرمودانەی ئاراستەی ئــەوان ئــەکرد، کەوتنــە مقۆمقۆو زۆرکاری تیکردن .

﴿ فتنازعوا أمرهم بينهم وأسروا النجوى ﴾ دوایی جــادو گــەران کەوتنــە گفتوگــۆو راویژکردن لەنیوان خۆیانا لەبارەی نیوان ئەوکارەی موساو فیرعەون و خۆیان و بەنــهینی گفتوگۆی نزمیان لەگەڵ یەکتری ئەکرد .

هەندیکیان ئەیان ووت: وای بە چاك ئەزانین بەرامبـەری موسـا نەکـەین و پاشەکشـێ بکـەین، هـەندێ تریـان بریاریـاندا جـادوی خۆیـان لـەدژی موسـا بەکاربـــهینن، دوای بەردەوبگرەیەکی زۆر لایەنگرانی فیرعـــەون سـەرکەوتن. بـەگویرەی فـەرمودەی خـوای مەزن.

﴿ وقـالوا إن هـذان لسـاحران یر یـدان أن یخرجـاکم مــن أرضکــم بســحرهما ﴾ وەجادوگەران وتیان بەراستی: ئەو دوپیاوە جادوگەرن ئەیانەوێ ئیوە دەربکەن لــەزەوی‌و نیشتمانی خۆتان کەزەوی میسرە بەهۆی جادوەکانیانەوەو ئەم شارە بخەنە ژیــر دەســەلاتی خۆیان .

﴿ ویذهبا بطرقتکم الم ثلی ﴾ وەروی ئـادەمیزاد بگـۆڕن و وەری گـیرن لـەم یاسـاو دەستورە بەرزەی خۆتان، سەربەخۆی‌و دەسەلات و ئاینی ئیوە ژیر پیێبکەن .

﴿ فأجمعوا کیدکم ثم إئتوا صفا ﴾ دوایی ئیـــوە هــەمو فیـلٚ‌و جـادوی هـیزی خۆتـان کۆبکەنەوە، پیك بین لـەسەر بیروباوەری خۆتان و یەك دەسـت بـن بۆپەکخستنی موسـا، لـەپاشا ریز بدەن و برۆن بۆلای جیگەی کــۆڕو کۆبونـەوە هـەتا موسـا بترسـێ‌و هەسـتی خۆی‌و تاقمەکەی لاواز بیێ .

﴿ وقد إفلح الیوم من استعلی ﴾ وەبەراستی بەختیارو خۆشبەختە کەسێ ئەمرۆ بلنـــدو سەربەرزبێ‌و ســەرنەکەوێ بەســەردژی خۆیـا. ئـەم رۆژە رۆژی تاقیکردنەوەیـە، ئەگـەر سەرنەکەوین ژیان بۆئیمە نابێ‌و نابرومان ئەچێ. کەچونە جیگەی دیاریکراو .

قَالُواْ يَٰمُوسَىٰٓ إِمَّآ أَن تُلۡقِيَ وَإِمَّآ أَن نَّكُونَ أَوَّلَ مَنۡ أَلۡقَىٰ ﴿٦٥﴾ قَالَ بَلۡ أَلۡقُواْۖ فَإِذَا حِبَالُهُمۡ وَعِصِيُّهُمۡ يُخَيَّلُ إِلَيۡهِ مِن سِحۡرِهِمۡ أَنَّهَا تَسۡعَىٰ ﴿٦٦﴾ فَأَوۡجَسَ فِي نَفۡسِهِۦ خِيفَةٗ مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ قُلۡنَا لَا تَخَفۡ إِنَّكَ أَنتَ ٱلۡأَعۡلَىٰ ﴿٦٨﴾ وَأَلۡقِ مَا فِي يَمِينِكَ تَلۡقَفۡ مَا صَنَعُوٓاْۖ إِنَّمَا صَنَعُواْ

كَيْدُ سَٰحِرٍۖ وَلَا يُفْلِحُ ٱلسَّاحِرُ حَيْثُ أَتَىٰ ﴿٦٩﴾ فَأُلْقِيَ ٱلسَّحَرَةُ سُجَّدًا
قَالُوٓاْ ءَامَنَّا بِرَبِّ هَٰرُونَ وَمُوسَىٰ ﴿٧٠﴾ قَالَ ءَامَنتُمْ لَهُۥ قَبْلَ أَنْ ءَاذَنَ
لَكُمْۖ إِنَّهُۥ لَكَبِيرُكُمُ ٱلَّذِي عَلَّمَكُمُ ٱلسِّحْرَۖ فَلَأُقَطِّعَنَّ أَيْدِيَكُمْ
وَأَرْجُلَكُم مِّنْ خِلَٰفٍ وَلَأُصَلِّبَنَّكُمْ فِي جُذُوعِ ٱلنَّخْلِ وَلَتَعْلَمُنَّ
أَيُّنَآ أَشَدُّ عَذَابًا وَأَبْقَىٰ ﴿٧١﴾ قَالُواْ لَن نُّؤْثِرَكَ عَلَىٰ مَا جَآءَنَا مِنَ
ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلَّذِي فَطَرَنَاۖ فَٱقْضِ مَآ أَنتَ قَاضٍۖ إِنَّمَا تَقْضِي هَٰذِهِ
ٱلْحَيَوٰةَ ٱلدُّنْيَآ ﴿٧٢﴾ إِنَّآ ءَامَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَٰيَٰنَا وَمَآ أَكْرَهْتَنَا
عَلَيْهِ مِنَ ٱلسِّحْرِۗ وَٱللَّهُ خَيْرٌ وَأَبْقَىٰٓ ﴿٧٣﴾ إِنَّهُۥ مَن يَأْتِ رَبَّهُۥ مُجْرِمًا
فَإِنَّ لَهُۥ جَهَنَّمَ لَا يَمُوتُ فِيهَا وَلَا يَحْيَىٰ ﴿٧٤﴾ وَمَن يَأْتِهِۦ مُؤْمِنًا قَدْ
عَمِلَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ فَأُوْلَٰٓئِكَ لَهُمُ ٱلدَّرَجَٰتُ ٱلْعُلَىٰ ﴿٧٥﴾ جَنَّٰتُ عَدْنٍ
تَجْرِي مِن تَحْتِهَا ٱلْأَنْهَٰرُ خَٰلِدِينَ فِيهَاۚ وَذَٰلِكَ جَزَآءُ مَن تَزَكَّىٰ ﴿٧٦﴾

﴿ قالوا یاموسی إما أن نلقی و إنا أن نکون أول من ألقی ﴾ جادوگەران ووتیان: ئـــەی موسا تۆداری دەستی خۆت فـرێ ئـەدەی یائیمـە یەکـەم جـار فـرەی بدەیـن گوریـس و داردەستی خۆمان ؟

﴿ قال بل ألقوا ﴾ موسا فـەرموی: بـەلکو ئیـوە یەکـەم جـار دارو گوریسـی خۆتـان فرەبدەن هەتا ئەو فێڵو جادوەی لاتانە دەربکەوێو ئەوەی پیتانە هەمو بخەنە کـار، موسـا

بۆئەوە فەرموی ئیوە یەکەم جار ئەوەی لایانە بیکەن هەتا بەدەست بۆشی بمیننەوەو دوایـی خوای مەزن دەسەلاتی خۆی دەربخا .

﴿ فإذا حبالهم وعصيهم يخيل إليه من سحرهم أنها تسعى ﴾ دوای ئەوەی جادوگەران ئەوەی لایان بوو لەدارو گوریـــس کـەفرەیاندا لـەکاتی فرەدانـی گوریـس و دارەکانیـان لەجادوی جادوگەران بەجۆرێ نیشان بەموسا ئەدرا کەئەو گوریس و دارانەیان رائەکـەن و ئەرۆن. ئەوەی راستیبێ ئەوگوریس و داردەستانەیان پیلانێ بو جادوگەران بـەجۆریکی هونەری جیوەیان کردبو نیودارەکانیان و دابویان لەگوریسەکان کاتێگەرمای خۆر بیدایـە لەوان دەستیان ئەکرد بەجوجۆل و وۆر بەپەلە ئـەهاتن و ئەرۆیشـتن و وائـەزانرا مـارن و رائەکەن. ئەگینا لەناوەرۆکا داری ووشك و مـوی بێگیـان بـوون. ئـەم باسـە لەئایـەتی (۱۱۳) ی سورەتی ئەلئەعرافدا باسی تری کراوە .

زانایان بیرو بۆچونیان لەژمارەی جادوگەران و ژمارە گوریس و دارەکانیـان جیـاوازە: ئەوەی گرنگ بێ ژمارەیـــان دیـاری نـەکراوە. بـەلام وادەرئەکـەوێ ژمارەیـان زۆربـوە، هەرچەندەبن خوا ئەیزانێ .

﴿ فأوجس في نفسه خيفة موسى ﴾ دوایی موسا لـــەدەرونی خۆیـا هەسـتی بەترسـان کرد. موسا لەو کەسانە نەبوە بترسێ. ئەو ترسەی لەبەرخۆی نەبو. چونکە خـوای مـەزن بەموساو هارونی فەرمو: ئیوە مەترسن من لەگەل ئیوەم. لەوە ئەترسا دانیشـتوان سـەریان لی تیك بچێ و پروپوچی جادوگەران کاریان بکاتە سەر .

﴿ قلنا لاتخف إنك أ نت الأعلى ﴾ ئیمە بەموسامان ووت: تۆمەترسە کەچاك و خراپ جوێ نەکریتەوە لای دانیشتوان بەراستی تۆزال ئەبی بەسەریاناو هەمو شتێ رون ئەبێ تەوە لەبەر چاوی دانیشتوانا. دوایی جادوگەران باوەرئەهینن بەراستی تۆ، ئەوان خاوەنی درۆو فیلن فیرعەون زۆری لیکردون .

﴿ وألق مافي يمينك تلقف ما صنعوا ﴾ وەتۆ فرەبدە شتێ بەدەسـتی راسـتی تۆیـە ئـەو شتەی تۆ قوت ئەدا شتی جادوگەران دروستیان کـردوە بەسـاختە لـەگوریس و لـەدارو نیشانی تۆی ئەدەن جوجۆل بکەن و تۆی پێ بترسینن .

﴿ إنما صنعوا كيد ساحر ولا يفلح الساحر حيث أتـى ﴾ بەراسـتی شـتی جادوگـەران دروستیان کردوە فیلی جادوگەریکەو ئەو جادوگەرە سـەرناکەوێ لەهـەر جیگەیەکـەوە هاتبێ بەو فیلـە وئەیەوێ دانیشتوان فریو بداو ناچیتە سەربۆی .

﴿ فألقی السـحرة سـجدا قـالوا آمننـا بـرب هـارون وموسـی ﴾ دوای ئـەوەی موسـا داردەستی خۆی فرەداو گوریس و دارەکانی ئەوانی هەلوشی جادوگەران خۆیـان بـەدەما خستو سوژدەیان برد بۆخوای مەزن چونکە بۆیان دەرکەوت ئەوکارەی موسـا جادونیـەو ووتیان: ئیمە بروامان هینا بەپـەروەردگاری هـارون و موسـا، بۆیـە هـارون پیش خـراوە لـەبەرئـەوی لەتەمـەنا لـەموسـا گـەورەتربوە، لـەبەرئـەوەیش گومـان نـەبرێ مەبەسـت لـەپەروەردەکەر فیرعەونی بەخیوکەری موسابێ لەکاتی منالیدا .

﴿ قال آمنتم له قبل أن آذن لكم ﴾ فیرعـەون بەجادوگـەرانی ووت: ئیـوە باوەرتـان بەموسا هیناوە بەرلـەوەی من دەستوربدەم باوەر بەموسا بهینن. فیرعەون ئەوەندە بێشـەرم بو وایئەزانی باوەرهینان بەخوای گەورە ئـەبێ مرۆڤیکـی لاوازی وەکـو ئـەو دەسـتوری بۆبدا. لـەو دراوە خۆی وازی نەهیناو تەمێ خوارنەبوو، ووتی:

﴿ إنه لكبركم الذی علمكم السـحر ﴾ بەراسـتی موسـا گـەورەو مامۆسـتای ئیـوەی ئەوتوبـە جـادوی بـەئیوە فـیرکردوە بەراسـتی مـن واتیگەیشـتوم ئیـوە لـەگـەڵ موسـای جادوگەری مامۆستای خۆتان پیك هاتوون پاشایەتی من و دەسەلاتی من نەهیلن. ئەتانەوێ رژیم و یاسای من وەگیرن لـەپاشا خۆتان دەسەلات بگرنە دەسـت. دوایـی دەسـتی کـرد بەهەرەشەو گورەشەو ووتی:

﴿ فلأ قطعن أيديكم وأرجلكم من خلاف ولأ صلبنكم فـی جـذوع النخـل ﴾ دوایـی بەراستی من دەست و پیکانی ئیوە ئـەبرم بەپیچەوانـەی یـەکتری. دەسـتی راسـت و پـی چەپتان ئەبرم هەتا ئازاری زۆرتان توشبێ و رسواتان بکەم و بەراستی من ئیوە هەلئەواسم بەسەر لقی درەختی خورماو ئەتان ئەکەم بەنمونەو دانیشتوانی ترتان پێتەمێ ئەکەم هـەتا کەسی تر نەتوانێ دژی من راوەستێ .

﴿ ولتعلمن أينا أشد عذابـا وأبقـى ﴾ وەئیـوە بزانـن و بۆتـان دەرئەکـەوێ چ کەسـێ لەئیمەو لەموسا ئازاردانی سەختەو بەردەوام ترە لەتۆلە سەندنەوەدا ئایا من یائەو خوایەی موسا ئیوە کورنوشی بۆئەبەن بەرەلـەوەی من دەستورتان پێبدەم .

﴿ قالوا لم نؤثرك علـى ماجاءنـا مـن البينـات والـذى فطرنـا ﴾ جادوگـەرەکان دوای ئەوەی باوەریان هینا بەفیرعەونیان ووت: ئیمە تۆ هـەلنابژیرین و ریـزی تۆنـادەین بەسـەر شتیکا هاتوە بۆلای ئیمەلـەو کارە پەك خەرو نیشانە روون و ئاشکرایانەو بەسەر کەسیکی ئەوتۆدا ئیمەی دروست کردوە، هەرەشەو گورەشـەی تـۆ کارناکاتـە سـەر ئیمـە کـەواز لەخوا پەرستی بهینین .

﴿ فأقض ماأنت قاض إنما تقضى هذه الحياة الدنيا ﴾ دوای فەرمان بـدەو ئەوشـتەی تۆ ئەتـەوێ بیکـە ئـەی فیرعـەون، ئیمـە لـەئازاردانی تـۆ ناترسـین و بـەردەوامین لەسـەر باوەربەخوا. بەراستی تۆفەرمان بەشتێ ئەدەی پیت خۆشـە لـەژیانی ئـەم جیهانـەدا، ئیمـە جیهان پەرست نین و پاداشتی رۆژی داوییمان ئەوێ و هەرئەو بەردەوامە تـۆ دەسـەلاتت بەسەر خۆتانیە چ جای جگەی خۆت .

﴿ إنا آمنا بربنا ليغفرلنا خطايانا ومـا أكرهتنـا عليـه مـن السـحر والله خير وأبقـى ﴾ بەراسـتی ئیمـە باوەرمـان هینـاوە بەپـەروەردگاری خۆمـان، لەبـەر ئـەوەی خۆشـبێ لەگوناهەکانمان و لەوشتەی تۆزۆرت کردوە لەئیمە لەسەرکردنی لەبەکارهینانی جـادوو خواچاکترە بۆئیمە پاداشتمان ئەداتەوە لەم جیهانـەدا لەهـەمو کەسـێ و بـەردەوامترە بـۆ پاداشت دانەوەی ئیمە لەپاشەرۆژدا، ئیمە بروامان وایە کۆمەلی خواپەرستان سەرئەکەون نەك تاقمی سەرلی شیوادانی تۆ.

﴿ إنـه مـن يـأت ربـه مجرمـا فـإن لـه جـهنم لايمـوت فيـها ولايحـى ﴾ بەراسـتی هەرکەسێبچێ بۆلای پـەروەردگاری خـۆی بـەتاوانباریو بێبـاوەری ، دوایـی بەراسـتی بۆئەوکەسە هەیە دۆزەخـێ نەئـەمرێ لـەناو ئەودۆزەخـەدا هـەتا رزگـاری بـێ لەسـزاو نەئەوەیە بژی بەژیانێ سـودی پـێ بگەیـەنێ. بـەلکو بـەردەوام ئـەبێ لەسـەر رسـوایی و سزادان.

﴿ ومن يأته مؤمنا قد عمل الصالحات فألئك لهم الدرجات العلى ﴾ وهەرکەسێ بچێ بۆلای پەروەردگاری خۆی بـەباوەرداری بەراستی ئـەو کەسـە کارەچاکـەکانی کـردوە لـەجیهاندا، دوایی بۆئەوکەسانە هەیە چەندین پلەوپایەی بلندوبەرز لـەرۆژی دواییدا، ئەبێ بزانرێ باوەرهینان بەتەنها نابیتە هۆی ئەو پلەو پایە بەرزانە. بەلکو هەردو لەباوەرهینان و کردنی کارەچاکەکان ئەبنە هۆی وەرگرتنی ئەو پلەو پایەیانە .

﴿ جنات عدن تجری من تحتها الأنهار خـالدين فيـها ذلـك جـزاء مـن تزكـى ﴾ ئـەو پلەوپایەیانـە بریتـین لـەچـەندین بەهەشـتی پایـەدارو بـەرین ئـەچێ بـەژیر درەختـەکانیاو بەملاولای کۆشکەکانیان چەندین روبارێ لـەئاوی شیرین و بەتام ئەوکەسـانە بـەردەوامن لـەنیو ئەو بەهەشتانەدا ئەژین، ئەو بەهەشتانە پاداشتی کەسیکە پاکی لـەپیسی بێ باوەری و گوناه، بەخوا پەرستی خۆی پاك کردبیتەوە .

وَلَقَدْ أَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِى فَٱضْرِبْ لَهُمْ طَرِيقًا
فِى ٱلْبَحْرِ يَبَسًا لَّا تَخَٰفُ دَرَكًا وَلَا تَخْشَىٰ ﴿٧٧﴾ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ
بِجُنُودِهِۦ فَغَشِيَهُم مِّنَ ٱلْيَمِّ مَا غَشِيَهُمْ ﴿٧٨﴾ وَأَضَلَّ فِرْعَوْنُ قَوْمَهُۥ
وَمَا هَدَىٰ ﴿٧٩﴾ يَٰبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ قَدْ أَنجَيْنَٰكُم مِّنْ عَدُوِّكُمْ وَوَٰعَدْنَٰكُمْ
جَانِبَ ٱلطُّورِ ٱلْأَيْمَنَ وَنَزَّلْنَا عَلَيْكُمُ ٱلْمَنَّ وَٱلسَّلْوَىٰ ﴿٨٠﴾ كُلُوا۟
مِن طَيِّبَٰتِ مَا رَزَقْنَٰكُمْ وَلَا تَطْغَوْا۟ فِيهِ فَيَحِلَّ عَلَيْكُمْ غَضَبِى
وَمَن يَحْلِلْ عَلَيْهِ غَضَبِى فَقَدْ هَوَىٰ ﴿٨١﴾ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ
وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴿٨٢﴾

﴿ ولقد أوحينـا إلى موسـا أن أسـر بعبـادي ﴾ وەدوای ئەوهـەمو كـارە پـەك خەرانـە لـەموساوەوە بۆفیرعەون و باوەرنەهینانیو لـەسنور لادانـی بەراسـتی ئیمـە سـروشمان نـارد بۆلای موسا کەتۆشەو رەویی بکە بەبەندەکانی من لـــەزەوی میسـرەوە. کاتـێ گەیشـتیتە کەناری دەریاو چاووت بەفیرعەون و لـەشکرەکەی کەوت بەدواتانەوە دین تۆمەترسە.

﴿ فأضرب لهم طريقا في البحر يبسا ﴾ دوایـــی تۆبـدە لـەروبارەکـە بەداردەسـتەکەی خۆت و پەیدای بکە بۆ بەندەکانی من ریگەیەکی ووشك هەتا ئەوان بەو ریگە ووشکەدا برۆن و بچنە ئەوبەری دەریاکەوە .

﴿ لاتخاف دركاو ولاتخشى ﴾ تۆمەترسە لـەوەی کەفیرعــەون و سـەربازەکانی پـیتان بگەن کەدواتان کەوتن مەترسە لـەوەیش بخنکین بەئاوی دەریاکەدا. موسا گەلـەکەی بەبێ ئازارو ناخۆشی چونە دەرەوەلـەنیو شاری میسر بۆلای دەریاکە لـەشەودا کەگەیشتنە سـەر دەریاکە بەوجۆرەی خوا فەرمانی دابو بەموسا بەوجۆرە داردەستەکەی کیشا بەدەریاکــەدا بوبەدوکەرتەوەو ناوەراستی دەریاکە ووشك بویەوەو موساو هاوریکانی چونــە ئەوبــەرەوە بەبێ ئازار .

﴿ فأتبعـهم فرعـون بجنـوده فغشـيهم مـن اليــم مــا غشـبهم ﴾ دوایــی فیرعــەون بەلـەشکرەکەیەوە دوایموساو بـــەنو ئیسـرائیلیەکان کـەوتن، دوایـی توشـی فیرعـەون و لـەشکرەکەی بو شتی توشی ئەوانبو، یانی شتیکی ئـەوندە گـەورە بـو مەگـەر هـەر خـوا بزانێ. فیرعەون کەچاوی کەوت بەموساو بەنوئیسرائیلیەکان بەبی ترس ئـەرۆن بەوریگـە ووشکەی نیو دەریاکەدا ئەویش خۆیو لـەشــکرەکەی چونـە نیـو دەریاکـەوە. بـەجۆرێ ئاخرەمین کەسی بەنو ئیسرائیلیەکان چونە دەرەروە ئاخرەمین کەسی لـەشــکری فیرعـەون چونە نیو دەریاوە لـەو کاتــەدا ئـاوی دەریاکـە تـەواوی لـەشـکری فیرعـەونی بەخۆیـەوە داپۆشیو هەمویان خنکان. هەربەو جۆرەی هەمو بەنوئیسرائیلیەکان بــەبێوەی رزگاریـان بووو .

﴿ وأضل فرعون قومه وما هــدى ﴾ وەفیرعــەون گەلەکــەی لەریگــەی راســت لاداو خۆیشیو تاقمەکەی ریگەی راستیان نەدۆزیــەوەو رزگــاری نــەکردن و بــەدرۆ کەوتــەوە کەلــەوەوبەر ئەیووت: من ریگەی راستان نیشان ئەدەم و لــەناو دەریاکەیشــدا ریگــەی لی وونکردن و چونە ناویو خنکان .

﴿ یابنی إسرائیل قد أنجیناکم من عدوکم وواعدناکم جانب الطر الأیمن ﴾ ئــەی بــەنو ئیسرائیل بەراســتی ئیمــە ئیوەمــان رزگــارکرد لــەئازاری دوژمنــی خۆتــان کەفیرعــەون و تاقمەکــەی فیرعــەونن کەلــەوەو بــەر ئیــوەی ئەچەوســانەوەو دوای ئــەوەی فیرعــەون و لەشکرەکەی خنکان ئیمە بەلینمان دابو بەموســای پیغەمبــەرتان کــەخۆیو حــەفتا کــەس لەئیوە برۆن بۆلای راستیکیوی تور هەتا ئیمە تەوراتی پیٚ ببەخشین کە دەستورو فــەرمانی خوای تیدا رونکراوەتەوە بۆتان .

﴿ ونزلنا علیکم المن السلوی ﴾ وەئیمە ناردمان بۆئیوەو بــەئیوەمان بەخشــی گــەزۆی شیرین و شیلاقەی گۆشت خۆش و زۆربەتام لەدەشتی تەیهداو بەئیوەمان فەرموو:

﴿کلوا من الطیبات مارزقناکم ولا تطفوا فیه فجل علیکم غضبــی ﴾ ئیــوە بخــۆن شــتیٚ ئیمە کردومانــە بەخواردەمــەنی بۆئیــوەو بــەئیوەمان بەخشــیوە لــەو خواردەمەنیــە پــاك و رەوایانەو لەسنوری خوای مەزن دەرمەچن لـەخواردنی ئەوو شتەی ئیمە پیمان بەخشــیون و لــەجیگەی خراپ و کاری ناپەسەندا دای مەنین، دوایــی پیویســت ئــەبیٚ بۆئیــوە ســزاو نەفرەتی من و دوایی توشی سزابن .

﴿ ومن یحلل علیه غضبی فقد هوی ﴾ وەهەر کەسیٚ بــرژی بەســەریاو پیویســت ببیٚ سزادانی ئیمە بۆی، دوایی ئەوکەسە لەناو چوەو ئەکەویتە ناو ئاگری دۆزەخەوە .

﴿ وإنی لغفار لمن تاب وآمن وعمل صالحا ثم اهتدی ﴾ وەبەراستی مــن خــۆش ئــەبم لەکەسیٚ لەگوناهی خۆی پەشیمان بوبیتەوەو کردەوەی چــاکی کردبیٚ لەپاشــا ریگــەی راستی وەرگرتبیٚو بەردەوام بوبیٚ لەسەریان .

وەك لەمەوبەر باسمان کرد دوای لــەناو بردنــی فیرعــەون خــوای مــەزن بــەلینی دابــو بەموسا تەوراتی بۆبنیریٚو خوای مەزن کاتیکی بۆدیاری کردبو. دوایی موسا حەفتا کەسی لەخزمەکانی خۆی هەلبژاردو چو بۆلای خوای مەزن و بۆبەســەر وەختــی ئەوبەلینــەوەو

هـارونی بـرای دانـا بەسـەر بەنوئیسـرائیلیەکانەوە. ئـەو لەبـەر چاونەبونـەی موسـایان بەهەلزانیو دەستیان کرد بەگویرەکە پەرستنت بـەهۆی راویژوپرسـی سامیریەوە، موسا کەمێ پیشکەوت لەخزمەکانی کاتێ چون بۆلای خوای مەزن بۆبیستنی فەرمودەی خوای مەزن لەکیوی تور. وەك خوای گەورە ئەفەرموێ:

وَمَآ أَعۡجَلَكَ عَن قَوۡمِكَ يَٰمُوسَىٰ ﴿٨٣﴾ قَالَ هُمۡ أُوْلَآءِ عَلَىٰٓ أَثَرِي وَعَجِلۡتُ إِلَيۡكَ رَبِّ لِتَرۡضَىٰ ﴿٨٤﴾ قَالَ فَإِنَّا قَدۡ فَتَنَّا قَوۡمَكَ مِنۢ بَعۡدِكَ وَأَضَلَّهُمُ ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٥﴾ فَرَجَعَ مُوسَىٰٓ إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ غَضۡبَٰنَ أَسِفٗاۚ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَلَمۡ يَعِدۡكُمۡ رَبُّكُمۡ وَعۡدًا حَسَنًاۚ أَفَطَالَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡعَهۡدُ أَمۡ أَرَدتُّمۡ أَن يَحِلَّ عَلَيۡكُمۡ غَضَبٞ مِّن رَّبِّكُمۡ فَأَخۡلَفۡتُم مَّوۡعِدِي ﴿٨٦﴾ قَالُواْ مَآ أَخۡلَفۡنَا مَوۡعِدَكَ بِمَلۡكِنَا وَلَٰكِنَّا حُمِّلۡنَآ أَوۡزَارٗا مِّن زِينَةِ ٱلۡقَوۡمِ فَقَذَفۡنَٰهَا فَكَذَٰلِكَ أَلۡقَى ٱلسَّامِرِيُّ ﴿٨٧﴾ فَأَخۡرَجَ لَهُمۡ عِجۡلٗا جَسَدٗا لَّهُۥ خُوَارٞ فَقَالُواْ هَٰذَآ إِلَٰهُكُمۡ وَإِلَٰهُ مُوسَىٰ فَنَسِيَ ﴿٨٨﴾ أَفَلَا يَرَوۡنَ أَلَّا يَرۡجِعُ إِلَيۡهِمۡ قَوۡلٗا وَلَا يَمۡلِكُ لَهُمۡ ضَرّٗا وَلَا نَفۡعٗا ﴿٨٩﴾

﴿ وما أعجلك عن قومـك ياموسـى قـال هـم أولاء علـى أثـرى وعجلـت إليـك رب لترضى﴾ وەچ شتیكە پالی ناوە بەتۆ پەلە بكەیی و پیش خزمەكانی خۆت بكــەویی بۆئــەم ماوە كورتە ئەی موسا، موسا فەرموی: ئەوان نزیكی من ولەدوای منەوەن و پیم ئەگەن و نیوانی من و ئەوان ئەندازەیەكی كەمەو من پەلەم كردوە بیم بۆلای تۆ ئەی پەروەردگاری من لەبەر ئەوەی تۆ لەمن رازی ببی.

لەپاش ئەوەی ئەو ماوە دیاریكراوەی چل رۆژیە كۆتایی پیـهات و موسا هـارونی لای بەنوئیسرائیلیەكان جیهیشتبو، موسای سامیری بەمامۆستایەتی شەیتان گەلی موسای لەئایین وەرگیرا، خوای مەزن موسای لەو روداوە ئاگاداركردو فەرموی:

﴿ قال إنا قد فتناك قومك من بعدك وأضلم السايرى ﴾ خوای مەزن فەرموی: بەراستی ئیمە خزمەكانی تۆمان گیرۆدەكردوەو تاقیمان كردونەتەوە لەدوای تۆو بزانرێ سروشــتی گویرەكە پەرستیان لاماوەتەوەو موسای سامیری ئەوانی لاداوە لەئایین و لەریگەی راســت و دەستیان داوەتە گویرەكە پەرستی .

﴿ فرجع موسا إلى قومــه غضبـان أسـفا ﴾ موســا گــەرابوبوەبۆلای خزمــەكانی خــۆی بەتورەیی‌و بەخەفەتەوە لەسەر ئەو شتەی ئەوان كردبویـان دوای ئــەوەی چــل رۆژەكــەی تەواو كردو تەوراتی وەرگرت .

﴿ قال ياقوم ألم يعدكم ربكم وعدا حسنا ﴾ موسا فەرموی: ئەی خزمــانی مــن: ئایـا پەروەردگاری ئیوە بەلینی نەدابو بــەئیوە بەشــتیكی راســت و شـیرین كەتــەورات بنیرێ بۆئیوەو یاسای پیویست و هەمو فەرمودەی خوای مەزنی تیدایە بۆراپەراندنی كارەكانتان.

﴿ أم طال عليكم العهـ د أم أردتم أن يحل عليكم غضب من ربكم فأخلفتم موعـدى ﴾ ئایا دریژەی كیشابو بەسەر ئیوەدا ماوەی دوركەوتنی من لەئیوە بەوچل شەوە، یاویستوتانە برژێ بەسەر ئیوەدا سزاو خەشمی خوای پــەروەردگاری ئیوە، دوایـی ئیـوە بـەدژی ئــەو بەلینەی من كەوتون داومە بــەئیوە كەبــەردەوامبن لەســەر باوەرهینــان بــەخواو هەلســان بەشتێ من فەرمانم پیداون .

﴿ قالوا ما أخلفنا موعدك بملكنا ولكنا حملنا أوزارا من زينة القوم ﴾ گویرەکە پەرستان ووتیان: ئیمە بەئارەزوی خۆمان بەدژی تۆ هەلنەساوین. بەلاّم ئیمە هەلمان گرتبو لەگەلّ خۆمان شتێ لەوشتە قورسانەی درابوە دەستمان لەزیرو زیوی تاقمی فیرعەون و قیبتیەکان، بۆئەوەی خۆمانی پێ برازینینەوە لەزەماوەن و سەیرانداو نەماندابوەوە بەوان .

﴿ فقذفناها فكذلك ألقى السايري ﴾ دوایی ئەو خشلّو زیروزیوەی ئەوانمان فرێ دایە نیوئاگر بەفەرمانی سامیری، دوایی سامیریش هەروەك ئیمە ئەوەی لای خۆی بو فرەیدایە ناوئاگر، هەتا باشتر بروای پێبکەین و بەفەرمانی هەلسین .

﴿ فأخرج لهم عجلا جسدا له خوار ﴾ دوای ئەوەی زیرو زیوەکان توانەوە موسای سامیری لەشی گویرەکەیەکی لەو ئاگرە هینایە دەرەوە بۆبەنو ئیسرائیلیەکان دەنگی لیوە ئەهات بەوینەی بۆرەی گویرەکەیە، موسای سامیری بەجۆریکی هونەری پەیکەری ئەو گویرەکەیەی دروست کردبوو قالبی بۆساختە هینابو، هەندێ لەبەنو ئیسرائیلیەکان لەبەردەم گویرەکەکەدا راوەستان و پیی خەلەتان. زانایان بیرو بۆچونیان جیاوازە: ئایا ئەو گویروەکەیە بوبەخاوەنی زینویەتیانە؟ زوربەی زانایان ئەلین: گیانی تیدانەبو. بەلاّم سامیری لەسەر وینەی گویرەکە داری رژاندبو کون و بۆشایی تیدا دروست کردبو بەجۆرێ با برۆیپشتایە بەو کونانەدا دەنگی لیپەیدا ئەبو وەك دەنگی گویرەکە. هەندێ تریان ئەلین: گەرا بەخاوەن گیان و ئەی بۆراند وەك بۆرەی گویرەکە. سامیری زۆری پێخۆش بو کەموسا لەوێ نیەو بەوپەیکەرە خەلەتاون .

﴿ فقالوا هذا إلهكم وإله موسى فنسى ﴾ دوایی سامیریو شوین کەوتوە خەلەتاوەکانی ووتیان: ئەم گویرەکەیە خوای ئیوەو خوای موساو خوای هەمو بونەوەرانە. دوایی موسا ئەم خوایەی لی ونبوەو چوە بۆکیوی توور بەشوینیا ئەگەرێو نازانێ میوانی ئیمەیەو لەلای ئیمەیە. بیگومان ئەوکەسەی بلێ: خوا خاوەنی لەشە لەگەلّ گویرەکە پەرستانا وینەی یەکن بەبێ باوەری و نەفامیدا .

﴿ أفلا يرون أن لايرجع إليهم قولا ولايملك لهم ضرا و لانفعا ﴾ ئایا ئـەو گویرەوەکـە پەرستانە نەیانزانیوە کەئەو گویرەکەیە هیچ گفتوگۆیە ناگیریتەوە بە وەڵام بۆلای ئـەوان و توانای ئەوەی نیە وڵامیان بداتەوەو خاوەنی هیچ زیانیۆ هیچ سودێ نیـەو ناتوانـێ شـۆق بهاویژێ و لـەقەبداو بەرگری لـەخۆی بکاو کاویژناکاو خواردن نـاخوا. ئیـتر چـۆن ئـەبێ خوابێ، ئەگەر گیانداری تەواویش بێ گویرەکە پەرستەکات لـەوان بەتواناترن .

وَلَقَدۡ قَالَ لَهُمۡ هَٰرُونُ مِن قَبۡلُ يَٰقَوۡمِ إِنَّمَا فُتِنتُم بِهِۦۖ وَإِنَّ رَبَّكُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ فَٱتَّبِعُونِي وَأَطِيعُوٓاْ أَمۡرِي ﴿٩٠﴾ قَالُواْ لَن نَّبۡرَحَ عَلَيۡهِ عَٰكِفِينَ حَتَّىٰ يَرۡجِعَ إِلَيۡنَا مُوسَىٰ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰهَٰرُونُ مَا مَنَعَكَ إِذۡ رَأَيۡتَهُمۡ ضَلُّوٓاْ ﴿٩٢﴾ أَلَّا تَتَّبِعَنِۖ أَفَعَصَيۡتَ أَمۡرِي ﴿٩٣﴾ قَالَ يَبۡنَؤُمَّ لَا تَأۡخُذۡ بِلِحۡيَتِي وَلَا بِرَأۡسِيٓۖ إِنِّي خَشِيتُ أَن تَقُولَ فَرَّقۡتَ بَيۡنَ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ وَلَمۡ تَرۡقُبۡ قَوۡلِي ﴿٩٤﴾ قَالَ فَمَا خَطۡبُكَ يَٰسَٰمِرِيُّ ﴿٩٥﴾ قَالَ بَصُرۡتُ بِمَا لَمۡ يَبۡصُرُواْ بِهِۦ فَقَبَضۡتُ قَبۡضَةٗ مِّنۡ أَثَرِ ٱلرَّسُولِ فَنَبَذۡتُهَا وَكَذَٰلِكَ سَوَّلَتۡ لِي نَفۡسِي ﴿٩٦﴾ قَالَ فَٱذۡهَبۡ فَإِنَّ لَكَ فِي ٱلۡحَيَوٰةِ أَن تَقُولَ لَا مِسَاسَۖ وَإِنَّ لَكَ مَوۡعِدٗا لَّن تُخۡلَفَهُۥۖ وَٱنظُرۡ إِلَىٰٓ إِلَٰهِكَ ٱلَّذِي ظَلۡتَ عَلَيۡهِ

عَاكِفًا لَّنُحَرِّقَنَّهُۥ ثُمَّ لَنَنسِفَنَّهُۥ فِى ٱلْيَمِّ نَسْفًا ﴿٩٧﴾ إِنَّمَآ إِلَٰهُكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِى لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَسِعَ كُلَّ شَىْءٍ عِلْمًا ﴿٩٨﴾

﴿ و لقد قال لهم هارون من قبل یاقوم إنما فتنتم به ﴾ وە بەراستی هارون بەگوێەکـە پەرستانی فەرمو بو بەرلەوەی موسا بگەرێتەوە لە کیوی تور لەروی ئامۆژگارییەوە: ئـەی تاقمی من: بەراستی ئیوە گیرۆدە بورن بــە پەرســتنی ئـەو گویرەکـەوەو دوای ئـارەزووی پوچـی خۆتـان کـەوتون. چ شـتی فریـوی ئیـوەی داوە هـەتا ئـەو گویرەکـە بپەرســتن؟ پەیکەریکی بی گییان شایستەی پەرستن نیە .

﴿ و إن ربكم الرحمن فاتبعوني و أطيعــوا أمري ﴾ وە بەراسـتی پـەروەردگاری ئیـوە خوای خاوەن بەخشـندەیەو پەشـیمان بونـەوەتان لی وەرئـەگری، دوایـی ئیـوە دوای مـن بکەون و لـەسەر ئایینی من بن لەپەرســتنی خـواداو پـەیرەوی فـەرمانی مـن بکـەن و واز لەپەرستنی ئەو گویرەکەیە بهێنن و کاریکی نارەواو پوچە .

﴿ قالوا لن نبرح عليه عاكفين حتى يرجع إلينا موسى ﴾ گویرەکـە پەرسـتان وتیـان: ئیمە لاناچین لـەسەر پەرستنی ئەم گویرەکەیە بەردەوام ئەبین هەتا کاتی موسـا لەگەرێتـەوە بۆ لای ئیمە. دوایی هەوالـمان بداتی ئایا خوا ئەمەیە سامیر دروست کردوە یا خوا ئەوەیـە موسا چوە بۆ لای گفتوگۆی لەگەل بکا ؟ موسـا گەرایـەوەو تەماشـای کـرد زۆربـەی بەنوئیسرائیلیەکان راوەستاون لـەسەر گویرەکــە پەرسـتن، موسـا رقـی هەلسـا و ریشـی هارونی برای گرت و رای کیشا بۆ لای خۆی .

﴿ قال يا هارون مامنعك إذ رأيتهم ضلـوا ﴾ موسـا فـەرموی: ئـەی هـارون: چ شـتی ریگەی لە تۆ گرت کاتی تــۆ ئـەوانت بینـی لـەریگـەی راسـت لایـان داوەو بـەوکارەی سامیری خەلەتاون ؟

﴿ ألا تتبعن أفعصيت أمري ﴾ ئایا بۆ تۆ دوای مـن نەکـەوتی کـاتی گفتوگـۆی تۆیـان وەرنەگرت و بهاتایەی وهەوالـت بە من بدایە، ئایا دوایی تۆ بۆ بێ فەرمانی منت کـردووە و هەڵنەساوی بە شتی سودی ئەوانی تیدابی، موسا سەروریشی هارونی گـرت و بەرقـەوە رای کیشا بۆ لای خۆی. ئەبی بزانری: ووشەی (لا) لـە رستەی (ألا تتبعن) زیادەیە .

﴿ قال یا ابن أم لا تأخذ بلحیتي ولا برأسي ﴾ هارون فەرموی: ئەی کوری دایکم: تـۆ ریش و سەری من مەگرەو رام مەکیشە بۆ لای خۆت، هیدی و لـەسەر خۆبە هــەتا بـۆت دەرئەکەوی کەخاوەنی بیانوم، تۆ برای دایکی منی و بـەزەییت پیمـا بیتـەوە لـەبـەر دلـی دایکم، بۆیە من و باوەرداران نەهاتین بۆ لای تـۆ لـەکاتی گویرەکـە پەرسـتنی ئـەواندا و بەجییان بهینین .

﴿ إني خشیت أن تقول فرقت بین بني إسرائیل و لم ترقب قولي ﴾ بەراستی من ترسام کە تۆ بلییت بەنو ئیسرائیلیەکانت پارچە پارچە کردوە و جیاوازیت خستوەتە تیوانیـان و کاریکی وات کردوە هەندیکیان دوای تـۆ بکـەون و تـاقمی تریـان دوای سـامیر بکـەون وبلیی تۆ چاوەروانی منت نەکردوە هەتا دیمەوە. دوایی موسا بروای بەراستی هارون کرد و روی وەرگیرا بۆ لای سامیری:

﴿ فما خطبك یاسامري ﴾ موسا فەرموی: دوایی ئەم کارەی تۆ شتیکە و چ شتی پالی بەتۆوە ناوە ئەم کـارە خراپـە بکـەیی وبەنوئیسـرائیلیەکان پارچـە پارچـە بکـەی، ئـەی سامیری. سامیری دەستی کرد بە فروفیل و درۆ هەلبەستنی بی بنچینە .

﴿ قال بصرت بما لم یبصروا به ﴾ سامیری بە موسای ووت: من شتیکم بینی بو بـەنو ئیسرائیلیەکان ئەو شتەیان نەدیبو، ئەو شتەیش ئەوەیە ئـەو کەسـەی ئـەهات بـۆ لای تـۆ چاوم کەوت بەوجیگەدا ئەو ئەچو بەسەریاگیای لی ئەروا و سەوز هەلئەگەرا .

﴿ فقبضت قبضة من أثر الرسول فنبذتها و کذلك سولت لي نفسي ﴾ دوایی من هەلم گرت مشتی لـە پاش ماوەی ئەو خاکەی ئەو نیردراوە بەسەریا ئەرۆیشت، دوایی من ئــەو خاکەم فرەدایە ناو ئەو گویرەکەیە لــەزیرو زیـوی تـواوە بـەجۆریکی هونـەری دروسـتم کردبوو هەر بەوجۆرەی خۆم رازاندمەوە پیم خۆشبوو ئەو گویرەکەیە دروست بو .

زانایان بیرو بۆچونیــان جیــاوازە: هــەندیکیان ئــەلین: مەبەســت بــەو نــیرراوەی ئــیرە جبرەئیلـە و مەبەست لـە پاشماوەکەیش ئەو خاکەیە جبرەئیل پیی پیدا ئــەنا، هــەندی تریــان ئەلین: مەبەست لـە نیرراوەکە موسایەو پاش ماوەکەیشی بریتیە لــە یاســاو ئــایینی موســا، هەندی ترتیان ئــەلین: ســامیری درۆی ئــەکرد هیــچ شــتیکی نــەبینیبوو هیــچ شتیکیشــی هەلنەگرتبوو، ئەیەویست لـەوخراپەی خۆیە رابکا، زانایــان لایــان وایــە ئــەم بیروبۆچونــە دوایی نزیکترە وەچینە میشکەوە زۆربەی زانایــان لایــان وایــە مانــای یەکــەمیان راســتە .
هــەرچۆنی بــی مانــای دەرکــەوتووی قورئــانی پــیرۆزە ئــەوەمان فیرئــەکا کــە ســـامیری بەنوئسرائیلیەکانی گومراکرد بــە پەرســتنی گویرکەەیــە وە بــەلام چ شــتی کــردی ئیمــە داوامان لی ناکری بزانین و پەیوەندی بە بیرو باوەری ژیانی ئیمەوە نیە .

بۆ زانین: لـەمەوبەر باسی ئەوەمان کرد کــە مەبەســت لــە نیراوەکــە موســایە وپــاش ماوەکەیشی ئایین وياسای موسایە، بەگویرەی ئەو بیروبۆچونە مانای ئەو رستانە بەم جۆرە ئەکری. من دوایی هەندی لـە ئایین وپاشماوەی یاسای نۆم هەلگرتبوو، دوایی من کــەزانیم ئایینی تۆ راست نیە وازم لی هینا و گەرامەوە بۆلای گویرەکە پەرســتی خــۆم و دەروونــی خۆم وای پی چاکبوو وام رازاندبوەوە بۆ خۆم .

﴿ قال فأذهب فأن لك في الحياة أن تقول لامساس ﴾ .موسا بەسامیری ووت : دوایی تۆ برۆو لـەم ناوەدا مەمینی. دوایی بۆتۆ هەبی لـەم ژیانەی جیهاندا کــە تــۆ بلــی بەکەســی بەکاری تۆ نەزانی: کەس دەست لـەمن نەداو دەست لـەکەس نادەم، پاداشتی تۆ لـەجیهاندا دەرکردن و کەنارە گیری لـە ئادەمیزاد، تیکەلاوی کەس نەکەیی و کــەس تیکــەلاوی تــۆ نەکا و گفتوگۆو مامەلـەت لـەگل نەکری و لـەگەلـت نەژین .

دوای ئەوەوی موسا فەرمانی دا بەدانیشتوان هیچ کەســی تیکــەلاوی ســامیری نــەکا، سامیری ژیانی خۆی لـە چۆلـەوانی ولـە نیو گیانادارانی کیویــدا بردەســەر زۆربــە ســەختی وکولـەمەرگی و سزای ئەوبو لـەجیهاندا .

﴿ و أن لك موعدا لن تخلفه ﴾ وە بەراستی بۆ تۆیش ئەبی لەپاشەرۆژدا سزایەکی زۆر سەخت وگرانتر تۆ ناتوانی لەدەستی راکەیی و لە تۆ تیپەرناکا، پرسیاری ئەم خراپە لـەتۆ ئەکری و سزای تۆ ئەدری بەسزایەکی ئیش دارو بەئاگری دۆزەخ .

﴿ و انظ ر إلى إلهك الذي ظلت عليه عاكفا لنخرقنه ثم لننسفنه في اليم نسفا ﴾ وەتۆ ئەی سامیری تەماشای لای خوایەکی ئەوتۆی خۆت بکە تـۆ لـەسـەر پەرستنی وەستاوی بەراستی بەئاگر ئەیسوتینم لەپاشا خۆلـەکەی فرەئەدەمە ناودەریاوە بەفریدانی هیچ شـتیك لی نەبینری، ئائەوەیە کۆتای هەموو شتیکی پروپوچ وفیلاوی ورسوایی وبی نرخیە .

دوای ئەوەی لـەکاری سامیری بویەوەو هۆی کردەوە بۆ لای باسی ئاین و پەرستراوی راست و دروست. لـەو بارەوە فەرموی:

﴿ إنما إلهكم الله الذي لا إله إلا هو وسع كـل شيء علما ﴾ بەراستی پەرستراوی راستی ئیوە خوایەکی ئەوتۆیە بە هیچ خوایە شایستەی پەرستنی بۆ نیە مەگەر هـەر خوایە خاوەنی توانایە بەجۆری ئـەزانی بەهەمووشـتی دروسـتبی بناسـری نـەك ئـەو گویرەکەیـە دروست کرابی و بسوتینری. خۆ ئەگەر زیندوش بی خۆی لەخۆیا بی ئاگایە و بی وینەیـە لەگیلیدا .

کۆتایی بەمانای ئەم ئایەتە ئـەهینین بەفـەرمودەی پیشـەوا رازی بەمـەی خـوارەوە کـە ئەلی:

(ئـەبو قـاسمی ئەنسـاری ئـەلی: جادوگـەرە بـت پەرسـتەکان، کـاتی تەنـها کـاریکی پەکخـەریان بینـی لـەداردەسـتی موسـا بـو بـەماریك باوەریـان بـەخواو بەموسـا هینـا و لـەبەرئەوەی بروایان بەباوەرهینانی خۆیان هەبوو ئەوسزا سەختانەی فیرعەونیان هـەلگرت و لـەباوەری خۆیان نەگەرانەوە. بەلام بەنو ئیسرائیلیەکان ئەو کارە پەکخەرانەیان بینـی و چاویان کەوت بەوەی جادوگەران باوەریان هینا بەموسا، دوایـی نـۆ کـاری پەکخـەریان بەموساوە بینی بوو، بەچاوی خۆیان بینیان دەریای سوور لە یەك بچراو هەر هـۆزی لـەو دوازدە هۆزە ریگەی تایبەتیان خۆیانیان بۆ دیاری کراو چاویان بەفیرعەون کەوت لەگـەل

دوژمنانی تریانا خنکان، کەچی کاتی لــەدەریا پەرینــەوە کۆمــەلیکیان بینــی گویرەکــەیان ئەپەرست بەموسایان ووت: تۆیش خوایەکی بەم جۆرە بۆ ئیمە دروست بکە، بۆیە کــاتی گویرەکە دروست کراوەکەی سامیریان بینی کوتوپر دەستیان بەپەرستنی کرد .

كَذَٰلِكَ نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنۢبَآءِ مَا قَدْ سَبَقَ ۚ وَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ مِن لَّدُنَّا ذِكْرًا ﴿٩٩﴾ مَّنْ أَعْرَضَ عَنْهُ فَإِنَّهُۥ يَحْمِلُ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ وِزْرًا ﴿١٠٠﴾ خَٰلِدِينَ فِيهِ ۖ وَسَآءَ لَهُمْ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ حِمْلًا ﴿١٠١﴾ يَوْمَ يُنفَخُ فِى ٱلصُّورِ ۚ وَنَحْشُرُ ٱلْمُجْرِمِينَ يَوْمَئِذٍ زُرْقًا ﴿١٠٢﴾ يَتَخَٰفَتُونَ بَيْنَهُمْ إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا عَشْرًا ﴿١٠٣﴾ نَّحْنُ أَعْلَمُ بِمَا يَقُولُونَ إِذْ يَقُولُ أَمْثَلُهُمْ طَرِيقَةً إِن لَّبِثْتُمْ إِلَّا يَوْمًا ﴿١٠٤﴾ وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْجِبَالِ فَقُلْ يَنسِفُهَا رَبِّى نَسْفًا ﴿١٠٥﴾ فَيَذَرُهَا قَاعًا صَفْصَفًا ﴿١٠٦﴾ لَّا تَرَىٰ فِيهَا عِوَجًا وَلَآ أَمْتًا ﴿١٠٧﴾ يَوْمَئِذٍ يَتَّبِعُونَ ٱلدَّاعِىَ لَا عِوَجَ لَهُۥ ۖ وَخَشَعَتِ ٱلْأَصْوَاتُ لِلرَّحْمَٰنِ فَلَا تَسْمَعُ إِلَّا هَمْسًا ﴿١٠٨﴾ يَوْمَئِذٍ لَّا تَنفَعُ ٱلشَّفَٰعَةُ إِلَّا مَنْ أَذِنَ لَهُ ٱلرَّحْمَٰنُ وَرَضِىَ لَهُۥ قَوْلًا ﴿١٠٩﴾ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ وَلَا يُحِيطُونَ بِهِۦ عِلْمًا ﴿١١٠﴾ ۩ وَعَنَتِ ٱلْوُجُوهُ لِلْحَىِّ ٱلْقَيُّومِ ۖ وَقَدْ خَابَ مَنْ

حَمَلَ ظُلۡمٗا (١١١) وَمَن يَعۡمَلۡ مِنَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ وَهُوَ مُؤۡمِنٞ فَلَا يَخَافُ ظُلۡمٗا وَلَا هَضۡمٗا (١١٢)

﴿كذلك نقص عليك من أنباء ماقد سبق ﴾ بەو جـۆرەی باسـی بەسـەرهاتی موسـامان بۆکردی ئیمە ئەیخوینینەوە بەسەر تۆدا هەندێ لەهەوالـەکانی نەتـەوەکانی رابـوردو بـەو جۆرەی تۆ بیستوتەو تەمێ‌کردن و پەندن بۆ ئادەمیزاد، لەهەمان کاتـا بەڵگەشـن لـەسـەر راستی تۆو لـەسەر پیغەمبەرایەتی تۆو نهینی بوون لای‌تۆ .

﴿ وقد آتيناك من لدنا ذكرا ﴾ وەبەراسـتی ئیمـە بەخشیومانە بـەتۆ لـەلایـەن ئیمـەوە ەقورئان کەهۆی سەربەرزی تۆیە. قورئان ناوبراوە بەزیکرباسی خواو هەوالی پیغەمبـەران و رۆژی دوایی‌و باوەرهینان و چاکەو خراپەو ئەو شنتانەی رەوان و ئەو شتانەی قەدەغەن و باسی دروست کردنی ئاسمانەکان و زەوی‌و شتی تری تیدایە .

﴿ من أعرض عنه فانه يحمل يوم القيامة وزرا ﴾ وەهەر کەسێ وازی لـەقورئان هینابـێ و بروای بەقورئان نەبوبێ‌و کـاری بـەناوەرۆکی نـەکردبێ، دوایـی بەراسـتی ئـەو کەسـە سزایەکی قورس هەلئەگرێ بۆ رۆژی دوایی‌و باری خۆی قـورس کـردوە بەسـزای رۆژی دوایی. لەمانای ئایەتی (١٢٤) ی ئـەم سـورەتەدا نـاوەرۆکی مانـای ئـەم ئایەتـە دوبـارە ئەکریتەوە .

﴿ خالدين فيه وساء لهم يوم القيامة حملا ﴾ بەردەوامن لـەنیو ئەو سزایەداو لـە نیو ئەو بارە گرانەداو، خراپ شتیکە هەلیان گرتوە لـەگوناه لـەرۆژی دوایدا .

﴿ يوم ينفخ في الصور ﴾ رۆژی دوایی رۆژیکـە فوئـەکرێ بەسـوردا. ووشـەی سـور هیمایە لـەزیندوبونەوەی مردوان لـەگۆرەکانیانا کاتێ ئیسرافیل فوئـەکا بەسـوردا، زانایـان ئەلین: سور بریتیە لـەکەرەنایە فوی پیدا ئـەکرێ هـەتا ئـادەمیزاد ئامـادەبن بۆکۆبونـەوە، وینەی فوکردن بەکەرەنای سەربازیدا هەتا ئامادەبن بۆرۆیشتنیان بۆگۆرەپانی مەشق .

﴿ ونحشر المجرمين يومئذ زرقا ﴾ وەئيمە لـەو رۆژەدا تاوانباران كۆئەكەينـەوە بەكويرىو روى رەش و بەتينويى. ئەبو حەيانى ئەندەلوسى لـەتەفسيرى (بحرالمحيط) ى خۆيا ئەفەرموێ (مەبەست لـە (زەرق) چاوى شينە كەخراپ ترينى رەنگە لاى عەرەب، چونكـە رۆمەكان دوژمنى ئەوانن و چاويان شينە) واديارە ئەبو حەيان كاتێ ماناى ئـەو ووشـەيەى كردوە نزيكبوە لـەجەنگى سەليبيەكانەوە .

﴿ يتخافتون بينهم إن لبثتم إلا عشرا ﴾ تاوانباران دەست ئەكەن بەراويژكردن لـەنيوان يەكتريدا بەنزمى گفتوگۆ ئەكەن لـەرۆژى دواييدا: لـەجيـهاندا دانەنيشـتون مەگـەر (١٠) شەو يا كەمتر .

ئەبێ بزانرێ: ووشەى (عشرا)، ووشەى (يوما) لـەم سورەتەدا، ووشەى (يوما أو بعض يوم) لـەئايەتى (١٩) ى سـورەتى ئەلكـەهف. ووشـەى (غير ساعة) لـەئايـەتى (٥٥) ى سورەتى رومدا. ووشەى (إلا قليلا) لـەئليەتى (٥٢)ى سـورەتى ئەلئيسـرائيلدا. هـەمويان هيمان لـەماوەيەكى كەم .

﴿ نحن أعلم بما يقولون إذ يقول أمثلهم طريقة إن لبثتم إلا يوما ﴾ ئيمـە زانـاترين بەشتى تاوانباران ئەيلێين كاتێ بەريزترين و گەورەترينى ئەو تاوانبارانە لـەلايەن گفتوگـۆوە ئەيووت: ئيوە دانەنيشتون لـەجيهاندا مەگەر تەنها يەك رۆژ، ئەو ژيانەتان خەويكبو بينيتان، ئيستا لـەژيانى تردان كۆتاى پينايەت .

﴿ ويسألونك عن الجبال فقل ينسفها ربى نفسا ﴾ وەتاوانبـاران پرسـيار ئەكـەن لـەتۆ لـەكيوەكان چ شـتيكيان پـێدێ لـەرۆژى دوايـيـدا، دوايـى تـۆ وەڵامـيـان بـدەرەوە: پەروەردگارى من ئەوكيوانە وورد ئەكاو ئەيانكا بەتۆز بەجۆرە ووردبونێ باليى ئەداو ئەييا بەئاسماناو جيگەكەيان بەچۆلى ئەميتيەوە .

﴿ فذرها قاعا صفصفا لاترى فيها عوجا ولا أمنا ﴾ دوايى پەروەردگارى مـن جيگـەى ئەوكيوانە بەجى ئەهيلێ بەزەويەكى لوس و تەخت بەجۆرێ تۆنابينى لـەسەر ئەو زەويـەدا نزمى و بەرزى .

﴿ یومئذ یتبعون الداعی لاعوج لـه ﴾ لـەو رۆژەدا ئـادەمیزاد دوای بـانگی کەسـیکی ئەوتۆ ئەکەون بانگیان ئەکا بۆجیگەی وەستانی پرسیارو وولاّم، ئەوکەسەیش ئیسـرافیلە، سەرپیچی کردن و نەرۆیشتن بۆئەوان نیە بـەگورجی و بەپەلـە وولاّمـی ئەدەنـەوە، هیچ کەسێ ناتوانێ نەروا .

﴿ وخشخت الأصوات للرحمان فلا تسـمع إلا همسـا ﴾ وەخـاوەن دەنگـەکان لاوازو سەرشۆرن لـەبەر سام و گەورەیی خوای خاوەن بەخشندە، دوایی تۆ هیـچ شتێ نابیستی مەگەر دەنگیکی نزم، ئەوەیش بەلـگەیە لـەسەر بچوکیو بێ دەسەلاّتی ئەوان.

﴿ یومئذ لاتنفع الشفاعة إلا من أذن له الرحمان ورضی له قولا ﴾ لەو رۆژەدا پارانـــەوە لـەهیچ کەسیکەوە سودی نیە مەگەر بۆکەسێ خوای خاوەن بەحشـنـدە دەستوری پـێبدا بپاریتەوەو رازی بێ ئەوکەسە گفتوگۆبکاو بپاریتەوە، ئەو ئایەتە بەلـگەیـە لـەسـەر ئـەوەی ئەوکەسە ئەبێ باوەرداربی، چونکە خوا هەر لـەباوەرداران رازیە ئەو رۆژە .

﴿ یعلم مابین أیدیهم وما خلفهم ولا یحیطون به علما ﴾ خوا ئەزانێ بەشتێ کردویانەو بەشتێ لـەمەودوا بەرەو رویان دێ و ئەیکەن و زانینی ئادەمیزاد ناتوانێ زانراوەکانی بزانـێ و ئەقلیان کورتەو نازانن چ شتیکیان کردوەو چ شتێ ئەکەن .

﴿ و عنت الوجوه للحي القیوم ﴾ وە خاوەن روەکان سـەری خۆیـان دائەنـەوینن بـۆ خوایەکی هەمیشە زیندوو بەریوەبـەری هەمووشـتی و بەسـەریانەوە وەسـتاوەو ئاگـاداری کردەوەیانە، ئادەمیزاد لـەو رۆژەدا رومەتیان تیك ئەچی لـەبـەردەم خـوادا وینـەی کەسـی بەدیل گیرابی وکۆت و پیون کرابی و بەرەو دادگا ببری .

﴿ وقد خاب من حمل ظلما ﴾ وە بەراستی رسواو بی بەهرەیە کەسـی هـەلی گرتبـی ستەم کردن و بی باوەری و گوناە و بی فەرمانی خوا، دەست دریژی کردبیتەسەر ریـز و سەربەستی ئادەمیزاد، ئەو کەسەی قازانج بکا لـەخزمەت خوادا کەسیکە چاکەی کردبـی لـەگەل ئادەمیزادا لـەبەر خواو مرۆڤایەتی .

﴿ ومن يعمل من الصالحات وهو مؤمن فلا يخاف ظلما ولا هضما ﴾ وە هـەر کەسـی هەندی لەکارە چاکەکان بکا و ئەو کەسە باوەرداربی دوایی ئەو کەسە ناترســی لــەوەی ستەمی لی بکری و پاداشتی شایستەی خۆی نەدریتی و ناترسی لەوەیش پاداشتەکەی کـەم بکریتەوە، ئەبی بزانری باوەرهینان مەرجە بۆ وەرگرتنی پەرستن و چاکە کردن .

وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَٰهُ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا وَصَرَّفْنَا فِيهِ مِنَ ٱلْوَعِيدِ لَعَلَّهُمْ يَتَّقُونَ أَوْ يُحْدِثُ لَهُمْ ذِكْرًا ﴿١١٣﴾ فَتَعَٰلَى ٱللَّهُ ٱلْمَلِكُ ٱلْحَقُّ وَلَا تَعْجَلْ بِٱلْقُرْءَانِ مِن قَبْلِ أَن يُقْضَىٰٓ إِلَيْكَ وَحْيُهُۥ وَقُل رَّبِّ زِدْنِى عِلْمًا ﴿١١٤﴾ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴿١١٥﴾ وَإِذْ قُلْنَا لِلْمَلَٰٓئِكَةِ ٱسْجُدُوا۟ لِءَادَمَ فَسَجَدُوٓا۟ إِلَّآ إِبْلِيسَ أَبَىٰ ﴿١١٦﴾ فَقُلْنَا يَٰٓـَٔادَمُ إِنَّ هَٰذَا عَدُوٌّ لَّكَ وَلِزَوْجِكَ فَلَا يُخْرِجَنَّكُمَا مِنَ ٱلْجَنَّةِ فَتَشْقَىٰٓ ﴿١١٧﴾ إِنَّ لَكَ أَلَّا تَجُوعَ فِيهَا وَلَا تَعْرَىٰ ﴿١١٨﴾ وَأَنَّكَ لَا تَظْمَؤُا۟ فِيهَا وَلَا تَضْحَىٰ ﴿١١٩﴾ فَوَسْوَسَ إِلَيْهِ ٱلشَّيْطَٰنُ قَالَ يَٰٓـَٔادَمُ هَلْ أَدُلُّكَ عَلَىٰ شَجَرَةِ ٱلْخُلْدِ وَمُلْكٍ لَّا يَبْلَىٰ ﴿١٢٠﴾ فَأَكَلَا مِنْهَا فَبَدَتْ لَهُمَا سَوْءَٰتُهُمَا وَطَفِقَا

يَخْصِفَانِ عَلَيْهِمَا مِن وَرَقِ ٱلْجَنَّةِ ۚ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴿١٢٢﴾

﴿ و كذلك أنزلناه قرآنا عربيا وصرفنا فيه من الوعيد لعلهم يتقون ﴾ وەهەر بـەوجۆرە باسمان کرد لـەوئايەتانەدا باسی هەرەشەو مژدە دانیان تیدابوو: ئیمە ناردومانەتە خـوارەوە قورئانی بەزمانی عەرەبی، هەتا عەرەبەکان تیبگەن لـەناوەرۆکی ئەو قورئانە وئیمە رونمـان کردووەتەوە لـە نیو ئەو قورئانەدا هەندی لـە هەرەشــەکان، بـۆ ئـەوەی لــەخوا بترسـن و خۆیان بپاریزن لـەبی فەرمانی خوا، بترسن لـەوەی سزا خوا برژی بەسەریانا بەوینــەی ئـەو سزایانە خوا رژاندی بەسەر گەلانی رابوردودا. لـەئایەتی (٢) ی سورەتی یوسوفدا وەلامی ئە وپرسیارە دراوە بۆچی قورئان بـەزمانی عـەرەبی هاتوەتـە خـوارەوە لـەگـەل ئەوەیشـدا پیغەمەر نیرراوە بۆ سەر دانیشتوانی هەمو روی زەوی .

﴿ أو يحدث لهم ذكرا ﴾ یا ئەو قورئانە پەیدا بکا بۆیان وەرگرتنی ئامۆژگـاری وببـی بەهۆی تەمی کردنیان کاتی ئـەو قورئانـە ئەبیسـن پشیمان بنـەوە لــەبی بـاوەری و بیر لـەگوناهی خۆیان بکەنەوە .

بۆ زانین: خوای مەزن لـەقورئانی پیرۆزدا بەم شیوانەی خوارەوە باسی قورئانی فەرموە: (العربي) یانی بەزمانی عەرەبی هاتوەتە خوارەوە. (الذکـر) یـانی ئامۆژگـاری کـردن (النور) یانی روناکی ریگەی راست (القول الفصل) یانی فەرمودەیە چاك و خـراپ جـوی ئەکاتەوە (الهدی) یانی شارەزایی کەری ئـادەمیزاد و جنۆکـە (الحکیـم) یـانی هەمووشـتی لـەجیگەی شیاوی خۆیا دائەنی. (المجید) یانی بەریز و گەورە (الروح) یـانی سروشـی خـوا (الحق) راست و بیگومان (النبأ العظیم) یانی هەوالیکی گەورە (الشفاء) رزگـاری کـەری بـاوەرداران، (الرحمة)خۆشـی بـاوەرداران (الـتنزیل) رەوانـەکردنی خـوا (البشیر النذیـر) مژدەدەرو ترسینەر (العزیز) گەورەو بەدەسەلات (الغظیم) زۆرگەورە (المبـین) یـانی رون

کەردوە. بەکورتی ئەو شیوانە ئاماژە بۆ ئەوە ئەکەن خوای مەزن قورانــی نـاردوە بۆســەر پیغەمەر بۆ شارەزایی کردن و بۆ بەختیاری و ئاسایشی ئادەمیزاد .

﴿ فتعالى الله الملك الحق ﴾ دوایی خوایە کەپاشاو خاوەنی راســتی هــەمو بونەوەرانــە دورو پاك و خاوینە لـەوەی بت پەرستان و بی ئایینان ئەیلین کــە خــوا منـال و هاوبەشـی هەیە، هەر خوا جیگەی هیواو ئومیدی بونەوەرانەو هەرئەو شایســتەی پەرستنە بەراسـتی وبەبی گومان. کاتی خوای مەزن باسی ریزو گەورەیی قورئانی فەرمو فەرمان بــە پیغەمــەر ئەدا خۆی مــاندو نــەکا بـۆ لـەبـەرکردنی قورئــان ووابزانــی قورئــانی لــەبیر ئەچیتــەوەو ئەفەرموی:

﴿ ولا تجعل بالقرآن من قبل أن يقضي إليك وحيه وقل رب زدني علما ﴾ وەتــۆ پەلــە مەکە لـەخویندنەوەی قورئاندا وبۆ لـەبەرکردنی کاتی دیتە خــوارەوە بـۆ لای تـۆ لــەپیش ئەوەی کۆتایی بە سروشی ئەو قورئانە بهینری، گوی‌ی لی بگرە و دلنیابە هیچ شــتی لــەو قورئانە لـەبیری تۆ ناچیتەوەو تۆ بلی: ئەی پەروەردگاری من تۆ زانست و زانیاری بۆ مــن زۆربکە بەجۆری سودبەخش بی بۆ بونەوەرانی خۆت .

بۆ ئاگاداری: هەموو بیروباوەر و دەســتور و یاســایە هــەن لــەروی زەویـدا لای خـوا نرخیان بۆ دانــانری مەگــەر ببنــە هــۆی خــۆش گوزەرانــی و ئاســایش وســەرفرازی بـۆ دانیشتوان بەبی گیروگرفت، ئەوەی رون وئاشکرایە خۆشی پاشە رۆژ لای خــوای مــەزن بەستراوە بەکردەوەی چاکی چاکەکەرانــەوەو بەباوەرهینانیانــەوە بەســود بەخشــینیان بــە ئادەمیزاد. بەگویرەی کردەوەی خۆیان پاداشتیان ئەدریتەوە .

﴿ و لقد عهدنا إلى آدم من قبل فنسي ولم تجد له عزما ﴾ وە ئیمە ســروشمان نــاردبو بۆلای ئادەم لـەپیش ئەو کەسانەی ئەوتۆ ئیستا پەیمان و فەرمانی خوایان شکاندوە کە ئادەم نزیکی ئەو درەختە نەبیتەوەو لـەبەرەکەی نەخوا، دوایی ئادەم دژی فەرمانی ئیمە هەلسا و ئیمە دەستمان نەکەوت لـەئادەمەوە نزیك نەبونەوەی لـەو درەختە و بەردەوام بــی لـەســەر فەرمانی ئیمە ، ئەگەر خــۆی بگرتایــە شــەیتان نــەی ئــەتوانی بیخەلــەتینی ودوایــی وازی لـەبەلینی ئەهینا.

﴿ و إذا قلنا للملائكة اسجدوا لآدم فسجدوا إلا إبليس أبى ﴾ وە تۆ بـیری ئـەو کاتـە بکەرەوە ئیمە ووتمان بەفریشتەکان: ئیوە ســوژدە بـەن بۆئـادەم و ریـزی بگـرن، دوایـی فریشتەکان هەموویان کرنوشیان برد بۆ ئادەم جگەی ئیبلس کورنوشی نەبرد بـۆ ئـادەم و بی فەرمانی خوای دەرخست وئاشکرای کرد .

﴿ فقلنا یا آدم إن هذا عدو لك و لزوجك فلا یخرجنکما من الجنة فتسعی ﴾ دوایـی ووتمان ئەی ئادەم: بەراستی ئەم ئیبلیسە دوژمنی تۆو ژنەکەی تۆیە، ئەوەبو کورنوشـی بـۆ نەبردی و هەرگیز بەختیاری ئیوەی ناوی و شتی چاکیشتان پی نالی، دوایی ئیبلیس ئیـوە دەرنەکا لـە بەهەشت، دوایی تۆ بەهۆی دەرکردنەوە تووشی ئازارو رەنج و دەردی سەری ببی بەهۆی گەرانتان بەدوای هۆی ژیان و گوزەرانتان لـەجیهاندا .

﴿ إن لك أن لاتجوع فیها ولا تعری ﴾ بەراستی بۆ تۆ هەیە کەبرسیت نەبی لـەنیو ئەو بەهەشتەدا و هەمو خواردەمەنیە بۆ تۆ ئامادەکراوەو روتال نابی و بـەرگ و پۆشـاکت بـۆ ئامادکراوە لـەهەمو رویکەوە خۆش گوزەرانیت بۆ ساختە هاتوە .

﴿ و إنك لاتظمأ فیها ولا تضحی ﴾ وە بەراستی تۆ لـەنیو ئەو بەهەشتەدا تینوت نـابی، کانیاو سەرچاوەو روباری زۆری تیدایە وتۆ تووشی گەرما نابی وگەرمایی خـۆر ئـازارت نادا وچونکە لـەبەهەشتا خۆر نیــەو دانیشـتون لــەنیو سـیبەری بـەردەوامدان، بەتایبـەتی لـەکاتی چیشتەنگاودا کەکاتی گەرمای سەختە تۆ هەست بەگەرما ناکەی .

خوای مەزن ئادەم ئەترسینی لـە گومان پەیدا کردنی شەیتان و ئەفەرموی: تـۆ لــەنیوان دووکار دای: یا ئەبی پەیرەوی فەرمانی من بکەی و بی فـەرمانی شـەیتان بکـەی، دوایـی پاداشتی تۆ ئەو بەهەشتەیە باسـی کـرا، هـەموو خۆشـیەکی تیدایـە. نەبرسـیتی نـەتینویتی ونەروتی و نەنەخۆشی و نەئازار و نە خەفەت نەمردن ونەفرمیسك ونەگەرما و نەسەرمای تیدا نیە، پرە لـە ئاسایش و خۆشی .

یا ئەوەیە بی فەرمانی من بکـەی و پـەیرەوی شـەیتان بکـەی، ئـەو کاتـە لـەبەهەشت دەرئـەکریی بـۆ لای جیـهانی پرئـازار و خراپـەکاری و نەخۆشـی، دوایـی ئـادەم ئــەو

هەرەشانەی لەبیری خۆی بردەوەو ئازارو ناخۆشی کەلەکەی کرد لەسەر خۆی و منـال و ژنەکەی هەر لەکاتی دەرکردنی لەبەهەشت و کوشتنی قابیل هابیل هەتا کۆتایی جیـهان . دور نیە کە دەرکردنی ئادەم لەبەهەشتا پەند وئامۆژگاری بی بۆ کەسـی دوای ئـارەزووی خراپی خۆی بکەوی و بەراستی پاداشتی سزا و رسوایی لای خوای مەزنە .

﴿ فوسوس إليه الشيطان قال يا آدم هل أدلك على شجرة الخلد و مـلـك لا تبلـى ﴾ دوایی شەیتان گومان و پەژارەی فریدا بۆ لای دەرونی ئادەم ووتی: ئەی ئـادەم: بەراسـتی من ئاگادری تۆ ئەکەم لەسەر درەختی هەرکەسی لەو درەختە بخـوا هـەتا هەتایـە پایـەدار ئەبی و نامری و ئاگاداریشت ئەکەم لە سـامان و دارایـیە هـەر نـەمان روی تـی نـەکا و کۆتایی پی نەیە. ئادەم وژنەکەی بە گفتوگـۆی شـەیتان خەلـەتان و ئامۆژگـاری خوایـان لەبیری خۆیان بدرەوەو بی فەرمانی خوایان کرد .

﴿ فأكلا منها فبدت لها سوآتهما وطفقا يخصفان مـن ورقـي الجنـة و عصـى آدم ربـه فغوى﴾ دوایی ئادەم و ژنەکــەی لەو درەختـەیان خـوارد و دوای خواردنـی ئەودرەختـە شەرمگە و شورەییەکانیان دەرکەوت و بەرگی بەهەشتیان لەبەرداکەنرا و روت کرانەوەو هەموو لەشیان دەرکەوت و لەشەرمەزاریدا دەستیان کرد بــە دارنینـی گـەلای درەختـی بەهەشت و ئەیان پیچا بەلەشی خۆیانەوەو ئادەم بی فەرمانی پـەروەردگاری خـۆی کـرد، دوایـی ئـادەم وازی لەریگـەی راسـتی خـوای مـەزن هینـا، بەسـەرهاتی ئـادەم و حـەوا ئامۆژگاری کردن و تەمی کردنەبۆ هەموو ئادەمیزادی کــە هــەر کەسـی دوای هەوەسـی خۆی بکەوی پاشەرۆژی وەك پاشەرۆژی ئادەم و حەوایە.

﴿ ثم اجتباه ربه فتاب عليه وهدى ﴾ لەپاشا پەروەردگاری ئادەم بە میهرەبانی خــۆی ئادەمی هەلبژارد و لەبەزەیی نزیکی کردەوە، پەشـیمان بویـەوە لــە بـی فـەرمانی خـوای مەزن، دوایی خوای مەزن پەشیمان بونەوەکــەی وەرگرتـو خـوای مـەزن ریگـە غومـایی ئادەمی کرد و بەردەوامی کرد لەسەر پەشیمان بونەوە .

زانایان بیرو بۆچونیان لــەبارەی گونـاهی پیغەمەرانـەوە جیـاوازی زۆریـان هەیـە: ئایـا پیغەمەران بی بـاوەری دەرئـەبرن و درۆ ئەکـەن و بـەدرۆوە وەلامـی پرسیار ئەدەنـەوە،

لەوەلامدا ئەبیژری ئەوانە هەمویان لە پیغەمەرانەوە نەبوەو پەیدایش نابی هەر ەلەسەرتای بونیانەوە هەتا کاتی مردنیان. ئایا پیغەمەران گوناهی گەورە و گوناهی بچوکیان کردوە بەر لە بالغ بونیان، بەر لەبونیان بە پیغەمەر و دوای بونیان بە پیغەمەر. لەوەلامی ئەو پرسیارانەدا بۆچوونی جیاواز هەیە، ئەو وەلامەی شایانی پلەوپایەو ریز و متمانەی پیغەمەران بی ئەوەیە: بەر لەبالغ بونیان گوناهی گەورەیان نەکردوەو گوناهیکی بچووکی وایان نەکردوە دژی پیاوەتی بێ. بیگومان دوای بونیان نەگوناهی گەورەو نەگوناهی بچوکیان نەکردوە لەجیهاندا. کەواتە گوناهکردنی ئادەم بەر لەوەبوە بکری بە پیغەمەر لەبەهەشتا بوەو لەجیهاندا نەبوە، لەدوای هاتنی بۆ سەر زەوی هیچ جۆرە گوناهیکی نەکردوە، بەلام هەرچۆنی بی ئادەم پەشیمان بوەتەوەو داوای لی بوردنی لەخوای مەزن کردو خوای گەورەیش لیی خۆشبوو، خوایش لەهەمو کەس زاناترە .

قَالَ ٱهْبِطَا مِنْهَا جَمِيعًۢا ۖ بَعْضُكُمْ لِبَعْضٍ عَدُوٌّ ۖ فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّى هُدًى فَمَنِ ٱتَّبَعَ هُدَاىَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِى فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا وَنَحْشُرُهُۥ يَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ أَعْمَىٰ ﴿١٢٤﴾ قَالَ رَبِّ لِمَ حَشَرْتَنِىٓ أَعْمَىٰ وَقَدْ كُنتُ بَصِيرًا ﴿١٢٥﴾ قَالَ كَذَٰلِكَ أَتَتْكَ ءَايَٰتُنَا فَنَسِيتَهَا ۖ وَكَذَٰلِكَ ٱلْيَوْمَ تُنسَىٰ ﴿١٢٦﴾ وَكَذَٰلِكَ نَجْزِى مَنْ أَسْرَفَ وَلَمْ يُؤْمِنۢ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِۦ ۚ وَلَعَذَابُ ٱلْءَاخِرَةِ أَشَدُّ وَأَبْقَىٰٓ ﴿١٢٧﴾ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ ٱلْقُرُونِ يَمْشُونَ

فِي مَسَٰكِنِهِمۡۚ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَأٓيَٰتٖ لِّأُوْلِي ٱلنُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ وَلَوۡلَا كَلِمَةٞ سَبَقَتۡ مِن رَّبِّكَ لَكَانَ لِزَامٗا وَأَجَلٞ مُّسَمّٗى ﴿١٢٩﴾

﴿ قال اهبطا منها جميعا بعضكم لبعض عدو ﴾ خوا فەرموی بەئادەم و بەحــەوا، ئیــوە هەردووکتان بچنە خوارەوە لەبەهەشت بۆ سەرزەوی هەمووتان، هەندی لــەئیوە دوژمنــی هەندی ترتانن، یانی هەندی لەمنالەکانی ئــادەم دوژمنــی هــەندی لەمنالــەکانی شــەیتان، هەندی لەمنالەکانی ئادەم دوژمنی هەندی لە منالکانی تری تۆن لەسەر کاروباری جیهان و ژیانی جیهانیان و لەسەر بیرو باوەریان .

﴿ فأما يأتينكم مني هدى فمن تبع هدى فلا يضل ولا يشقى ﴾ دوایی ئەگەر هــات بــۆ لای ئیوە شارەزایی کەری من وەك قورئان و پیغەمەر بۆ بــەجی هینــانی فــەرمانی لەلایــەن منەوە، دوایی هەرکەسی دوای ئەو شارەزای کەرانەی من بکەوی و فــەرمانی مــن بــەجی بهینی، دوایی ئەو کەسە لەریگەی راســت لانــادا لەجیــهانداو رســوا و بــی بــەهرە نــابی لەرۆژی دواییدا وبەختیار ئەبی .

﴿ ومن أعرض عن ذكري فأن له معيشة ضنكا﴾ وە هەرکەسی واز لەیادو قورئانی من بهینی و باەرنەهینی و داوی نەکەوی وفەرمانبەرداری یاسای من نەبی، دوایی بەراستی بۆ ئەو کەســە هەیــە ژیــانی تــەنگ و تروســك، یــانی هــەموکاتی دلــی ناخۆشــەو ئەترســی لەکارەساتی کوتوپری و سامانەکەی لەناوبا، بەرچاوتەنگ و مشت قوچراوە، هەرچەندە دارایی زۆری هەبی هەردلی ناخۆشە، بەلام مرۆڤی هەژار و باوەردار بەبەشی خۆیقنیــات ئەکاو بەو بەشە دلشاد و خۆشنودە .

پرسیار/ دەرکەوتوی ئەو ئایەتە وائەگەیەنی خوا فەرمانی داوەو دیاری کردوە گوناهبار و بی باوەران لە تەنگی و ناخۆشی گوزەرانی کەمندا بژین، کەچی ئەبینری گوناهبــاران و بی باوەران پلەو پایە و داراییان هەموکاتی لەزۆریدایە ؟.

وەلام/ زانایان ئەلین مەبەست لەتەنگی و ناخۆشی لیرەدا دلەراوکیی دەرونەو جولانی دەرونە لەسەر ئـەو سـامانەو ئەترسـی لـەوەی کارەسـاتی کوتوپـری روبـدا و سـامان و پلەوپایەی نەمینی. دوای خۆشی ناخۆشی روی تی بکا. ئـەوەی شـایانی باسـبی ترسـان و دلەراوکی لەسەر نەمانی سامانی جیهان بۆ ئەوانە بی فـەرمانی خـوا ئەکـەن و ئەوانـەیش خوا پەرستن هەردووکیان ئەگریتەوە، چونکە سروشتی ئادەمیزاد کویرەو چـاك و خـراپ جوی ناکاتەوە، روداو و کارەسات بەزەیی بەچاك و خراپ و لاواز و بـەتوانادا نایەتـەوە وە موبالات بە پاشەرۆژی پیاو چاکان ناکا .

ئەوەیشی راستی بی هەژاری بەهۆی فـەرمانی زەوییـەوە پـەیدا ئـەبی نـەك بەفـەرمانی ئاسمان، بەزۆری هەژاری بەهۆی ستەم کردن و بـی دادیـی تاوانبـارانی کـار بەدەسـت و پیاوخراپانەوە پەیدا ئەبی، ئەگەر یاسای خوای مەزن بەرپا بکری هەژاری لـەروی زەویـدا پەیدا نەئەبوو ئادەمیزاد بەیەکسانی ئەژیان .

﴿ ونحشره يوم القيامة أعمى ﴾ وە ئیمە ئەو کەسەی روی وەرگـیراوە لـە راغویـی و ئایین ئیمە کۆی ئەکەینەوە بـەکویری لـەرۆژی دواییـدا، بـەکویری نیشـانی دانیشـتوانی ئەدەین. هەندی لەزانایان ئەلین: مەبەست لــەکویری بەلگەییـە، هـەندی تریـان ئـەلین: بیبەش بوونە لەبەهەشت. ئــەوەی راسـتی بـی مەبەسـت کویـری چـاوە، چونکـە خـوا ئەفەرموی:

﴿ قال رب لم حشرتني أعمى وقد كنت بصـيرا ﴾ ئـەو کەسـە کویـرە ئـەلی: ئـەی پەروەردگاری من: لەبەرچ شـتی تـۆ منـت کـۆ کردوەتـە بـەکویری لـەم رۆژەدا و مـن لەجیهاندا چاوم ئەی بینی .

﴿ قال كذلك أتتك آياتنا فنسيتها وكذلـك اليـوم تنسـى ﴾ پـەروەردگاری فـەرموی: هەربەوجۆرەی نیشانە ئاشکراکانی ئیمە هاتبون بۆ لای تۆ دوایی وازت لی هینـان و روت لی وەرچەرخاندن هەربەم جۆرەیش تۆ لــەم رۆژەدا وازت لی ئـەهینری لـەدۆزەخدا و بـی بەش ئەبی لەبەزەیی خوا .

﴿ وكذلك نجزي من أسرف ولم يؤمن بآيات ربه ﴾ وەهـەر بـەوجۆرەی تـۆ وازت لی هینراوە لـەدۆوەخدا هەروایش ئیمـە پاداشـت و سـزای کەسـی ئـەدەین لـەسـنوری خـوا دەرچوبی و هاوبەشی بۆ خوا دانابی و بـاوەری بەنیشـانە رونـەکانی پـەورەدگاری خـۆی نەهینابی .

﴿ ولعذاب الآخرة أشد وأبقى ﴾ وە بەراستی سزای پاشەرۆژ سـەختتر و بـەردەوامترە لەگوزەرانی کەم ولـەکویری هەرکاتی خرایە ناودۆزەخ کویریەکەی نامین هـەتا جیگـەی خرابی خۆی ببینی لـەسەر واز هینانی لـەنیشانە رونـەکان و لـەسـەر بـی باوەریەکـەی بـە پەرورەدگاری خۆی .

﴿ أفلم يهد لهم كم أهلكنا قبلهم من القـرون يمشـون فـي مسـاكنهم ﴾ ئایـا دوایـی پەوەردگاری دانیشتوانی مەککە رونی نەکردوەتەوە بۆیان بەهۆی قورئـان و پیغەمـەرەوە: یمە زۆر کەسمان لـەدانیشتوانی خولـەکانی رابوردومـان لـەناوبردون دانیشـتوانی مەککـە ئەرۆن بەجیگاکانیانا لـەکاتی چونیان بۆ کاروانو بازرگانی و هیچ کەسـی لـەوان نـەماون کەزۆرتر لـە قورەیشیەکان بەهیزتر و ساماندارتر بون، وەك گەلـەکانی عادو نوح و سەمود و، چونکە ئـەوان بۆیـە لـەناوچون بـی فـەرمانی پیغـەمەرەکانی خۆیانیـان کـرد، بۆچـی قورەیشەیکان ناترسن کە بی فەرمانی موحەمەد ئەکەن ئەمانیش لـەناوبچن؟.

﴿ إن في ذلك لآيات لأولـي النـهى﴾ بەراسـتی هەیـە لـەبنـەبرکردنی گـەلانی پیشـوو چەندین نیشانەی ئاشکرا بۆ ئەو کەسـانە خـاوەنی ئـەقلن و بـیر بکەنـەوە لـەبەسـەرهاتی گەلانی رابووردو کەلـەناوچون .

﴿ ولولا كلمة سبقت من ربلك لكان لزامـا و أجـل مسـمى ﴾ وە ئەگـەر فـەرمودە و بریار لـەپەروەردگاری تۆوە دەرنەچوبایە پیشەکی بەدواخستنی لەناوبدرنی قورەیشـەیکان بۆ کاتیك دیاریکراو بەراستی پیویست ئـەکرا لـەناوبردنیان بەوینـەی گـەلانی رابـوردو لـەجیهاندا. بەلام سزادانیان دوا ئەخری بۆ رۆژی دوایی و بۆ هەندی کاتی دیـاری کـراو لـەجیهاندا .

فَٱصۡبِرۡ عَلَىٰ مَا يَقُولُونَ وَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ قَبۡلَ طُلُوعِ ٱلشَّمۡسِ وَقَبۡلَ غُرُوبِهَاۖ وَمِنۡ ءَانَآيِٕ ٱلَّيۡلِ فَسَبِّحۡ وَأَطۡرَافَ ٱلنَّهَارِ لَعَلَّكَ تَرۡضَىٰ ﴿١٣٠﴾ وَلَا تَمُدَّنَّ عَيۡنَيۡكَ إِلَىٰ مَا مَتَّعۡنَا بِهِۦٓ أَزۡوَٰجٗا مِّنۡهُمۡ زَهۡرَةَ ٱلۡحَيَوٰةِ ٱلدُّنۡيَا لِنَفۡتِنَهُمۡ فِيهِۚ وَرِزۡقُ رَبِّكَ خَيۡرٞ وَأَبۡقَىٰ ﴿١٣١﴾ وَأۡمُرۡ أَهۡلَكَ بِٱلصَّلَوٰةِ وَٱصۡطَبِرۡ عَلَيۡهَاۖ لَا نَسۡـَٔلُكَ رِزۡقٗاۖ نَّحۡنُ نَرۡزُقُكَۗ وَٱلۡعَٰقِبَةُ لِلتَّقۡوَىٰ ﴿١٣٢﴾

﴿ فـاصبر علی مایقولون ﴾ دوایی ئارام بگرە لـەسەر شتی بت پەرستان بەتۆی ئـەلـین: کەتۆ درۆزن و جادوگەرو شاعیریو شیتو بوختان چیت، هەتاکاتی فەرمانی من دەرئـەچی بۆ لـەناوبردنیان. بیگومان هەرکەسی ئارام بگری سەرئەکەوی بەسەر دوژمنانی خۆیا .

﴿ وسبح بحمد ربك قبل طلوع الشمس و قبل غروبها ﴾ وەتـۆ نویـژ بکـە بەسـوپاس کردنەوە بۆ پەورەدگاری خۆت کە رانومایی تـۆی کـردوە و یـاریدەی تـۆی داوە دوری بخەرەووە لـەوشتانەی شایستەی ئەونین لـەهاوبەشـدانان بـۆی بـەهۆی نویژکردنـی بـەیانی بەرلـەهەلـهاتنی خۆر و بەنویژ کردنی نیوەرۆو عەسر بەر لـەئاوابونی خۆر .

﴿ ومن آناء اللیل فسبح﴾ وە دوایی نویژ بکە لـەهەندی کاتەکانی شەودا، وەك نویژی مەغریب و نویژی عیشا، لـەم رستەیەدا خوای مەزن شەوی پیش خستوە لـەبەر ریزگرتنـی شەو، چونکە مـرۆڤ لـەوکاتانـەی شـەودا میشکی چۆلـە لــەبیر کردنـەوەی کـاری گوزەرانی جیهان و باشتر ئەتوانی دەرونی خۆی بەرەو یەزدان بباو کاتی پشوودانیشە .

﴿ و أطراف النهار لعلك ترضى ﴾ وە تۆ نویژ بکــە لەهــەردوو لای رۆژدا بـەکردنی نویژی بەیانی ونویژی مەغریب لەبەرئەوەی تۆ خۆشـنودو رازبـە، ئـەو رستەیە دووپـات کردنەوەی نویژی بەیانی ونویژی مەغریب، چونکە ریزی تایبەتی خۆیانیان هەیـە. هـەندێ لەزانایانِ ئەلین: مەبەست لەرستەی ( اطراف النهار) لەلادانی خۆر لەناوەراسـتی ئاسمـان لەبەرئەوەی کۆتایی نیوەی رۆژەو سەرەتای نیوەکەی تریەتی، دورنیە مەبەست لەو کاتانە فەرماندانبێ بەیادکردنەوەی خوا لەهەمو کاتیکـا. بـەهیواو ئومیـدی ئـەوە تـۆ رازی بـی لەپاداشتی رۆژی دوایی‌و بەوەی دەستوری پارانەوەت پێدراوە لەو رۆژەداو خۆشـنودیش ببی، هەندێ لەزانایان ئەلین: مەبەست لە( اطـراف النـهار)فەرماندانـە بـەکردنی نویـژێ سونەت لە هەموو لایەکانی رۆژدا.

﴿ ولاتمدن عينيك إلى مامتعنا به أزواجا منهم زهـرة الحيـاة الدنيـا لتفتنـهم فيـه ﴾ وە بەراستی تۆ چاوی خۆت دریژ مەکە بۆ لای شتی ئیمە بەخشیومانە بەچــەند تـاقمی لـەبی باوەران جوانی جیهان لەبەرئەوەی ئیمە لەوشتە ئــەوان تـاقی ئەکەینـەوە شـایانی سـزابن لەرۆژی دواییدا. یانی تۆ گرنگی مەدە بەشتی تۆ ئەی بینی لەسامانداری بی باوەران، ئیـتر لەهەر جۆری بن: بت پەرست بن یان جوو گاورەکان بن، چونکە خوای مەزن بەو دراییە ئەوان تاقی ئەکاتەوەو نهینی ئەوان دەرئەخا و تۆلـەیان لی ئەسینی .

لەتەفسیر تەبەریدا هاتوە پیغەمەری خـوای مـەزن ﴿ﷺ﴾ نـاردی بـۆ لای جولـەکەیـە قەرزی بداتی ئەو جولەکەیە قەرزەکەی نەدایــە، دوایـی پیغەمـەر ﴿ ﷺ﴾ زۆری خەفـەت خوارد، بۆ دلنەوایی پیغەمەر ﴿ﷺ﴾ ئەو ئایەتەی نارده خوارەوە .

لەسـالی (١٩٣٤) داهونەرمـەندی بـەناوبانگ موستـەفا صـادیق رافیعـی ئـەلی لـــە دووبەرنامـەی خۆیـا: (موحەمـەد ﴿ ﷺ﴾ بەهــەزاری ژیـاوە و بـەلام هـەزاری موحەمـەد بەگەورەترین کارە پەکخەرەکانی ئەژمیررین و هەتا ئیستا کــەس ئاگـاداری بـۆ لای ئـەو کارە پەکخەرە پەیدا نەکردوە، چونکە خاون دارایی بوە. بـەلام دەسـت گوشـاد تـر بـوە لەباونەی هیشـــتوە پـەرەی پـی بـدری لای خـۆی و بەخشـیویەو نەماوەتـەوەلای ئـەو .

موحەمەد ﴿ﷺ﴾ کەگەورەو خاوەنی دەستوری نەتەوەو ئۆمەتەکەیـــەتی پیـــاویکی هـــەژاری وابوە خۆی ماندو کردوە بۆ ژیانی خۆی رۆژی برسی بوەو رۆژی تیر، مەبەستی یەکـــەمی ئەو پیاوە ئەوەبوە یەك پارچەیی مرۆڤایەتی بچەســپینی و قورســایی نیوانیــان پایــەدار بکــا، بەراستی موحەمەد ﴿ﷺ﴾ ئەیزانی هەرکەسی گیروگرفتی خۆی نەیەلی بەتەنها ئـەو کەسـە کاروباری کۆمەل رائەوەستینی و ئالۆزی ئەکا، ئەیزانی چاکەی خـۆی لـەراسـتیدا ئەوەیـە چاکە بۆ جگەی خۆی پەیدا بکا وە یەك بژین. نەك چاکەی جگەی خۆی بخـواو هـەردوو لایان لـەناو بچن) کەواتە جوانی وسامانی جیهان کورت و بی دەوامەو پروپوچە .

﴿ ورزق ربك خير وأبقى ﴾ وەشتی پەروەردگاری کردویەتی بەبەشـی تـۆ لـەپاداشـتی رۆژی دوایی چاکترە لـەوەی بەخشیویە بەوان لـەجیهانداو بەردەوامترە و کۆتایی نایە .

بۆ زانین: ژیان وزیندەگانی جیهان گالتە بــە هــەژاران و ســاماندران ئەکــەن بـەزمانی تایبەتی خۆیان بەبی جاوازی لـە نیونیانا: ئەوە نەهەژاران خۆیان ماندوو ئەکەن بــا هــەندی جاریش بەناچاری بۆ زۆرکردنی پلەو پایەی جگەی خۆی و وایش ئەبی خۆی لــەناو ئـەبا بۆ پەرەپیدانی سامانی جگەی خۆی .

ساماندارو خاوەن پلـەیش ئەیزانی ئەو سامانەی ئەوان بە ئارەقی نیو چاوانی هــەژاران پەیدا ئەبی و هەردوو لایان ئەو راستیە ئــەزانن، هیــچ لایــەکیان چاکــەی هیــچ لایــەکیان نالین: زۆرجاران لـەدژی یەکترین بەدەم و بەچەك ، ئەوەی گەشەبکا و بی ئاژاوە بی هــەر دارایــی وســامانە، کەواتــە هــەردوو لایــان خزمــەتکاری شــتیکی مــردون، نــەخۆیان و ونەجگەی خۆیان سودی لی وەرناگرن بەبی ئاژاوە. بەلام ئایینی ئیسلام ئەیــەوی بــەدارایی مرۆڤ گەشەبکاو خزمەتی مرۆڤایەتی پی بکا ومرۆڤ خۆی نەکا بەخزمــەتکاری و کـۆی بکاتەوەو بیشاریتەوەو، هەژاری جیگەی شانازی پیغەمەری ئیسلامە و گــەورەترین کــاری پەکخەری ئەو بوە، هەرچەندە سامانی ئەوکاتــەی ئەهاتــە بــەردەمی ئــەو پیغەمــەرەو ئــەو خاوەنی بوە. بەلام دەست گوشاد ترینی مرۆڤ بوە لـەبەخشینی داراییدا هــەرگیز هــەولی نەداوە زاوزی بکا و سودی خۆیی وئـادەمیزادی بەلایــەوە وەك یــەك وابــوە وویســتویەتی هەمو ئادەمیزاد یەکسان بن لـەساماتی جیهانداو کەس شانازی بەسامانەوە نەکا .

﴿ وأمر أهلك بالصلاة واصطبر عليها ﴾ وەتۆ فەرمان بدە بـەخیزانی خـۆت و بەهـەمو کەسـێ بـەکردنی نویـژو بـەردەوامبن لـەسـەر نویژکـردن، پیغەمبـەر ﴿ ﷺ ﴾ دوای هاتنـە خوارەوەی ئەم ئایەتە ئەچو بۆلای فاتمەی کچیو عەلیو هەمو بەیانیەك و ئەیفـەرمو: نویـژ نویژ، چەند مانگێ بەردەوام بو لـەسەر ئەوکارە.

﴿ لأنسألك رزقا نحن نرزقك والعاقبة للتقوى ﴾ وەئیمە داوا لـەتۆ ناکەین کە تۆ هیــچ کەسـی لـەبونـەوەرانی مـن بـەخیو بکـەیی و خواردەمـەنیان بدەیتـی بـەلکو ئیمـە داوای کارکردن لـەتۆ ئەکەین، ئیمە تۆو خیزانی تۆو هەمو بونەوەران بـەخیو ئەکـەین و رۆزیـان ئەدەینی، کەواتە تۆ خەفەتی رۆزی مەخۆو پاشەرۆژی چاك وبەختیاری بۆ ئەو کەسـانەیە لـەخوا ئەترسن و خاوەنی لـەخوا ترسانن و خۆیان لـە گوناە ئەپاریزن .

وَقَالُواْ لَوْلَا يَأْتِينَا بِـَٔايَةٍ مِّن رَّبِّهِۦٓۚ أَوَلَمۡ تَأۡتِهِم بَيِّنَةُ مَا فِي ٱلصُّحُفِ ٱلۡأُولَىٰ ﴿١٣٣﴾ وَلَوۡ أَنَّآ أَهۡلَكۡنَٰهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبۡلِهِۦ لَقَالُواْ رَبَّنَا لَوۡلَآ أَرۡسَلۡتَ إِلَيۡنَا رَسُولٗا فَنَتَّبِعَ ءَايَٰتِكَ مِن قَبۡلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخۡزَىٰ ﴿١٣٤﴾ قُلۡ كُلّٞ مُّتَرَبِّصٞ فَتَرَبَّصُواْۖ فَسَتَعۡلَمُونَ مَنۡ أَصۡحَٰبُ ٱلصِّرَٰطِ ٱلسَّوِيِّ وَمَنِ ٱهۡتَدَىٰ ﴿١٣٥﴾

﴿ و قالوا لايأتينا من ربه ﴾ وە بت پەرستانی مەککـە ئـەیان ووت: بۆچـی موحەمـەد نایهینی بۆلای ئیمە نیشانەیەکی ئاشکراو کاریکی پەکخـەری ئیمـە لـەلای پـەورەدگاری خۆیەوە، هەتا ئەونیشانەیە ببی بەبەلـگە لـەسەر راستی موحەمەد .

ئەگەر بت پەرستان مەبەستیان تاوانج و بی باوەری نیە، بەنیازی پاکەوە داوای کـاری پەکخەر ئەکەن ئەوەتە هاتوە بۆ لایان کاری پەکخەر، وەك خوای مەزن ئەفەرموی:

﴿ أو لـم تأتيـهم بينـة مـافي الصحـف الأولى ﴾ ئايا نـەهاتوە بـۆ لای ئـەوان كـاری پەكخەرو نیشانەی ئاشكرا لـەنیو نامەكانی پیشوودا، وەك تەورات و ئینجیــل و نامـەكانی تریش. یانی ئەوە ئەو قورئانە لـەبەردەستانایە هەمووكاریكی پەكخــەری تـر و كاریگـەری تیدایە، یەكی لـەو كارانە ئەمەیە: كە ئەو شتانەی لـەنیو ئەو نامانەدایە روونــی كردوەتــەوە بجۆریكی راست و رەوان، هەوالی داوە بــەئیوە گـەلانی پیشـوو پیغەمــەرەكانی خۆیانیـان بەدرۆخستوەەتەوە، دوایی خوا بنەبری كردوون. كەواتە ئــەو شـتانە ئـەو بـت پەرسـتانە داوای ئەكەن بۆ فر وفیل و گالتە پی‌كردن و خەلـەتاندنە و بۆیشیان ناچیتە سەر .

﴿ ولو أهلكناهم بعذاب من قبله ﴾ وە ئەگەر ئیمە ئەو بت پەرستانەمان لــەناو ببردایـە بەهەر سزایەبوایە لـە پیش رەوانەكردنی موحەمەدەوەو هاتنــە خــوارەوەی قورئـان، رۆژی دوایی ئیمە پرسیاریان لی ئەكەین بۆچی باوەرتان نەهیناوە ؟ .

﴿ لقالوا ربنا لولا أرسلت إلينا رسولا فنتبع آياتك م ن قبل أن نذل ونخزي ﴾ بەراستی بت پەرستان لـەرۆژی دواییدا ئەلین: ئەی پەروەردگاری ئیمە: تۆ رەوانەت نــەكردوە بـۆ لای ئیمە پیغەمەری، دوایی ئیمە پەیر‌وی بەلـگە ئاشكراكانی تۆمان بكردایــە، بروایشـمان بەدووا رۆژ بهینایە لـەپیش ئەوەی ئیمە سەرشۆربوینایە لـەجیهاندا بەكوشتن و دیل كردن و لـەرۆژی دواییدا رسوا بــین. بخریینــە نیــو ئــاگری دۆزەخ. بــەلام ئیمــە بیانومـان بریـن و لـەناومان نەبردن بەرلـەهاتنی قورئانو رەوانەكردنی موحەمەد .

﴿ قل كل متربص فتربصوا ﴾ تۆ بلی بــەبی بـاوەران: هەموویــەكی لــەمن و لــەئیوە چاوەرووان ئەكەین بۆ ئەنجامی پاشــەرۆژی خۆمـان. دوایـی ئیـوە چـاوەرووان بكـەن بـە هەرجۆری لاتان چاكەو پیتان خۆشە .

﴿ فسوف تعلمــون مـن أصحـاب الـصـراط السـوي ومـن اهتـدى ﴾ دوایـی ئـەزانن لـەهەردوو جیهاندا چ كەسی حاوەنی ریگەی راستەو چ كەسی ریگەی راستی وەرگرتوەو

شارەزای فەرمانی خوای وەرگرتوەو رزگاری ئەبی لەسـزای خـوای مـەزن . ئـەو ئایەتـە راگەیاندنە بۆ ئەوکەسـانەی بەریگـەی ناراسـت و بەریگـەی لـەناوبردنی خۆینـا ئـەرۆن وهەرەشەیە بۆیان بەسزایەکی سەخت کە چاوەروانیان ئەکا .

بەیاریدەی خوای ەزن کۆتایی بەماناکردنی جزمی شانزدەهەم هات رۆژی دووشەممە
(۱۳)ی مانگی زیلحیجە (۱٤۲۰ ) ی کۆچی بەرانبەر بە ۲۰ / ۳/ ۲۰۰۰ زایینی
خوای‌مەزن یاریدەمان بدە بۆئو شتانەی خۆت ئەیزانی وچاکە بۆئیمە
سوپاسی بی‌پایان بۆ خوای گەورە و درود لەپیغەمەر

## ﴿ پێرست ﴾

خوێنەری هێژا لەم جزمەدا ئەرکی چاوپیاخشانی ئەم هەڵانە بگرە ئەستۆی خۆت

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ | هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|---|---|---|---|
| أن لو | لو | ٤ | ٧ | (علو) | (علوا) | ١١٥ | ٨ |
| (سلله به) | (شلكه) | ٧ | ٢٢ | نەیان ئێمە | ئێمە | ١١٥ | ١٦ |
| نەختە | نەختە نەختە | ١٢ | ٧ | ئێوە بەخشیو | ئێوەمان بەخشیبو | ١١٧ | ٢ |
| (المصلحين) | (المخلصين) | ١٧ | ١٩ | سەدەمەدا | سەردەمەدا | ١٢٠ | ١٢ |
| زۆری و | زۆری | ١٨ | ١٢ | پێویستی | پێنوسی | ١٢٢ | ٧ |
| (تعب) | (لصب) | ١٩ | ١٢ | (يصل) | (يضل) | ١٢٦ | ٤ |
| لە | لەو | ١٩ | ١٤ | خوار | خوا | ١٣٤ | ١٧ |
| بەزێر | پەزێر | ٢٠ | ١٥ | خوە | خوا | ١٣٤ | ٢٠ |
| براازی | برازای | ٢١ | ٢٣ | جوی ح | جوی | ١٣٨ | ١١ |
| نریان | تریان | ٢٥ | ٥ | نحوی | نجوا | ١٤٥ | ٧ |
| لەو | لەد | ٢٥ | ٧ | فسینغچون | فسینفضون | ١٤٧ | ٩ |
| گومڕایی | بە کومڕای | ٢٥ | ١٤ | باوەڕداران | بێ باوەڕان | ١٥٠ | ١١ |
| سبعان | (سبعا) | ٣٠ | ٩ | ڕكارتان | ڕزگارتان | ١٥٠ | ١٢ |
| لەسەربێ | باوەڕ | ٣٠ | ١٧ | خەتی | سەختی | ١٥٠ | |
| (تؤمرون) | (تؤمر) | ٣١ | ١٤ | (الملكوته) | الملعونة | ١٥٤ | ١ |
| خوایاران | خوابیبارێنێ | ٣٣ | ١٦ | (أم اتم) | ام أمنتم | ١٥٨ | ١٧ |
| بگەیەمە | بگەیەنن | ٣٤ | ١٠ | پەروەردگاری | پەروەردگار | ١٥٨ | ١٨ |
| وەڵەسەر | وەڵەسەر خراپە | ٣٧ | ٤ | مرڤێ | مرۆڤێ | ١٦٤ | ١٥ |
| خرابە | خراپە | ٤٧ | ١ | (يستغرونك) | يستفزونك | ١٦٤ | ٢٢ |
| وە سوژدی | سوژدە | ٥٧ | ١١ | (أن الحزبين) | أی الحزبين | ١٩٣ | ١٦ |
| روستی | دروستی | ٥٩ | ٢ | ئەو ماوبە | ئەو ماوەیە | ٢٠٦ | ١ |
| ڕوشی | ڕەوشی | ٦٦ | ١٦ | توااني | تواناي | ٢٠٩ | ٩ |
| مم | من | ٦٧ | ٨ | داو | داوە | ٢٠٩ | ١٢ |
| الله | لله | ٧ | ١٤ | (بغاث) | بعاثوا | ٢٠٩ | ١٤ |
| داوی | دوایی | ٧٤ | ٣ | (صعنا) | صفا | ٢١٨ | ١٤ |
| کردنەوەتی | کردنەوە | ٧٤ | ٤ | (موقبا) | موقبا | ٢٢١ | ١٤ |
| بەوی | ببە | ٧٤ | ٧ | خوشبون | خۆشبون | ٢٣٢ | ١٦ |
| بۆکا | کار | ٧٧ | ١٣ | ائندروا | أندرو | ٢٢٣ | ١١ |
| طفلم | ظعنكم | ٧٧ | ١٥ | ئاگارم | ئاگادارم | ٢٢٥ | ١٦ |
| بەنە | بەندە | ٧٧ | ٢٠ | لتفرق | لیفرق | ٢٣٣ | ١٢ |
| وەئبنە | وە ئێمە | ٨٢ | ١ | ئەنامە | ئەندامەکا | ٢٣٧ | ١ |
| ئەفەرموێ موچ | ئەفەرموێ | ٨٨ | ٤ | ئاشتانە | ئەوشتانە | ٢٤٥ | ٢١ |
| فروانی | فراوانی | ٩٦ | ١٦ | (عفيا) | غبيا | ٢٥٥ | ١٠ |
| دادرێن | دادەنرێن | ٩١ | ١٧ | سبیحول | سجدة | ٢٥٦ | ٩ |
| قانا | قانتا | ١٠١ | ٤ | حفاناً | ضنانا | ٢٥٧ | ٧ |
| نبونیان | نێوانیایانا | ١٠٣ | ١١ | (بوالدی) | بوالدتی | ٢٦٧ | ٦ |
| ڕێکەی‌یان | ڕێگەیان | ١٠٤ | ١٤ | کییانە | کۆنیانە | ٢٦٩ | ٣ |
| (وما صبرك) | وأصيروا وما صبرك | ١٠٥ | ١٢ | هەرخە | هەرچەندە | ٢٧٢ | ٥ |
| سبدەتد | سبدرة | ١٠٧ | ١٧ | لەنێوان مەبەتا | لەنێوان میسرومەدینەدا | ٢٧٥ | ١١ |

| هەڵە | ڕاست | لاپەڕە | دێڕ |
|---|---|---|---|
| لە ستنور | لە سنور | ١١٥ | ٩ |
| دەور | دەر | ٢٧٦ | ١٩ |
| برکێکی | بەرکێکی | ٢٨٣ | ١١ |
| (تعلی) | تتلی | ٢٨٤ | ٣ |
| مزگەوتوکانیان | مزگەوتەکانیانەوە | ٢٨٥ | ٤ |
| یا بە دیاری | بەدیاری | ٢٨٨ | ١٧ |
| پێغەمەر | خوا | ٢٩١ | ١٠ |
| تۆدای | تۆدا | ٢٩٣ | ٤ |
| چوە | هاتوچوی | ٢٩٣ | ١٤ |
| (فاقذمە) | (فافذ فیە) | ٢٠٥ | ١٦ |
| ئەرۆست | ئەرۆیشت | ٢٠٥ | ١٨ |
| (فآتعا) | (فأتیاە) | ٣١١ | ١ |
| نوو | نو ۆ | ٣١١ | ٢٠ |
| (أصی) | أوحی | ٣١٢ | ١ |
| (قرن) | (القرون) | ٣١٣ | ٩ |
| (شیلا) | (سبلا) | ٣١٣ | ٢١ |
| گومڕایان و | کومڕایا | ٣١٤ | ١ |
| (لألی) | لأولی | ٣١٤ | ١٢ |
| (وألی) | (وأبی) | ٣١٥ | ١ |
| بەزرو | بەرزو | ٣١٦ | ١٧ |
| باەکی | باوکی | ٢٧٥ | ١٩ |
| یطرقتکم المتلی | بطریقتکم المثلی | ٣١٨ | ٩ |
| دوۆر | وە زۆر | ٣٢٠ | ٨ |
| لەو دراوەی | لەو ڕادەی | ٣٢١ | ١٣ |
| (لم تؤثرك) | لن تؤثرك | ٣٢٢ | ٤ |
| شیرادانی تۆ | شیوانی تو | ٣٢٢ | ١٩ |
| (وأضلم) | (وأضلهم) | ٣٢٧ | ٩ |
| گویکە | گوێرەکە | ٣٣٠ | ٣ |
| تەماشاشای | تەماشای | ٣٣٠ | ١٥ |
| سامیری | مرسای سامیری | ٣٣١ | ١٢ |
| ترتیان | تریان | ٣٣٢ | ٤ |
| کردی | کردبێ | ٣٣٢ | ٨ |
| (ولا تجعل) | ولا تعجل | ٣٤٠ | ٩ |
| بونیان | بونیان بە پێغەمەر | ٣٤٣ | ٦ |
| داوی | دوای | ٣٣٤ | ١٤ |
| بەڵگەیە | بێ بەڵگەیە | ٣٤٥ | ١٤ |
| بمە | بەمە | ٣٤٦ | ١١ |
| بدرنی | بردنی | ٣٤٦ | ٢٠ |
| رازبە | ڕازی یە | ٣٤٨ | ٢ |
| وەیەك | یەك یەك | ٣٤٩ | ٦ |
| (لا یأتینا) | لولا یأتینا | ٣٥٠ | ١٥ |